- ناوی کتێب: بەختەوەر بژی.
- نوسینی: د. محەمەد عەریفی.
- وەرگێڕانی: هێمن محەمەد عەلی.
- دیزاین: قەیدار ڕەحیم.
- چاپ: یەکەم.
- ژمارەی سپاردن: ٢٧٠٩ی ساڵی ٢٠١٠.
- چاپخانە: دار المعرفة - لبنان.




نارین

هەولێر- چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید.

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی.

تەلەفۆن: ٠٠٩٦٤٦٦٢٥١١٩٨٢

مۆبایل: ٠٠٩٦٤٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

Website: www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com

ناوازەترین بەرهەمی د. محەمەد عەریفی

# بەختەوەربژی

• هونەری هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی، لە سایەی ڕێژینی پێغەمبەرداﷺ.

• ئەزموونی زیاتر لە بیست ساڵی توێژینەوەو خول و یادەوەری نووسەر.

وەرگێڕانی

**هێمن محەمەد عەلی**

١٤٣٢ك چاپی یەکەم ٢٠١١ز

ناریـن



## پێشەکی..

### بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگارو درودو سلاویش بۆ سەر گیانی پێغەمبەری پێشەوای ئازیزو نازدارﷺ..

لە تەمەنی شانزە سالیمدا پەرتوکێکی (دیل کارنیجی)م لەبەر دەستدا بوو، بە ناوی (هونەری مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکیدا) بە ڕاستی پەرتوکێکی زۆر ناوازەو نایاب بوو، هەر لەبەرئەوە چەندان جار خوێندمەوە..

نوسەری پەرتوکەکە پێشنیاری ئەوەی کرد بوو، کە پێویستە خوێنەر هەموو مانگێك جارێکی بخوێنێتەوە، منیش وام کردو یاساو بنەماکانی پەرتوکەکەم بە سەر هەڵسوکەوتەکانم لەگەڵ خەڵکیدا جێبەجێ کردو ئەنجامی زۆر سەرسوڕهێنەرم لێیانەوە بە دەست هێنا..

نوسەری پەرتوکەکە کۆمەڵێك بنەماو یاسای دیاری کرد بوو، لە ژێر هەر بنەمایەکیشدا نمونەو ڕووداوی پیاوانی بە تواناو بلیمەتی باس کرد بوو، وەك: ڕۆزفێلت.. لنکۆلن.. جوزف.. مایك..

بیرم کردەوەو لە ژیانی (دیل کارینجی) وردبوومەوە، ڕوانیم ئەم پیاوە لە پێناوی بەختەوەری ژیانی دونیادا دەینوسی و خەڵکی بۆ ژیانێکی ئاسودە ڕێنمایی دەکرد، ئەی ئەگەر ئەم پیاوە ئاینی پیرۆزی ئیسلامی بناسیایەو موسڵمان بووایە، ئەوا ئەو کاتە بەختەوەری هەردوو دونیای بە دەست دەهێنا.. بەڵام بە داخەوە، پاشان ڕوون بۆوەو دەرکەوت کە (کارینجی) خۆی کوشتووە، ئەوسا بۆم دەرکەوت کە پەرتوکە ناوازەو بە نرخەکەی هیچ سودێکی پێنەگەیاند..

بە ناو مێژووی موسڵماناندا گەڕام و وردبوومەوە، بینیم لە ناو ڕێژینی پێغەمبەری ئازیزﷺ و هاوەڵانیدا نمونەی زۆر جوان و بە نرخ هەیە لە هونەری مامەڵە کردندا، کە دەتوانرێت لێیان بەهرەمەند بین.. هەر لەم ڕوانگەیەوە دەستم کرد بە نوسینی ئەم پەرتوکە، لە بواری هونەری هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا..

ئەم پەرتوکەی بەردەستت، نوسراوو لەدایك بووی مانگێك یان ساڵێك نیە، بەڵکو



ئەنجامی لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی بیست ساڵمە.. سوپاسی پەروەردگارم دەکەم کە تا ئێستا یارمەتی داوم بە نوسینی نزیکەی بیست پەرتوك، کە هەندێکیان تیراژی دوو ملیۆنیان تێپەراندووە، لەگەڵ ئەمەشدا خۆشەویسترین پەرتوك لە دڵمدا ئەم پەرتوکەی بەردەستی بەرێزتە، هەستیش دەکەم بە سودترینی پەرتوکەکانمە..

ئەو پەرتوکەی کە وشەکانیم بە مەرەکەبێکی تێکەڵ لە خوێنم نوسیووە.. هەستو نەستم لەگەڵ دێرەکانیدا ئاوێزان بوون.. زۆرێك لە یادگاریەکانمی تیادا تۆمارە..

کۆمەڵە وشەیەکی تیادایە کە لە دڵەوە دەرچووە، بەو هیوایەی بگات بە دڵەکان.. زۆر ئامەزرۆم لە دەرگای دڵی تۆی خۆشەویست بداتو لە ماڵی دڵتدا جێگیر بێتو بحەوێتەوە.. دەی تۆش بەزەییت پیایدا بێتەوە..

ئای چەند دڵخۆشو ئاسودە دەبم کاتێك خوشکێك یان برایەکی خوێنەر، ئەوەی لەم پەرتوکەدایە، لە ژیانیدا جێبەجێی بکات.. بەهۆی ئەم پەرتوکەوە بەرە بە ژیانی بداتو زیاتر خۆشی لە ساتەکانی تەمەنی ببینێت، پاشان هەستو سۆزی خۆی بەوپەڕی راشکاویو راستگۆییەوە لە ڕێگەی نامەوە، یان لە ڕێگەی (SMS)ەوە بۆ نوسەری ئەم چەند دێرە بنێرێت، بۆ ئەوەی سوپاسی بکەمو بە نادیاریش نزای بۆ بکەمو لە پەروەردگار بۆی بپارێمەوە..

هیوادارم ئەم پەرتوکە سودمەند بێتو سودی لێببینرێتو تەنهاش لەبەر خاتری پەروەردگاری خۆشەویست بێت.. ئامین..

د.محمد عبدالرحمن العريفي
Arefe5@yahoo.com
پۆستە/ ١٥١٥٩٧ ریاز ١١٧٧٥
مۆبایل/ ٠٠٩٦٦٥٠٥٨٤٥١٤٠

**سەرەتا..**

مەبەست ئەوە نیە پەرتوکێك بخوێنیتەوە..
بەڵکو گرنگ ئەومیە، سودی لێ ببینیت..



# ئەوانە سودمەند نابن..

لەبیرمە لە ڕێگەی مۆبایلەکەمەوە، کورتە نامەیەکم بۆ هات، تیایدا نوسـرا بوو: یا شێخ، حوکمی خۆکوشتن چیە؟

پەیوەندیـم بەو کەسـەوە کـرد، گەنجێـك وەڵامی دامـەوەو پێـم وت: ببورە لە پرسیارەکەت حاڵی نەبووم، پرسیارەکەت دوبارە بکەرەوە!

وەڵامی دایەوەو وتی: پرسیارەکەم ڕوونو ئاشکرایە.. حوکمی خۆکوشتن چیە؟

ویستم وەڵامێکی بدەمەوە، کە بە لایەوە چاوەڕوان نەکراو بێت، بۆیە بە پێکەنینەوە پێم وت: دروستو ڕێگە پێدراوە..

گەنجەکە هاواری کردو وتی: چی؟!

وتـم: ئەڵێـی چـی هاوکاریت بکـەم لە دیـاری کردنی ئـەو ڕێگەیـەی کە خۆتی پێدەکوژیت؟!

گەنجەکە بێدەنگ بوو..

پاشان وتم: باشە بۆچی دەتەوێت خۆت بکوژێت؟!

وتی: لەبەرئەوەی هیچ پلەوپایەو وەزیفەیەکم نیەو خەڵکی خۆشیان ناوێمو هەست دەکەم کەسـێکی زۆر دۆڕاوو ڕوخـاومو هەروەها..و.. ڕووداوێکی خـۆی بە درێژی بۆ گێرامەوە، کە نەیتوانیووە پەرە بە تواناکانی بداتو توشی شکست بووە..

ئەم حاڵەتەش بەڵایەکی گەورەیە کە بە سەر زۆرێك لە خەڵکیدا هاتووە..

بۆچی دەبێت کەسـانێك بەم شێوەیە سەیری خۆیان بکەنو خۆیان لە لا کەم بێت؟! بۆ دەبێت بە چاوێك سەیری ئەو کەسانە بکات، کە لە سەر لوتکەی چیاکان ڕاوەستاونو لە خۆی ڕانەبینێت، وەکو ئەو کەسـانە بگاتە سـەر لوتکەی چیا؟! هیچ نەبێت ئەگەر نەشـتوانێت بگاتە لوتکە، با بە سەر چیاکاندا سـەرکەوێت، هەروەك ئەو کەسانەی کە سەرکەوتن..

ومن يتهيب صعود الجبال      يعيش أبد الدهر بين الحفر..

بەڵێ.. ئەو کەسەی بترسێت سەرکەوێت بە سەر چیاکاندا، دەبێت ژیانی لە چاڵو شیوەکاندا بە سەر بەرێت..

ئەزانی کێ سود لەم پەرتوکە نابینێت؟! یان کێ سودمەند نابێت لە هەر پەرتوکێك لە پەرتوکەکانی هونەری مامەڵەو هەڵسوکەوت کردن؟!

ئەو کەسە سودمەند نابێت، کە ملکەچی هەڵەکانی دەبێتو خۆی دەداتە دەست ئەو حاڵەتەی کە تێیدایەتیو دەڵێت: هەر لە سەرەتاوە من بەم شێوەیە گەورە بوومو ناتوانم گۆڕانکاری لە خۆمدا ئەنجام بدەم.. خەڵکیش هەر بەم چاوەوە سەیرم دەکەن.. زۆر مەحاڵە وەکو خالید بتوانم قسەو گوفتاری جوان دەربڕم.. یان وەکو أحمد بەردەوام ڕوخۆش بم.. یان وەکو زیاد لە لای خەڵکی خۆشەویست بم..

ڕۆژێك لەگەڵ پیاوێکی پیردا دانیشتبووم، لە شوێنێکی گشتیدا، پیاوە پیرەکە لەگەڵ تەنیشتەکەیدا قسەی دەکردو ئامادەبووانیش لەبەرتەمەنو ڕیشە سپییەکەی ڕێزیان دەگرت، منیش چەند کورتە ئامۆژگاریەکم پیشکەش کرد، لە ناو قسەکانمدا، باسی فەتوایەکی شێخ عبدالعزیز بن بازم کرد، کاتێك لە قسەکانم تەواو بووم، پیاوە پیرەکە زۆر بە شانازیەوە پێی وتم: منو شێخ عبدالعزیز بن باز چل ساڵ لەمەوبەر هاوڕێی یەکتر بووینو لە یەکێك لە مزگەوتەکاندا لە لای شێخ محمد إبراهیم دەمانخوێند.. ئاوڕم دایەوەو سەیرێکیم کرد، بە ڕوخساریەوە شادومانیەك دەبینرا، لەبەرئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوڕێی پیاوێك بووە، کە زۆر سەرکەوتوو بووە لە ژیانیدا..

لە دڵی خۆمدا دوبارەم دەکردەوەو دەم وت: هەژارو داماو، ئەی تۆ بۆ وەکو شێخ عبدالعزیز بن باز سەرکەوتوو نەبوویت؟! کە ڕێگەی سەرکەوتنت دۆزیەوە، ئەی بۆ نەتتوانی بگەیتە مەنزڵو بەردەوام بیت؟!

بۆچی کاتێك کە شێخ عبدالعزیز بن باز کۆچی دوایی کرد، دوانگەو میحرابو پەرتوکخانەکان هەموو دەستیان کرد بە گریان؟!

چەندان کەس بۆ لە دەستچوونی ئەو زانایە دەیان ناڵاندو ئەسرینیان دەڕشت، بەڵام لەوانەیە کاتێك کە تۆ دەمریت، کەسێك مەگەر لەبەر عورفو عادەت، یان بۆ موجامەلە نەبێت، فرمێسکێکت بۆ نەڕێژێت!!

هەمووومان لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان بڵێین: فلانە کەسمان دەناسی.. هاوڕێی فلانە

کەس بووین.. لەگەڵ فلانە کەسدا لە فلانە شوێن‌و جێگەدا دانیشتین.. ئەم قسانە هیچیان جێگەی فەخرو شـانازی نین، بەڵکو شانازی ئەوەیە بگەی بە لوتکە، وەکو ئەو کەسانەی پێی گەیشتن..

دەی پاڵەوان‌و گورج‌وگۆڵ بەو هەر لە ئێستاوە، هەموو ئەو کارانە جێبەجێ بکە، کە سود بە تواناکانت دەگەیەنن..

دەی سـەرکەوتوو بـە.. چارەو ڕوخسـاری مۆن‌و گـرژت، بگۆڕە بـە زەردەخەنەو ڕوخۆشی..

ڕەزیلی‌و چروکیت، بگۆڕە بە بەخشندەیی..

توڕەییت، بە لەسەرخۆیی..

بەڵاو نارەحەتیەکانت، بگۆڕە بە شادومانی‌و بەختەوەری..

چەکی بەهێزیشت، با باوەڕو ئیمانەکەت بێت..

بەختـەوەر بژی‌و چێژ لـە ژیانت ببینە، چونکە ژیان زۆر کورتـەو کاتێك نیە بۆ غەم‌و خەفەت.. ئەی چی بکەیت باشە؟!

ئەم پەرتوکەم بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسـیارە نوسـیووە.. لەگەڵم بن‌و پشتیوان بە خودای پەروەردگار دەگەین بە مەبەست..

**لەگەڵماندا دەمێنێتەوە..**

**پاڵەوان: ئەو کەسەیە، کە سورە لە سەر ئەوەی پەرە بە تواناکانی بداتو سودیان لێ ببینێت..**

# چی فێردەبین..؟!

زۆربەی خەڵکی هاوبەشن لە هۆکارەکانی خۆشیو ناخۆشی.. هەموویان کاتێك پارەو سەروەتو سامانیان زۆر دەبێت، دڵخۆش دەبن..

کاتێــك لە کارەکانیاندا ســەرکەوتوو دەبن، هەروەها کاتێك نەخۆشــیەکانیان چاك دەبێتەوە، دڵخۆش دەبن..

کاتێك ژیان بە دەمیانەوە پێدەکەنێتو ئامانجەکانیان بەدی دێت، خۆشحاڵ دەبن..

لــە هەمان کاتدا، هەموویان کاتێك هەژار دەبن، دڵتەنگی ڕوویان تێدەکاتو غەمبار دەبن..

کاتێــك نەخۆش دەکەونو کاتێك کە ســوکایەتیان پێدەکرێت، غەمبار دەبن.. مادام وایــە، دەی وەرە بــا بگەڕێین بە دوای ئــەو ڕێگەو هۆکارانەدا، کە دڵخۆشــمان دەکاتو سەرکەوینو زاڵ بین بە سەر ئەو ڕێگەو هۆکارانەدا کە دڵتەنگمان دەکەن..

بەڵــێ.. ڕێــرەوی ژیان هــەر وایە، مرۆڤ لە نێوان خۆشــیو ناخۆشــیدا، لە نێوان تاڵیو شــیرینیدا دەیگوزەرێنێت.. منیش لەم شــتانەدا لەگەڵتدام، بەڵام زۆرجار بەڵاو نارەحەتــیو غەمو خەفەتــەکان، لە قەبارەی خۆیان گەورەتــر دەکەینو چەندان ڕۆژ بە غەمو پەژارەوە ژیان بە ســەر دەبەین، لە کاتێکدا وا پێویست بوو، کاتژمێرێك، یان چەند ساتێکی کەممان، لەگەڵ ئەو غەمو پەژارانەدا بەسەر بردبایا..

دەی بۆچی ئەو کاتە پیرۆزانە لەگەڵ غەمو پەژارەدا بە سەر بەرین؟!

براو خوشــکی ئازیز: بزانە کە غەمو پەژارە بــە بێ پرسو ڕاو بە بێ لە دەرگادان، خۆی دەکات بە ناو دڵو دەروونـدا، بەڵام چەندان ڕێگەو شــێوازیش هەیە، بۆ داخستنی دەرگاکان بە ڕووی غەمو پەژارەکان..

وەرە بچین بۆ بابەتێکی تر..

چەندان کەســی خۆشەویست دەبینیت لە ناو کۆمەڵگەدا.. ئەو کەسانەی، کە خەڵکی بە بینینیان دڵخۆش دەبن.. ئەو کەســانەی کە خەڵکی حەز دەکەن لەگەڵیان دانیشــنو هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن..

ئایــا ڕۆژێك بیرت کردۆتەوە کە یەکێك بیت لەو کەســانە؟! بۆچی ڕازی دەبیت، کە

خەڵکی کاریگەرییان لە سەرت هەبێت و پێیان سەرسام بیت؟! ئەی تۆ بۆ کاریگەری لە سەر دەوروبەرت دروست ناکەیت و وا لە خۆت ناکەیت، خەڵکی پێت سەرسام بن؟!

لێرەدا با فێر بین، چۆن هەوڵ بدەین بەو شێوەیە بین و کاریگەری لە سەر کەسانی تر دروست بکەین.. بۆچی ئامۆزایەکت لە کۆڕو دانیشتنێکدا کاتێك کە قسە دەکات، خەڵکی هەموو بێدەنگ دەبن و گوێی لێدەگرن، بەڵام کاتێك تۆ قسە دەکەیت، خەڵکی پشت هەڵدەکەن و بێزار دەبن و بە قسەی ئەملاولا نارەحەتت دەکەن؟! بۆچی؟!

لەوانەیە تۆ زیاتر شارەزاو خاوەن زانیاری تریش بیت.. بڕوانامەکەشت بەرزتر بێت.. خاوەن پلەو پایەیەکی بەرزیش بیت.. ئەی بۆچی ئەو توانیویەتی سەرنجی خەڵکی بۆ خۆی ڕابکێشێت؟! ئەی بۆ تۆ ناتوانی؟!

بۆچی باوکی وا هەیە، منداڵەکانی زۆریان خۆش دەوێت و حەز دەکەن هەمیشە لە خزمەتیدابن، بەڵام باوکی واش هەیە، منداڵەکانی بە چەندان بیانوو خۆیان لە باوکیان دەشارنەوەو حەز ناکەن لەگەڵیدا کاتەکانیان بەسەربەرن؟!

بۆچی هەردووکیان هەر باوك نین..؟! ئەی بۆچی..؟! ئەی بۆچی..؟!

لێرەدا هەوڵ دەدەین کە فێر بین، بەختەوەر بژین و چێژ لە خۆشییەکانی ژیان ببینین.. فێری ڕێگەو هۆکارەکانی ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆمان ببین..

فێربین کاریگەرییان لە سەر دروست بکەین..

فێر بین لە سەر کەم و کوڕییەکانی خەڵکی ئارامگر بین و بتوانین لەگەڵ ئەو کەسانەدا بژین، کەبە هەڵسوکەوتیان دەوروبەریان ئازار ئەدەن..و.. هەروەها..

دەی سڵاوت لێبێت و بەخێرهاتنت لێدەکەم بۆ ئەم بوارە..

وتەیەك..

سەرکەوتن: بریتیە لە ئەنجامدانی چەند شارەزاییەك، کە بە هۆیانەوە خۆشەویستی خەڵکی بە دەست بهێنیت، نەك دۆزینەوەی ئەو شتانەی کە خەڵکی خۆشیان دەوێ.



## بۆچی بەدوای شارەزاییەکاندا دەگەڕێین..؟!

سەردانی یەکێك لە ناوچە هەژارنشینەکانم کرد، بۆ ئەوەی وتەو ئامۆژگاریەك پێشکەش بکەم.. لە دوای وتەکانم یەکێك لە مامۆستاکان هات بۆ لامو پێی وتم: پێمان خۆشەو حەز دەکەین یارمەتیو هاوکاری هەندێك لە قوتابیەکان بکەیت..

منیش بە سەرسوڕمانەوە وتم: ئایا قوتابخانەو خوێندنگەکانی دەوڵەت بە خۆڕایی نین؟!

وتی: بەڵێ وایە، بەڵام یارمەتیان بدە بۆ ئەوەی خوێندنی زانکۆ تەواو بکەن..

وتم: هەروەها زانکۆش، ئایا زانکۆکانیش حکومی نین؟! بەڵکو حکومەت پارەشیان دەداتێ!!

وتی: چیرۆكو بەسەرهاتەکەت بۆ دەگێڕمەوە..

وتم: دەی..

وتی: هەندێك لە قوتابیەکانمان بە نمرەیەك دواناوەندی تەواو دەکەن، کە کەمتر نەبێت لە ٩٩٪، ئەوەندە خاوەن زانیاریو زاناو بە توانان، بەشی نەتەوەیەك دەکەن.. کاتێك دواناوەندی تەواو دەکەنو دەیانەوێت بڕۆن بۆ شارێکی تر، بۆ ئەوەی درێژە بە خوێندن بدەن، لە بوارەکانی ئەندازیاری، یان شەریعە، یان کۆمپیوتەر، باوکی هەندێکیان ڕێگریان لێدەکەنو بە منداڵەکانیان دەڵێن: ئەوەندەی فێربوویت بەسەو دانیشەو لەگەڵمدا خەریکی بەخێوکردنو لەوەڕاندنی مەڕومالاٌت بە..

منیش ئاگام لە خۆم نەماو بە دەنگی بەرز هاوارم کردو وتم: بەخێوکردنی مەڕومالاٌت؟!

وتی: بەڵێ.. بەخێوکردنو بوون بە شوانی مەڕومالاٌت..

بەڵێ.. ئەو هەژارە لە لای باوکی دەمێنێتەوەو دەبێت بە شوانی مەڕو بزن.. هەموو تواناو بەهرەکانی دەچنە ژێر گڵ.. چەندساڵێك بە سەر تەمەنیدا تێدەپەڕێتو

شــوانی بزن‌و مەڕ دەبێت، لەوانەشە ژیانی هاوسەردارێش پێك بهێنێت‌و منداڵیشیان ببێت‌و بە هەمان شێوەی باوکی هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵەکانیدا بکات‌و مەڕو بزنیان پێ بلەوەڕێنێت‌و بیانکات بە شوان!!

وتم: ئەی چارەسەر چیە؟!

وتی: چارەسەر ئەوەیە کە باوکیان ڕازی بکەین بەوەی کە کەسێك بە کرێ بگرن، بە چەند ســەد ڕیاڵێك مەڕو ماڵاتەکانیان بۆ بە خێو بکات.. ئەو پارەیەش ئێمە بیدەین، بۆ ئــەوەی منداڵە لێهاتووەکانیان تواناو بەهرەکانیــان بەرهەم بهێنن، هەروەها هەوڵ بدەیــن ئەرك‌و خزمەت‌و بژێوی قوتابیەکانیش بگرینە ئەســتۆ، هەتا خوێندنەکەیان تەواو دەکەن..

پاشــان مامۆستاکە کەمێك سەری داخســت‌و وتی: بە ڕاستی گوناهو تاوانە بەهرەو شــارەزایی‌و تواناکان لە ناخ‌و دەروونی خاوەنەکانیاندا بخنکێنرێت‌و لەناوببرێت‌و بەو هۆیەشەوە تووشی غەم‌و پەژارەبن..

بیرم لە وتەکانی مامۆستاکە کردەوەو بۆم دەرکەوت، ناتوانین بگەین بە لوتکە، تەنها بە بەکارهێنانی تواناو بەهرەکان نەبێت..

بە دڵنیاییەوە هەموو ئەوانەی کە سەرکەوتوو بوون، بەهۆی ئەنجامدان‌و بەکارهێنانی تواناو بەهرەکانیانەوە بووە، جا لە بوارێکی وەك زانست‌و زانیاریدا بێت، یان لە بواری بانگەوازکردنــدا بێت، یان لە بواری بازرگانی، یان لە بــواری وتاربێژیدا، یان لە بواری پزیشکیدا، یان لە بواری ئەندازیاریدا، یان لە بەدەست هێنانی دڵی خەڵکیدا بوو بێت‌و توانیبێتیان خۆیان لە لای خەڵکی خۆشەویست بکەن.. یاخود ئەو کەسانەی سەرکەوتوو بوون، لە هەڵســوکەوتیاندا لەگەڵ دۆســت‌و هاوڕێ‌و دەرو دراوسێکانیاندا، هەمووی بە هۆی بەکارهێنانی تواناو شارەزایی‌و بەهرەکانیانەوە بووە..

مەبەستم لە سەرکەوتووانیش، ئەو کەسانە نیە کە بە هۆی کەسانی ترەوەو بە سەر شانی خەڵکیدا هەوڵ دەدەن سەرکەون‌و ئامانجەکانیان بە دەست دەهێنن!!

هەموو ئەو کەســانەی کــە لە بوارەکانی ژیانیاندا ســەرکەوتوو بــوون، بەهۆی بە گەڕخستنی تواناو شــارەزایی‌و بەهرەکانیانەوە بووە، جا خۆیان هەستیان پێکرد بێت، یان نا..

هەندێك كەس هەر لە خودی خۆیاندا كەسانێكی سەركەوتوون، كەسانی تریش هەن كە هەوڵیانداوە فێری بە گەرخستنی تواناو بەهرەكانیان بن‌و لە پاش جێبەجێ كردنی ئەو بنەمایانە سەركەوتنیان بە دەست هێناوە..

ئێمە لێرەدا دەربارەی ئەو كەسە سەركەوتووانە دەدوێین‌و شارەزای ژیانیان دەبین‌و هــەوڵ دەدەین شــارەزای ئەو ڕێگەو هۆكارانەیان بین كە بــە كاریان هێناوە، بۆ ئەوەی بزانین چۆن سەركەوتنیان بە دەست هێناوە؟

ئایا گونجاوە هەمان ڕێگەو شــێوازی ئەو كەســانە بگرینە بەر، بۆ ئەوەی بە هەمان شێوەی ئەوان سەركەوتن بە دەست بهێنین؟!

ماوەیەك لەمەو پێش گوێم لە چاوپێكەوتنی یەكێك لە دەوڵەمەندە بە ناوبانگەكانی جیهان بوو، ئەویش شــێخ ســلێمان راجحی بوو.. بینیم ئەم پیاوە لە هەڵســوكەوتیدا، هەروەها لە بیروبۆچوونیدا، وەكو چیایەكی بەرز وابوو..

پیاوێك، كە خاوەنی چەندان ملیارە.. خاوەنی چەندان باڵەخانەو خانووە.. ســەدان مزگەوتی دروست كردووە.. هەزارەها بێباوك‌و بێنەوای سەرپەرشتی كردووەو بەخێوی كردوون..

پیاوێك لە لوتكەی ســەركەوتندا، دەربارەی ژیانی خۆی دەدواو باســی پەنجا ســاڵ لەمەوبەری خۆی دەكرد، كە وەكو هەر كەســێكی ئاســایی وا بووە.. زۆر كات تەنها نانی ئەو ڕۆژەی هەبووەو جاری وا هەبووە ئەوەشی دەست نەكەوتووە!!

باسی ئەوەی كرد كە زۆرجار ماڵ‌و جێگەو ڕێگەی خەڵكی پاك كردۆتەوە، بۆ ئەوەی خواردنی ڕۆژانەی بە دەســت بهێنێت!! جاری واش هەبووە، شەوی گەیاندووە بە ڕۆژو لە دوكانێك، یان لە بانكێكدا كاری كردووە!!

باسی ئەوەی كرد، كە سەرەتا چۆن لە دامێنی چیاكاندا ژیانی بەسەربردووەو پاشان بەردەوام بووە لە سەركەوتن، هەتا گەیشتووەتە سەر لوتكەی چیا..

لــە تواناو بەهرەكانی ئــەو پیاوە وردبوومەوەو بۆم دەركــەوت زۆر كەس هەن، كە دەگونجێت بە هەمان شێوەی ئەو پیاوە بن لە ژیانیانداو بە پشت بەستن بە پەروەردگار ســەركەوتن بە دەســت بهێنن، بەڵام دەبێت فێری بەگەرخســتنی تواناو بەهرەكانیش بین‌و لەگەڵ ئەمانەشدا بە ئارام‌و خۆڕاگر بین..

شـتێکی تر هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەندێکمان توانای داهێنانمان هەیە، بەڵام لە تواناو بەهرەکانمان بێئاگاین، یان کەسـێك نیە کـە یارمەتیدەرمان بێت‌و هاوکاریمان بکات.. وەکو ئەوەی کەسێك توانای دەربڕینی بەهێزە، یان خاوەن بۆچوونێکی بازرگانیە، یاخـود زانیـاری‌و زیرەکیەکی تێدا بەدی دەکرێت.. ئەم بەهـرەو توانایانەش، یان بە هـۆی خودی کەسـەکەوە دەردەکەوێت، یان لە ڕێگەی مامۆسـتایەکەوە، یان لە ڕێگەی بەرپرسـێکی ئیداریەوە، یان لە ڕێگەی برایەکی ئامۆژگاریکارو دڵسۆزەوە دەردەکەوێت، هەر چەندە لەم ڕۆژگارەدا ئەو جۆرە کەسانە زۆر کەمن..

جاری واش هەیە ئەم تواناو بەهرانە لە ناو ناخی ئەو کەسانەدا بەند دەکرێن‌و پێش ئەوەی لە دایك بن دەمرن‌و لەناودەچن.. ئەو کاتەش سەرکردەیەك، یان وتاربێژێکی بە توانا، یان زانایەك، لە دەست دەدەین، بەهەمان شێوە لەوانەیە هاوسەرێك، یان باوکێکی ئامۆژگاریکار لە دەست بدەین..

لێرەدا باسی هەندێك لە بەهرەو توانای ناوازە دەکەین‌و بیرت دەخەینەوە، بەڵکو لە تـۆی بەرێزدا هەبن، ئەگەر لە تۆی ئازیزیشـدا بوونیان نەبێت هەوڵ دەدەین پرۆفەت پێبکەین‌و لە سەریان ڕات بهێنین..

دەی خێرا..

بیرۆکەیەک..

ئەگەر بە سەر چیادا سەرکەوتیت، بۆ لوتکە بڕوانەو ئاوڕ بە لای ئەو بەردانەدا مەدەرەوە، کە لە دەوروبەرتەوە بەردەبنەوە.. بە باوەڕو متمانەوە سەرکەوەو باز هەڵمەدە، با قاچت نەخزێت‌و بەرنەبیتەوە..

# پەرە بە تواناکانت بدە..

لەگەڵ هەندێك كەسـی وادا، دادەنیشـیتو دەكەویتە گفتوگۆ، كە تەمەنی بیسـت ساڵێك دەبێتو دەبینیت خاوەن شێوازێكی دیاریكراوە، لە هەڵسوكەوتو بیروبۆچوونیدا، پاشان لە تەمەنی سی ساڵیدا لەگەڵیدا دادەنیشیتو سەیر دەكەیت خاوەن هەمان تواناو بیروبۆچوونو زانستو زانیاریەو هیچ بەرەو پێشچوونێكی لە ژیانیدا ئەنجام نەداوە..

بەڵام بە پێچەوانەوە كەسـانێكی تر دەبینیت، سـودیان لە ژیانی خۆیان بینیووەو هەمــوو رۆژێكیــان لــە رۆژەكانی پێشــتریان جیاوازتــرەو گۆڕانكارییان لــە ژیانیاندا ئەنجامداوەو بەرەو پێشچوونیان پێوە دیارە.. بەڵكو كاتژمێرێك لە ژیانیان تێناپەڕێت، ئەگەر لە رووی دینو دونیاوە بەرەو پێشچوونێك ئەنجام نەدەن..

ئەگەر دەتەوێت ئەو جۆرە كەسانە بناسیت، وەرە با لە ژیانیان وردبینەوە..

كەناڵە ئاسمانیەكان وەك نمونە وەردەگرین..

كەسانێك هەن كاتەكانی خۆیان لەگەڵ كەناڵە ئاسمانیە بە سودەكاندا بەسەردەبەنو زانیاریو زیرەكییان بەرەو پێشەوە دەبەن.. سود لە شارەزایی گفتوگۆی كەسانی بلیمەت وەردەگــرن.. فێری راگۆڕینەوەو بە ئارامی دەربڕینــی بۆچوونەكانیان دەبێت.. فێری شــێوازی دەربڕینی جوانو رازی كردنی كەسی بەرامبەر دەبێت، بە شێوازی زۆر نەرمو نیانو جوان هەڵسوكەوت دەكات..

بە پێچەوانەشەوە كەسانێك هەن كە نایەڵن زنجیرە دراماكانیان لە دەست دەرچێت، ئەو درامایانەی كە باس لە چیرۆكی خۆشەویستییەكی دۆڕاوو شكست خواردوو دەكەن، یان باس لە شـانۆییەكی سـۆزداری دەكەن، یان كاتەكانیان بە دیار فیلمێكی خەیاڵاوی ترسناكەوە بە سەر دەبەن، كە هیچ بنەماو بنەرەتێكی راستی نیە..

توخودا لە دوای پێنج ساڵ سەیری كەسانی بەشی یەكەمو كەسانی بەشی دووەم بكە، كامیان تواناكانیان پەرە پێداوەو بەرەو پێشەوە هەنگاویان ناوە؟!

كامیان زانیاریەكانیان فراوانتر بووە؟!

كامیان هەڵسوكەوتیان لەگەڵ رووداوەكاندا گونجاوترە؟!

بێگومان كەسانی بەشی یەكەم سەركەوتووترن، بەڵكو لە هەڵسوكەوتیشیاندا هەست

بەم جیاوازیانە دەگرێت..

کەسانی بەشی یەکەم، لە وتەو گوفتارەکانیاندا پشت بە بنەما شەرعیەکانو ئامارو ڕاســتیەکان دەبەستن، کەسانی بەشی دووەمیش لە کاتی ئاخاوتنەکانیاندا پشت ڕاستی قسەکانیان، بە وتەی بە ناو هونەرمەندانو گۆرانی بێژان دەکەن..

ئەوەتا یەکێك لەو کەسانە جارێك لە جاران لە ناو قسەکانیاندا دەڵێت: خودا فەرمویەتی: ئەی بەندەکەم هەوڵو کۆشش بکە، منیش لەگەڵتدا هەوڵو کۆشش دەکەم!!

ئەو کەســە ئاگادار دەکەنــەوەو پێی دەڵێن: ئەمە ئایەتو فەرمایشــتی پەروەردگار نیە!!

کەســەکە ڕەنگی تێکدەچێتو پاشــان بــیری کەوتەوە، ئەو قســەیەی لە یەکێك لە دراماکاندا بیستووەو لە بیرو هۆشیدا ڕەنگی داوەتەوەو لە خەیاڵیدا ماوە..

بەڵێ.. قاپو مەنجەڵ، ئەوەی لێدەردەهێنرێت کە تیایدایەتی، یاخود چی بچێنیت، هەر ئەوەش دروێنە دەکەیت..

با ئەمجارەیان گۆڤارو ڕۆژنامەکان بە نمونە وەربگرین..

چەندن ئەوانەی گرنگی بە هەواڵو زانیاری بە سوود دەدەن.. هەوڵ دەدەن پەرە بە تواناکانیان بدەنو بە زانستو زانیاری بە سوود، خۆیان پڕ چەك بکەن؟!

ئەی چەندن ئەوانەی تەنها سەیری لاپەڕەکانی بەشی وەرزشو هەواڵە هونەریەکان دەکەن؟! هەتا وای لێهاتووە، ڕۆژنامەکان پێشبڕکێی ئەوە دەکەن، کە لاپەڕەی هونەریو وەرزشــیەکانیان زیاتــر بکــەنو لاپەڕەکانی تر کــەم بکەنەوە.. ئەگــەر دەتەوێت دوا نەکەویتو لە کۆڕو دانیشــتنەکاندا، خەڵکی سەیری تۆ بکەنو گوێت لێبگرنو پێشڕەو بیت نەك پاشــکۆ، ئەوا پەرە بە تواناو بەهرەو زانیاریەکانت بدەو بە پرۆڤەو ڕاهێنان، خۆت بەرەو پێشەوە بەرە..

عبدالله پیاوێکی دڵگەرم بوو، بەڵام زۆر وریاو لێزان نەبوو.. ڕۆژێك بۆ ئەنجامدانی نوێژ، لە ماڵ دەردەچێتو بەرەو مزگەوت دەکەوێتە ڕێ.. هەنگاوەکانی خێراتر دەکات، بۆ ئەوەی فریای قامەتی نوێژ بکەوێتو جەماعەتەکەی لە دەست نەچێت.. لە ڕێگە بــە لای پیاوێکدا دەڕوات، کە لە ســەر دارخورمایەك دەبێــتو خەریکی چاککردنو خزمەت کردنی باخەکەی دەبێت..

عبدالله سەری سوڕ دەمێنێو لە لای سەیرە، کە چۆن ئەم پیاوە گرنگی بە نوێژەکەی نادات و ناچێت بۆ مزگەوت، هەر وەك ئەوەی گوێی لە بانگیش نەبوو بێت!!

هەر بۆیە بە توڕەییەوە هاوار دەکاتو دەڵێت: دابەزەو بچۆ بۆ نوێژ..

کابرای سەر دارخورماکەش زۆر بە ئارامیەوە دەڵێت: باشە.. باش..

عبداللەش دەڵێت: پەلە بکە ئەی گوێدرێژ!!

کابرا هــاوار دەکاتو دەڵێت: من گوێدرێژم؟! لقێك دارخورما دەبڕێتو دادەبەزێت، بۆ ئەوەی سەری پان بکاتەوە..

عبدالله کە ئەمەی بینی، سەری خۆی دادەپۆشێتو بەرەو مزگەوت بۆی دەرچێت..

پیاوەکە بە توڕەییەوە لە دارخورماکە دابەزیو بەرەو ماڵ کەوتە ڕێو نوێژی کردو کەمێك پشوویدا، پاشان بۆ لای باخەکەی ڕۆیشتەوە، بۆ ئەوەی کارەکەی تەواو بکات..

کاتێك نوێژی عەسر هاتو عبدالله بەرەو مزگەوت کەوتە ڕێ.. بە لای دارخورماکەدا ڕۆیشــتەوە، بینی پیاوەکە وا بە ســەر دارەکەوەیە، ئەمجارەیان شــێوازی هەڵسوکەوتی خۆی گۆڕیو وتی: السلام علیکم.. حاڵت چۆنە؟!

کابراش لە وەڵامدا وتی: سوپاس بۆ خودا باشم..

عبدالله وتی: خۆش موژدە بیت، بەرهەمی ئەمساڵ چۆنە؟!

پیاوەکە دووبارە وتی: سوپاس بۆ خودا باشە..

عبدالله وتی: خودا سەرکەوتووت بکاتو ڕزقو ڕۆزیت پێببەخشێتو خۆشی بخاتە نێو ماڵو حاڵت..

پیاوەکە بەم دۆعاو پاڕانەوانە زۆر دڵخۆش بوو.. ئا لەم کاتەدا عبدالله وتی: دەبینیم بە هۆی ســەرقاڵی ئیــشو کارەکانتەوە، ئاگات لە بانگی عەســر نیە!! بانگی فەرمووەو نزیکە قامەت بکرێت، خۆزگە دادەبەزیتو فریای نوێژەکەت دەکەوتیتو پشویەکیشت بە خۆت دەدا، لە دوای نوێژەکەش کارەکەت تەواو بکە، خودا لەش ساغ بکات..

پیاوەکە دابەزیو بەرەو لای عبدالله کەوتە ڕێو زۆر بە گەرمی چاكو چۆنی لەگەڵ کردو وتی: سوپاســت دەکەم بۆ ئەو ڕەوشتو هەڵسوکەوتە جوانەت، بەڵام ئای خۆزگە ئەو کەسەم دەبینی کە نیوەڕۆ بە لامدا تێپەڕی، ئەوسا فێرم دەکرد کێ گوێدرێژە؟!

**ئەنجام..**

شارەزاییەکانی مامەڵە کردنت لەگەڵ خەڵکیدا، بناغەی دیاری کردنی شێوازی مامەڵە کردنی خەڵکیە لەگەڵتدا..



## غەم لە ڕابردوو مەخۆو مەگری بۆ شیرو دۆی ڕژاو..

هەندێك كەس وا گومان دەبەن، ئەو سروشـــتو هەڵسوكەوتەی كە لە سەری گەورە بوونو لە لای خەڵكیش پێی ناسراون، شایەنی گۆڕان نیەو تازە هەر بەو شـــێومیەش دەبن كە هەن.. هەر بۆیە ملكەچ دەبنو ڕازی دەبن، هەر وەك چۆن ملكەچـــی ئەوە بوون، كە كورتن یان درێژ، ڕەنگی پێـــستیان ســـپیە یان ڕەش، چونكە لایان وایە سروشتو هەڵســـوكەوتی مرۆڤەكانیش، وەك كورتو درێژی جەســـتەی مرۆڤو ڕەنگی پێستی، شـــایەنی گۆڕانكاری نیە، لەگەڵ ئەوەشدا لە لای مرۆڤی زیرەكو وریا، گۆڕینی سروشتو هەڵسوكەوت ئاسان ترە، لە گۆڕینو دانانی جلوبەرگ..

سروشتو هەڵسوكەوتمان شیرو دۆی ڕژاو نیە، نەتوانین كۆی بكەینەوە، بەڵكو لە دەســـتی خۆماندایەو زۆر ئاسانەو دەتوانین هەڵسوكەوتو سروشتی كەسانی تریش بگۆڕین.. بە هەمان شێوە دەتوانین ژیریو عەقڵیشیان بگۆڕین..

إبن حزم لـــە كتێبی (طوق الحمامة)دا دەگێڕێتـــەوەو دەڵێت: لە ئەندەلوس بازرگانێكـــی بە ناوبانگ هەبوو.. لە نێـــوان ئەم بازرگانەو چوار بازرگانی تردا، پێشبڕكێی بازرگانی هەبوو، كێشە كەوتە نێوانیانو چوار بازرگانەكە ڕقیان لێی هەڵساو پەیمانیاندا بێزارو نارەحەتی بكەن..

بەیانییەك بازرگانە ناودارەكە، لە ماڵەوە بەرەو شوێنی كارەكەی كەوتە ڕێ.. كراسو جامانەیەكی سپی جوانی پۆشی بوو..

بازرگانی یەكەمی پێگەیشتو پاش چاكو چۆنی سەیری جامانەی بازرگانە بە ناوبانگەكەی كردو وتی: بە ڕاستی ئەو جامانە زەردەت زۆر جوانە..

بازرگانەكە وەڵامی دایەوەو وتی: چاوت نابینێت؟! سپیە نەك زەرد..

ئەویش وتی: نا.. زەردە، بەڵام جوانە..

بازرگانەكە ڕۆیشـــت، پاش كەمێك بە یەكێكی تریان گەیشت، لە دوای چاكو

چۆنیو هەواڵ پرســین، ئەم پیاوەیان بە بازرگانەکەی وت: ئەمڕۆ چەند قیتو قۆزیت؟! جلوبەرگەکانیشت زۆر جوانن، بە تایبەت ئەم جامانە سورەت..

بازرگانەکە وتی: کابرا ئەم جامانەیە سپیە، نەك سور؟!

بڕۆ وازم لێ بهێنە،جامانەکەم سپیە..

بازرگانی هەژار کەوتە ڕێو لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکردو سەیری ئەملاولای جامانەکەی دەکرد، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت، کەسپیە..

بازرگانەکە گەیشــتە شوێنی کارەکەیو ویســتی دوکانەکەی بکاتەوە، ئا لەم کاتەدا کەسی سێیەمیان هاتو وتی: فلانە کەس، ئەم بەیانییە زۆر جوانیت.. بە تایبەت کراسەکەت هەر زۆر جوانە، ئەوەی زیاتر جوانی کردوویت، ئەو جامانە سەوزەی سەرتە..

بازرگانەکە سەیری جامانەکەی کرد، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت سپیە، پاشان وتی: کاکی برا جامانەکەم سپیە سپی..

پیاوەکە وتی: سەوزە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی جوانە، غەمبار مەبە..

پیاوەکە ڕۆیشتو بازرگانەکەش هاواری کردو وتی: جامانەکەم سپیە..

کەمێك لە دوکانەکەیدا دانیشتو هەر سەیری ئەملاولای جامانەکەی دەکرد، لەپڕ کەســی چوارەم خۆی کرد بە ژووردا و وتی: چۆنی فلانە کەس.. ماشاالله، ئەم جامانە شینەت لە کوێ کڕیووە؟!

بازرگانەکە هاواری کرد: جامانەکەم سەوزە!!

کابراش وتی: نا شینە..

بازرگانەکە وتی: نا ســورە!! نا نا.. ســپیە!! کورە شینە!! نانا سەوزە!! پاشان دەســتی کرد بە پێکەنین.. پاشــان کەوتە هاوار هاوار!! پاشــان دەستی کرد بە گریانو دەستی کرد بە هەڵبەزو دابەز!!

إبن حزم دەفەرموێت: لە دوای ئەو ڕووداوە بازرگانەکەم بینی، شــێت ببوو، بە شەقامەکانی ئەندەلوسدا دەگەڕاو منداڵ بەردیان تێدەگرت..

کەواتە ئەو چوار کەســە بە تواناو لێهاتوویەکی ســادەو ساکارەوە، توانییان سروشتی ئەو بازرگانە ناودارە بگۆڕنو بێزاری بکەن، تەنانەت توانییان ژیریشی

پێ لە دەست بدەن و شێتی بکەن!!

ئەی تۆ بۆ ناتوانی گۆڕانکاری ئەنجام بدەیت، لە کاتێکدا تواناو لێهاتووییەکی وات لە بەردەستدایە، کە بە نیگای خودای گەورە پشتیوانی لێکراوەو ڕۆشن کراوەتەوە!! ئەو هەڵسوکەوت و هونەرانەی کە بە هۆی جێبەجێ کردنیانەوە، مرۆڤ دەتوانێت ڕەزامەندی پەروەردگاری بە دەست بهێنێت!!

دەی هەوڵ بدە هەر هونەرو لێزانینێك، کە دەبێتە هۆی بەختەوەریت و کامەرانت دەکات، ئەنجامی بدەو خۆتی پێ دەوڵەمەند بکە..

ئەگەر پێم دەڵێیت: ناتوانم..!! پێت دەڵێم: هەوڵ بدە..

ئەگەر دەڵێیت: نازانم..!! منیش پێت دەڵێم: فێر بە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: «إنما العلم بالتّعلّم، وإنما الحلم بالتحلّم».. واتە: (زانست بە خۆفێرکردنەو لەسەرخۆیش بە خۆڕاهێنانە)..

**تێڕوانین..**

پاڵەوان ئەوکەسەیە سەرەڕای توانای پەرەپێدانی شارەزاییەکانی خۆی، توانای پەرەپێدانی شارەزاییەکانی خەڵکیش، یان گۆڕینیانی هەیە..

# کەسێکی ناوازەبە..

بۆچـــی دوو کەس لە کـــۆڕو دانیشـــتنێکدا، گفتوگۆکانیـــان بە لێك تێنەگیشـــتن‌و ناکۆکـــی کۆتایی دێت؟! کەچی دوو کەســـی تر گفتوگۆکانیان بە لـــە یەك حاڵی بوون‌و ڕەزامەنـــدی‌و خۆشـــی کۆتایی پێدێنن؟! بـــە دڵنیاییەوە بە هۆی شـــارەزاییانەوەیە، لە هونەری گفتوگۆدا..

بۆچـــی دوو وتاربێـــژ هەمان بابەت باس دەکـــەن، کەچی گوێگـــران‌و ئامادەبووانی یەکێکیان باوێشـــك دەدەن‌و خەو دەیانباتەوە، یان یاری بە جێگەو بەرماڵەکەی ژێریان دەکەن‌و دەستکاری دەکەن، یان زوو زوو شێوازی دانیشتنەکەیان دەگۆڕن؟!

بە پێچەوانەشـــەوە گوێگران‌و ئامادەبووانی وتاربێژی دووەم، زۆر بە تامەزرۆییەوە گوێ دەگرن‌و زۆر جار چاویشیان ناتروکێنن‌و بێئاگایی ڕوویان تێناکات؟!

بە دڵنیاییەوە هۆیەکەی بریتیە لە شارەزایی لە هونەری دەربڕیندا.. بۆچی فلانە کەس لە کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا، کاتێك کە قسە دەکات، بێدەنگی باڵ بە سەر ئامادەبوواندا دەگرێت‌و هەمووان چاوی تێدەبڕن؟! کە چی کاتێك هەندێك کەس قسە دەکەن، ئامادەبووان خەریکی قســـەو گفتوگۆی لا بەلان، یان خەریکی خوێندنەوەو ســـەیرکردنی نامەی مۆبایلەکانیانن؟!

هۆی ئەمەیان بریتیە لە لێهاتووی‌و توانای قســـەبۆچی کاتێك مامۆســـتایەك کە بە ڕاڕەوی قوتابخانەدا تێپەڕ دەبێت، قوتابییەکان چواردەوری دەدەن.. یەکێك تەوقەی لەگەڵ دەکات، ئەوەی تر کێشـــەی خۆی لە لا باس دەکات، یەکێکی تریان پرس‌و ڕای پێدەکات، خۆ ئەگەر ڕێگـــە بە قوتابیەکان بدات، بێنە ژوورەکەی، ئـــەوا پڕ دەبێت لە قوتابی، چونکە هەموویان خۆشیان دەوێت‌و حەز بە نزیکی دەکەن..

لە هەمان کاتدا مامۆســـتای وا هەیە، بە تەنهـــا هەنگاو دەنێت‌و یەك قوتابی نزیکی ناکەوێت، کەســـێك سلاوو چاك‌و چۆنی لەگەڵ ناکات، خۆ ئەگەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە دەرگای ژوورەکەی ئاوەلا بکات، کەســـێك ســـەردانی ناکات، چونکە حەز بە دانیشـــتنی ناکەن..

- بۆچـی؟! چونکـە هەموو ئەمانە پەیوەندییان بـە هونەری مامەڵە کردنـەوە هەیە، لەگەڵ خەڵکیدا..

بۆچی کاتێك کەسـێك ڕوو لە کۆڕو دانیشتنێکی گشتی دەکات، ئامادەبووان خۆشحاڵ دەبن و بە بینینی شادومان و بەختەوەر دەبن.. هەموو حەز دەکەن لە لای ئەو دابنیشێت، بەڵام کەسـێکی تـر دێتە ژوورەوەو زۆر بە ساردوسـڕی چاك و چۆنـی و بەخێرهاتنی لەگەڵ دەکەن.. سەیری ئەملاو ئەولای دەکات، بۆ ئەوەی شوێنێکی دەست بکەوێت و لێی دانیشێت، کەچی کەسێك جێگەی ناکاتەوە، یان کەسێك بانگی ناکات بۆ ئەوەی بێت و لە تەنیشتیەوە دانیشێت..

بۆچی؟! لەبەر ئەوەی ئەم کارانە پەیوەندییان بە کاریگەری و بە دەست هێنانی دڵی بەرامبەرەوە هەیە..

بۆچی باوکی وا هەیە کاتێك دێتەوە بۆماڵەوە، منداڵەکانی خۆشـحاڵ دەبن و پێشوازی لێدەکەن؟! باوکی واش هەیە، کاتێك دێتەوە بۆ ماڵەوە، منداڵەکانی ئاوڕیشـی لێنادەنەوە؟! لەبەر ئەوەی ئەم کارە پەیوەندی بە هونەری مامەڵەو هەڵسـوکەوت کردنەوە هەیە لەگەڵ منداڵەکانیاندا..

لـەم شـێوازو نمونانە، بە هەمان شـێوە لە مزگەوت و ئاهەنـگ و بۆنەکاندا هەیەو دوبارە دەبنەوە.. هەموو ئەمانە پەیوەندییان بە ئاسـت و شارەزایی کەسەکانەوە هەیە، لە هونەری هەڵسوکەوت کردنیاندا لەگەڵ دەوروبەریاندا..

بشزانە دروست کردنی کاریگەری لە سەر خەڵکی و بە دەست هێنانی خۆشەویستییان، زۆر لەوە ئاسانترە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە!!

زیـادەڕەوی ناکەم و زۆر تاقیم کردۆتەوە.. بە دەسـت هێنانـی دڵی خەڵکی بە زۆر ڕێگەو شـێوازی جیـاواز دەبێت، بە مەرجێك کارەکەمان لە سـەر بنەمای ڕاسـتگۆیی بێـت و ڕاهێنان و پرۆفەشـی لە سـەر بکەیـن و بـە ڕێك و پێکیش ئەنجامـی بدەین.. هەڵسـوکەوتەکانمان کاریگەریان لە سـەر خەڵکی دەبێت، ئەگەر خۆشـمان هەسـتی پێنەکەین و ئاگامان لێینەبێت..

ماوەی سـیانزە سـاڵ پێش نوێژو وتارخوێنی مزگەوتی کۆلێژی سەربازی بووم.. بە دەروازەیەکدا دەڕۆیشـتم بۆ مزگەوت کە پاسـەوانێکی لێبـوو، دەروازەکەی دەکردەوەو

دایدەخستەوە.. هەموو جارێك سور بووم لە سەر ئەوەی بە گەرموگوڕیەوەو بە هەر دوو دەستم سڵاوی لێبکەم.. لە دوای نوێژیش سواری ئۆتۆمبیلەکەم دەبوومو دەگەڕامەوە بۆماڵەوە..

زۆربەی کات مۆبایلەکەم پڕ دەبوو لەو نامەو پەیوەندییانەی کە لە کاتی نوێژدا بۆم دەهاتن.. لە کاتی گەڕانەوەمدا سەرقاڵی نامەکان دەبوومو پاسەوانەکەش دەرگای دەروازەکەی دەکردەوەو منیش چاوم هەر لە سەر مۆبایلەکەم دەبوو، بێئاگا بووم لەوەی بە ڕوویەکی خۆشەوە خودا حافیزی لێبکەم.. هەتا ڕۆژێك ڕایگرتمو پێی وتم: یا شێخ لێم زیزی؟!

وتم: بۆچی؟!

وتی: لەبەر ئەوەی کاتێك کە دێیتە ژوورەوە سڵاو دەکەیتو دڵت خۆشەو ڕووخۆشیت، بەڵام لە کاتی گەڕانەوەدا دڵخۆشو خۆشحاڵ دیار نیت!!

پاسەوانەکە پیاوێکی سادەو ئاسایی بوو، سوێندی بۆ خواردم کە خۆشی دەوێمو بە بینینم خۆشحاڵە.. پۆزشم بۆ هێنایەوەو بۆم ڕوون کردەوە، هۆکارەکە سەرقاڵیمە..

پاشان بۆم ڕوون بۆوە کە هەڵسوکەوتەکانمان ڕەنگدانەوەیان دەبێتو لە کاتی بێئاگاییشماندا خەڵکی تێبینیان لە سەرمان دەبێتو سەرنجمان دەدەن..

**ڕۆشنایی..**

> به هۆی به دەست هێنانی ماڵ و سامانەوە، خەڵکی لە دەست مەدە، لەبەر ئەوەی بە دەست هێنانی خەڵکی، ڕێگەو هۆکارە بۆ بە دەست هێنانی ماڵ و سامان..

## کێت زۆر خۆش دەوێت..؟!

جاری وا هەیە، هەندێك مرۆڤی شارەزاو خاوەن بەهرەو توانا، بە شێوەیەکی زۆر ناوازەو جوان هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا دەکەن، بە جۆرێك کەسی بەرامبەر وا هەست دەکات خۆشەویست ترین کەس بێت لە لای..

بە شێوەیەکی ئەوەندە جوان هەڵسوکەوت لەگەڵ دایکتدا بکە، تا دەگاتە رادەیەك دایکت هەست بکات، تا ئێستا هیچ کەسێك بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵدا ئەنجام نەداوە.. بە هەمان شێوە هەڵسوکەوت لەگەڵ باوك.. هاوسەر.. منداڵەکانت.. هاورێکانت، ئەنجام بدە.. لەگەڵ ئەو کەسانەشدا کە تەنها جارێك دەیان بینی، هەوڵ بدە زۆر بە جوانی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەیت، وەك ئەوەی کاتێك بۆ تەنها جارێك دەچیتە فرۆشگەیەك، یان دەچیتە بەنزینخانەیەك..

دەتوانی وا لە هەموو کەسێك بکەیت، کەوا هەست بکات خۆی خۆشەویست ترین کەسە لە لای تۆ.. پێغەمبەری خوداش ﷺ لەم بوارەدا پێشەنگ و پێشەوایە..

بەڵێ.. ئەوەی بە دواداچوونی بۆ ژیانی پێغەمبەری خودا ﷺ هەبوو بێت، دەبینێت ئەو پێشەوایە ﷺ خاوەن هەڵسوکەوت و ئاکارو رەفتارێکی زۆر جوان بووە.. لەگەڵ هەر کەسێکدا هەڵسوکەوتی بکردایە، ئەو کەسە وایدەزانی پێغەمبەری خودا ﷺ لە هەموو کەسێك زیاتری خۆش دەوێت.. ئەو کەسەش وای لێدەهات پێغەمبەری خودای ﷺ لە هەموو کەس خۆشتر دەویست، لەبەر ئەوەی هەستی بە سۆزو خۆشەویستی ئەو پێشەوایە ﷺ دەکرد..

عەمری کوری عاص ﷺ بلیمەت و لێهاتوویەك بوو، لە هەرە بلیمەت و لێهاتووەکانی عەرەب.. خاوەنی دانایی و وریایی و زیرەکیەکی زۆر بوو.. یەکێك بوو لەو چوار کەسەی، کە بە بلیمەت ترین کەسانی عەرەب ناسرا بوون.. عەمر باوەری هێناو موسڵمان بوو، گەورەی هۆزەکەشی بوو.. کاتێك بە پێغەمبەری خودا ﷺ دەگەیشت، پێغەمبەری خودا ﷺ بە روویەکی خۆشەوە پێشوازی لێ دەکردو دەیدواند.. کاتێك دەچووە کۆرو دانیشتنێکەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ بە هاتنی عەمر ﷺ خۆشحاڵ دەبوو.. کاتێکیش بانگی عەمری دەکرد، بە جوانترین ناو بانگی دەکرد..

کاتێك عەمر ﷺ هەستی بەم سۆزو خۆشەویستییەی پێغەمبەری خودا ﷺ کرد،

گومانی وا بوو خۆشەویست ترین کەسە لە لای پێغەمبەری خودا ﷺ .. هەر بۆیە ویستی لە گومانەکەی دڵنیا بێت‌و بۆی ڕوون بێتەوە..

ڕۆژێك دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ و لە لای دادەنیشێت‌و پاشان دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێ خۆشەویسترین کەسە لە لات؟

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: عائیشە..

عەمر ﷺ فەرمووی: مەبەستم لە پیاوانە، ئەی پێغەمبەری خودا، نەك کەس‌وکارەکانت..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: باوکی..

عەمر رضي الله عنه فەرمووی: ئەی دوای ئەو؟

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: عومەری کوری خەتتاب..

عەمر فەرمووی: ئەی پاشان؟ پێغەمبەری خودا ﷺ کۆمەڵە پیاوێکی ژمارد.. پاشان فلانە کەس.. پاشان فلانە کەس.. بە پێی زووتر موسڵمان بوونیان‌و قوربانیدانیان بۆ ئیسلام، دەیژماردن‌و ناوی دەهێنان..

عەمر رضي الله عنه دەفەرموێت: بێدەنگ بووم، لە ترسی ئەوەی نەوەکو لە کۆتایی هەموویاندا ناوم بهێنێت..

سەیر بکە چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ بە هەڵسوکەوتی جوان، توانی دڵی عەمری کوری عاص رضي الله عنه کەمەند کێش بکات..

پێغەمبەری خودا ﷺ لە پێناوی موسڵماناندا، وازی لە کارەکانی دەهێناو ئەو خۆشەویستیەی کە هەیبوو بۆیان، دەریدەبری‌و ڕێزی لێدەگرتن..

کاتێك ئاینی ئیسلام بڵاوبۆوەو خاکی موسڵمانان فراوان بوو، پێغەمبەری خودا بانگخوازانی دەنارد، بۆ بانگ کردنی تیرەو هۆزەکان، بۆ ئەوەی موسڵمان بن‌و لە ئاینی ئیسلام شارەزا بن.. جاری واش هەبوو، جەنگ ڕوویدەداو پێویست بوو سوپا ڕەوانەی سەر ئەو ناوچانە بکات..

عەدی کوری حاتەمی طائي پادشای هۆزی (طيء) بوو، لە کاتی ڕوودانی جەنگ لەگەڵ موسڵماناندا، عەدی هەڵهات‌و پەنای برد بۆ ڕۆمەکان لە شام.. موسڵمانان گەیشتنە ناوچەی (طيء)، لەبەر ئەوەی عەدی هەڵهاتبوو، سەرکەوتن بە سەریاندا زۆر ئاسان بوو، چونکە پادشایەك نەبوو سەرپەشتییان بکات، سوپایەکی ڕێك‌وپێکیشیان نەبوو..

سوپای موسڵمانان لە کاتی جەنگدا، لەگەڵ خەڵکیدا زۆر بە چاکی ڕەفتاریان دەکردو

سۆزو بەزەییان هەبوو، هەر چەندە لە کاتی کوشتاریشدا بوونایە.. مەبەستیش لەم جەنگە پاراستنی موسڵمانان بوو لە فێڵو تەڵەکەی هۆزەکەی عەدی، هەروەها پیشاندان و دەرخستنی هێزی موسڵمانان بوو، بەو هۆزە..

موسڵمانان هەندێك کەسیان لە هۆزەکەی عەدی بە دیل گرتو لە نێوانیشیاندا خوشکێکی عەدی هەبوو.. دیلەکانیان بەرەو شاری مەدینە بردو پێغەمبەری خودایان ﷺ ئاگادار کردەوە، کە عەدی هەڵهاتووە بۆ شام..

پێغەمبەری خوداﷺ سەرسام بوو لە هەڵهاتنی عەدی!! چۆن لە ئاینی خودا رایکردووەو گەلو هۆزەکەشی جێ هێشتووە؟!

کاتێك عەدی دەگاتە لای رۆمەکان، رێزو شکۆیەکی پێویستی لێ ناگرنو هەر بۆیە بە ناچاری دەگەڕێتەوە بۆ ناو خاکی عەرەب..

عەدی چیرۆكو رووداوی چوونی بۆ شاری مەدینەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: هیچ کەسێك ئەوەندەی من رقی لە پێغەمبەری خوداﷺ نەبوو.. من گاور بووم و پێش ئەوەی ئاوام بە سەر بێت پادشای هۆزەکەشم بوو.. ئەوەندە رقم لە پێغەمبەری خوداﷺ بوو، رۆیشتم بۆ لای قەیسەری رۆم، لەوێ شوێنو جێگەو ژیانم خۆش نەبوو، وەکو پێویست رێزیان نەگرتم، هەر بۆیە بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو وتم: ئەگەر درۆ بکاتو پێغەمبەر نەبێت، ئەوا هیچ زیانێکم پێناگەیەنێت، خۆ ئەگەر راستگۆش بێت ئەوا بۆم دەردەکەوێتو دەزانم راست دەکات، هەر بۆیە بەرەو شاری مەدینە کەوتمە رێ، کاتێکیش چوومە ناو شاری مەدینەوە، خەڵکی دەیان وت: ئەوە عەدی کوری حاتەمە.. ئەوە عەدی کوری حاتەمە..

هەر چەندە عەدی دژایەتی موسڵمانانی کرد بوو، هەروەها لە دەستی موسڵمانانیش هەڵهات بوو، رقێکی زۆریشی لە موسڵمانان بوو، کە چی پێغەمبەری خودا ﷺ بە هاتنی عەدی خۆشحاڵ بوو.. بە روویەکی خۆشەوە پێشوازی لە عەدی کردو دەستی خستە نێو دەستیو بردیەوە بۆماڵەوە..

کاتێك عەدی شان بە شانی پێغەمبەری خوداﷺ دەرۆیشت، گومانی وابوو هەردووکیان یەکسانن!!

وایدەبینی محمد پادشاو فەرمانڕەوای مەدینەو دەوروبەریەتیو خۆشی فەرمانڕەواو پادشای شاخەکانی (طيء)و دەوروبەریەتی..

محمد خاوەن ئاینێکی ئاسمانییەو ئەمیش لە سەر ئاینێکی ئاسمانییە، کە مەسیحیەتە..

محمد خاوەن پەرتوکێکی ئاسمانییە، کە قورئانەو ئەمیش شوێنکەوتەی پەرتوکێکی ئاسمانییە، کە ئینجیلە..

عەدی وای هەست دەکرد لە رووی هێزو سوپاوە نەبێت، هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ محمددا نیە!! لە رێگەی رۆشتنەوەیان بۆ ماڵی پێغەمبەری خوداﷺ، عەدی سێ دیمەنی ناوازەی لە پێغەمبەری ئازیزﷺ بینی..

کاتێك بە رێگەدا دەرۆیشتن، ئافرەتێکیان بینی بانگی پێغەمبەری خوداﷺ ی کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ کارێکم پێت هەیە.. پێغەمبەری خوداشﷺ دەستی لە دەستی عەدی کردەوەو چوو بۆ لای ئافرەتەکەو زۆر بە ئارامی گوێی بۆ وتەکانی ئافرەتەکە شل کرد..

عەدی ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەری خوداﷺی بەراورد کرد، بەو سەرۆك‌و فەرمانرەواو پادشایانەی کە بینی بوونی، پاشان تاوێك وردبۆوەو لە دڵی خۆیدا وتی: سوێند بە خودا ئەم خۆبەکەم زانین‌و هەڵسوکەوتە جوانە، لە هەڵسوکەوتی فەرمانڕەوا ناچێت.. بە راستی ئەم رەوشتە رەوشتی پێغەمبەرانە..

ئافرەتەکە پێویستییەکەی تەواو بوو، پێغەمبەری خوداشﷺ گەڕایەوە بۆ لای عەدی‌و کەوتنەوە رێ..

لە رێگە پیاوێك بەرەو رووی پێغەمبەری خوداﷺ هات.. پیاوەکە چی وت؟! ئایا وتی: پێغەمبەری خوداﷺ ماڵ‌و سامانێکی زۆرم هەیەو هەژارو نەدارم پیشان بدە، با بیاندەمێ؟! یان وتی: زەوی‌وزارم چاندووەو بەرهەمێکی زۆری بەرهەم هێناوە، چی لێبکەم؟! خۆزگە وای بوتایە، بۆ ئەوەی عەدی هەستی بە دەوڵەمەندی‌و خۆشگوزەرانی موسڵمانان بکردایە..

پیاوەکە هاتە پێشەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سکاڵای دەست کورتی‌و هەژاریت لە لا دەکەین!! ئەم پیاوە ئەوەندەی خواردن نەبوو، کە منداڵەکانی پێ تێر بکات.. موسڵمانانیش هەموو ئەوەندە هەژار بوون، نەیاندەتوانی یارمەتی ئەو پیاوە هەژارە بدەن.. پیاوەکە ئەم قسانەی دەکردو عەدیش گوێ بیستی بوو، پێغەمبەری خوداشﷺ بە چەند وشەیەك وەڵامی دایەوەو رۆیشتن..

کەمێکی تر رۆیشتن، پیاوێکی تریان پێگەیشت‌و وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لە دەست رێگرو جەردە هاوار هاوارمانەو سکاڵای خۆمان لە لای تۆ دەکەین!! ئەی پێغەمبەری ئازیزﷺ بە هۆی زۆری دوژمنانی دەوروبەرمانەوە، بە هۆی زۆری

دزو ڕێگرەوە، لە خۆمان دڵنیا نین لە شاری مەدینە بچینە دەرەوە.. .. پێغەمبەری خوداش ﷺ بە چەند وشەیەك وەڵامی ئەمیشی دایەوەو ڕۆیشتن..

عەدی لە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە،لە ناو هۆزەکەیدا خاوەنی ڕێزو شکۆ بووەو هیچ دوژمنێکیش مەترسی لە سەر ژیانیان نەبوو، ئیتر بۆچی بێتە ناو ئاینێکەوە، کە خەڵکەکەی لاوازو هەژارو نەدارو نەبووبن..هەروەها لە ترس‌و دڵە ڕاوکێشدا بن!!

بەڵێ.. گەیشتنە ماڵی پێغەمبەری خودا ﷺ و چوونە ژوورەوە.. تەنها ڕاخەرێکی لێبوو، پێغەمبەری خودا ﷺ وەکو ڕێزێك دای بە عەدی بۆ ئەوەی لە سەری دانیشێت‌و پێی فەرموو: وەری بگرەو لە سەری دابنیشە.. عەدیش دایەوە بە پێغەمبەری خودا ﷺ و وتی: تۆ لە سەری دابنیشە.. پێغەمبەری خوداش ﷺ دیسانەوە فەرمووی: نا تۆ لە سەری دابنیشە، پاشان عەدی لە سەری دانیشت..

پێغەمبەر خودا ﷺ بە عەدی فەرموو: ئەی عەدی موسڵمان بە، سەلامەت‌و پارێزراو دەبیت..

عەدیش وتی: من ئاینی خۆم هەیە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: من لە تۆ زیاتر شارەزاییم لە ئاینەکەتدا هەیە..

عەدی وتی: تۆ لە من شارەزاتری بە ئاینەکەم، چۆن؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: بەڵێ، من شارەزاترم.. ئایا تۆ لە پەیڕەوانی ڕێچکەی (ڕەکۆسی) نیت؟!

(ڕەکۆسی) بەشێکە لە ئاینی گاورەکان‌و لە ئاگرپەرستەکانەوە نزیکە.. ئەمەش تواناو زیرەکی پێغەمبەری خودا ﷺ دەردەخات لە هونەری ڕازی کردنی بەرامبەردا، لەبەر ئەوەی نەیفەرموو: ئایا تۆ گاور نیت؟! بەڵکو باسی زانیاری وردتری ئاینەکەی عەدی کردو لە ناو ئاینەکەی عەدیدا، ئەو ڕێچکەیەشی دیاری کرد، کە عەدی پەیڕەوی دەکرد..

وەکو ئەوەی لە ئەوروپا کەسێکت پێبگات‌و پێت بڵێت: بۆچی نابیت بە مەسیحی؟! تۆش بڵێت: من خاوەنی ئاینی خۆمم..

ئەو کەسەش ئەوەندە شارەزای ئاینەکەت بێت، پێت نەڵێت: ئایا تۆ موسڵمان نیت؟! هەروەها نەڵێت: ئایا تۆ سوننی نیت؟! بەڵکو پێت بڵێت: ئایا تۆ شافیعی نیت؟! یان ئایا تۆ حەنبەلی نیت؟!

پێغەمبەری خوداش ﷺ بە عەدی فەرموو: ئایا تۆ لە (ڕەکۆسیەکان) نیت؟ عەدیش لە وەڵامدا وتی: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرموی: کاتێك لەگەڵ هۆزەکەتدا بەشداری جەنگ دەکەیت، چواریەکی دەستکەوتنی جەنگەکە بۆ خۆت دەبەیت، وا نیە؟!

عەدی وتی: بەڵێ وایە..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەی ئەوە لە ئاینەکەی تۆدا حەرامو قەدەغە کراوە..

دووبارە عەدی وتی: بەڵێ وایە..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: من دەزانم چی ڕێگریت لێدەکات لەوەی موسڵمان بیت، بە لاتەوە نەنگیە کە شوێنکەوتەی کەسانی هەژارو لاواز بیت!!

ئەی عەدی، دەزانی (حیرە) کوێیە؟!

عەدی وتی: نەم بینیووە، بەڵام بیستوومە، ناوچەیەکە لە عێراق..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: سوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە، پەروەردگار ئەم ئاینە سەر دەخاتو ئافرەتی موسڵمان لە حیرەوە دەچێت بۆ حەجو تەواف ماڵی خودا دەکاتو غەیری کەسێکی مەحرەمی خۆی کەسی لەگەڵدا نابێت.. (واتە: موسڵمانان ئەوەندە لە ئارامیو ئاسایشدا دەبن، ترسیان لە هیچ شتێك نابێت)، هیچ هۆزو نەتەوەیەکیش ناتوانن دەست درێژی بکەنە سەر موسڵمانانو موسڵمانان دەبنە خاوەن هێزێکی زۆر بەهێزو فراوان..

کاتێك عەدی گوێی لەم قسانە بوو، دیمەنی سەرکەوتنی موسڵمانانی لە بیرو هۆشیدا وێنا دەکردو بیری لێدەکردەوە.. ئافرەتێك بەوپەڕی ئارامیو ئاسایشەوە لە عێراقەوە بڕواتو بگاتە شاری مەککە!! ئەمە واتای ئەوەیە، موسڵمانان دەست بە سەر شاخەکانی (طيء)و شوێنی هۆزەکەی ئەمیشدا دەگرن.. عەدی سەری سوڕماو لە دڵی خۆیدا وتی: ئەی چەتەو ڕێگرەکانی (طيء) لەو کاتەدا لەکوێ دەبن؟!

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: موسڵمانان دەست بە سەر سەروەتو سامانو زێڕو زیوی کیسرای کوڕی هورمزیشدا دەگرن..

عەدی وتی: کیسرای کوڕی هورمز؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بەڵێ.. کیسرای کوڕی هورمز.. ئەو سەروەتو سامانەش لە ڕێگەی خوادا دەبەخشرێت..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەگەر بمێنیو تەمەنت درێژ بێت، ئەوا پیاوی وا دەبینی پڕ دەستی زێڕو زیو دەبێتو دەڵێت: کێ ئەم زێڕو زیوەم لێوەردەگرێت، کەسێك نیە لێی وەربگرێت.. (واتە: ئەوەندە سەروەتو سامان زۆر

دەبێت، دەوڵەمەندەکان دەگەڕێن بە دوای هەژارەکاندا، بۆ ئەوەی لەو سەروەتو سامانە زۆرەی خودا پێی بەخشیوون بیاندەنێ، کەسێکیان دەست ناکەوێت)..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ ئامۆژگاری عەدی کردو ڕۆژی دوایی بیر خستەوەو فەرمووی: بە دڵنیاییەوە هەموو کەسێك بە بێ وەرگێڕو بە تەنها بە پەروەردگاری دەگات، کاتێك سەیری لای ڕاستی دەکات، جگە لە دۆزەخ هیچ شتێکی تر نابینێت، بە هەمان شێوە کاتێك سەیری لای چەپیشی دەکات، جگە لە دۆزەخ هیچ شتێکی تر نابینێت..

عەدی بیری دەکردەوەو بێدەنگی باڵی بە سەر خەیاڵو هەستو نەستیدا کێشا بوو..

لەپڕ پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەی عەدی بۆچی لە وتنی لاإله إلا الله ڕادەکەیتو باوەڕ ناهێنیت؟ ئایا هیچ خودایەکی گەورەتر لە (الله) هەیە؟!

عەدی فەرمووی: ئەوا موسڵمان بوومو باوەڕم هێنا.. أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله.. ڕوخساری پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ گەشایەوەو دڵخۆش بوو..

عەدی دەڵێت: ئەوەتا ئێستا ئافرەتی موسڵمان بە بێ ترسو بە ئارامی دەچێت بۆ ماڵی خودا.. موسڵمانان دەستیان بە سەر زێڕو زیوی کیسراشدا گرت.. سوێند بە خودا مژدەی سێیەمیش، کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سەروەتو سامان زۆر دەبێت، هەژاران نامێنن، دێتە دی، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری ئازیزﷺ فەرموویەتیو ئەو پەیمانی داوە. رواه مسلم..

دەی سەیری ئەو هەڵسوکەوتە جوانەی پێغەمبەری خوداﷺ بکە، کە بەرامبەر عەدی نواندی.. چەند بە جوانی بانگی کرد، بۆ ئەوەی موسڵمان بێت.. ئەگەر بەو شێوە جوانە ڕەفتار لەگەڵ خەڵکیدا بکەین، بە دڵنیاییەوە دڵیان کەمەندکێش دەکەینو لە لایان خۆشەویست دەبین..

بیرۆکە..

بە بەکارهێنانی نەرمو نیانیو شێوازی جوانی قایل کردنو شارەزایی لە مامەڵە کردندا، چیمان بوێت، دەتوانین بە دەستی بێنین..

## چێژ لە بەهرەو تواناکانت وەربگرە..

زیرەکیو بەهرەو تواناکان، خۆشییەکی هەست پێکراون.. ئەنجامدانی ڕەفتارو گوفتارو هەڵسوکەوتی جوان، تەنها بۆ بە دەست هێنانی پاداشتی دوارۆژ نیە، بەڵکو خۆشیو ئاسودەییو بەختەوەرییەکە،لە ژیانی دونیاشدا هەستی پێدەکرێت..

دەی چێژ لە شارەزاییو بەهرەو تواناکانت ببینەو لەگەڵ هەموو خەڵکیدا بەکاریان بهێنە.. لەگەڵ بچوكو گەورەدا.. لەگەڵ هەژارو دەوڵەمەنددا.. لەگەڵ دوورو نزیکدا.. لەگەڵ خزمو بێگانەدا، لەگەڵ هەموو کەسدا بەکاریان بهێنەو خۆشەویستیت لە دڵو دەروونیاندا بڕوێنەو بەرەو چاکسازی ئاراستەیان بکە..

عەلی کوڕی جەهم شاعیرێکی ڕەوان بێژو زمان پاراو بوو، بەڵام دێهاتی بوو.. هیچی لە ژیان نەدەزانی، تەنها ئەو شتانە نەبێت کە لە چۆڵیو بیاباندا بینیبوونی..

خەلیفە متوکل، خەلیفەیەکی خاوەن دەسەڵاتو بە توانا بوو.. بەخشیشو دیاری بەو کەسانە دەدا کە پیایا هەڵیاندایا، هەر بۆیە کاتێك عەلی کوڕی جەهم دێتە شاری بەغدا، پێی دەڵێن: ئەوەی بە خەلیفەدا هەڵبدات، ئەوا خەلیفە دیاریو بەخشیشی دەداتێ..

عەلی کوڕی جەهمیش خۆشحاڵ دەبێتو بەرەو کۆشکی خەلیفە دەکەوێتە ڕێ.. کاتێك دەچێتە ژوورەوە دەبینێت وا شاعیران، هۆنراوە دەخوێننەوەو سەروەتو سامان بە دەست دێنن.. عەلی کوڕی جەهم بەرەو لای خەلیفە دەچێت، خەلیفەش بەو هەموو سامو هەیبەتو دەسەڵاتەیەوە.. پاشان بە خەیاڵی خۆی دەست بە پیاهەڵدانو ستایشی خەلیفە دەکاتو دەڵێت:

أنت كالكلب في حفاظك للود — وكالتيس في قراع الخطوب

أنت كالدّلو لا عدمتك دلواً — من كبار الدلا كثيرُ الذّنوب..

بەڵێ.. خەلیفەی بە سەگو بەرانو بیرو خۆڵو قوڕ وەسف کرد، لە کاتێکدا لە پێش ئەمدا خەلیفەیان بە خۆرو مانگو شاخەکان وەسف کرد بوو!! خەلیفە زۆر تووڕە بوو!! پاسەوانەکان ووروژانو شمشێرەکانیان ڕاکێشاو خۆیان بۆ کوشتنی ئامادە کرد، بەڵام خەلیفە هەستی بەوە کرد کە عەلی کوڕی جەهم لەو سروشتو بوونەوەرەدا گەورە بووەو ئەو کاریگەرییەی بە سەرەوەیە، هەر بۆیە ویستی بیگۆڕێت، فەرمانی کرد لە

کۆشکێکی ئاپابدا نیشتەجێی بکەن‌و با بە خۆشترین شێوە ژیان بە سەر بەرێت..

بەڵێ.. عەلی کوڕی جەهم تامی خۆشییەکانی چەشت.. لە سەر دۆشەك‌و سەرینی بە نرخ شانی دانەداو لەگەڵ شاعیرە زۆر بە ناوبانگ‌و ناودارەکاندا دادەنیشت.. ماوەی حەوت مانگ بەم شێوەیە مایەوە..

شەوێك خەلیفە کۆڕو دانیشتنێکی هەبوو، بیری عەلی کوڕی جەهمی کەوتەوەو داوای کرد بۆی بانگ بکەن.. کاتێك عەلی ئامادە بوو، خەلیفە داوای لێکرد هۆنراوەیان بۆ بخوێنێتەوە، بەڵام ئەم جارەیان لە هۆنراوەکەیدا وشەی زۆر جوانی بەکارهێناو خەلیفەشی بە خۆرو ئەستێرەو شمشێر وەسف کرد!!

سەیرکە خەلیفە چۆن توانی سروشتی عەلی کوڕی جەهم بگۆڕێت؟!

زۆر جار سروشتی هاوڕێ‌و منداڵەکانمان بێزارمان دەکەن، ئایا هیچ هەوڵێکمان داوە، بۆ ئەوەی بیان گۆڕین؟! لە پێش هەموو ئەمانەشەوە، پێویستە سروشتی خۆمان بگۆڕین.. گرژی‌و مۆنیمان، بگۆڕین بە زەردەخەنەو ڕووخۆشی.. ڕق‌و کینەمان، بگۆڕین بە لەسەرخۆیی‌و نەرم‌و نیانی.. چروکی‌و ڕەزیلیمان، بگۆڕین بە بەخشندەیی..

هیچ شتێکیش لەمانە نارەحەت‌و زەحمەت نیە، بەڵام تەنها پێویستیمان بە سوور بوون‌و هەوڵدان هەیە، دەی ئازاو پاڵەوان‌و دەست بەکار بە..

ئەگەر سەیری ژیاننامەی پێغەمبەری ئازیزﷺ بکەین، دەبینین بە جوانترین هەڵسوکەوت، ڕەفتاری لەگەڵ خەڵکی دەکردو دڵی کەمەندکێش دەکردن‌و چرۆی خۆشەویستی لە دەروون‌و ناخیاندا دەچاند.. ئەم هەڵسوکەوتەشی بۆ موجامەلە کردنی خەڵکی نەبوو، کاتێك دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، نەرم‌و نیانییەکەی نەدەگۆڕی بۆ توڕەیی‌و ڕق‌و کینە..

نەخێر.. پێغەمبەری خوداﷺ کەسێك نەبوو، لەگەڵ خەڵکیدا ڕووخۆش‌و نەرم‌و نیان بێت‌و لەگەڵ ماڵ‌و منداڵیشیدا، گرژو مۆن‌و توڕە بێت.. نەخێر.. بەو هەڵسوکەوت‌و ئاکارو ڕەفتارو گوفتارە جوانانەی خوداپەرستی دەکرد، هەروەك بەهۆی شەونوێژو ڕۆژووەوە، خوداپەرستی ئەنجام دەدا..

زەردەخەنەو ڕووخۆشی‌و نەرم‌و نیانی، بە خوداپەرستی‌و عیبادەت دەزانی.. لێخۆشبوون‌و لێبوردەیی بە چاکەو خێرو خێرات دەزانی.. ڕەوشت‌و ئاکاری جوانی بە عیبادەت دەزانی‌و لە هەموو هەڵسوکەوتێکدا خۆی پێدەڕازاندەوە، لە ئاشتی‌و جەنگدا.. لە برسێتی‌و تێریدا.. لە ساغی‌و لە نەخۆشیدا.. لە خۆشی‌و غەمباریدا، ڕەفتارو ڕەوشتی جوانی بەکاردەهێنا..

بەڵێ.. زۆرێك لە ئافرەتان دەنگوباس‌و هەواڵی سنگ فراوانی‌و زەردەخەنەو بەخشندەیی هاوسەرەکەی لە دەرەوەی ماڵەکەی بیستووە، بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەوەی کە بینیویەتی لە ماڵەوە، تەنها ڕەوشتی ناشیرین‌و نێوچاو تاڵی‌و ڕەزیلی‌و چروکی مێردەکەی بووە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: «خيركم خيركم لأهله، وأنا خيركم لأهلي». رواه الترمذي. واتە: (باشترینتان، باشترینتانە بۆ ماڵ‌و خێزانی، منیش باشترین کەسی ئێوەم، بۆ ماڵ‌و خێزانم)..

سەیر بکەو بزانە ڕەفتاری پێغەمبەری خوداﷺ چۆن بووە لەگەڵ ماڵ‌و خێزانەکانیدا..

ئەسوەدی کوڕی یەزیدﷺ دەفەرموێت: پرسیارم لە عائیشەی دایکی ئیمانداران کردو پێم وت: پێغەمبەری خودا لە ماڵەوە چی کارێکی دەکرد؟ عائیشەش (خودای لێ ڕازی بێت) لە وەڵامدا دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ ئیش‌و کارەکانی ماڵەوەی دەکردو لە ئیش‌و کاردا خۆی لە ئەندامەکانی ماڵەکەی جیا نەدەکردەوەو ئەگەر کاتی نوێژ بهاتایە، دەستنوێژی دەگرت‌و دەچوو بۆ نوێژ..

بە هەمان شێوە لەگەڵ دایك‌و باوکانیشدا.. زۆرن ئەو کەسانەی کە لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوتی جوان ئەنجام دەدەن‌و هەمیشە لێو بە خەندەن، بەڵام بە داخەوە لەگەڵ نزیکیترین کەسیاندا.. لەگەڵ کەسێکدا کە گەورەترین ماف بە سەریانەوە هەیە.. لەگەڵ باوك‌و دایکیاندا، هەست‌و نەستێکی جیاوازو توندو تیژیان هەیە..

بەڵێ.. باشترینتان، باشترینتانە لەگەڵ کەس‌و کاریدا.. لەگەڵ هاوسەرەکەیدا.. لەگەڵ باوك‌و دایکیدا.. لەگەڵ منداڵەکانیدا.. لەگەڵ خزمەتکارەکانیدا..

ئەوەتا ڕۆژێك حەسەن یان حوسەین دەچێتە سەر سکی پێغەمبەری خوداﷺ و میز بە سکی پێغەمبەری خواداﷺ دەکات، هەتا میزەکەی بە سەر سکی پێغەمبەری خواداﷺ دێتە خوارێ.. هاوەڵان دەیانەوێت دووری بخەنەوە، کە چی پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: وازی لێ بهێنن‌و مەیترسێنن. رواه أبوداود..

بە ڕاستی جوانە.. بڕوانە پێغەمبەری خوداﷺ چۆن بەو ڕەوشت‌و ئاکارە ناوازانە خۆی ڕازاندۆتەوە!! هەر بۆیە هیچ سەیر نیە، کە دەبینین ئا بەو شێوەیە دڵ‌و دەروونی گەورەو بچوکی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە..

**بۆچوون..**

لە باتی ئەوەی تاریکی بە نەفرین بکەیت، هەوڵی چاککردنی چراو گڵۆپەکان بدە..

## لەگەڵ هەژاراندا..

هەندێك لە خەڵكی بە ڕەوشتێكی بازرگانی هەڵسوكەوت لەگەڵ دەوروبەریاندا دەكەن.. كەسانی دەوڵەمەند، لەبەر ئەوەی خاوەن سەروەت و سامانن، قسەیان خۆشەو ئەگەر قسەكەیان شایەنی پێكەنینیش نەبێت، دەوروبەرەكەی بۆی پێدەكەنن، كاتێك هەڵەیەكیش دەكات، لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندە، هەڵەكەی بە بچوك سەیر دەكرێت و چاوپۆشی لێدەكرێت..

بەڵام كەسانی هەژار، ئەگەر قسەیەك بكەن كە شایەنی پێكەنین و زەردەخەنەش بێت، گاڵتەیان پێدەكرێت، كاتێكیش هەڵەیەكیان لێ ڕوودات، گەورەتر لە قەبارەی خۆی سەیری دەكرێت..

بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ سۆزو بەزەیی بۆ هەژاران و دەوڵەمەندان، وەكو یەك بوو.. ئەنەسی كوڕی مالیكؓ دەفەرموێت: پیاوێكی بیابان نشین هەبوو، بە ناوی زاهیری كوڕی حەرام.. ئەم پیاوە زۆر جار كە بۆ پێویستیەكی بهاتایە بۆ شاری مەدینە، دیاریەكی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ دەهێنا، پێغەمبەری خوداشﷺ لە كاتی گەڕانەوەیدا، هەندێك خورما، یان هەر شتێكی تری هەبووایە، بەو پیاوەی دەبەخشی..

پێغەمبەری خوداﷺ ئەم پیاوەی خۆش دەویست، هەر بۆیە دەیفەرموو: إن زاهراً باديتنا.. ونحن حاضروه.. واتە: زاهیر گوندە بۆ ئێمەو ئێمەش شارین بۆ ئەو..

ئەم پیاوە لە ڕووی شێوەو ڕوخسارەوە، كەسێكی زۆر ناشیرین بوو، ڕۆژێك ئەم پیاوە دێت بۆ شاری مەدینەو دەچێت بۆ ماڵی پێغەمبەری خوداﷺ بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ نابینێت، لەبەر ئەوەی هەندێك كەلوپەل و شمەكی هێنا بوو بۆ فرۆشتن، پیاوەكە دەچێت بۆ بازاڕ..

كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بە هاتنی زاهیری كوڕی حەرام دەزانێت، دەچێت بۆ بازاڕو بە دوایدا دەگەڕێت، هەتا دەیبینێتەوە، كاتێك دەیبینێ، وا خەریكی كڕین و فرۆشتنەو عەرەق بە ڕوخساریدا دێتە خوارێ.. جل و بەرگی بیابان نشینی لەبەردایەو بۆن و بەرامی دەشت و دەری لێدێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، پێغەمبەری خوداﷺ لە پشتەوە باوەشی پێدا دەكات.. پیاوەكەش نازانێت، كێیە باوەشی پێدا كردووەو لە دواوە گرتوویەتی؟! پیاوەكە دەترسێت و دەڵێت: بەرم بدە.. ئەوە كێیە؟!

پێغەمبەری خوداش ﷺ بێدەنگ دەبێت و قسە ناکات.. پیاوەکەش هەوڵ دەدات خۆی لە دەستی رزگار بکات.. هەر بۆیە ئاوڕی داداتەوە بۆ ئەوەی بزانێت کێیە؟! کاتێك زانی پێغەمبەری خودایە ﷺ دڵی ئارام بۆوەو ترسەکەی رەویەوەو زیاتر پشتی نوساند بە سنگی پێغەمبەری خوداوە ﷺ ..

هەر بۆ دڵخۆشی زاهیر، پێغەمبەری خودا ﷺ گاڵتەی لەگەڵ کردو بە دەنگی بەرز بە خەڵکەکەی وت: کێ بەندە دەکرێت..؟ کێ بەندە دەکرێت..؟

زاهیر سەیری حاڵی خۆی کرد، چەند هەژارو داماوەو خاوەنی هیچ سەروەت و سامانێکیش نیە.. هەروەها شێوەو روخسارێکی جوانیش نیە، هەر بۆیە وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەتا ئەوەندە بە رووت و رەجاڵی و لێقەوماوی دەمبینی، کێ منت لێدەکرێت؟!

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: نەخێر.. تۆ لە لای خودا رووت و رەجاڵ و لێقەوماو نیت و لە لای خودا زۆر بەرزو بە نرخیت..

پێغەمبەری خودا ﷺ ئاوا دڵی هەژارانی بۆ لای خۆی کێش دەکردو خۆی لە لایان خۆشەویست دەکرد، هەربۆیە ئەوانیش خۆشیان دەویست..

زۆرێك لە هەژاران رەخنەی ئەوە لە دەوڵەمەندان ناگرن، لەبەر ئەوەی پارمەتییان نادەن و سەروەت و سامانیان نادەنێ و رەزیل و چروکن، بەڵام رەخنەی ئەوەیان لێدەگرن، کە لەگەڵیاندا نەرم و نیان نین و بە هەڵسوکەوتی جوان رەفتاریان لەگەڵ ناکەن..

چەندان هەژارو نەدار هەن، کە پێکەنین و زەردەخەنەت بۆ کردوون و دڵت خۆش کردوون و هەست و سۆزیانت راگرتووەو رێزت گرتوون، ئەوانیش لە تاریکی شەودا، دەستی نزاو پارانەوەیان لە پەروەردگار بۆ بەرز کردوویتەتەوە؟! لەوانەشە بە هۆی ئەو پارانەوەو نزایانەوە، بەزەیی پەروەردگارت لە ئاسمانەوە بۆ دابەزیبێت..

کەسانی وا هەن، تەپ و تۆزاوی و هەژارو نەدارو رووت و رەجاڵن، کاتێك لە دەرگای مرۆڤەکان دەدەن، دەرگایان لێناکەنەوە.. بەڵام ئەو کەسانە لە لای پەروەردگار ئەوەندە بەرێزو گەورەن، ئەگەر داوای لێبکەن وەڵامیان دەداتەوە.. دەی هەمیشەو هەردەم بەرامبەر هەژاران رووخۆش و لێو بە خەندە بە..

**ئاماژە..**

لەوانەیە دەربڕینی زەردەخەنەیەك بە رووی هەژارێکدا، چەندان پلە لە لای پەروەردگار بەرزت بکاتەوە..



## ئافرەتان..

لە کۆنەوە وتراوە: هەر پیاوێك سۆزو خۆشەویستی بۆ ئافرەتەکەی دەرنەبڕێت، ئەوا ئەو ئافرەتە بە دوای سۆزو خۆشەویستیدا دەگەڕێت..

ئافرەتان ماف خۆیانە، لە لایەن هاوسەرو باوكو براکانیانەوە، سۆزو خۆشەویستییان پێ بدرێتو بە جوانترین شێوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێت، ئەگەر نا خەڵکانی دەروون نەخۆشو لاواز، ئەو هەلە دەقۆزنەوەو لە ئافرەتەکانمان نزیك دەبنەوەو ئەو بۆشاییە پڕ دەکەنەوەو سۆزو خۆشەویستی درۆینەیان بۆ دەردەبڕن..

ئەگەر پەروەردگار جەستەیەکی بەهێزی بە پیاوان بەخشی بێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە سۆزو بەزەییەکی گەورەی بە ئافرەتان بەخشیووە.. زۆرێك لە پیاوانی دەسەڵاتدارو خاوەن هێزو تواناکان بینراون، لە بەرامبەر هێزی سۆزداری ئافرەتاندا چۆکیان داداوە..

پێغەمبەری خوداﷺ ئامۆژگاریت دەکات، بەوەی کە هەڵسوکەوتت جوان بێت، لەگەڵ هاوسەرەکەتداو ڕێز لە هەستو سۆزی بگریت، بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بەختەوەرو ئاسودە بژیت..

هەروەها پێغەمبەری خوداﷺ ئامۆژگاری باوکان دەکات، لەگەڵ کچەکانیاندا چاك بنو هەڵسوکەوتی جوانییان لەگەڵدا ئەنجام بدەن، هەروەك دەفەرموێت: «من عال جاريتين حتى تبلغا، جاء يوم القيامة أنا وهو، وضم أصابعَهُ». رواه مسلم. واتە: (هەر کەسێك دوو کچ بەخێو بکات هەتا گەورە دەبن، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا منو ئەو کەسە، وەکو پەنجەکانی دەست لە یەك نزیك دەبین)..

هەروەها ئامۆژگاری کوڕانو پیاوان دەکات، کردارو ڕەفتاریان بەرامبەر دایکیان جوان بێت.. ئەوەتا پیاوێك دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ کێ شایستەی ئەوەیە، زۆر باشبم بۆیو هەڵسوکەوتم لەگەڵیدا جوان بێت ؟ پێغەمبەری خوداﷺ سێ جار دەفەرموێت: دایکت.. پاشان دایکت.. پاشان دایکت.. پاشان باوکت.. متفق عليه..

هەروەها ئامۆژگاری پیاوان دەکات، بەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستییەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەتاندا بکەن‌و لێیان تورە نەبن..

پێغەمبەری خوداﷺ لە حەجیماڵئاواییدا، لە نێوان سەد هەزار میوانانی ماڵی خوادا، لە نێوان کەسانی ڕەش‌و سپیدا.. لە نێوان کەسانی گەورەو بچوکدا.. لە نێوان کەسانی دەوڵەمەندو هەژاردا، بە دەنگی بەرز هاوار دەکات‌و دەفەرموێت: «ألا واستوصوا بالنساء خيراً.. ألا واستوصوا بالنساء خيراً» . رواه مسلم والترمذي. واتە: (ئاگادار بن‌و ئامۆژگاری ئافرەتان بکەن‌و لەگەڵیاندا باش بن.. ئاگادار بن‌و ئامۆژگاری ئافرەتان بکەن‌و لەگەڵیاندا باش بن)..

ڕۆژێك کۆمەڵێك لە ئافرەتان لە لای هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوداﷺ سکاڵای خراپی هەڵسوکەوتی مێردەکانیان دەکەن.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بەمەی زانی، هەستا ئامۆژگاری خەڵکەکەی کردو فەرمووی: (هەندێك لە ئافرەتان هاتوونەتە ماڵەکەم‌و سکاڵاو شکات لە هەڵسوکەوتی خراپی مێردەکانیان دەکەن، ئا ئەو پیاوانە کەسانی باش نین لە ناو ئێوە).. پاشان فەرمووی: «خيركم خيركم لأهله، وأنا خيركم لأهلي». رواه الترمذي وابن ماجة. واتە: (باشترینتان ئەو کەسانەن کە لەگەڵ هاوسەرو ماڵ‌و منداڵیاندا باشن، وە من باشترینتانم بۆ هاوسەرو ماڵ‌و منداڵم)..

لە پێناوی ڕێزو شکۆمەندی ئافرەتاندا، چەندان جەنگ‌و غەزا هەڵگیرساوە.. کاسەی سەر هاردراوەو سەر لە لاشە جیاکراوەتەوە.. هەموو ئەمانەش لە پێناو ئابڕووی تەنها ئافرەتێکدا ڕوویانداوە..

.. بەڵێ.. لە پێناو ئابڕووی تەنها یەك ئافرەتدا.. موسڵمانان خوێن و جەستەی خۆیان کرد بە قوربانی.. جولەکەکان لەگەڵ موسڵماناندا لە شاری مەدینە نیشتەجێ بوون.. کاتێك کە فەرمانی باڵاپۆشی لە لایەن پەروەردگارەوە دابەزی بۆ ئافرەتان.. جولەکەکان تووڕە بوون‌و لەلایان ناخۆش بوو.. حەزیان نەکرد ئافرەتانی موسڵمان خۆیان داپۆشن.. زۆر هەوڵیان دەدا تۆوی ناکۆکی‌و دووبەرەکی لە نێوان ئافرەتانی موسڵماندا بچێنن، بەڵام نەیانتوانی..

لە یەکێك لە ڕۆژەکاندا ئافرەتێکی داوێن پاك، لە ئافرەتانی موسڵمان چوو بۆ بازاڕی جولەکەکان‌و لە دوکانی یەکێك لە زەڕەنگەرە جولەکەکاندا دانیشت.. زەڕەنگەرە جولەکەکە بەم باڵاپۆشی‌و داپۆشراویەی ئافرەتە موسڵمانەکە نارەحەت‌و تووڕە بوو،

دەیویست سەیری ڕوخساری ئافرەتەکە بکاتو گاڵتەی پێبکات، وەك پێش هاتنی ئاینی ئیسلام، ئەم کارانەیان لە دژی ئافرەتان ئەنجام دەدا..

بەڵێ.. جولەکەکە داوای لە ئافرەتەکە کرد ڕوخساری دەربخات.. ویستی بەهۆی پارەو سامانەوە لە خشتەی بەرێت، بەڵام ئەم ئافرەتە باوەڕدارە ڕازی نەبوو.. زەڕەنگەرەکە ئافرەتەکەی خلافاند.. کاتێك ئافرەتەکە دانیشتبوو، لای خوارەوەی کراسەکەی بەست بە لای سەرپۆشەکەیەوە، کە شۆڕ ببوەوە بە سەر پشتیدا.. کاتێك ئافرەتەکە هەڵسا، کراسەکەی لە دواوە بەرزبووەوەو لاشەی دەرکەوتو جولەکەکە پێی پێکەنی.. ئافرەتەکە هاواری کردو خۆزگەی بە مەرگ دەخواست، نەك دەرکەوتنی جەستەی..

کاتێك پیاوێك لە موسڵمانان ئافرەتەکەی بەم شێوەیە بینی.. شمشێرەکەی هەڵکێشاو زەڕەنگەرە جولەکەکەی کوشت.. جولەکەکانیش لە موسڵمانەکە کۆبوونەوەو شەهیدیان کرد..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ زانی کە جولەکەکان پەیمانیان شکاندووەو سوکایەتی بە ئافرەتانی موسڵمان دەکەن.. گەمارۆی جولەکەکانیانداو ویستیان تۆڵەی ئەو ئافرەتە پاكو بەڕەوشتە بسەننەوە..

ئا لەم کاتەدا یەکێك لە سەربازەکانی شەیتان.. لەو کەسانەی کە گرنگی بە ئابڕووی ئافرەتانی موسڵمان نادەن.. یەکێك لەو کەسانەی کە هەر خەمی تێرکردنی داوێنو سکیانن.. سەرۆکی دووڕووەکان، عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هەڵساو وتی: ئەی موحەممەد هەڵسوکەوتت لەگەڵ جولەکەکاندا باش بێت..

لە پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا جولەکەکان لایەنگرو پاڵپشتی ئەم دووڕووە بوون.. پێغەمبەری خوداﷺ بەرپەچیدایەوەو ڕازی نەبوو.. جارێکی تر ئەم دووڕووە قسەکانی دوبارە کردەوە.. هەمدیسان پێغەمبەری خوداﷺ پشتی تێکردو ڕووی لێوەرگێڕا..

داوای لێبوردن و لێخۆشبوون بۆ کۆمەڵە کەسێك دەکات، دەیانەوێت خراپە لە نێوان ئیمانداراندا بڵاوبکەنەوە.. ئەم دووڕووە تووڕە بوو.. دەستی کرد بە پشتێنی زرێکەی پێغەمبەری خوداداﷺو هەر دوبارەی دەکردەوەو دەیوت: لەگەڵیاندا باش بە.. لەگەڵیاندا باش بە..

پێغەمبەری خوداﷺ لایکردەوە بە لایداو فەرمووی: وازم لێبێنە.. بەڵام ئەم دووڕووە هەر ڕازی نەبوو.. داوای لە پێغەمبەری خوداﷺ کرد، کە دەست لە کوشتنیان هەڵگرێت.. پێغەمبەری خوداﷺ لایکردەوە بە لایداو فەرموی: ئەوانە بۆ تۆ.. وازی لە کوشتنیان هێنا، بەڵام لە شاری مەدینە، شار بەدەری کردن..

بەڵێ.. ئافرەتانی ڕەوشت بەرزو پاك داوێن، شایستەی زۆر لەوە زیاترن..

خەولەی کچی سەعلەبە، یەکێك بوو لە ئافرەتە چاکەکارەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوداﷺ، خێزانی ئەوسی کوڕی صامت بوو، ئەوس پیاوێکی پیر بوو، زووش تووڕە دەبوو.. ڕۆژێك دێتەوە بۆ ماڵەوەو لەگەڵ خێزانەکەیدا ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان، ئەوس تووڕە دەبێت و دەڵێت: تۆ وەکو دایکم وایت و بە تووڕەییەوە دەچێتە دەرەوە..

لە سەردەمی نەفامیدا، ئەگەر پیاوێك ئەم قسەیەی بە هاوسەرەکەی بووتایە، ئەوا تەڵاقی دەکەوت، بەڵام خەولە نەیدەزانی لە ئیسلامدا حوکمی ئەم قسەیە چیە.. ئەوس هاتەوە بۆ ماڵەوە، خەولە خۆی لێ دوورخستەوەو وتی: سوێند بە خودا نابێت لێم نزیك بیتەوە هەتا خوداو پێغەمبەرەکەیﷺ دادوەریمان نەکەن، هەر بۆیە خەولە کەوتە ڕێ بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و ڕووداوەکەی بۆ باس کردو سکاڵای خراپ هەڵسوکەوتی مێردەکەی لە لای پێغەمبەری خوداﷺ کرد..

پێغەمبەری خوداشﷺ خەولەی ئارام کردەوەو پێی فەرموو: لەگەڵ کوڕە مامەکەتدا باش بە، چونکە پیاوێکی بە تەمەنەو لە خودا بترسەو چاك بە لەگەڵیدا..

خەولەش بە دەم غەم و خەفەتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ گەنجی و جوانی خۆم پێشکەش بە مێردەکەم کرد.. سکم بۆ هەڵڕشت، ئێستاش پیر بووم و منداڵم نابێت، کەچی پێم دەڵێت: وەکو دایکم وایت.. خودایە سکاڵای خۆم لە لای تۆ دەکەم..

پێغەمبەری خوداشﷺ چاوەڕێی سروش و نیگای پەروەردگاری دەکرد، چونکە هێشتا لە ئیسلامدا حوکمی ئەم حاڵەتە دانەبەزی بوو..

هەر لەو کاتەی کە خەولە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوو ﷺ، جوبرائیل لە ئاسمانەوە دابەزی بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و لەگەڵ خۆیدا یەکلاکردنەوەی حاڵەتەکەی خەولەو مێردەکەی هێنا بوو..

پێغەمبەری خوداﷺ لای کردەوە بە لای خەولەداو فەرمووی: پەروەردگار لە سەر حاڵەتەکەی نێوان تۆو هاوسەرەکەت قورئانی دابەزاند، پاشان ئایەتەکەی بۆ

خوێندەوەو فەرمووی: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ١ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ٢ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٣ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٤﴾ المجادلة. واتە: (ئەی محمدﷺ بێگومان خودا وتوێژی ئەو ئافرەتەی بیستو وەری گرت، کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات دەربارەی هاوسەرەکەی، سکاڵای خۆیشی بۆ لای خودا دەبات، خودایش گفتوگۆکەتانی بیست، بە ڕاستی خودا بیسەرو زانایە ئەوانەتان بە هاوسەرانیان دەڵێن: تۆ لە جێگەی دایکمدایت، هاوسەرەکەیان بەو قسەیە نابنە دایکیان، چونکە دایکیان تەنها ئەوانەن کە ئەوانیان لێبووە، ئەوانە قسەیەکی نابەجێ دەکەنو بوختانێکی ناپەسەند دەڵێن، بێگومان خودا چاوپۆشی دەکاتو لێیان خۆش دەبێت (ئەگەر ئەوانە پەشیمان ببنەوەو داوای لێخۆش بوون بکەن) ئەوانەی وا بە هاوسەرەکانیان دەڵێنو دوایی پەشیمان دەبنەوە لەوەی کە وتوویانە، ئەوە دەبێت کۆیلەیەك ئازاد بکەن پێش ئەوەی ئەو ژنو مێردە بە یەك بگەن، ئەو بڕیارە ئێوەی پێ ئامۆژگاری دەکرێت، خودایش ئاگادارە لەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن ئینجا ئەوەی کۆیلەی دەست نەکەوت، ئەوە دەبێت دوو مانگ لە سەر یەك بەڕۆژوو بێت، پێش بە یەکگەیشتنیان، جا ئەوەی ناتوانێت بەڕۆژوو بێت، با شەست هەژار تێر بکات لە ژەمێك خواردن، ئەوەی کەباسکرا بۆ ئەوەیە باوەڕتان پتەو بێت بە خوداو پێغەمبەرەکەی (چونکە خودا چارەسەر دادەنێت بۆ گیرو گرفتەکان)، ئەو بڕیارانەش سنوری خودان، بۆ ئەوانەش کە کافرن (ملکەچی فەرمانی خودا نابن) سزای بە ئێشو ئازار بۆیان ئامادەیە)..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بڕۆ بە هاوسەرەکەت بڵێ: لە کەفارەتی ئەو قسەیەی کە کردوویەتی، با بەندەیەك ئازاد بکات..

خەولە وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ توانای ئەوەی نیە بەندەیەك بکڕێتو ئازادی بکات!!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەی با دوو مانگی لەسەریەك بەڕۆژوو بێت!!

خەولەش وتی: سوێند بە خودا هاوسەرەکەم پیاوێکی بە تەمەنەو ناتوانێت بەڕۆژوو بێت!!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەی با خواردنی شەست هەژار لە خورما بدات!!

خەولە وتی: هەژارەو ناتوانێت!!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: من یارمەتی دەدەمو بەشێکی خورماکەی بۆ دەدەم..

خەولەش وتی: منیش بەشەکەی تری بۆ دەدەم..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: چاك دەکەیت، دەی بڕۆ خورماکەی بدەریو یارمەتیشی بدەو هەڵسوکەوتیشت لەگەڵیدا باش بێت..

پاكو بێگەردی بۆ ئەو خودایەی، کە ئەو هەموو سۆزو بەزەییەی خستووەتە دڵی پێغەمبەرەکەیەوەﷺ، تەنانەت بەشداری لە چارەسەرکردنی کێشە تایبەتییەکانی خەڵکیشدا دەکات..

بەڵێ.. بە دڵنیاییەوە من خۆم ئەمەم تاقی کردۆتەوە، هەڵسوکەوتی نەرمو نیانو دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی لەگەڵ هاوسەرو کچانماندا، لە پێش هەموو کەسێکیشدا لەگەڵ دایكو خوشکانماندا، کاریگەرییەکی وا گەورەو بەهێز دروست دەکات، کە هەرگیز بە خەیاڵتدا نەهاتبێت.. تەنها ئەو کەسانەش هەست بەم کاریگەرییە بەهێزە دەکەن، کە خۆیان ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە جوانانەیان پەیڕەو کرد بێتو تاقییان کردبێتەوە..

بە دڵنیاییشەوە دەڵێم: کەسانێك ڕێز لە ئافرەتان دەگرن، کە خۆیان بەڕێزن.. کەسانێکیش بێڕێزی بەرامبەر ئافرەتان دەکەن، کە خۆیان سوكو بێڕێزن..

**هەڵوێستە..**

ڕەنگە ئافرەت لە سەر هەژاریو ناشیرینیو سەرقاڵی هاوسەرەکەی ئارام بگرێت، بەڵام زۆر بە کەمی دەتوانێت لە سەر ناشیرینی هەڵسوکەوتی هاوسەرەکەی ئارامگر بێت..

# تەمەنی منداڵی..

زۆرن ئەو هەڵوێستانەی، کە لە تەمەنی منداڵیدا لە ژیانماندا ڕوویانداوەو هەتا ئێستاش لە یادەوەریەکانماندا هەر تۆمارن، جا ئەو یادەوەریانە خۆش بووبن، یان ناخۆش..

لە ڕێگەی یادەوەریەکانتەوە بگەڕێوە بۆ سەردەمی منداڵیت.. ئەو کاتەت لەبیرناچێت، کە مامۆستای قوتابخانە دیارییەکی پێکەش کردیت، یان ئەو کاتەی کەسێك لە کۆڕوکۆبوونەوەیەکی گشتیدا، ستایشی کردوویت.. ئەم یادگاریانە لە یادەوەریەکانتدا تۆمارەو لەبیرت ناچنەوە..

بە هەمان شێوە، یادەوەریە ناخۆشەکانیش بە ئاسانی بیرناچنەوە.. ئەو کاتەی کە لە تەمەنی منداڵیتدا، مامۆستا لێیداویت، یان ئەو کاتەی لەگەڵ هاوڕێکانتدا دەمەقاڵێیەکت تووش بووە، یان ئەو کاتەی کە لەماڵەوە سوکاتیەکمان پێکرا بێت، یان کەسێك لە ئێمە لە لایەن هاوسەری باوکمانەوە، نارەحەتکرابین، ئەمانە کۆمەڵە حاڵەتێکن، لە یادەوەریماندا تۆمارنو بە ئاسانی ناسڕێنەوە..

چەندان جاری وا هەبووە، کاتێك چاکەیەك لەگەڵ منداڵێکدا کراوە، تەنها کاریگەری لە سەر منداڵەکە جێ نەهێشتووە، بەڵکو کاریگەری لە سەر باوکیو کەسوکارەکەشی جێ هێشتووەو خۆشەویستی هەمووان، بە دەست هاتووە..

کاتێك مامۆستایەك هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵ قوتابیەکی سەرەتاییدا ئەنجام دەدات، بەهۆی باس کردنی هەڵسوکەوتە جوانەکانی مامۆستاکەوە، لە لایەن قوتابیەکەوە، مامۆستاکە لە لایەن باوكو کەسوکاری قوتابیەکە خۆشەویست دەبێت..

کەواتە هەرگیز زەردەخەنەو لێو بە خەندەییت، بەرامبەر بە منداڵ بە کەم مەزانەو هەوڵ بدە دڵو دەروونی بە دەست بهێنیتو بە جوانترین هونەرو لێزانین هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەنجام بدە..

ڕۆژێك لە قوتابخانە دەربارەی نوێژ وانەم بە کۆمەڵێك قوتابی بچوك دەوتەوە، پرسیارم لێکردن دەربارەی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوداﷺ لە سەر گرنگی نوێژ.. یەکێك لە قوتابیەکان بە فەرموودەیەك وەڵامی دامەوەو وتی: پێغەمبەری خوداﷺ

دەفەرموێت: «بين الرجل وبين الكفر أو الشرك، ترك الصلاة».. واتە: (جیاوازی نێوان مرۆڤی موسڵمانو بێباوەڕ، یان هاوەڵدانەر، وازهێنانە لە نوێژ)..

وەڵامەکەیم زۆر لە لا جوانو سەرنج ڕاکێش بوو، ئەوەندە کاری تێکردم کاتژمێرەکەی دەستم داناو پێشکەشیم کرد، هەر چەندە کاتژمێرەکەشم کاتژمێرێکی ئاسایی و هەژارانە بوو..

ئەم هەڵوێستە، بوو بە هاندەرێك بۆ ئەو قوتابییەو زانستو زانیاری خۆش ویستو بەرەو ئاراستەی قورئان لەبەرکردن هەنگاوی ناو خۆی بۆ ئەو بوارە تەرخان کرد..

ڕۆژەکان تێپەڕین.. بەڵکو چەندین ساڵ بە سەر ئەو ڕووداوەدا ڕۆیی، پاشان لە یەکێك لە مزگەوتەکاندا بینیم پێشنوێژی مزگەوتەکە، ئەو قوتابییە کە کاتژمێرەکەمم پێشکەش کرد.. ئەو منداڵە کۆلیژی شەریعەی تەواو کرد بوو، لە یەکێك لە دادگاکانیشدا کاری دەکرد.. من ئەو ڕووداوەم بیر نەمابوو، ئەو بیری خستمەوە..

سەیر بکە دوای چەندین ساڵ، ئەو هەڵوێستە لە یادەوەرییەکانیدا تۆمارەو لە بیری نەچۆتەوە..

جارێکی تر لە کۆڕێکی تردا، گەنجێکی ڕوخسار گەشاوەو جوان، زۆر بە گەرمی چاكو چۆنی لەگەڵ کردمو هەڵوێستێکی جوانی بیرخستمەوە، کە کاتی خۆیو لە منداڵیدا، لە قوتابخانە بەرامبەری نواند بووم.. جاری وا هەیە، بە هۆی ئەوەی کەسانێك هەڵسوکەوتێکی جوانیان، لە مزگەوت لەگەڵ منداڵاندا نواندووە، دەبینین ئەو منداڵانە بە دەستە بچوکەکانیان باوکیان ڕادەکێشنو دەیانبەن بۆ لای ئەو کەسە ڕەوشتو هەڵسوکەوت جوانانە، بۆ ئەوەی چاكو چۆنییان لەگەڵ بکەن، باوکانیشیان هەواڵی خۆشەویستی منداڵەکانیان بەو کەسانە ڕادەگەیەنن..

لێت ناشارمەوە جاری وا هەیە لە کۆڕێك یان ئاهەنگێکی قەرەباڵغ، کە خەڵکێکی زۆر بانگ کرابن، زیادەڕۆی دەکەم لە ڕێزگرتنو دواندنی منداڵانداو گوێ لە قسەکانیان دەگرم، هەر چەندە زۆر جار قسەکانیشیان زۆر گرنگو بە بایەخ نەبن، ئەمەش وەکو ڕێزگرتنێك بۆ باوکی منداڵەکە، لە هەمان کاتیشدا بۆ بە دەست هێنانی خۆشەویستی منداڵەکەو باوکیشی..

هاوڕێیەکم هەبوو، زۆر جار لەگەڵ کوڕە بچوکەکەیدا دەمبینین.. جاری وا هەبوو منداڵەکەیم دەدواندو بە نەرمو نیانی هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکرد.. ڕۆژێك لە شوێنێکی

فەرمبالغدا ، هاوڕێکەم دەستی منداڵەکەی گرت بوو، سلاوی لێکردەو پاشان وتی: چ هەڵسوکەوتێکت لەگەڵ کوڕەکەمدا کردووەو ئاوا توانیووتە دڵی بۆ لای خۆت ڕابکێشیت؟!
چەند ڕۆژێك پێش ئێستا مامۆستایەکیان لە قوتابخانە پرسیاری لێکرد بوون، کە لە پاشەڕۆژدا حەز دەکەن ببن بە چی؟!

هەیان بوو وتبووی: حەز دەکەم ببم بە پزیشك.. هەیان بوو وتبووی: حەز دەکەم ببم بە ئەندازیار.. بەلام ئەم کوڕەی من وتبووی: حەز دەکەم ببم بە محەممەد عەریفی!!

دەتوانی تێبینی ئەوە بکەی، کە خەڵکی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ منداڵاندا جیاوازە، کاتێك پیاوێك دێتە کۆڕو دانیشتنێکەوەو چاك‌و چۆنی‌و تەوقە لەگەڵ ئامادەبووانداه دەکات، ئەگەر تەماشا بکەیت، ئەو منداڵەی کە لەگەڵیدایەو لە دوایەوە دەڕوات، وەکو باوکی دەکات..

هەندێك لە خەڵکی بێناگان بەرامبەر بچوکەکان.. هەندێکی تریان بە ساردی‌و بە بەشێکی کەم لە دەستی تەوقە لەگەڵ منداڵاندا دەکەن.. کەسی وا هەیە، زۆر بە گەرمی تەوقە لەگەڵ منداڵاندا دەکات‌و بە زەردەخەنەو بە ڕوویەکی خۆشەوە دەڵێت: چۆنی پاڵەوان؟! حاڵ‌و هەواڵت چۆنە زیرەك‌و وریا؟! بە دڵنیاییەوە ئەم جۆرە کەسە، لە لای منداڵەکە خۆشەویست دەبێت‌و دەچێتە دڵیەوە، بەڵکو ئەم کەسە لە لای دایك‌و باوکی منداڵەکەش خۆشەویست دەبێت..

یەکەمین مامۆستاو پێشەواو پەروەردەکارﷺ بە جوانترین شێوەو شێواز، هەڵسوکەوتی لەگەڵ منداڵاندا ئەنجامداوە، ئەوەتا ئەنەسی کوڕی مالیكﷺ برایەکی بچوکی دەبێت، پێغەمبەری خوداﷺ یاری لەگەڵ دەکات‌و بە نازناو بانگی دەکات.. ئەم منداڵە کە پێغەمبەری خوداﷺ بە أبوعمیر بانگی دەکات، باڵندەیەکی دەبێت‌و پاشماوەیەك باڵندەکەی دەمرێت.. پێغەمبەری خوداشﷺ کاتێك منداڵەکە دەبینێ، یاری لەگەڵ دەکات‌و پێی دەفەرمووێت: «یا أبا عمیر، مافعل النغیر»..؟!

هەر کاتێکیش پێغەمبەری خوداﷺ بە لای منداڵاندا بڕۆیشتایە، سلاوی لێدەکردن‌و دەستی بە سەریاندا دەهێنا.. کاتێکیش لە غەزاو جەنگ دەگەڕایەوە، منداڵان بەرەو پیری پێغەمبەری خوداﷺ دەهاتن‌و ئەمیش لەگەڵ خۆی سواری دەکردن..

هەروەها کاتێك کە لە جەنگی موئتە گەڕانەوەو گەیشتنەوە شاری مەدینە، منداڵان بەرەو پیریان هاتن، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: منداڵەکان لەگەڵ خۆتان سەر

بخەن‌و کوڕەکەی جەعفەریش بدەن بە من..

بەڵێ.. عبداللەی کوڕی جەعفەری وەرگرت‌و لە پێش خۆیەوە سواری وڵاخەکەی کرد.. ڕۆژێکی تریان پێغەمبەری خوداﷺ دەستنوێژی دەشۆرد، منداڵێکی پێنج ساڵە دێت بۆ لای، پێغەمبەری خوداشﷺ هەندێك ئاو دەکاتە دەمی پیرۆزیەوەو پاشان دەیکات بە ڕوخساری منداڵەکەدا. رواه البخاري.

بە شێوەیەکی گشتی پێغەمبەری خودا ﷺڕووخۆش‌و دەم بە خەندە بووە لەگەڵ خەڵکیداو هەوڵیداوە خۆشی بخاتە دڵیانەوە.. ڕوح سوك بووە لە لای خەڵکی‌و هەرگیز لێی بێزار نەدەبوون..

ڕۆژێك پیاوێك دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو داوای ئاژەڵێکی لێدەکات، بۆ ئەوەی لە غەزاو جەنگدا سواری بێت، پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: بەچکە وشترێکت دەدەمێ سواری بیت.. پیاوەکە لە لای سەیر دەبێت‌و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: بەچکە وشتر چۆن منی بۆ هەڵدەگیرێت؟!

هەر بۆیە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ چی لە بەچکە وشتر بکەم؟! پێغەمبەری ئازیزیش لە وەڵامدا پێی دەفەرموێت: ئەی هەموو وشترێك بەچکەی وشترێکی تر نیە؟!

پێغەمبەری خوداﷺ مەبەستی ئەوە بوو، وشترێکی سواریی گەورەی دەداتێ، بەڵام خۆ هەر بەچکەی وشترێکی تربووە..

ڕۆژێکی تر پێغەمبەری خوداﷺ هەر بۆ خۆشی بە ئەنەس دەفەرموێت: ئەی خاوەن دوو گوێچکە..

جارێکی تر ئافرەتێك دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو سکاڵا لە مێردەکەی دەکات.. پێغەمبەری خوداش ﷺ پێی دەفەرموێت: مێردەکەت ئەو پیاوەیە، کە لە چاویدا سپیاییەك هەیە؟ ئافرەتەکە کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، دڵی ڕادەچڵەکێت‌و وا گومان دەبات، کە پیاوەکەی کوێر بووە، هەروەك پەروەردگار لە باسی یەعقوب‌ﷺ دا دەفەرموێت: ﴿وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ۝٨٤﴾ یوسف. واتە: (چاوەکانی سپی هەڵگەڕاو ئاوی سپی تێزاو بینینی نەما لە ئاخ‌و داخ‌و خەفەت‌و ئێشدا، هەر خەم‌و پەژارەی خۆی دەخواردەوە)..

ئافرەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی‌و سەیری چاوی دەکات‌و لێی ورد دەبێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: لە چاوی مێردەکەتدا سپیاییەك هەیە!!

مێردەکەشی دەڵێت: ژنەکە، ئایا چاوی هەموو کەسێك، سپیەکەی لە ڕەشیەکەی زیاتر نیە؟!

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گاڵتەو قسەی خۆشی لەگەڵ کەسێکدا بکردایە، بە تەواوی تێکەڵی دەبوو، هەروەها لەگەڵیدا پێدەکەنی‌و دڵی خۆش دەکرد..

ڕۆژێك ئیمامی عومەرﷺ دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و دەبینێت پێغەمبەری خوداﷺ لە هاوسەرەکانی توڕە بووە، بە هۆی ئەوەی هاوسەرەکانی داوای بژێوی زیاتریان لێکرد بوو..

ئیمامی عومەرﷺ بە پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك ئێمە لە ناو قورەیشدا بووین، ئەگەر دەتبینین چۆن بە سەر ئافرەتاندا زاڵ‌و بە دەسەڵات بووین!! چۆن دەیان توانی داوای بژێوی زیاترمان لێبکەن، بەڵام کاتێك هاتین بۆ شاری مەدینەو ئافرەتانمان بینییان ئافرەتانی مەدینە بە سەر پیاوانیاندا زاڵ‌و دەسەڵاتدار بوون، هەر بۆیە ئافرەتانی ئێمەش لەوانەوە فێر بوون‌و ئێستاش وادەبینی دەبینی دەنگمان بە سەردا بەرز دەکەنەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گوێی لەم قسانەی ئیمامی عومەرﷺ بوو، ڕوخساری گەشایەوەو زەردەخەنە کەوتە سەر لێوە پیرۆزەکانی، پاشان ئیمامی عومەرﷺ لە قسەکانی بەردەوام بوو، پێغەمبەری خوداشﷺ زیاتر بزەخەنەی بۆ کردو ددانە پیرۆزەکانی دەرکەوتن، هەموو ئەمانەشی بۆ دڵخۆشی‌و خۆشی خستنە دڵی ئیمامی عومەرەوە بوو..

ئەگەر بەم شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکەین، ئەوسا بە ڕاستی چێژی ڕاستەقینە لە ژیان وەردەگرین‌و خۆشمان‌و خەڵکیش دڵخۆش دەکەین..

بیرۆکە..

منداڵ وەکو قوڕێکی نەرمو شل وایە، چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین، بەو شێوەیەی لێ دەردەچێت..

## لەگەڵ ژێردەستەو کارگوزاراندا..

پێغەمبەری خوداﷺ بە پێی گونجان لەگەڵ کەسەکاندا، هەوڵی دەدا بە شێوەیەکی جوان بچێتە دڵی خەڵکیەوەو کاریگەرییان لە سەر دروست بکات..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ مامی کۆچی دوایی کرد، بێباوەڕانی قورەیش زیاتر ئازاری پێغەمبەری خودایانﷺ دەداو هەوڵیان دەدا زیاتر نارەحەتی بکەن، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ بەرەو شاری تائیف کەوتە ڕێ، سابەڵکو هۆزەکانی دانیشتووی تائیفو لە سەرووی هەمووشیانەوە، هۆزی سەقیف پشتگیری بکەنو باوەڕی پێ بهێنن..

کاتێك گەیشتە شاری تائیف، چوو بۆ لای سێ کەسی ناوداری هۆزی سەقیف، کە هەرسێکیان برا بوون، بە ناوەکانی (عبداللیلو حبیبو مسعود)..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵیان دانیشتو بانگی کردن بۆ لای یەکتاپەرستیو داوای پشتیوانیو پشتگیری لێکردن، بەڵام ئەوان زۆر بە خراپیو بە ناشیرینی وەڵامیان دایەوە..

یەکێکیان وتی: ئەگەر خودا تۆی بە پێغەمبەر ڕەوانە کرد بێ، ئەوا شەرت بێت پەردەی کەعبە بدڕێنم..

دووەمیان وتی: خودا کەسی دەست نەکەوت بیکات بە پێغەمبەر تۆ نەبێت؟!

سێیەمیان وتی: هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەمو ناتدوێنم، لەبەر ئەوەی ئەگەر ڕەوانەکراوی خودا بیت، هەر وەك خۆت دەیڵێیت، ئەوا تۆ زۆر لەوە گەورەتری کە من قسەت لەگەڵ بکەم، خۆ ئەگەر درۆش بە دەم خوداوە بکەیت، ئەوا دووبارە پێویست ناکات قسەت لەگەڵ بکەم!!

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ گوێی لەم قسە زبرو ڕەقو ناخۆشانە بوو، لە لایان هەستاو لە گەورە پیاوانی سەقیف نائومێدو بێهیوا بوو، دڵتەنگیش

بوو بەوەی ئەگەر قورەیش بەم هەواڵە بزانن، ئەوا زیاتر ئازاری دەدەنو نارەحەتی دەکەن، هەر بۆیە داوای لێکردن ئەم هەواڵە با لە لایان بە نهێنی بمێنێتەوەو باسی نەکەن، بەڵام ئەم داواکاریەشیان بە قسە نەکردو نەفامو شێتو بەندەکانیان لێهانداو بە هاوار هاوارو جنێوو قسەی ناشیرین شوێنی کەوتنو بەردبارانیان کرد، هەتا ئەو کاتەی خەڵکێکی زۆری لێ کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوداش چووە ژێر سێبەری دیواری باخی عوتبەو شەیبەی کوڕانی ڕەبیعەوەو ئەو خەڵکەکەش کە شوێنی کەوتبوون گەڕانەوە..

کاتێك کوڕەکانی ڕەبیعە پێغەمبەریان بەم شێوەیە بینی، بەزەیی‌و سۆزیان بۆی جوڵا، بەندەیەکیان هەبوو بە ناوی عەداس کە مەسیحی بوو، بانگیان کردو پێیان وت: هێشوویەك ترێ بۆ ئەو پیاوە بەرەو پێی بڵێ: ئەم هێشووە ترێیە بخۆ..

عەداس بە هێشووە ترێکەوە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و لە بەردەمی دایناو پاشان بە پێغەمبەری خوداﷺی وت: بخۆ..

پێغەمبەری خوداشﷺ دەستی پیرۆزی بۆ درێژ کردو فەرمووی: بسم الله، پاشان دەستی بە خواردنی هێشووە ترێکە کرد..

عەداس سەری سوڕماو وتی: سوێند بە خودا خەڵکی ئەم ناوچەیە ئەم قسەیە ناکەنو ناڵێن: بسم الله!!

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: عەداس خەڵکی کوێیت؟ ئەی لە سەر چ ئاینێکیت؟

عەداس وتی: خەڵکی شاری نەینەوامو لە سەر ئاینی مەسیحیشم..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: خەڵکی شارەکەی یونسی کوڕی مەتای پیاوچاکیت؟

عەداس لەم قسەیەی پێغەمبەری خوداﷺ سەرسام بوو!! پاشان وتی: تۆ یونسی کوڕی مەتا چۆن دەناسیت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: یونس برامە، ئەو پێغەمبەری خودا بوو، منیش پێغەمبەری خودام..

ئا لەم ساتەدا عەدداس خۆی دا بە سەر پێغەمبەری خوداﷺ و سەرو قاچی پێغەمبەری خوداﷺ ی ماچ کرد.. کوڕەکانی ڕەبیعەش سەیریان دەکردو یەکێکیان بەوی تریانی وت: ئەوا بەندەکەی خراپ کردی.. کاتێکیش عەدداس گەڕایەوە، کاریگەری بینینی پێغەمبەری خوداﷺ ی بە ڕوخسارەوە دیار بوو.. گەورەکەی پێی وت: هاوار بۆ تۆ عەدداس، ئەوە بۆ دەستو سەرو قاچی ئەو پیاوەت ماچ کرد؟!

عەدداسیش وتی: گەورەم سەر زەوی کەسی باشتری لەو پیاوە تێدا نیە، هەواڵێکیشی پێدام، جگە لە پێغەمبەران کەسی تر ئەو هەواڵە نازانێت!! پاشان گەورەکەی وتی: عەدداس وریابە لە ئاینەکەت هەڵت نەگێڕێتەوەو لات نەدات، ئاینەکەی خۆت لە ئاینی ئەو پیاوە باشترە..

ئایا ئەمڕۆ ئێمە ناتوانین لە کۆمەڵگەداو لەگەڵ خەڵکیدا، بە جوانترین شێوە هەڵسوکەوت بکەین؟! با ئەو خەڵکانەش لە هەر ئاستو پلەو پایەیەکدا بن، هەر وەك پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ عەدداسی بەندەدا ئەو شێوە هەڵسوکەوتە ناوازەو جوانەی بەکارهێنا..

سەرنج..

لەگەڵ مرۆڤەکاندا بە شێوەیەك هەڵسوکەوت بکە کە مرۆڤن، نەك لە سەر بنەمای شکڵو شێوەو سەروەتو سامانو پلەوپایەو وەزیفەیان..



## لەگەڵ بێباوەڕانو دوژمناندا..

پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ بێباوەڕانیشدا، دادپەروەرانە مامەڵەی دەکردو لە سەر ئازارو نارەحەتیەکانیان ئارامی دەگرتو هەوڵی دەدا چاکسازیان تێدا دروست بکاتو بەرەو ئاکارە جوانەکان ئاراستەیان بکات..

ئەی چۆن وا نەبێت، لە کاتێکدا پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء. واتە: (ئەی محمدﷺ ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەتو بەرەکەت، بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزادو گیاندارو ڕووەكو پەری‌و..هتد))..

بۆ کێ؟! بۆ ئیمانداران؟! نەخێر.. بۆ هەموو جیهان.. بۆ هەموو مرۆڤەکان، تەنانەت بۆ ئاژەڵانو ڕووەكو بێگیانەکانیش..

ئەوەتا جولەکەکان زۆر ئازاری پێەمبەری خودایانﷺ دەدا، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ زۆر نەرمو نیان بوو لەگەڵیان..

عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: جولەکەکان بە لای ماڵی پێغەمبەری خواداﷺ دەڕۆیشتنو لە باتی بڵێن: السلام علیکم، دەیان وت: السام علیکم.. واتە: (لە ناوچونو مردنتان لە سەر بێت)..

پێغەمبەری خوداش لە وەڵامدا دەیفەرموو: هەروەها لە سەر ئێوەش..

بەڵام عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) لە سەر ئەم قسە ناشیرینەی جولەکەکان ئارام ناگرێتو پێیان دەڵێت: مردن لە سەر ئێوە بێت، هەروەها نەفرینو ڕقی خوداشتان لە سەر بێت..

پێغەمبەری خوداشﷺ بە عائیشەی فەرموو: ئەی عائیشە، لە سەرخۆبە.. نەرمو نیان بەو دوور بکەوەرەوە لە توندو تیژی‌و قسەی ناشیرین..

عائیشەش (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئایا گوێت لێنەبوو چیان وت: پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: ئایا گوێت لە من نەبوو چیم پێووتن؟! وەڵامم دانەوەو پەروەردگار لێی وەرگرتمو ئەوەی ئەوانی وەرنەگرت..

بەڵێ.. پێویست ناکات جنێوو قسەی ناشیرین، بە جنێوو قسەی ناشیرین وەڵام بدرێتەوە.. ئایا پەروەردگار نەیفەرمووە: ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنًا ...٨٣ ﴾ البقرة.

واتە: (بە گوفتاری چاك‌و جوان، لەگەڵ خەڵكیدا بدوێن)..

جارێك لە جاران پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، لە یەكێك لە غەزاكان دەگەڕێنەوەو لە ناوچەیەك لادەدەن بۆ ئەوەی پشوویەك بدەن، هاوەڵان هەریەكەیان دەچنە ژێر دارێكەوەو خەویان لێدەكەوێت، پێغەمبەری ئازیزیشﷺ دەچێتە ژێر سێبەری دارێكەوەو شمشێرەكەی بە لقێك، لە لقەكانی دارەكەوە هەڵدەواسێت‌و دەخەوێت..

یەكێك لە بێباوەڕان، كاتێك دەبینێت پێغەمبەری خوداﷺ لە ژێر دارێكدا بە تەنها خەوی لێكەوتووە، ئەم هەلە دەقۆزێتەوەو زۆر بە ئارامی دەكەوێتە ڕێ‌و شمشێرەكەی پێغەمبەری خوداﷺ لە لقی دارەكە دەكاتەوەو بە دەنگێكی بەرز هاوار دەكات‌و دەڵێت: ئەی محمد كێ لە دەستی من دەتپارێزێت‌و ڕزگارت دەكات؟!

پێغەمبەری خوداﷺ خەبەری دەبێتەوەو دەبینێت پیاوێك بە شمشێرەكەیەوە بە سەر سەریەوە وەستاوەو پێغەمبەری خوداشﷺ بە تەنهایەو هاوەڵانی بڵاوەیان لێكردووە، پیاوەكەش لەوپەری بەهێزیدایەو هەر زوو زوو ئەم قسەیە دوبارە دەكاتەوەو دەڵێت: كێ لە من دەتپارێزێت‌و ڕزگارت دەكات؟!

پێغەمبەر ئازیزیشﷺ بەوپەڕی متمانەوە دەفەرموێت: اللە لە دەستی تۆ ڕزگارم دەكات‌و دەمپارێزێت..

پیاوەكە دەشڵەژێت‌و شمشێرەكەی لە دەست بەردەبێتەوە..

ئەمجارەیان پێغەمبەری خوداﷺ شمشێرەكەی هەڵدەگرێت‌و دەفەرموێت: ئەی تۆ كێ لە دەستی من دەتپارێزێت‌و ڕزگارت دەكات؟!

پیاوەكە ڕوخساری دەژاكێت‌و دەشڵەژێت‌و داوای بەزەیی لە پێغەمبەری خوداﷺ دەكات‌و دەڵێت: هیچ كەسێك لە دەستی تۆ ڕزگارم ناكات، لەگەڵم باشبە..

پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: موسڵمان دەبیت؟

پیاوەكە دەڵێت: نەخێر، بەڵام لەگەڵ هیچ هۆزو خەڵكانێكدا نابم، كە لە دژت بجەنگن..

پێغەمبەری خوداشﷺ لێی خۆش بوو..

ئەو پیاوە گەورەی هۆزەكەی بوو، كاتێك گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەكەی، بانگی كردن بۆ ئەوەی موسڵمان بن، هەموویان بە دەم داواكاریەكەیەوە هاتن‌و موسڵمان بوون..

بەڵێ.. لەگەڵ خەڵكیدا باش بە، دڵ‌و دەرونیان كەمەندكێش دەكەیت، ئەوەتا پێغەمبەری خوداﷺ، بە هەڵسوكەوتی جوان، ڕووبەڕووی دوژمنە سەرسەختەكانیشی بۆوەو توانی خۆی لە لایان شیرین‌و خۆشەویست بكات‌و ڕێگەی هیدایەتیان پیشان

بدات و لە بێباوەڕی ڕزگاریان بکات..

کاتێك بانگەوازی پێغەمبەری خوداﷺ لە ناو خەڵکیدا بڵاوبۆوە، قورەیش هەموو ڕێگەیەکیان لە دژی گرتە بەر.. هەموو بەربەستێکیان بۆ بەرپەچدانەوەی بانگەوازی ئیسلام بەکارهێنا، بەڵام بە پێچەوانەوە ڕۆژ بە ڕۆژ ئاینی ئیسلام پەرەی دەسەندو ژمارەی موسڵمانانیش زیادیان دەکرد.. هەر بۆیە زیرەکترین پیاوی قورەیشیان دیاری کرد بۆ ئەوەی بینێرن بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکات و لەگەڵیدا ڕێك بکەون.. بۆ ئەم مەبەستەش عوتبەی کوڕی ڕەبیعەیان دیاری کردو بە نوێنەرایەتی قورەیش ناردیان بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ ..

بەڵێ.. عوتبە بەرەو لای پێغەمبەری خوداﷺ کەوتە ڕێ و گەیشتە لای.. کاتێك گەیشتە لای پێغەمبەری خوداﷺ، بینی زۆر بە ئارامی دانیشتووە، پاشان پرسیاری کردو وتی: محمد تۆ باشتری یان عبداللەی باوکت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ وەکو ڕێزێك بۆ باوکی، بێدەنگ بوو..

پاشان وتی: ئەی تۆ باشتری یان عبدالمطلب ی باپیرەت؟!

بەهەمان شێوەی پێشوو پێغەمبەری خوداﷺ وەکو ڕێزێك بۆ باپیرەی بێدەنگ بوو..

پاشان عوتبە وتی: ئەگەر خۆت بە باشتر لەوان دەزانیت، قسە بکە با گوێمان لێبێت، ئەگەر ئەوانیش لە خۆت بە باشتر دەزانیت، خۆ ئەوان ئەو خودایەیان دەپەرست کە تۆ ڕەخنەی لێدەگریت و بە سوکی باسی دەکەیت؟!

پێش ئەوەی پێغەمبەری خوداﷺ وەڵام بداتەوە، عوتبە تورە دەبێت و دەڵێت: سوێند بە خودا هیچ شوومیەك بە وێنەی تۆ، تووشی هۆزەکەمان نەبووە!!

ناکۆکی و جیاوازیت لە نێوانمان دروست کرد.. کەم و کوڕی لە ئاینەکەمان دەگریت و بە سوکی باسی خوایەکانمان دەکەیت.. لە ناو عەرەبدا ئابرووت بردووین، هەتا وامان لێهاتووە بە شێوەیەك باس دەکرێین و پێمان دەڵێن: لە ناو قورەیشدا جادووگەر پەیدا بووە.. سوێند بە خودا چاوەڕێی ئەوە دەکەین، کە هەندێکمان شمشێر هەڵگرین و دوای یەك ببڕینەوە..

عوتبە ڕەنگ و ڕوخساری گۆڕا بوو.. زۆر تورە بوو، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ بەوپەڕی ئارامی و ڕێزەوە گوێی گرتبوو، پاشان عوتبە ویستی بە هۆی سەروەت و سامان و پلەو پایەوە، وا لە پێغەمبەری خوداﷺ بکات، واز لە بانگەوازەکەی بهێنێت و پێی وت: ئەی محمد ئەگەر مەبەستت دەستکەوتنی سەروەت و سامانە، ئەوا ئەوەندەت

ماڵو سامان بۆ کۆ دەکەینەوە، هەتا دەبیت بە دەوڵەمەندترین پیاوی قورەیش..

ئەگەر مەبەستت بە دەست هێنانی پلەو پایەو گەورەییە، ئەوا دەتکەین بە گەورەی خۆمان..

خۆ ئەگەر حەزیشت بە ئافرەتی جوانە، ئەوا هەر ئافرەتێك دەست نیشان دەکەیت، ئێمە دەیان ئافرەتت لێ مارە دەکەین..

ئەگەریش پەری‌و جنۆکە سەریان لێداویت‌و ناتوانیت لە خۆتیان دوور بخەیتەوە، ئەوا داوای باشترین پزیشك‌و دانات بۆ دەکەین‌و هەرچی سەروەت‌و سامانیشمان هەیە، لەو پێناوەدا بۆتی خەرج دەکەین، هەتا چاك دەبیتەوە..

عوتبە بەم شێوە ناشیرینە لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو.. کۆمەڵێك پەیمانی تەفرەدەری دا بە پێغەمبەری خودا ﷺ، لە بەرامبەریشدا پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر بە ئارامی‌و لە سەرخۆیی، گوێی گرت بوو..

بەڵێ.. قسەو پەیمانەکانی عوتبە لە موڵك‌و ماڵو سەروەت‌و سامان‌و ئافرەت‌و چارەسەری نەخۆشی، کۆتاییان هات..

ئەمجارەیان عوتبە بێدەنگ بوو.. چاوەڕێی وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ سەری بەرز کردەوەو سەیری عوتبەری کردو زۆر بە ئارامی پێی فەرموو: ئایا تەواو بوویت، ئەی باوکی وەلید؟

عوتبە چاوەڕێی ئەم ئاکارە جوانەی لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەکرد، هەر بۆیە زۆر بە کورتی وەڵامی دایەوەو وتی: بەڵێ..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: دەی گوێم لێ بگرە..

عوتبەش وتی: دەی..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی کرد بە قورئان خوێندن‌و فەرمووی: ﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾﴾ فصلت. واتە: بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان (هەر خودا خۆی زانایە بە نهێنی ئەو پیتانە ئەم قورئانە دابەزێنراوە لە لایەن پەروەردگاری خاوەن بەزەیی‌و میهرەبانەوە کتیبێکە, ئایەت‌و فەرمانەکانی بەش کراوەو جیاکراوەتەوە (ئیمان‌و کوفر، حەڵاڵ‌و حەرام، چاکەو خراپە..هتد)، قورئانێکە بە عەرەبیەکی ڕەوان بۆ کەسانێك کە دەیزانن‌و شارەزاییان هەیە (لە زمانەوانی‌و زانستەکان) هەر ئەم قورئانە مژدە بەخشە بە ئیمانداران، ترسێنەری کافرانە، کە چی

زۆربەی هاوەڵ دانەران پشتیان تێکردو بەرهەڵستیان کردو نابیستن)..

پێغەمبەری خوداﷺ لە سەر قورئان خوێندنەکەی بەردەوام بوو، عوتبەش کەوتە لەرزەو موچرکە بە لەشیدا دەهاتو دەچوو.. هەر دوو دەستی خستە پشتیەوەو پاڵی پێیانەوەداو گوێ بیستی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بوو.. پێغەمبەری خوداشﷺ هەر بەردەوام بوو، هەتا گەیشتە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ﴾ فصلت. واتە: (جا ئەگەر لەگەڵ ئەم هەموو باسی دەسەڵاتو توانایی‌و زانایيەی خودای گەورەدا پشتیان هەڵکردو گوێیان نەگرت، پێیان بڵێ: من ئاگادارتان دەکەم لەوەی کە شریخەو بروسکەو کارەساتێکتان بە سەر بێت، وەك ئەوەی بە سەر عادو سەمود هات)..

کاتێك عوتبە گوێی لەم ترساندنە قورئانیە بوو، ڕاپەڕی‌و بە پەلە دەستی خستە سەر دەمی پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ئەوەی لە قورئان خوێندنەکەی واز بهێنێت‌و بوەستێت، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ هەر بەردەوام بوو، هەتا گەیشتە ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە سوژدەی تێدایە، کە دەفەرموێت:﴿ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ ﴾ فصلت. واتە: (جا ئەگەر بێ بڕواکان خۆیان بە زل‌و گەورە بزانن، (ئەوە وازیان لێ بهێنە) چونکە ئەو فریشتانەی لە خزمەت پەروەردگاری تۆدان، شەوو ڕۆژ سەرگەرمی تەسبیحات‌و ستایشن، هەرگیز بێزاری ڕوویان تێناکات‌و خۆیان بە گەورە نازانن)..

پاشان سوژدەی بردو سەری بەرز کردەوەو سەیری عوتبەی کردو فەرمووی: گوێت لێ بوو، باوکی وەلید؟

عوتبە وتی: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەوە تۆو ئەویش ئەوەی کە گوێت لێ بوو..

عوتبە هەڵساو ڕۆیشتەوە بۆ لای هاوەڵەکانی، ئەوانیش زۆر بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێی عوتبەیان دەکرد.. کاتێك گەیشتەوە لایان، هەندێك لە هاوەڵانی سوێندیان بۆ هەندێکیان خوارد، کە ئەو ڕوخسارەی ئێستای عوتبە، زۆر جیاوازە لەو ڕوخسارەی پێش ڕۆیشتنەکەی!!

کاتێك لە لایان دانیشت، پێیان وت: هەواڵ چیە، ئەی باوکی وەلید؟

عوتبەش وتی: سوێند بە خودا گوێ بیستی وتەیەك بووم، هەرگیز شتی وام گوێ لێ نەبووە!! سوێند بە خودا ئەو وتەیەی من گوێ بیستی بووم، نەهۆنراوە بوو، نە

جادوو.. ئەی قورەیش بە گوێم بکەن‌و واز لەو پیاوەو ئەوەی پێیەتی بهێنن، سوێند بە خودا لەو وتانەی کە من گوێ بیستی بووم، هەواڵێکی زۆر گەورە هەیە، ئەی هۆزەکەم، ئەم وتانەم لە محمد بیست.. ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢﴾ فصلت هەتا گەیشتە ﴿فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةً مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ۝١٣﴾ فصلت. ئیتر دەستم خستە سەر دەمی، بۆ ئەوەی واز بهێنێت.. بە دڵنیاییشەوە ئێوە هەمووتان دەزانن، کاتێك محمد قسەیەك بکات درۆ ناکات، بۆیە ترسام سزاو نارەحەتیتان بۆ دابەزێت، پاشان عوتبە کەمێك بە بێدەنگی مایەوەو بیری دەکردەوە، دەوروبەرەکەشی هەموو سەیریان دەکردو چاویان تێبڕی بوو، پاشان وتی: سوێند بە خودا لە قسەکانیدا شیرینی‌و خۆشییەك هەبوو، شیرینییەکی لە ڕادەبەر.. وتە بەرزەکانی هاوشێوەی میوە بوون‌و بە سەر هەموو شتێکیشدا بەرز دەبێتەوەو هیچ شتێکیش ناتوانێت بە سەر ئەو قورئانەدا بەرز بێتەوەو هەر شتێکیش بەرەنگاری بێتەوە، تێکی دەشکێنێت.. قسەکانی قسەی مرۆڤ نەبوو!!

ئەوانیش وتیان: ئەی باوکی وەلید، ئەوەی تۆ دەیڵێیت هۆنراوەیە، هۆنراوە..

عوتبەش وتی: سوێند بە خودا هیچ پیاوێك هێندەی من شارەزای هۆنراوە نیە، بە دڵنیاییەوە ئەو قسانەی ئەو دەیکرد، هۆنراوە نەبوون‌و لە هۆنراوەش ناچوون.. بەردەوام عوتبە هۆزەکەی دەدواند، بۆ ئەوەی ڕازییان بکات، بەڵام بە داخەوە بە گوێیان نەکرد..

ڕاستە عوتبە موسڵمان نەبوو، بەڵام نەرم‌و نیانی‌و مەیلی بۆ لای ئیسلام هەبوو.. سەیر بکە، هەڵسوکەوتی جوانی پێغەمبەری خوداﷺ چۆن کاری کردە سەر عوتبە، هەر چەندە عوتبە لە گەورە بێباوەڕانی قورەیش بوو، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ چەند بە جوانی گوێی لە قسەکانی گرت‌و بۆ تەنها جارێکیش قسەکانی پێنەبڕی!!

ڕۆژێکی تر، بە هەمان شێوە قورەیش کۆبونەوەو حصینی خوزاعییان دیاری کرد، بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ بکات‌و بەر لە بانگەوازەکەی بگرێت.. ئەم پیاوە باوکی هاوەڵی بەڕێز عیمرانی کوڕی حصینرضي الله عنه بوو..

باوکی عیمران کەوتەڕێ‌و چوو بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوداﷺ لە ناو هاوەڵانیدا دانیشتبوو.. بە هەمان شێوەی پێشتری نوێنەرانی قورەیش، دەستی کرد بە قسەی ناخۆش‌و وتی: ناکۆکێت لە نێوانمان دروست کرد.. دووبەرەکیت خستە ناومان‌و.. هتد..

پێغەمبەری خوداشﷺ هەر بێدەنگ بوو، هەتا هەموو قسەکانی تەواو کرد، پاشان

زۆر بە ئارامی‌و بە جوانی پێی فەرموو: باوکی عیمران تەواو بوویت؟

ئەویش وتی: بەڵێ.. پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: دەی هەندێك پرسیارت لێدەکەم‌و وەڵامم بدەرەوە.. باوکی عیمران وتی: دەی گوێم لێیە..

پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری کردو فەرمووی: باوکی عیمران، ئەمڕۆ ئێوە چەند خودا دەپەرستن؟

باوکی عیمرانیش وتی: حەوت.. شەشیان لە زەوین‌و دانەیەکیان لە ئاسمان!!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: کامیان جێگەی هیواو ئومێدو ترسە؟!

باوکی عیمران وتی: ئەوەیان کە لە ئاسمانە..

پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر بە ئارامیەوە فەرمووی: ئەی باوکی عیمران ئەگەر موسڵمان بیت، دوو وشەت فێر دەکەم، کە سودت پێبگەیەنن.. باوکی عیمران یەکسەر لەوێ موسڵمان دەبێت‌و پاشان دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ئەو دوو وشەیەم فێر بکە، کە پەیمانت پێدام.. پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: بڵێ: «اللهم ألهمني رشدي، وأعذني من شرِّ نفسي».. واتە: (پەروەردگار بەرچاو ڕۆشن‌و پێشبینیم پێببەخشەو لە شەری دەرونیشم بمپارێزە)..

ئای بۆ ئەو هەڵسوکەوتە بەرزو جوانە!! بە ڕاستی ئەو شێوازە هەڵسوکەوتە زۆر سود بەخشە، بۆ بانگەواز کردنی بێباوەڕان‌و ڕاکێشانیان بەرەو خێرو چاکە..

گەنجێك بۆ خوێندن دەچێت بۆ وڵاتی ئەڵمانیاو لە شوقەیەکدا نیشتەجێ دەبێت.. گەنجێکی ئەڵمانی دراوسێی دەبێت، هەر چەندە جگە لە دراوسێیەتی هیچ پەیوەندیەکیان پێکەوە نابێت.. گەنجە ئەڵمانیەکە گەشتێکی کت‌وپڕی بۆ دروست دەبێت‌و دەڕوات، ئەم گەنجە بەشداری کرینی ڕۆژنامەیەکی کردووە، هەر بۆیە ئەو فەرمانبەرەی ڕۆژنامە دابەش دەکات، هەموو ڕۆژێك ڕۆژنامەی گەنجەکە لە بەردەم دەرگای ماڵیان دادەنێت.. گەنجە موسڵمانەکەش ئاگاداری کەڵەکە بوونی ڕۆژنامەکان دەبێت، لە بەردەم دەرگای دروسێ ئەڵمانیەکەی، پرسیار دەکات‌و بۆی دەردەکەوێت کە گەشتی کردووەو لە ماڵ نیە، هەر بۆیە هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی ڕۆژنامەکان‌و لە شوێنێکدا بۆی هەڵدەگرێت..

لە دوای دوو، یان سێ مانگ، کاتێك دراوسێ ئەڵمانیەکەی دێتەوە، بەخێرهاتنەوەی لێدەکات‌و پاشان ڕۆژنامەکانی دەداتێ‌و پێی دەڵێت: وتم لەوانیە لە ڕێی ئەم ڕۆژنامەیەوە بەشداری پێشبڕکێیەکت کرد بێت، یاخود بابەتێکی تایبەتی بخوێنیتەوەو مەبەستت بێت

لە دەستت دەرنەچێت، هەر بۆیە ویستم ڕۆژنامەکانت نەفەوتێت‌و بۆم هەڵگرتوویت..

گەنجە نەڵمانیەکە زۆر بە سەرسامیەوە سەیری ئەم گەنجە موسڵمانە دەکات‌و پێی دەڵێت: لە سەر ئەم کارەت هیچ پاداشت‌و کرێیەکت ناوێت؟

گەنجە موسڵمانەکەش دەڵێت: نەخێر، بەڵکو ئاینەکەمان فەرمانمان پێدەکات، لەگەڵ دراوسێدا باش بین، تۆش دراوسێیت‌و دەبێت هەڵسوکەوتم لەگەڵتدا جوان‌و باش بێت..

بەڵێ.. ئەم گەنجە موسڵمانە، لە سەر چاکەو هەڵسوکەوتی جوان بەردەوام دەبێت، لەگەڵ دراوسێ ئەڵمانیەکەیدا، هەتا ئەو گەنجە موسڵمان دەبێت..

بە ڕاستی ئەوە تام‌و چێژی ڕاستەقینەی ژیانە..

دەی هەست بکە، کە ژمارەیەکی لە لای ڕاستەوە، نەك سفری دوای فاریزە.. دەی با جێگەی دەستت دیار بێت لە کۆمەڵگەدا.. بە هەموو شێوازێك بەندایەتی بۆ پەروەردگارت ئەنجام بدە، تەنانەت بە ئاکارو ڕەفتارەکانیشت..

چەندان بێباوەڕ هەن بە هۆی هەڵسوکەوتی هەندێك بە ناو موسڵمانەوە، لە سەر بێباوەڕی خۆیان بەردەوام بوون‌و نەهاتوونەتە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە.. جا بە هۆی زوڵم‌و ستەمی ئەو بە ناو موسڵمانانەوە بێت، یان بەهۆی غەش‌و فێڵ‌و تەڵەکەوە بێت، یان بە هۆی ئازاردانی دراوسێیەتیەوە بێت، یان بە هۆی هەر هۆکارێکی ترەوە بوو بێت..

دەی با پەرەیەکی سپی هەڵبدەینەوەو سەر لە نوێ هەوڵ بدەین، بە ئاکارو ڕەفتاری جوان‌و گوفتاری شیرینمان بانگەوازی بێباوەڕان بکەین، بەرەو ئاینی پاك‌و بێگەردی ئیسلام..

**ڕۆشنایی..**

باشترین بانگخواز، ئەو بانگخوازمیە پێش ئەوەی بە گوفتارەکانی بانگی خەڵکی بکات، بە کردارەکانی بانگیان دەکات..

# لەگەڵ ئاژەڵانو بێ زمانانیشدا..

هەر کەسێك بەهرەو تواناکانی لە خێرو چاکەدا بەکاربهێنێت، ئەوا وای لێدێت هەڵسوکەوتی جوان تێکەڵ بە سروشتو خوێنی دەبێتو هەرگیز لێك جیانابنەوەو هەردەم بە شێوەیەکی نەرمونیانو بەسۆز دەیبینی، تەنانەت لەگەڵ باڵندەو ئاژەڵانو بێ زمانانیشدا..

جارێك پێغەمبەری خوداﷺ لە گەشتێکدا دەبێت، بۆ پێداویستیەکی خۆی کەمێك دوور دەکەوێتەوە، دەبینێت هاوەڵانی هەندێك بێچووە باڵندەیان گرتووە.. دایکی بێچووە باڵندەکانیش لەتاو بێچووەکانی، هەر بە دەوریاندا دێتو دەچێت، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئەمە دەبینێت، ئاوڕ بە لای هاوەڵانیدا دەداتەوەو دەفەرموێت: کێ بێچووی ئەم باڵندەیەی گرتووەو نارەحەتی کردووە؟! دەی با بەری بداتو بۆی بگێڕێتەوە..

ڕۆژێکی تر، پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك شارە مێرولەیەك بە سوتاوی دەبینێت، دەفەرموێت: کێ ئەم شارە مێرولەیەی سوتاندووە؟! هەندێك لە هاوەڵان فەرموویان: ئێمە.. پێغەمبەری خوداﷺ تووڕە بوو، پاشان فەرمووی: کەس بۆی نیە بە ئاگر سزاو ئازاری هیچ شتێك بدات، تەنها پەروەردگار نەبێت..

پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بە سۆزو میهرەبانە بووە، ئەوەتا ڕۆژێك خەریکی دەستنوێژ شۆرین دەبێت، پشیلەیەك دێت بۆ لای، پێغەمبەری خوداﷺ قاپی ئاوەکەی بۆ نزیك دەکاتەوەو پاشان بە پاشماوەی ئاوی دەمی پشیلەکە، دەستنوێژەکەی دەشۆرێت..

ڕۆژێکی تر پیاوێك دەبینێت، قاچی خست بووە سەر ملی مەڕێكو بە بەرچاوی مەڕەکەشەوە چەقۆکەی تیژ دەکرد، بۆ ئەوەی پێی سەرببڕێت، مەڕەکەش سەیری دەکرد.. پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك ئەم کارەی پیاوەکەی بینی، تووڕە بوو، پاشان فەرمووی: ئایا دەتەوێت دووجار بیکوژێت؟! نەدەکرا پێشتر چەقۆکەت تیژ بکردایە؟!

ڕۆژێکی تر پێغەمبەری خوداﷺ دوو پیاو دەبینێت لە سەر وشترەکانیان وەستاونو قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن.. کاتێك وشترەکانی بەم شێوەیە بینی، سۆزی بۆیان جوڵاو داوای لە پیاوەکان کرد، وشترەکانیان وەکو کورسی بەکارنەهێنن، چونکە ئاژەڵ بۆ

ئەوە دروست نەکراوەو دروست نیە سواری ئاژەڵ بین، تەنها بۆ کاتی پێویستی نەبێت، کاتێکیش پێویستیەکەمان تەواو بێت، دەبێت دابەزین بۆ ئەوەی ئەوانیش پشوویەك بدەن..

هەروەها پێغەمبەری خوداﷺ داوا لە ئیمانداران دەکات ڕوخساری ئاژەڵان بە ئاگر داخ نەکەنو ئازاریان نەدەن.. پێغەمبەری خوداﷺ وشترێکی هەبوو بە ناوی (عضباء)، کۆمەڵێك لە بێباوەڕان هەندێك لە وشتری موسڵمانەکانیان برد، کە لە دەوروبەری شاری مەدینە بوون، وشترەکەی پێغەمبەری خوداشﷺ لە ناو ئەو وشترانەدا بوو، لەگەڵ وشترەکاندا ئافرەتێکی موسڵمانیشیان دەستگیر کردو لەگەڵ خۆیان بردیان.. کاتێك لە مەترسی دوورکەوتنەوە، وشترەکانیان بەرەڵا کرد بۆ ئەوەی خواردن بخۆنو خۆشیان پشوویەك بدەنو بخەون.. لەم کاتەدا ئافرەتەکە هەڵدەستێت بۆ ئەوەی ڕا بکات، بۆ ئەم مەبەستەش دەیەوێت سواری یەکێك لە وشترەکان بێت، لە هەر یەکێکیان نزیك دەبێتەوە، دەنگێکی بەرزی لێ بەرز دەبێتەوە، ئەمیش لە ترسی ئەوەی پیاوەکان بەخەبەر نەیەن، وازیان لێ دێنێت، هەتا دەگاتە لای وشترەکەی پێغەمبەری خوداﷺ، لەبەر ئەوەی ئەم وشترەیان زۆر بێدەنگ دەبێت، ئافرەتەکە سواری دەبێتو بەرەو شاری مەدینە دەکەوێتە ڕێ..

کاتێك ئافرەتەکە هەست دەکات، لە مەترسی دوورکەوتۆتەوەو ڕزگاری بووە، دەڵێت: خودایە نەزر بێت ئەگەر ڕزگارم بێت، ئەم وشترە سەرببڕم.. ئافرەتەکە گەیشتەوە مەدینەو خەڵکەکە وشترەکەی پێغەمبەری خودایان ناسیەوە..

بەڵێ.. ئافرەتەکە بە وشترەکەوە بەرەو لای پێغەمبەری خوداﷺ کەوتە ڕێو داوای لە پێغەمبەری خوداﷺ کرد کە وشترەکەی بداتێ، بۆ ئەوەی سەری ببڕێو نەزرەکەی جێبەجێ بکات..

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: بە شێوەیەکی خراپ دەتەوێت پاداشتی وشترەکە بدەیتەوە؟! پەروەردگار بەهۆی ئەو وشترەوە ڕزگاری کردیت، تۆش دەتەوێت سەری ببڕیت؟! پاشان فەرمووی: پێویست نیە نەزرێك جێبەجێ بکرێت، کە سەرپێچی پەروەردگاری تێدا بێت، هەروەها پێویست ناکات نەزر لە سەر شتێك جێبەجێ بکرێت، کە موڵکی ئەو کەسە نەبێت..

دەی بۆچی هەڵسوکەوتو ئاکارو ڕەفتارەکانت ناگۆڕیت، بۆ کۆمەڵە هەڵسوکەوتو

ئاکارو رەفتارێکی زۆر جوان؟! بە شێوەیەك ئەو هەڵسوکەوتە جوانانە بە تەواوی لەگەڵ سروشتو ناخو دەروونتدا تێکەڵ بنو هەرگیز لێت جیا نەبنەوەو لەگەڵ خەڵکیو تەنانەت لەگەڵ ئاژەڵانو بێ زمانانو دارو درەختیشدا هەوڵ بدەیت بەکاریان بهێنیت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ رۆژانی هەینی کاتێك وتاری دەدا، پاڵی بە کۆڵەکەیەکی دارخورمای مزگەوتەکەیەوە دەدا.. ئافرەتێکی خەڵکی شاری مەدینە بە پێغەمبەری خوداﷺ دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ کورێکم هەیە دارتاشە، بۆ پێی نەڵێم: شتێکت لە شێوەی دوانگەیەکدا بۆ دروست بکات، بۆ ئەوەی لە کاتی وتاری هەینیدا لە سەری بوەستیت؟ پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەی ئەگەر حەز دەکەیت، با دروستی بکات..

بەڵێ.. دوانگەکەیان بۆ دروست کردو رۆژی هەینی پێغەمبەری خوداﷺ سەرکەوتە سەر دوانگەکە بۆ ئەوەی وتاری هەینی پێشکەش بکات.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ چووە سەر دوانگەکە، کۆڵەکەی دار خورماکە هاوارێکی لە شێوەی دەنگی جوانەگایەکدا لێبەرزبۆوەو دەستی کرد بە ناڵە ناڵو تەنانەت مزگەوتەکەش کەوتە لەرزە!!

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گوێی لە دەنگی کۆڵەکەی دار خورماکە بوو، دابەزیو باوەشی پێداکردو بە خۆیەوە گوشیو بەرەبەرە وەکو منداڵێك چۆن ژێر دەبێتەوە، ئاوا ناڵە ناڵەکەی بێدەنگ بوو، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: «أما والذي نفس محمد بيده، لو لم ألتزمه لما زال هكذا إلى يوم القيامة». رواه مسلم وأحمد. واتە: (سوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر باوەشم پێدا نەکردایە، هەتا رۆژی دوایی لە ناڵە ناڵ نەدەکەوتو بێدەنگ نەدەبوو)..

**ئاماژەیەك..**

پەروەردگار رێزی لە مرۆڤ گرتووە، بەڵام ئەمە دەرگای ئەوە بە رووی مرۆڤەکاندا واڵا ناکات، کە سوکایەتی بە دروست کراوەکانی تر بکەنو بیان چەوسێننەوە..

## ١٠٠ ڕێگە بۆ بەدەست هێنانی دڵو دەروونی خەڵکی..

هەموو کەسێك بۆ بە دەست هێنانی ئەو شتانەی کە دەیەوێت، هونەرو لێزانینی تایبەت بە خۆی هەیە.. ئەو کەسەی عاشقو شەیدای بە دەست هێنانی سەروەتو سامانە، هونەرو زیرەکی بەکاردەهێنێت، بۆ کۆکردنەوەو بەگەڕخستنو زیادکردنی سەروەتو سامانەکەی، هەروەها هەوڵ دەدات زیاتر ڕێگەو هۆکارەکانی شارەزا بوونی قازانجو بازرگانی فێر بێت..

بە هەمان شێوە کەناڵە ئاسمانیەکان، چەندان ڕێگە بەکاردەهێنن بۆ ڕاکێشانی بینەران، ئەمەش بە بەکارهێنانی بەرنامەی هەمە چەشنەو ڕێگەو شێوازی جۆراو جۆر، هەروەها لە ڕێگەی ڕاهێنانی پێشکەشکارانی بەرنامەکانەوە، بۆ ئەوەی بتوانن زیاتر سەرنجی بینەران ڕابکێشن..

بە هەمان شێوە بوارەکانی تری ڕاگەیاندنە نوسراوو بیستراوەکانی تریش، هەوڵ دەدەن سەرنجی زۆرترین خوێنەرو بیسەر بە لای خۆیاندا ڕابکێشن..

هەروەها فرۆشیارەکانیش، هەوڵ دەدەن گەرمو گوڕییەك بە بازاڕی شتومەکەکانیان بدەن، جا لە ڕێگەی حەڵاڵو ڕێگەپێدراوەکانەوە بێت، یان لە ڕێگە حەرامو قەدەغە کراوەکانەوە..

هەموو ئەمانەی باسمان کردن، بۆ بەدی هێنانی ئاواتەکانیان، هەوڵ دەدەن هونەرو لێزانینی بەهێزو کاریگەرتر بەکاربهێنن..

بە دەست هێنانی دڵو دەروونی خەڵکیش هونەرێکە، هۆکارو ڕێگەی تایبەت بە خۆی هەیە.. دەچینە کۆڕو دانیشتنێکەوە، کە نزیکەی چل کەسی تێدایەو لێیان دەچیتە پێشەوەو چاكو چۆنیو تەوقەیان لەگەڵ دەکەیت.. کاتێك تەوقە لەگەڵ کەسی یەکەمدا دەکەیت، بەشێك لە دەستیت بۆ درێژ دەکاتو زۆر بە ساردیەوە چاكو چۆنیت لەگەڵ دەکات..

کەسی دووەم کاتێك دەستی بۆ درێژ دەکەیت، بۆ ئەوەی تەوقەی لەگەڵ بکەیت، سەرقاڵی قسەو باسی لا بە لایەو ئەمیش زۆر بە ساردیەوە چاكو چۆنیت لەگەڵ دەکاتو بە بێ ئەوەی سەرنجێکت بداتیو سەیرێکت بکات، تەوقەت لەگەڵ دەکات..

کەسی سێیەمیش سەرقاڵەو بە مۆبایلەکەی خەریکی قسەکردنەو دەستیت بۆ درێژ دەکات، بۆ ئەوەی تەوقەت لەگەڵ بکات، بە بێ ئەوەی بە یەك وشەش بەخێرهاتنت بکات..

بەڵام کەسی چوارەم، کاتێك دەتبینێت هەڵدەستێتو بەرەو پیریت دێتو ئامادەی بەخێرهاتنت دەبێت، کاتێك چاوت بە چاوی دەکەوێت ڕوخساری دەگەشێتەوەو زەردەخەنە دەکەوێتە سەر لێویو بە بینینت زۆر خۆشحاڵ دەبێتو زۆر بە گەرمو گوڕیەوە چاكو چۆنیت لەگەڵ دەکاتو لە کاتی تەوقە کردنیشدا دەستت دەگوشێت.. ئەمە لە کاتێکدا نەدەیناسیتو نەدەتناسێت!!

دوای ئەوەی چاكو چۆنیت لەگەڵ هەمووان کردو دانیشتیت، توخوا هەست ناکەیت دڵت بەرەو لای کەسی چوارەم لێدەدات؟!

بەڵێ.. بە دڵنیاییەوە، ئەو کەسە لە دڵو دەروونتدا جێگەی خۆی کردۆتەوە، بە بێ ئەوەی بیناسیو ناشزانی ناوی چیەو چ پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتیشی هەیە!! لەگەڵ ئەوەشدا لە یەکەم یەکتر بینیندا، توانی دڵت کەمەندکێش بکات.. ئەمەش نە بە هۆی ماڵو سامانەکەیەوەو نە بە هۆی پلەو پایەو نە بە هۆی ناوو ناوبانگەکەیەوە بووە، بەڵکو بە هۆی هونەری هەڵسوکەوتە جوانەکانیەوە، توانی سەرنجی تۆ بۆ لای خۆی ڕابکێشێت..

کەواتە دڵو دەروونی هیچ کەسێك، بە هۆی پارەو سەروەتو سامانو جوانیو پلەو پایەوە، بە دەست نایەت، بەڵکو زۆر بە ئاسانیو بە کەمتر لەم شتانە بە دەست دێت، لەگەڵ ئەمەشدا خەڵکانێکی زۆر کەم دەتوانن سود لە تواناکانیان ببینن‌و خۆیان لە لای خەڵکی شیرین بکەن..

لە بیرمە یەکێك لە قوتابیەکانم، کە لە کۆلێژ دەیخوێند، توشی نەخۆشییەکی دەروونی هاتبوو.. باوکی ئەم قوتابیە ئەفسەرو پایەدار بوو.. چەند جارێك هات بۆ لام بۆ کۆلێژ، بۆ ئەوەی لە چارەسەری کورەکەیدا هاوکاری بکەم..

منیش چووم بۆ ماڵیان، بینیم خاوەن کۆشكو تەلارێکی ناوازە بوون.. کۆڕو دانیشتنی باوکیشی، لێوان لێو بوو لە میوان، جێگەیەکی چۆڵت نەدەبینی.. بە ڕاستی سەرسام بووم بەوەی، کە خەڵکی تا ئەو ئەندازەیە ئەم پیاوەیان خۆش دەوێتو ڕێزی دەگرن!!

چەند ساڵێك تێپەڕیو باوکی قوتابیەکەم خانەنشین کرا.. جارێکی تر سەردانم کردنو چوومە ژوورەوە، بۆ ناو کۆشكو تەلارەکەیان، بینیم دیوەخانەکەیان زیاتر لە پەنجا کورسی تێدایە، بەڵام بە داخەوە تەنها کەسێکی لێبوو، ئەویش سەیری

بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی دەکرد، لەگەڵ خزمەتگوزارێك کە چاو قاوەی دەهێنا.. کەمێك دانیشتم‌و هەستام‌و ڕۆیشتم..

بیرم لەو کاتەی دەکردەوە، کە خانەنشین نەکرا بوو.. ئەو کاتەی کە خاوەن پلەو پایەیەکی بەرز بوو.. ئێستاش دەبینم دیوەخانەکەی چۆڵ‌و هۆڵە!! لە ڕابوردوودا چی ئەو خەڵکەی لەوماڵەدا کۆکردبۆوە؟! هەستم بەوە کرد، ئەو پیاوە بە هۆی ڕەوشت‌و هەڵسوکەوتی جوانیەوە، نەیتوانیبوو خەڵکی لە دەوروبەری خۆی کۆ بکاتەوە، بەڵکو ئەو خەڵکەی بە هۆی پلەو پایەکەیەوە، لە دەوری خۆی کۆکردبۆوە، کاتێکیش خانەنشین کراو پلەو پایەکەی نەما، خۆشەویستی‌و فەرمبالغیەکەش نەما!!

دەی تۆی بەرێز، پەندو ئامۆژگاری لە ژیانی ئەو پیاوە وەربگرەو بە شێوەیەك لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوت بکە، کە خەڵکی لە بەر کەسایەتیت خۆشیان بوێت‌و حەز بکەن گوێیان لە وتە بە نرخەکانت بێت، حەز بکەن هەردەم ڕوخسارە پاکەکەت ببینن‌و ئامادەی کۆڕو کۆبوونەوەو دانیشتنەکانت بن.. حەز بکەن هەڵەکانیان بۆ ڕاست بکەیتەوەو بەشداری غەم‌و نارەحەتیەکانیان بیت..

نەکەی وا لە خۆت بکەیت، خەڵکی بە هۆی گیرفان‌و کورسیەکەتەوە خۆشیان بوێت، نەکەی وایان لێبکەیت دڵیان وا بەستەی گیرفان‌و کورسیەکەت بن، چونکە کورسی وگیرفان هەتا سەر بەردەوام نابن..

ئەو کەسەی هەموو پێداویستیەکانی خواردن‌و خواردنەوە بۆ ژن‌و منداڵەکانی دابین دەکات، بەڵام ناتوانێت دڵ‌و هەست‌و سۆزیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، بە داخەوە ئەوا تەنها توانیوویەتی سکیان بە دەست بهێنێت!! ئەو کەسەی کە پارەو پوڵ بۆ ماڵ‌و منداڵی هەڵدەرێژێت، بەڵام هەڵسوکەوتی لەگەڵیان خراپە، ئەوا تەنها دەتوانێت هەست‌و سۆزیان بۆلای گیرفانەکانی ڕابکێشێت، نەك بۆ لای دڵ‌و دەروونی..

لەبەر ئەوە بە لاتەوە سەیر نەبێت، کاتێك گەنجێك دەبینیت سکاڵاو کێشەی خۆی لە لای هاورێیەکی، یان لە لای مامۆستاکەی، یان لە لای پێشنوێژی مزگەوتەکەیان باس دەکات‌و لە لای باوکی قسە ناکات‌و دەیشارێتەوە، بۆچی؟!

لەبەر ئەوەی باوکی نەیتوانیووە دڵی کوڕەکەی بە دەست بهێنێت‌و دیوارەکانی نێوان خۆی‌و کوڕەکەی بروخێنێت.. بەڵام ئەوان توانیوویانە دەرگای دڵی ئەو گەنجە بە ڕووی خۆیاندا ئاوەڵا بکەن، بەڵکو جاری وا هەیە دوژمنێکی سەرسەخت، دەتوانێت دڵی بەرامبەرەکەی بە دەست بهێنێت‌و سەرنجی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت!!

ئایا تێبینی ئەوەت نەکردووە، جاری وا هەیە کەسێك دێتە کۆڕو دانیشتنێکی قەرەباڵغەوەو سەیری ئەملاو ئەولای دەکات، بۆ ئەوەی جێگەیەکی دەست بکەوێت‌و لێی دابنیشێت، کاتێك ئامادەبووان دەیبینن هەموویان پێشبڕکێ دەکەن بۆ ئەوەی لە تەنیشت خۆیانەوە، جێگەی بۆ بکەنەوەو لە لایانەوە دانیشێت!! بۆچی؟!

ئایا هەرگیز بۆ ئێوارە خوانێك بانگ نەکراویت، کە شێوازی ئێوارە خوانەکە بە شێوەی بۆفییەی کراوە بوو بێت، بە شێوەیەك کە هەر کەسەو خۆی خواردنی خۆی تێدەکات‌و جێگەیەك بۆ خۆی دەدۆزێتەوەو دادەنیشێت.. ئایا نەت بینیووە کەسانێك، کاتێك خواردنەکەیان تێدەکەن‌و ئاوڕ دەدەنەوە، چەندان کەس بانگیان دەکەن‌و بە دەستەکانیان ئاماژەیان بۆ دەکەن، کە جێگەی بەتاڵیان لە تەنیشتەوەیە، بۆ ئەوەی بێن‌و لەگەڵیان دابنیشن.. لە هەمان کاتدا کەسانێك دەبینیت، خواردنەکەیان بە دەستەوەیەو سەیری ئەملاو ئەولای خۆیان دەکەن، کەچی کەسێك بانگیان ناکات، بۆ ئەوەی جێگەیەکی چۆڵیان نیشان بدەن!!

بۆچی خەڵکەکە تامەزرۆن بۆ کەسانی یەکەم، وەك لە کەسانی دووەم؟!

ئایا هەست ناکەیت کەسانێك هەن لە هەر کوێ بن، وەکو ئەوەی موگناتیسیان بە دەستەوە بێت، دڵەکان بەرەو لای خۆیان بە کێش دەکەن؟!

سەیرە!! ئەو کەسانە چۆن دەتوانن دڵی ئەو هەموو کەسە بە لای خۆیاندا پەلکێش بکەن؟!

بە دڵنیاییەوە کۆمەڵێك ڕێگەو هۆکاری زیرەکانە هەیە، کە دەتوانرێت دڵ‌و دەروونی خەڵکی پێ ڕاو بکرێت..

**بڕیار..**

تواناکانمان بۆ بەندکردنی دڵ‌و دەروونی خەڵکی‌و بە دەست هێنانی خۆشەویستییان، بوارێکی گەورەمان پێدەبەخشن، بۆ ئەوەی زیاتر هەست بە خۆشییەکانی ژیان بکەین..

## نیەتت تەنها بۆ خودای پەروەردگار بێت..

بیرم لە هەڵسوکەوتی هەندێك لە خەڵکی دەکردەوە، کە چەندان ساڵ ژیانم لەگەڵ بەسەر بردبوون، لەو ماوەیەدا بۆ تەنها جارێکیش زەردەخەنەیەکم بە روخساریانەوە نەبینی، جارێك نەمبینین پێبکەنن و تێکەڵییەك لەگەڵ ئەو کەسانەدا دروست بکەن، کە قسەیان بۆ دەکردن..

گومانم وا بوو ئەم جۆرە کەسانە بەو شێوە گەورە بوون و ناگۆڕێن.. بەڵام لە پڕ بە شێوەیەکی زۆر جیاواز لە هەندێك شوێنی دیاری کراوو تایبەت دەمبینین، لەگەڵ کەسانێکی دەوڵەمەندو خاوەن پلەو پایەدا، زۆر بە باشی پێدەکەنین و رووشیان خۆش بوو!! هەستم کردو بۆم دەرکەوت ئەم کارانەیان تەنها بۆ مەبەستی بەرژەوندی تایبەتی خۆیانە، بەمەش خێرو پاداشتێکی زۆر گەورەیان لە دەست خۆیان دەدا!!

لەبەر ئەوەی موسڵمانی راستەقینە بە کردارو هەڵسوکەوتی جوانی خوداپەرستی ئەنجام دەدات و کارەکانیشی تەنها لەبەر خاتری پەروەردگاریەتی، نەك لە پێناوی بە دەست هێنانی ماڵ و سەروەت و سامان و پلەو پایەو لەبەر ئەوەی خەڵکی ستایش و سوپاسی بکەن، هەروەها بە شێوەیەك هەڵسوکەوت ناکات، لەبەر ئەوەی ئافرەتێکی پێبدەن،یان لەبەر ئەوەی قازانجێکی دونیایی بە دەست بهێنێت..

نەخێر.. موسڵمانی راستەقینە، کارەکانی لە پێناوی ئەوەدا ئەنجام دەدات، کە لە لای پەروەردگاری خۆشەویست بێت و پاشان پەروەردگار لە لای دروست کراوەکانیشی خۆشەویستی بکات..

بەڵێ.. هەر کەسێك هەڵسوکەوتی جوان، بە خوداپەرستی بزانێت، ئەوا بە جوانترین شێوە هەڵسوکەوت لەگەڵ هەژارو دەوڵەمەند..هەروەها لەگەڵ کارگوزارو بەڕێوەبەردا ئەنجام دەدات..

ئایا کاتێك بە کارگوزارێك دەگەیت، کە خەریکی گسکدانی شەقامەکانەو

دەستی درێژ دەکات، بۆ ئەوەی تەوقەت لەگەڵ بکات، لە لای تۆ وەکو ئەوە وایە کە ڕۆژێکی تر بەرپرسێکی گەورە دەستی درێژ بکات، بۆ ئەوەی تەوقەت لەگەڵ بکات؟! ئایا هەردووکیان لە لای تۆ یەکسانن؟! بە هەمان شێوەو ڕوخسار، ڕووبەڕوویان دەبیتەوە؟! ئایا خەندەو ڕووخۆشیت، بۆ هەردووکیان وەك یەکە؟!

نازانم، وایت یان نا!! بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ هەر دوو جۆرە کەسەکەی لە لا یەکسان بوو.. کاتێك ئامۆژگاری خەڵکی بکردایە، کاتێك سۆزو خۆشەویستی دەربڕیبایە، خەڵکی لەلا یەکسان بوو.. کێ دەزانێ، لەوانەیە ئەو کەسەی کە کەشخەیی بە سەردا دەکەیتو لە بەرامبەریدا خۆت بە گەورە دەزانی، لە لای پەروەردگار گەورەترو بەڕێزتر بێت، لە پڕاوپڕی زەوی لەو کەسەی کە تۆ ڕێزی دەگریتو گرنگی پێدەدەیت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: «إن من أحبكم إلي وأقربكم مني مجلساً يوم القيامة، أحاسنكم أخلاقاً».رواه الترمذي. واتە: (خۆشەویست ترین کەستان لە لای منو نزیکترینتان لە منەوە لە ڕۆژی دواییدا، ڕەوشت بەرزترینتانە)..

هەروەها بە ئەشجەعی کوڕی عبدقیس دەفەرموێت: «إن فيك لخصلتين، يحبهما الله ورسوله». واتە: (دوو ڕەوشت لە تۆدا هەیە خوداو پێغەمبەر، ئەو دوو ڕەوشتەیان خۆش دەوێت)..

دەبێت ئەو دوو ڕەوشتە چی بن؟! دەبێت شەونوێژو ڕۆژوو بن؟! ئەشجەع دڵی خۆش بوو، ڕوخساری گەشایەوەو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو دوو ڕەوشتە چین؟! پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: «الحلم والأناة». رواه أحمد ومسلم. واتە: (هێمنیو لەسەرخۆیی)..

هەروەها پرسیار لە پێغەمبەری خوداﷺ کرا چ کارێك زۆر چاكو جوانە؟ پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: «البر حسن الخلق». رواه مسلم. واتە: (کاری زۆر چاكو جوان، بریتیە لە ڕەوشتو هەڵسوکەوتی جوان)..

هەروەها پرسیاری لێکرا، دەربارەی زۆرترینی ئەو کەسانەی کە دەچنە بەهەشت؟ پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: «تقوى الله وحسن الخلق». رواه الترمذي. واتە: (زۆرترینی ئەو کەسانەی کە دەچنە بەهەشت، بریتین لەو

کەسانەی زۆر پارێزکارن‌و لە پەروەردگار دەترسن‌و ئەو کەسانەی کە ڕەوشت‌و ڕەفتاریان جوانە)..

هەروەها پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: «اكمل المؤمنين إيماناً احاسنهم اخلاقا الموطؤون أكنافاً الذين يألفون ويؤلفون، ولاخير فيمن لايألف ولايؤلف». رواه الترمذي. واتە: (تەواوترینی باوەڕداران، ئەو باوەڕدارانەن کە هەڵسوکەوت‌و ڕەفتاریان زۆر جوانە، ئەو کەسانەی کە خەڵکیان خۆش دەوێت‌و خەڵکیش ئەمانی خۆش دەوێت، ئەو کەسانە بێ خێرن کە خەڵکیان خۆش ناوێت‌و خەڵکیش ئەوانی خۆش ناوێت‌و لەگەڵ خەڵکیدا هەڵناکەن)..

هەروەها دەفەرموێت: «ماشيء اثقل في الميزان من حسن الخلق». رواه ابوداود. واتە: (هیچ شتێك لە تەرازووی پەروەردگاردا، بە هاوشێوەی ڕەوشت جوانی، قورس‌و سەنگین نیە)..

هەروەها دەفەرموێت: «إن الرجل ليبلغ بحسن الخلق درجة قائم الليل وصائم النهار». رواه الترمذي. واتە: (مرۆڤ بە هۆی هەڵسوکەوتی جوان‌و ڕەوشتی بەرزەوە، پلەی دەگات بە پلەی کەسێك کە بە شەو، شەونوێژ بکات‌و بە ڕۆژیش بەڕۆژوو بێت)..

هەر کەسێك خاوەنی هەڵسوکەوتی جوان‌و ڕەوشتی بەرز بێت، دونیاو دوارۆژ بە دەست دەهێنێت‌و براوە دەبێت.. ئەگەر دەتەوێت بە تەواوی بۆت ڕوون بێتەوە، ئەوا سەیری ئوم سەلەمەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) بکە، کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ دانیشتووەو بیری ڕۆژی دوایی دەکاتەوەو پرسیار لە پێغەمبەری خوداﷺ دەکات‌و دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەگەر ئافرەتێك لە دونیادا دوو شووی کرد بێت‌و دوو هاوسەری هەبوو بێت، پاشان ژنەکەش‌و هەر دوو هاوسەرەکەشی بمرن‌و هەرسێکیشیان پەروەردگار بەهەشتیان پێببەخشێت، ئایا ئەو ئافرەتە بۆ کام هاوسەریان دەبێت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بۆ ئەوەیان دەبێت، کە باڵای بەرزترە؟! یان فەرمووی: بۆ ئەوەیان دەبێت، کە زیاتر بە ڕۆژوو بووە؟! یان فەرمووی: بۆ ئەوەیان دەبێت، کە زیرەك‌و زاناترە؟!

نەخێر.. بەڵکو فەرمووی: دەبێت بە هاوسەری ئەوەیان، کە ڕەوشت‌و

هەڵسوکەوتی جوانتر بووە.. ئوم سەلەمە سەری سوڕما کاتێك گوێی لەم قسەیەی پێغەمبەری خوداﷺ بوو، هەر بۆیە کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئوم سەلەمەی بەم شێوەیە بینی، فەرمووی: ئەی ئوم سەلەمە، کەسی ڕەوشت بەرز، خێرو چاکەو پاداشتی دونیاو دوارۆژیشی بۆ خۆی بردووە..

بەڵێ.. کەسی ڕەوشت بەرز، خێرو خۆشی دونیاو دوارۆژی دەستگیر دەبێت.. لە دونیادا لە لای خەڵکی خۆشەویست دەبێت، لە ڕۆژی دواییشدا پاداشتێکی زۆر گەورە بە دەست دەهێنێت..

مرۆڤ هەر چەندێك کاری خێرو چاکە ئەنجام بدات، ئەگەر ڕەوشتو ڕەفتاری خراپو ناشیرین بێت، ئەوا کارە چاکەکانیشی خراپو بێ خێر دەبێت..

بە پێغەمبەری خودایانﷺ فەرموو: فلانە ئافرەت نوێژەکانی بە باشی ئەنجام دەداتو بە ڕۆژوو دەبێتو خێرو خێراتیش دەکات، بەڵام بە قسەو باس دراوسێکانی ئازار دەداتو هەڵسوکەوتی لەگەڵیاندا باش نیە..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەو ئافرەتە دۆزەخیە..

پێغەمبەری پێشەواﷺ لە هەموو کردەوەیەکی چاکدا پێشڕەو بووە.. بەڕێزترینو ئازاترینو لەسەرخۆترین مرۆڤ بووە.. لە کچە عازەبێك بە ڕێزو بە حەیاو شەرمنتر بووە.. ڕاستگۆو دەستپاك بووە.. بێباوەڕانو خراپەکاران، لە پێش باوەڕدارانو چاکەکارانەوە، شایەدییان بۆ ڕەوشتە جوانەکانی داوە..

ئەوەتا خەدیجەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) لە سەرەتای دابەزینی سروشدا، کاتێك دەبینێت پێغەمبەری خوداﷺ ڕەنگی گۆڕاوە، دەفەرموێت: سوێند بە خودا هەرگیز پەروەردگار سەرشۆڕو سوكو ڕیسوات ناکات.. بۆچی؟!

پاشان فەرمووی: لەبەر ئەوەی تۆ ماڤی خزمایەتی دەدەیتو سەردانیان دەکەیتو ڕێز لە میوان دەگریتو یارمەتی لێقەوماوو بێنەوایان دەدەیت، هەروەها یارمەتی هەموو ئەو کەسانە دەدەیت، کە نوێنەرایەتی حەقو ڕاستی دەکەنو ڕاستگۆیتو سپاردە دەپارێزی..

تەنانەت پەروەردگار وەسفو سەنای پێغەمبەری ئازیزیﷺ لە قورئانەکەیدا تۆمار کردووەو هەتا ڕۆژی دواییش دەخوێندرێتەوە، هەروەك دەفەرموێت:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم. واتە: ( بە ڕاستی تۆ لە سەر ڕەوشتو خوویەکی زۆر جوانو پەسەندو بێ وێنەو مەزنیت)..

پێغەمبەری ئازیزﷺ ڕەوشتو ئاکارەکانی قورئانی بوون.. کاتێك ئەم ئایەتەی دەخوێند﴿ وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ ﴾ البقرة. واتە: (هەمیشە خێرو چاکە ئەنجام بدەنو چاکە خواز بنو (ماڵو سامانتان لە پێناوی خوادا ببەخشن) چونکە بە ڕاستی خودا ئەو چاکەکارانەی خۆش دەوێت).. چاکەی دەکردو چاکتر دەبوو..

بەڵێ، لەگەڵ گەورەو بچوکدا، لەگەڵ دەوڵەمەندو هەژاردا، لەگەڵ بەهێزو لاوازدا چاکەی دەکرد.. کاتێك گوێی لەم ئایەتە دەبوو، کە دەفەرموێت: ﴿ فَٱعْفُواْ وَٱصْفَحُواْ ...... ﴿١٠٩﴾ ﴾ البقرة. واتە: (ئێوە هەر لێیان ببورنو لێیان مەگرنو چاوپۆشییان لێ بکەن).. لێبوردەو لێخۆشبوو دەبوو.. هەروەها کاتێك ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە، کە دەفەرموێت: ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا ...... ﴿٨٣﴾ ﴾ البقرة. واتە: (گوفتاری چاكو جوان بە خەڵکی بڵێن).. ئەوا بە جوانترین شێوە قسەی لەگەڵ خەڵکیدا دەکردو دەیدواندن..

دەی مادام ئەو پێغەمبەرە ئازیزەﷺ پێشەوامانەو پەیامو بەرنامەکەشی پەیامو بەرنامەمانە، لە ژیانو هەڵسوکەوتەکانی وردبەرەوەو بزانە لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوتی چۆن بووە.. چۆن چارەسەری هەڵەو کەموکورتیەکانی خەڵکی کردووە؟! چۆن لە سەر ئازارو نارەحەتیەکانیان ئارامی گرتووە؟! چۆن توانیوویەتی لە پێناو ئاسودەیی خەڵکیدا، شەکەتو ماندوێتی بچێژێت؟! چۆن توانیویەتی لە بانگەوازکردنیاندا، خۆڕاگر بێت؟!

ڕۆژێك هەوڵیداوە پێویستی هەژارێك جێبەجێ بکات.. ڕۆژێك ناکۆکی نێوان ئیمانداران چارەسەر کردووە.. ڕۆژێك بانگەوازی بێباوەڕانی کردووە، بۆ ئەوەی لە تاریکی نەفامیەوە، بەرەو ڕوناکی ئیمان ڕێنمایان بکات، هەتا ئەو کاتەی چووە تەمەنەوەو ئێسقانەکانی لاواز بوون، هەر وەك عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ چووە تەمەنەوە، زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە ئەنجام دەدا.. بۆچی؟! لەبەر ئەوەی خەڵکی ماندوویان کردو ئازاریانداو تێکیان شکاند.. بەڵێ، تێکیان

شکاند!!

وإذا كانت النفوس كباراً تعبت في مرادها الأجسادُ

بەڵێ.. ئەگەر کەسێك هیواو ئاواتی بەرزی هەبێت، دەبێت جەستەی ئامادە بێت، بۆ هەڵگرتنی ئێش و ئازارو نارەحەتیەکان..

پێغەمبەری خوداﷺ ئەوەندە سور بوو، لە سەر ڕەوشت و ئاکاری جوان، لە پەروەردگار دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: «اللهم كما احسنت خلقي، فأحسن خلقي». رواه احمد. واتە: (پەروەردگار هەر وەك چۆن بە جوانی دروستت کردووم، ئاواش ڕەوشت و ڕەفتارم جوان بکە)..

هەروەها دەیفەرموو: «اللهم اهدني لأحسن الأخلاق، لايهدي لأحسنها إلا انت، واصرف عني سيئها، لايصرف عني سيئها إلا انت». رواه مسلم. واتە: (پەروەردگار ڕێنماییم بکە بۆ جوانترین ڕەوشت و ڕەفتار، هیچ ڕێنماییکارێکیش نیە بۆ ڕەوشتە جوانەکان تۆ نەبێت، لە ڕەوشتە خراپەکانیش دوورم بخەرەوەو لام بدە، کەسیش ناتوانێت لە ڕەوشتە خراپەکان لام بدات، تۆ نەبێت)..

بەڵێ.. ئێمە هەمووومان زۆر پێویستمان بەوە هەیە، شوێن پێی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەﷺ بکەوین، بۆ ئەوەی بەهۆی شوێن کەوتنی هەڵسوکەوتەکانیەوە دڵی موسڵمانان بۆ لای خۆمان ڕابکێشین و بانگیان بکەین بۆ لای ئاکارە جوانەکان، هەروەها بۆ ئەوەی ڕاستی ئەم ئیسلامە نیشانی بێباوەڕان بدەین و وایان لێبکەین بەرەو ڕوناکی باوەڕ هەنگاو بنێن..

**ئاماژە..**

با نیەتت پاکو چاك بێت، بۆ ئەوەی تواناکانی هەڵسوکەوتت لەگەڵ خەڵکیدا، ببێتە مایەی خوداپەرستی و نزیك بوونەوەت لە پەروەردگار..

# وتەو هەڵسوکەوتی گونجاو بەکاربهێنە..!!

سروشتی خەڵکی بە شێوەیەکە، هاوڕان لەوەی هەموویان، هەندێك شتیان خۆش دەوێت و پێی دڵخۆش دەبن.. هەروەها هاوڕان لەوەی هەموویان ڕقیان لە هەندێك شتەو پێی دڵتەنگ دەبن.. بەڵام لە هەندێك شتدا ڕاجیاوازن، کەسانێك هەن، هەندێك شتیان خۆش دەوێت و کەسانێکی تر هەن ڕقیان لە هەمان ئەو شتانەیە..

خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی ڕووخۆشی و زەردەخەنەیان خۆش دەوێت و ڕقیان لە گرژی و دڵتەنگی و غەمبارییە، لە لایەکی ترەوە هەندێك کەس هەن حەزیان لە گەمەو گاڵتەو گەپ و قسەی خۆشە، بە پێچەوانەوە هەندێك کەس حەزی پێناکەن.. کەسانێك هەن حەزیان لەوەیە خەڵك سەردانیان بکات و ئەمیش بچێت بۆ لای خەڵك و کەسانێکیش هەن بە پێچەوانەوە.. کەسانێکی تر هەن حەزیان لە گفتوگۆو قسەی زۆرە، هەشیانە زۆر کەم حەز بە قسە دەکەن.. هەر یەکێکیش لەمانەی باسمان کرد، ئاسودەیە بەو کەسانەی کە سروشتیان وەك هاوشێوەی ئەم وایە..

دەڵێن پیاوێك هەڵۆیەك دەبینێت، لەگەڵ قەلەڕەشێکدا بەیەکەوە بە ئاسماندا دەفڕن..

پیاوەکە سەرسام دەبێت!! چۆن دەبێت پادشای باڵندەکان لەگەڵ قەلەڕەشدا بفڕێت؟! هەر بۆیە گومانی وابوو، کە دەبێت خاڵێکی هاوبەش لە نێوانیاندا هەبێت، بە چاوەکانی چاودێری دەکردن، هەتا ماندوو بوون و نیشتنەوە، بینی هەردووکیان قاچیان شەلە!!

کاتێك کوڕێك هەست دەکات باوکی حەزی بە بێدەنگییەو ڕقی لە قسەکردنی زۆرە، با بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات، کە پێی خۆشە، بۆ ئەوەی لە لای باوکی خۆشەویست بێت و حەز بکات هەموو کات کوڕەکەی لێی نزیك بێت..

هەروەها کاتێك ئافرەتێك هەست دەکات، هاوسەرەکەی حەزی بە گاڵتەو گەپە، با گاڵتەو گەپی لەگەڵ بکات و دڵی خۆش بکات، ئەگەر زانی پێچەوانەی ئەم حاڵەتەی پێخۆشەو ڕقی لە گاڵتەو یارییە، دەی با دووربکەوێتەوە لەو کارانەو کێشە دروست نەکات..

بە هەمان شێوە هەڵسوکەوت لەگەڵ دۆست و برادەران و دراوسێکانتدا بکە، هەرگیز

وا هەست ناکەیت، خەڵکی هەموو خاوەن یەك جۆرە هەستو سۆزن.. نەخێر، خەڵکی هەموو وەك یەك نینو بەیەك جۆریش بیرناکەنەوە..

دایکی یەکێك لە هاوڕێکانم، کە ئافرەتێکی چاکەخوازی بە تەمەنە، زۆر ستایشی یەکێك لە کورەکانی دەکردو کاتێك ئەو کورەی سەردانی دەکرد، زۆر ئاسودەو خۆشحاڵ دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کوڕو کچەکانی تری زۆر لەگەڵیدا باش بوون، کە چی هەر دڵی بەو کورەی دەکرایەوەو بە بینینی دەگەشایەوە..

بە دوای ئەم نهێنیەدا گەڕامو ویستم بزانم بۆچی ئەم کوڕەیانی زۆر خۆش دەوێت، هەتا ئەوە بوو ڕۆژێك لەگەڵ ئەو برادەرەمدا دانیشتمو دەربارەی ئەو باسە پرسیارم لێکرد.. هاوڕێکەم لە وەڵامدا پێی وتم: کێشەکە ئەوەیە براکانم نازانن دایکم چ جۆرە هەڵسوکەوتو قسەو باسێکی پێخۆشە، هەر بۆیە کۆڕو دانیشتنی ئەوانی پێخۆش نیەو بەزوویی لێیان بێزار دەبێت..

بە پێکەنینەوە پێم وت: ئەی تۆ بۆت دەرکەوتو زانیت، کە دایکت چ جۆرە قسەو دەنگو باسێکی پێخۆشە؟!

بە پێکەنینەوە وتی: لە نهێنیەکە ئاگادارت دەکەم، دایکم وەکو هەر پیرێژنێکی تر، حەزی بە قسەو گفتوگۆی بابەتی ئافرەتانە، وەك ئەوەی کێ شوی کردو کێ تەڵاقدراو فڵانە ئافرەت چەند منداڵی هەیەو گەورەکەیان کامەیەو کەی فڵانە کەس فڵانە کەس مارە دەکاتو ئەی فڵانە کەس یەکەم منداڵی ناوی چیەو ...هتد.. من دەزانم ئەم قسانە بێ سوودن، بەڵام دوبارە کردنەوەی ئەم هەواڵانە، ئاسودەییو خۆشی بە دایکم دەبەخشن.. دایکم هەست بە گرنگی ئەو بابەتانە دەکات، کە خۆی باسیان لێوە دەکات، لەبەر ئەوەی ئێمە ئەو بابەتانەمان بەر چاو ناکەوێتو لە هیچ پەڕاوێکدا نایان خوێنینەوەو لە هیچ کاسێتێکیشدا، گوێ بیستی نابینو بە هیچ شێوەیەکیش لە تۆڕی ئینتەرنێتیشدا بەر چاومان ناکەون!!

هەر بۆیە کاتێك لەگەڵ دایکمدا دادەنیشتمو ئەو باسو خواسانە دەجوڵێنم، دایکم خۆشحاڵ دەبێت، بەڵام براکانم حەوسەڵەی گوێگرتنی ئەو جۆرە قسەو باسانەیان نیەو سەرقاڵی هەندێك هەواڵو قسەو گفتوگۆن، کە بە لای دایکمەوە بێ بایەخن، هەر لەبەر ئەوەیە دایکم حەز بە دانیشتنیان ناکاتو بە من دڵخۆشە!! ئەمە هەموو ئەو نهێنیە بوو کە دەتویست لە بارەی دایکمەوە بیزانیت..

بەڵێ.. کاتێك لە سروشتی کەسێك شارەزا دەبیتو دەزانیت چی پێخۆشەو چی

پێناخۆشە، دەتوانیت بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەیت، کە پێی دڵخۆش دەبێت..

ئەوەتا پێغەمبەری خوداﷺ بە پێی سروشتی کەسەکان هەڵسوکەوتی دەکرد، لەگەڵ هاوسەرێکیدا بە شێوەیەك هەڵسوکەوتی دەکرد، کە لەگەڵ سروشتی ئەو هاوسەرەیدا گونجاوو لەبار بووایە..

عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) ئافرەتێکی کراوە بوو، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ یاری‌و گاڵتەی لەگەڵ کردووە، جارێك بەیەکەوە لەگەڵ کاروانی موسڵماناندا لە گەشتێکدا دەبن، کاتێك کاروانەکە لە شاری مەدینە نزیك دەبێتەوە، پێغەمبەری خوداﷺ بە خەڵکەکە دەفەرموێت: ئێوە لە پێشمانەوە بڕۆن.. کاتێك خەڵکەکە دەڕۆن، پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ عائیشەدا (خودای لێ ڕازی بێت) بە تەنها دەمێننەوە.. عائیشەش (خودای لێ ڕازی بێت) لەوکاتەدا گەنج بوومو لەشیشی سووك بووە.. پێغەمبەری خوداﷺ بانگی دەکات‌و پێی دەفەرموێت: وەرە با پێشبڕکێت لەگەڵ بکەم.. پێشبڕکێ دەکەن‌و پێش پێغەمبەری خوداﷺ دەداتەوە..

پاش ماوەیەکی تر، لە گەشتێکی تردا بەیەکەوە دەبن‌و عائیشەش (خودای لێ ڕازی بێت) تەمەنی زیادی کرد بوو، هەروەها قەڵەویش ببوو.. پێغەمبەری خوداﷺ بە هەمان شێوەی پێشوو، بە خەڵکەکەی فەرموو: ئێوە پێش بکەون‌و بڕۆن، پاشان بە عائیشەی فەرموو: وەرە با پێشبڕکێت لەگەڵ بکەم.. ئەمجارەیان پێغەمبەری خوداﷺ پێشکەوت، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئەمەی بینی، دەستیدا بە نێوان هەر دوو شانیداو فەرمووی: ئەمەیان لە باتی جارەکەی پێشوو، وەك ئەوەی بفەرموێت: ئەم بردنەوەیە، لە بری دۆڕاندنەکەی پێشوو..

بەڵام هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەدیجەی دایکی ئیمانداراندا بە شێوازێکی تر بوو، لەبەر ئەوەی خەدیجە (خودای لێ ڕازی بێت) بیست‌و پێنج ساڵ لە پێغەمبەری خوداﷺ بە تەمەنتر بوو..

بە هەمان شێوە ڕەچاوی حاڵەتی هاوەڵەکانیشی دەکرد، بە هەمان شێوەی ئیمامی ئەبوبەکرڕضي الله عنه هەڵسوکەوتی لەگەڵ طلحەدا ڕضي الله عنه نەدەکرد، هەروەها هەڵسوکەوتی تایبەتی لەگەڵ ئیمامی عومەرداڕضي الله عنه دەکردو هەندێك کاری دەدایە پاڵ‌و لە هەندێك شتدا پشتی پێدەبەست، کە لەگەڵ کەسی تردا وای نەدەکرد..

پێغەمبەری خوداﷺ لە جەنگی بەدردا، کاتێك هەواڵی پێگەیشت بێباوەڕانی

قورەیش، بە زۆر هەندێك لە خەڵكییان هێناوە بۆ جەنگ لە دژی موسڵمانان، فەرمووی: بە دڵنیاییەوە من دەزانم هەندێك لە پیاوانی بەنی هاشمو كەسانێكی تریش بە زۆر هێنراون بۆ جەنگو هیچ پێویستیشیان بە كوشتاری ئێمە نیە، هەر كەسێك لە ئێوە بە كەسێك لە بەنی هاشم گەیشت، با نەیكوژێت.. هەر كەسێكیش بە عەباسی مامی پێغەمبەری خوداﷺ گەیشت، با نەیكوژێت، لەبەر ئەوەی بە زۆر هێناویانە..

وتراویشە عەباس‌‌ﷺ موسڵمان ببوو، بەڵام ئاشكرای نەكرد بوو، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ حەزی نەدەكرد موسڵمانان بیكوژنو حەزیشی نەدەكرد موسڵمان بوونەكەی ئاشكرا بكات، جەنگەكەش یەكەم جەنگی نێوان موسڵمانانو بێباوەڕان بوو، لەمەودوا موسڵمانان دەبووایە كەسانی نزیكو باوكو ڕۆڵەی خۆیان بكوشتایە، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ ڕێگری دەكات لەوەی كە هەندێك كەس كوشتاریان بكرێتو بكوژرێن..

عوتبەی كوڕی ڕەبیعە، یەكێك بوو لە گەورە بێباوەڕانو سەركردەكانی جەنگ، ئەبو حوزەیفەی كوڕیشی لە ڕیزی موسڵماناندا بوو، هەر بۆیە ئەم هاوەڵە ئارامی نەگرتو وتی: ئایا كوشتاری باوكو ڕۆڵەو براكانی خۆمان بكەینو واز لە عەباس بهێنین؟! سوێند بە خودا، ئەگەر پێی بگەم بە شمشێر دایدەگرمەوە..

ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوداﷺ.. پێغەمبەری خوداﷺ ئاوڕی بە دەوروبەری خۆیدا دایەوە، بینی زیاد لە سێ سەد پاڵەوان بە دەوریەوەن.. یەكسەر ڕووی كردە ئیمامی عومەر‌‌ﷺ و فەرمووی: ئەی باوكی حفص، ئایا دەبێت بە شمشێر لە ڕوخساری مامەی پێغەمبەری خودا بدرێت؟!

ئیمامی عومەر‌‌ﷺ دەفەرموێت: سوێند بە خودا ئەوە یەكەم جار بوو، پێغەمبەری خوداﷺ بە نازناوی باوكی حفص بانگم بكات.. ئیمامی عومەر‌‌ﷺ دەیزانی لە گۆڕەپانی جەنگدا، هیچ بوارێك نیە بۆ ئەوەی ئاسانكاری لەگەڵ كەسێكدا بكرێت، كە لە فەرمانی فەرماندە لابداتو بیەوێت فەرمانەكانی جەنگ بشكێنێت، هەر بۆیە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ڕێگەم پێبدەو وازم لێبێنە، بۆ ئەوەی بە شمشێر لە گەردنی بدەم..

پێغەمبەری خوداﷺ ڕێگری كردو نەیهێشت ئیمامی عومەر‌‌ﷺ كاری وا بكات، هەروەها هەستی كرد، ئەو هەڕەشەیەی ئیمامی عومەر‌‌ﷺ بەسە بۆ ئاسایی كردنەوەی ئەو حاڵەتە..

ئەبو حوزەیفە‌‌ﷺ پیاوێكی چاكەكار بوو، لە دوای ئەو ڕووداوە دەفەرمووێت: هەرگیز لەو قسەیەم دڵنیا نیم، كە لەو ڕۆژەدا كردمو بەردەوام دەترسم، مەگەر پەروەردگار

بە هۆی شەهیدیەوە لێم خۆش بێتو ئەو گوناهەم بسڕێتەوە، ئەوە بوو لە ڕۆژی یەمامەدا، پەروەردگار پلەی بەرزی شەهیدی پێبەخشی..

ئەوە ئیمامی عومەرﷺ بوو، پێغەمبەری خوداﷺ دەیزانی، چ کارێکی پێ دەسپێرێت.. ئەو کارەی پێی سپاردو پرسی پێکرد، بریتی نەبوو لە کاروباری تایبەت بە کۆکردنەوەی زەکاتو خێرو خێرات.. هەروەها کارەکە تایبەت نەبوو بە ڕێکخستنەوەی دوو کەسی ناکۆكو ناتەبا، یاخود ڕاینەسپارد بۆ ئەوەی نەزانێك فێر بکات، بەڵکو کارەکە پەیوەندی هەبوو بە گۆڕەپانی جەنگەوەو هەڵوێستی پیاوێکی ئازاو بە جەرگی دەویست، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ ئیمامی عومەریﷺ هەڵبژاردو پرسی پێکردو فەرمووی: ئایا دەبێت بە شمشێر لە ڕوخساری مامی پێغەمبەری خودا بدرێت؟!

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ نەخۆش کەوتو کۆچی دوایی نزیك بۆوەو ئازارەکانی زیادیان کرد، ئیتر نەیدەتوانی پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بکات، لە سەر جێگەکەیەوە فەرمووی: بە ئەبوبەکر بڵێن: با پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات..

ئەبوبەکرﷺ پیاوێکی دڵ ناسك بوو.. لە ژیانی دونیاو لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوداشﷺ هەر هاوەڵی پێغەمبەری خوداﷺ بوو.. هەروەها لە پێش هاتنی ئیسلامو لە دوای هاتنی ئیسلامیش، هەر هاوەڵو خۆشەویستی یەکتر بوون..

هەروەها ئەبوبەکرﷺ باوکی عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوداشﷺ بوو.. لەبەر ئەم هۆکارانە، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ نەخۆشیەکەی تینی بۆ هێنا، ئیمامی ئەبوبەکرﷺ هێندەی کێوێك غەمو خەفەت ڕوویان تێکردو دڵو دەروونیان داگیر کرد..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانیدا بەوەی، کە با ئەبوبەکرﷺ پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات، هەندێك لە ئامادەبووان، بە پێغەمبەری خودایانﷺ فەرموو: ئەبوبەکرﷺ پیاوێکی دڵ نەرمو دڵ ناسکەو لەبەر گریان ناتوانێت لە جێگەی تۆ، پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات، بە تایبەت لەم کاتەدا کە نەخۆشیت!!

پێغەمبەری ئازیزﷺ دەیویست ئاماژە بەوە بکات، کە دوای خۆی، ئەبوبەکرﷺ شایستەیە کە ببێت بە جێنشینی، دوبارە فەرمووی: بڕۆن بە ئەبوبەکر بڵێن: با پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات..

ئەبوبەکر هەر چەندە خاوەن هەستو سۆزێکی ناسك بوو، بەڵام بەهێزو بە تواناش بوو، کاتێك هاوەڵان دەیانویست جێنشینێك بۆ پێغەمبەری خوداﷺ دابنێن، ئیمامی

عومەرﷺ دەفەرمویێت: چووین بۆ سەقیفەی بەنی ساعیدە، بۆ ئەوەی لە سەر جێنشینێك ڕێك بکەوین.. هاوەڵان لە کۆچکەران و پشتیوانان، هەموو کۆبوونەوە.. کاتێك دانیشتین یەکێك لە پشتیوانان وتارێکی خوێندەوە، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو پاشان وتی: ئێمە پشتیوانانی خوداین.. هەروەها سوپای ئیسلامین.. ئێوەش ئەی کۆچکەران بەشێکن لە ئێمەو دەتانەوێت ئەو کاری جێنشینەمان لێ قۆرخ و زەوت بکەن؟!

کاتێك قسەکەری پشتیوانان بێدەنگ بوو، ویستم قسە بکەم و هەندێك قسەم لە دڵی خۆمدا ڕێك خست، کە جێگەی سەرسوڕمانی خۆم بوو، دەمویست لەبەردەم ئیمامی ئەبوبەکرداﷺ قسەکانم پێشکەش بکەم.. لە قسەکانیشمدا ڕەچاوی هەندێك قسەی توندو تیژم کرد بوو.. ئیمامی ئەبوبەکرﷺ فەرمووی: عومەر لە سەرخۆبە.. منیش پێم ناخۆش بوو لێی تورە بم و وەڵامی بدەمەوە..

بەڵێ.. ئیمامی ئەبوبەکرﷺ دەستی بە وتارەکەی کردو زۆر لە من زاناو بە تواناتر بوو.. سوێند بە خودا هەر وشەیەکم ئامادە کرد بوو، ئیمامی ئەبوبەکرﷺ هاوشێوەی ئەوەی من، یان جوانتر لە وشەکانی منی باس کرد، پاشان فەرمووی: ئەی پشتیوانان ئەوەی باستان کرد لە خێرو چاکە ماڤی خۆتانە، بەڵام کاری جێنشینی بۆ قورەیش دەبێت، من لەم دوو پیاوە ڕازیم و کامیانتان دەوێت، بەیعەت بەوەیان بدەن..

ئیمامی عومەرﷺ دەفەرمویێت: دەستی من و دەستی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی گرت.. هیچ قسەیەکیم پێناخۆش نەبوو، تەنها ئەم قسەیەی نەبێت کە منی دیاری کرد، بۆ ئەوەی لەگەل ئەبو عوبەیدەدا، یەکێکمان ببین بە جێنشینی پێغەمبەری خوداﷺ.. سوێند بە خودا حەز دەکەم لە گەردنم بدرێت، بەڵام نەبم بە جێنشین و فەرمانڕەوای کەسانێك کە ئیمامی ئەبوبەکریان لە ناودا بێت..

خەڵکەکە هەموو بێدەنگ بوون، پاشان یەکێك لە پشتیوانان وتی: با ئەمیرێك لە ئێمەو ئەمیرێك لە قورەیش هەڵبژێرین.. ئیمامی عومەرﷺ دەفەرمویێت: دەنگە دەنگ و ژاوەژاو دروست بوو، هەتا وای لێهات خەریك بوو ناکۆکی دروست ببێت، هەر بۆیە وتم: ئەبوبەکر دەستتم بدەرێ، دەستی بۆ درێژ کردم و بەیعەتم پێدا، پاشان کۆچکەران بەیعەت و پەیمانیان پێدا، پاشان پشتیوانانیش بەیعەتیان پێدا..

بەڵێ.. هەموو کەسێك کلیلێکی هەیە، دەتوانیت بەو کلیلە دەرگاکانی دڵی بکەیتەوەو خۆتی لە لا خۆشەویست بکەیت و دڵ و دەروونی بە دەست بهێنیت.. ئایا هیچ ڕۆژێك گوێت لە هاوکارەکانی کارت نەبووە، بڵێن: فڵانە کەس کلیلی بەڕێوەبەرەو ئەگەر

کارێکتان بە بەڕێوەبەر هەبوو، بە فلانە کەس بڵێن، با پێی بڵێت، چونکە دەتوانێت ڕازی بکات؟!

دەی بۆچی بەهرەو تواناکانت ناکەیت بە کۆمەڵە کلیلێك، بۆ کردنەوەی دەرگاکانی دڵی خەڵکی؟! دەی پێشڕەو بە، نەك پاشکۆ.. هەوڵ بدە کەسێکی ناوازە بیت‌و بگەڕێ بە دوای کلیلەکانی دڵی دایك‌و باوك‌و هاوسەرو منداڵەکانتدا.. هەوڵ بدە بە دوای کلیلی کردنەوەی دڵی بەڕێوەبەری کارەکەت‌و هاوڕێکانتدا بگەڕێیت.. ناسین‌و دۆزینەوەی ئەو کلیلانە، سود بەخش دەبن بۆ ئەوەی بتوانین ئامۆژگاری خەڵکی بکەین‌و گوێمان لێبگرن، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە هەموویان، هاوشێوەی یەك نین لە وەرگرتنی ئامۆژگاریەکانمان..

سەیری پێغەمبەری خوداﷺ بکە، کاتێك لە ناو مزگەوتدا، لەگەڵ هاوەڵانیدا دانیشتووەو پیاوێك دێتە ناو مزگەوتەکەوەو سەیری لای ڕاست‌و چەپی خۆی دەکات، لە باتی ئەوەی بچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو هاوەڵانی دابنیشێت، دەچێتە گۆشەیەك لە گۆشەکانی مزگەوتەکەو دەست دەکات بە میز کردن!!

هاوەڵان سەرسام‌و تورە بوون!! میز کردن لە مزگەوتدا؟! چۆن دەبێت؟! خەریك بوو بە باز هەڵدان بەرەو ڕووی بچن!! بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ هاوەڵانی ئارام کردەوەو فەرمووی: پەلەی لێ مەکەن‌و میزەکەی پێ مەبڕن.. هاوەڵان هەموو ڕوویان تێکردو پیاوەکەش بەردەوام خەریکی میز کردن بوو!!

پێغەمبەری خوداﷺ سەیری ئەم دیمەنەی دەکرد.. لە مزگەوتە پیرۆزەکەیدا میز دەکرێت، کە چی هاوەڵەکانی هێمن دەکاتەوە!! ئای لەو نەرم‌و نیانیە!!

بەڵێ.. پیاوەکە لە میز کردن بۆوەو پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بە نەرمی بانگی کردو کاتێك پیاوەکە هاتە بەردەم پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرموو: ئێرە مزگەوتەو مزگەوتیش بۆ ئەوە دروست نەکراوە، بەڵکو بۆ ئەوە دروست کراوە، کە نوێژی تێدا بکرێت‌و قورئانی تێدا بخوێنرێت..

کێشەکە کۆتایی هات‌و زۆر بە کورتی ئامۆژگاری کرد، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ نوێژی دابەست‌و پێشنوێژی بۆ موسڵمانان کرد، دەستی بە قورئان خوێندن کردو پاشان کڕنوشی برد، کاتێك لە کڕنوش بەرز بۆوە، فەرمووی: سمع الله لمن حمده.. نوێژخوێنەکانیش وتیان: ربنا ولك الحمد، تەنها پیاوەکە نەبێت لە دوای ئەوەی وتی: ربنا ولك الحمد، وتی: خودایە تەنها ڕەحم بە من‌و محمد بکەیت‌و بەس!! پێغەمبەری

خوداﷺ گوێی لەم پاڕانەوەو دوعایە بوو، کاتێك لە نوێژەکەی سلاوی دایەوە، فەرمووی: ئەوە کێ بوو ئەو قسەیەی کرد؟!

هاوەڵانیش ئاماژەیان بۆ پیاوەکە کرد.. پێغەمبەری خوداﷺ بانگی کردو بینی هەمان ئەو ئەو پیاوە دەشتەکیەی پێشووە، کە میزەکەی کرد، ئەوەندە خۆشەویستی پێغەمبەی خوداﷺ چوو بووە دڵیەوە، حەزی دەکرد ڕەحمو بەزەیی خودای گەورە، تەنها هەردووکیان بگرێتەوە.. کاتێك هاتە بەردەم پێغەمبەری خوداﷺ، پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرموو: فراوانیەکی گەورەت تەسك کردەوە!! ڕەحمو بەزەیی پەروەردگار ئەوەندە فراوانە، هەمووومان دەگرێتەوە، بەڵکو هەموو خەڵکی دەگرێتەوە، تەنها لە سەر خۆمو خۆت کورتو تەسکی مەکەرەوە..

سەیر بکە پێغەمبەری خوداﷺ چۆن دڵی ئەو پیاوەی بە دەست هێنا؟! لەبەر ئەوەی دەیزانی بە چ شێوەیەك هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات.. ئەو پیاوە، کەسێکی دەشتەکی بوو، وەکو ئەبوبەکرو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) زانستو زانیاری نەبوو..

معاویەی کوری حەکەمﷺ هاوەڵێکی دەشتەکی بوو.. هەرگیز لە شاری مەدینەو لە کۆڕو دانیشتنی پێغەمبەری خواداﷺ دانەنیشتبوو، بەڵکو لە بیاباندا خەریکی بەخێوکردنی مەڕومالات بوو..

ڕۆژێك معاویەﷺ دێت بۆ شاری مەدینەو دەچێتە ژوورەوەی مزگەوتەکەی پێغەمبەی خوداﷺو لە لای پێەمبەری خوداﷺو هاوەڵانی دادەنیشێت، گوێی لە پیاوێك دەبێت دەپژمێتو دەڵێت: الحمدلله، ئەوانیش پێی دەڵێن: یرحمك الله.. معاویەﷺ ئەم قسانە لەبەر دەکاتو پاشان دەڕوا، پاش چەند ڕۆژێك بۆ پێویستییەکی خۆی دێت بۆ شاری مەدینەو دەچێتە ژوورەوە بۆ مزگەوتو دەبینێت پێغەمبەری خوداﷺ لە نوێژدایەو پێشنوێژی بۆ موسڵمانان دەکات، ئەمیش دەچێتە ڕیزی نوێژ خوێنانەوە، لە کاتی نوێژەکەدا گوێی لە پژمەی یەکێك لە نوێژخوێنان دەبێت.. معاویە بیری دەکەوێتەوە، کە ئەگەر کەسێك بپژمێت دوای ئەوەی کە دەڵێت: الحمدلله، دەبێت پێی بڵێیت: یرحمك الله.. هەر بۆیە معاویەﷺ زۆر بە پەلەو بێ ئەوەی گوێی لە الحمدللەی ئەو کەسە بێت کە دەپژمێت، یەکسەر بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکاتو دەڵێت: یرحمك الله.. نوێژ خوێنان شڵەژانێکیان تێدەکەوێتو بە سەرسوڕمانەوە ئاوڕی بۆ دەدەنەوە.. (ئەم ڕووداوە لە کاتێکدا بووە، کە ئاوڕدانەوە لە نوێژدا ڕێگە پێدراو بووە).. کاتێك معاویەﷺ نوێژخوێنان بەم شێوە سەرسامیە دەبینێت، ئەمجارەشیان

قسە دەكات‌و دەڵێت: دایكتان ڕۆڵە ڕۆتان بۆ بكات، ئەوە بۆ بەم شێوەیە سەیرم دەكەن؟!
نوێژخوێنانیش بە دەستەكانیان بە ئەژنۆیاندا دەكێشا، بۆ ئەوەی بێدەنگ بێت‌و قسەی تر نەكات، كاتێك بینی خەڵكەكە هەموو بێدەنگن، ئەمیش بێدەنگ بوو.. (دیارە ئەم پیاوە كاتێك فێری نوێژكردن بووە، هێشتا قسەكردن لە نوێژدا قەدەغە نەكراوە)..

كاتێك نوێژ كۆتایی هات، پێغەمبەری خوداﷺ ئاوڕی بە لای خەڵكەكەدا دایەوە، دەنگی ئەو كەسەی كە لە نوێژەكەدا قسەی كرد، لە لا نامۆ بوو، هەر بۆیە پرسیاری كردو فەرمووی: ئەوە كێ بوو قسەی كرد؟!

ئاماژەیان كرد بۆ معاویەﷺ، پێغەمبەری خوداﷺ بانگی معاویەی كرد، معاویەش بە ترس‌و لەرزەوە هاتە پێشەوەو نەیدەزانی پێغەمبەری خوداﷺ چۆن پێشوازی لێدەكات‌و چی لەگەڵ دەكات؟! لەبەر ئەوەی ئەم بووە هۆی ئەوەی نوێژخوێنەكان سەرقاڵ بكات..

معاویەﷺ دەفەرموێت: بە دایك‌و باوكمەوە بە قوربانی پێغەمبەری خوداﷺ بم، سوێند بە خودا نە لەوەو پێش‌و نە دواتر، هەرگیز هیچ مامۆستایەكی باشترم لە پێغەمبەری خوداﷺ نەبینیووە، كە ئەوەندە بە جوانی خەڵكی فێر بكات.. سوێند بە خودا نە لێیدام‌و نە تووڕەی كردم‌و نە قسەیەكی ناخۆشیشی پێ وتم، بەڵكو فەرمووی: ئەی معاویە: ئەمە نوێژەو نوێژیش نابێت قسەی تێكەڵ بكرێت، بەڵكو نوێژ بریتیە لە خوێندنی قورئان‌و وتنی سبحان الله‌و الله أكبر..

كێشەكە كۆتایی هات‌و پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بە كورتی ئامۆژگاری معاویەی كرد..

بەڵێ.. معاویە لە نوێژ تێگەیشت‌و دڵ‌و دەروونی ئاسودە بوو، پاشان دەستی كرد بە پرسیار كردن لە پێغەمبەری خوداﷺ و وتی: پیاوانێك لە ناوماندا هەن، بانگەشەی ئەوە دەكەن كە غەیب‌و نادیارەكان دەزانن.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرموی: مەچۆ بۆ لایان، تۆ موسڵمانیت.. تەنها خودای پەروەردگار غەیب‌و نادیارەكان دەزانێت..

پاشان معاویەﷺ پرسیاری كردو وتی: پیاوانێكی ترمان لە ناودا هەن، بانگەشەی ئەوە دەكەن كە بە هۆی باڵندەوە، شومی‌و ڕووداوە خراپەكان دیاری دەكەن.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەوەی ئەوان دەیڵێن: هیچ كاریگەریەكی خراپ‌و باشی نابێت..

ئەوە هەڵسوكەوتی پێغەمبەی ئازیزەﷺ لەگەڵ پیاوێكدا كە لە مزگەوتەكەیدا میز دەكات!! ئەوەش هەڵسوكەوتێتی لەگەڵ پیاوێكدا كە لە نوێژدا قسە دەكات!! پێغەمبەری

خودا ﷺ ڕەچاوی حاڵەتی ئەم دوو پیاوەی دەکرد و دەیزانی پێویستە چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێت، بەڵام بە شێوازێکی زۆر جیاواز هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەڵەی مەعازی کوڕی جەبەلدا کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە هاوەڵە نزیکەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو، هەروەها لە بە دەست هێنانی زانیاریشدا زۆر سوور بوو..

ئەم هاوەڵە خۆشەویستەی پێغەمبەری خودا ﷺ ، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژی عیشا دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی و لە مزگەوتەکەیاندا پێشنوێژی عیشایان بۆ دەکات، کە ئەم نوێژە بۆ ئەم سوننەت بوو، بەڵام بۆ هۆزەکەی فەرزی نوێژی عیشا بوو..

شەوێک مەعاز رضي الله عنه دەگەڕێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی و پێشنوێژیان بۆ دەکات.. گەنجێکیش لە هۆزەکەی دێتە ڕیزی نوێژخوێنانەوە، مەعاز رضي الله عنه لە دوای سورەتی (الفاتحة) دەست دەکات بە خوێندنی سورەتی (البقرة).. خەڵکیش لەو کاتەدا بە هۆی ئیش و کارەکانیانەوە هیلاک و ماندوو بوون، حەزیان دەکرد زوو نوێژەکەیان بکەن و بچنەوە بۆ ماڵەوە، بۆ ئەوەی پشوویەک بدەن..

گەنجەکە لە نوێژەکە بەردەوام دەبێت و مەعازیش رضي الله عنه درێژە بە قورئان خوێندنەکەی دەدات.. کاتێک مەعاز رضي الله عنه هەر بەردەوام دەبێت، گەنجەکە بە تەنها نوێژەکەی تەواو دەکات و لە مزگەوتەوە بەرەو ماڵەوە دەگەڕێتەوە.. مەعاز رضي الله عنه لە دوای ئەوەی نوێژەکە تەواو دەکات، هەندێک لە خەڵکەکە پێی دەڵێن: ئەی مەعاز فلانە کەس لەگەڵمان دەستی بە نوێژکردن کرد، بەڵام کاتێک نوێژەکەت درێژ کردەوە، ڕۆی..

کاتێک مەعاز گوێی لەم قسەیە بوو، وتی: ئەوە کارێکی خراپ و دووڕووییە و دەبێت پێغەمبەری خودا ﷺی لێ ئاگادار بکەم..

گەنجەکە قسەکەی مەعاز رضي الله عنه دەبیستێتەوە، هەر بۆیە ئەمیش دەڵێت: منیش پێغەمبەری خودا ﷺ لە درێژ کردنەوەی نوێژەکەی ئاگادار دەکەمەوە.. گەنجەکە دەچێتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ و پێی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مەعاز لە لای تۆ ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوەو پاشان کە دەشگەڕێتەوە، نوێژێکی زۆر درێژمان بۆ دەکات و بە تەواوی نوێژی عیشاکەمان دوا دەخات و درەنگمان بە سەر دێنێت..

پێغەمبەری خوداش ﷺ بە مەعاز دەفەرموێت: لە نوێژەکەتدا چ سورەتێک دەخوێنی؟! مەعاز لە وەڵامدا دەفەرموێت: سورەتی البقرة و.. و.. چەند سورەتێک لە سورەتە درێژەکانی ژمارد.. پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێک زانی خەڵکەکە بە هۆی درێژی

نوێژەکەی مەعازەوە، نوێژی عیشایان دوا دەکەوێت، تووڕە بوو، پاشان فەرمووی: ئەی مەعاز ئایا دەتەوێت کێشە بنێیتەوەو نارەحەتی بۆ خەڵکی دروست بکەیتو نوێژیان لە لا قورسو گران بکەیت؟! کاتێك پێشنوێژی دەکەیت، سورەتەکانی ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾ و ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ﴾ و ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾ بخوێنە..

گەنجەکە لە سەر دڵی ناخۆش بوو، کە مەعازﷺ پێی وتبوو، ئەو کارەی گەنجەکە کردوویەتی بریتیە لە دووڕوویی، هەر بۆیە وتی: لەمەودوا بۆ مەعاز دەردەکەوێت، کە من ئیماندارم یان دووڕوو..

چەند ڕۆژێکی کەم تێپەڕی، جەنگێك لە نێوان موسڵمانانو بێباوەڕاندا ڕوویداو گەنجەکە بە پلەی بەرزی شەهیدی گەیشت.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵی شەهید بوونی گەنجەکەی پێگەیشت، بە مەعازی فەرموو: ئەو گەنجە چی بەسەرهات، ئەی مەعاز؟! مەعازیشﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، پەروەردگار ڕاستی کردو منیش ناڕاست، ئەو گەنجە شەهید بوو..

سەیر بکەو ورد بەرەوە لە جیاوازی هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوداﷺ لە نێوان کەسەکاندا.. سەیر بکە بزانە پێغەمبەری خوداﷺ چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئوسامەی کوڕی زەیددا دەکات، لە کاتێکدا ئوسامەﷺ بە خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست ناسرا بوو، لە ماڵی پێغەمبەری خوداشداﷺ پەروەردەو گەورە کرا بوو..

پێغەمبەری خوداﷺ هەندێك لە هاوەڵانی دەنێرێت بۆ غەزایەك، کە ئوسامەشیان لە ناودا بوو.. کاتێك جەنگەکە دەستی پێکرد، موسڵمانان سەرکەوتنو بێباوەڕانیش توشی شکست بوونو هەڵهاتنو ڕایان کرد.. یەکێك لە شەرکەرانی بێباوەڕان، کاتێك بینی هاوەڵەکانی شکاونو شکستیان هێناوە، شمشێرەکەی هەڵگرتو ئەمیش ڕای کرد.. ئوسامەی کوڕی زەیدو پیاوێکی تر لە موسڵمانان شوێنی کەوتن، هەتا گەیشتنە پیاوەکەو شمشێریان لێ ڕاکێشا..

پیاوەکە کاتێك ئەم دوو کەسەی بینی، وا شمشێریان بە دەستەوەیەو بە تەمای کوشتنین، بە ترسو لەرزێکی زۆرەوە وتی: أشهد أن لاإله إلا الله، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.. ئوسامەو پیاوە موسڵمانەکەی تر، حەپەسانو نەیان دەزانی، ئایا ئەم پیاوە بە ڕاستی موسڵمان بووەو باوەڕی هێناوە، یان مەبەستی لەم کارەی فێڵو تەڵەکەیە؟! شوێنەکە گۆڕەپانی جەنگەو حاڵەتەکەش ناسکەو سەیری دەوروبەری خۆیان دەکرد، جگە لە لاشەو جەستەی پارچە پارچە کراوو دەستو قاچی پەڕیوو، هیچی تریان

نەدەبینی.. جەستەو لاشەکان تێکەڵ یەکتر ببون و خوێن جۆگەلەی بەستبوو، پیاوەکە لە نێوانیاندا بوو، هەردووکیان هەر سەیریان دەکرد، پێش ئەوەی بەر تیری بێباوەڕان بکەون، پێویست بوو بڕیارێکی خێرا بدەن.. کاتی ئەوەیان نەبوو، بیرێکی لێ بکەنەوەو پرس و رایەك لەگەڵ یەکتر بکەن..

پیاوە موسڵمانەکەی کە لەگەڵ ئوسامەدا بوو، شمشێرەکەی کردەوە بە کێلانەکەیداو دەستی لە کوشتنی هەڵگرت، بەڵام ئوسامەﷺ ئەم کارەی کابرای بە فێڵ و تەڵەکە زانی و بە شمشێرەکەی کوشتی!! موسڵمانەکان بە هەست و جۆش و خرۆشی سەرکەوتنەوە، بەرەو شاری مەدینە گەڕانەوە..

ئوسامەﷺ لە بەردەمی پێغەمبەری خواداﷺ باسی جەنگەکەی کردو هەواڵی کابراکەشی بۆ گێڕایەوە.. پێغەمبەری خوداﷺ بە تامەزرۆییەوە، گوێی بۆ هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان شل کرد بوو، بەڵام کاتێك ئوسامەﷺ فەرمووی: پیاوەکەم کوشت، پێغەمبەری خوداﷺ ڕەنگی گۆڕاو فەرمووی: ئەو پیاوە وتی: لاإله إلا الله، پاشان کوشتت؟! ئوسامەﷺ فەرمووی: پێغەمبەری خوداﷺ لە ترسدا شایەدومانی هێنا.. پێغەمبەری خوداﷺ دوبارە فەرمووی: وتی: لاإله إلا الله، پاشان کوشتت؟! ئایا دڵت شەق کرد، تا بزانی لە ترسدا شایەدمانی هێناوە؟! لە ڕۆژی دواییدا، کاتێك ئەو پیاوە ئەو شایەدمانەی دەکات بە بەڵگە بە سەرتەوە، چی دەکەیت؟!

بەردەوام ئەم وتانەی بەرامبەر ئوسامە دوبارە دەکردەوە، ئوسامەﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ ئەوەندە ئەم قسانەی دوبارە کردەوە، هەتا خۆزگەم دەخواست و حەزم دەکرد ئەو ڕۆژە موسڵمان بوومایەو باوەڕم بهێنایە..

**بۆچوون..**

خەڵکی یەك جۆر نین، سروشتیان جیاوازەو وەك ڕەنگەکان نین، بە ئاسانی بیان ژمێریت..

## وتەی گونجاو هەڵبژێرە..

بەردەوام دەبین لە سەر شێوازەکانی قسە کردن و بەکارهێنانی وشەو وتەی گونجاو، لەگەڵ رەچاو کردنی حاڵەت و تەمەنی کەسانی بەرامبەر.. ئەو شێوازەی قسەی لەگەڵ گەنجێکدا پێدەکەین، جیاوازە لەو شێوازە قسە کردنەی کە لەگەڵ پیاوێکی بە تەمەندا، یان لەگەڵ زانایەکدا، یان لەگەڵ نەخوێندەوارێکدا قسەی پێدەکەین.. قسە کردنمان لەگەڵ هاوسەرانماندا جیاوازە، لە قسە کردنمان لەگەڵ خوشکەکانمان..

مەبەستمان لەوە نیە بە تەواوی قسەکانمان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاواز بێت..

نەخێر.. بەڵکو مەبەستمان لەوەیە ئەو چیرۆک و قسانەی کە بۆ خوشکەکەتی دەگێڕیتەوە، گونجاو نیە بۆ خێزانەکەشت هەمان چیرۆک و رووداو بگێڕیتەوە!! ئەو قسەیەی لەگەڵ گەنجێکدا دەیکەیت، گونجاو نیە پیاوێکی بە تەمەن گوێ بیستی بێت!!

بە نموونەیەك رِوونی دەکەینەوە.. کۆمەڵێك پیاوی بە تەمەن میوانی باپیرەتن و هاتوون سەردانی بکەن و تۆش لە لایان دانیشتوویت، ئایا بە گونجاوی دەزانیت بە پێکەنینەوە باسی گەشتی خۆت و هاورێکانت بۆ ئەو پیاوە بە تەمەنانە بکەیت و بڵێیت: فلانە هاورێم گۆڵێکی زۆر جوانی کرد، زۆر بە لێهاتوویی بە سەر تۆپەکەی گرت و پاشان بە ئەژنۆ دایبەزاندو بە قاچی گۆڵەکەی تۆمار کرد!!

بێگومان ئەم بابەتە بۆئەو شوێنە گونجاوو لەبار نیە.. هەروەها کاتێك قسە لەگەڵ کۆمەڵە منداڵ و مێردمنداڵێکدا دەکەیت، گونجاو نیە باسی چیرۆکێکیان بۆ بکەیت، کە پەیوەندیدار بێت بە چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنی نێوان هاوسەران.. بە دڵنیاییەوە تۆش لەگەڵ مندا هاورِایت و گێرِانەوەی ئەم بابەتە بۆ ئەو منداڵانە بە گونجاو نازانیت..

کەواتە لە هۆکارەکانی سەرنج رِاکێشانی خەڵکی، بەکارهێنان و گێرِانەوەی ئەو چیرۆك و رِووداوو قسانەیە، کە حەزی پێدەکەن و پێی دڵخۆش دەبن، وەك ئەوەی باوکێك کورِێکی زیرەك و بە توانای هەبێت، بێگومان پێی خۆشە دەربارەی کورِەکەی

پرسیاری لێبکەیت، لەبەر ئەوەی شانازی پێوە دەکات‌و حەز دەکات هەمیشە باسی بکات.. بە هەمان شێوە کابرایەکی دوکاندارو بازرگانی ناو بازاڕ، حەز دەکات پرسیار دەربارەی ئیش‌و کارەکەی بکەیت، لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە دڵخۆشی دەکات، ئەو کاتە لە لای خۆشەویست دەبیت‌و حەز بە هاوڕێیەتی‌و کۆڕو دانیشتنەکانت دەکات..

پێغەمبەری خوداش ﷺ ڕەچاوی ئەم حاڵەتەی کردووەو شێوازی قسە کردنی لەگەڵ گەنجێکدا جیاواز بووە لە شێوازی قسە کردنی لەگەڵ بە تەمەنێکدا، یان لەگەڵ ئافرەتێکدا، یان لەگەڵ منداڵێکدا..

جابری کوری عبدالله رضي الله عنه هاوەڵێکی بەڕێزو خۆشەویستی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو، باوکی جابر رضي الله عنه لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو، نۆ کچیشی لە پاش بەجێما بوو، جگە لە جابر رضي الله عنه هیچ بەخێوکارو سەرپەرشتیکارێکیان نەبوو.. هەروەها قەرزێکی زۆریشی لە دوای خۆی جێهێشتبوو، هەموو ئەم کارانەش بە سەر شانی جابرەوە رضي الله عنه بوون، کە هێشتا لە سەرەتای بەهاری تەمەنی لاوێتیدا بوو..

جابر رضي الله عنه هەمیشە لە ئەندێشەو خەیاڵدا بوو، بیری لە قەرزەکانی باوکی دەکردەوە، کە ئێوارەو بەیانی خاوەن قەرزەکان داوایان لێدەکردەوە، هەرروەها بیری لە حاڵ‌و گوزەرانی ئەو نۆ خوشکەی دەکردەوە، کەجگە لەم تاقە برایە کەسیان نەبوو..

جابر رضي الله عنه لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچوو، بۆ یەکێك لە غەزاکان‌و ئەوەندە هەژارو نەدار بوو، وشترێکی پێبوو بۆ سواری، هەر ئەوەندە بوو دەڕۆیشت، لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی وشترێکی تر بکرێت، هەر بۆیە خەڵکەکە هەموویان پێشکەوتن‌و ئەمیش کەوتە کۆتایی کاروانەکەوە.. پێغەمبەری خوداش ﷺ لە کۆتای سوپاکەوە دەڕۆیشت، هەستی بە جابر کرد کە وشترەکەی چەند بە لە سەرخۆیی دەڕوات‌و خەڵکیش هەموو پێشیان کەوتوون، هەر بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەوە چیە جابر؟!

جابریش رضي الله عنه لە وەڵامدا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، وشترەکەم ئاوا دوای خستووم..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: پەخی بدەو با لە سەر زەویەکە دانیشێت.. جابر رضي الله عنه وشترەکەی پەخداو پێغەمبەری خوداش هەروەها.. پاشان فەرمووی: گۆچانەکەی دەستت یان پارچەیەك دارم بدەرێ.. جابر رضي الله عنه گۆچانەکەی دەستی دایە دەست پێغەمبەری خودا ﷺ و پێغەمبەری خوداش ﷺ زۆر بە هێواشی چەند گۆچانێکی بە وشترەکەدا کێشا، لە کاتێکدا وشترەکە زۆر بە لاوازی‌و بێتوانایی لە سەر زەویەکە دانیشت بوو..

هەر لە دوای پیاکێشانەکەی پێغەمبەری خوداﷺ بە گۆچانەکەی جابرﷺ، وشترەکە هەستاو گورج‌وگۆڵو بەهێزی پێوە دیار بوو..

جابرﷺ کاتێك وشترەکەی بەم شێوەیە بینی، زۆر بە دڵخۆشیەوە سواری بوو، پاشان شان بە شانی پێغەمبەری خوداﷺ کەوتە رێ.. پێغەمبەری خوداﷺ ویستی جابرﷺ بدوێنێو قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام دەبێت چ بابەتێکی لەگەڵ باس بکات؟!

جابرﷺ لە سەرەتای تەمەنی لاوێتیدا بوو، خەمو خەیاڵی گەنجانیش لەو تەمەنەدا زیاتر بابەتەکانی ژن هێنانوماڵو منداڵ پێکەوەنانە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: جابر خێزانت هەیە؟

جابرﷺ فەرمووی: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: کچ بوو، یان بێوەژن؟

جابرﷺ فەرمووی: بێوەژن.. پێغەمبەری خوداﷺ سەرسام بوو!! چۆن گەنجێك لە یەکەم هاوسەرگیریدا، بێوەژنێك مارە دەکات!!

پێغەمبەری خوداﷺ بە نەرمیەوە بە جابری فەرموو: دەی کچێکت بهێنایە، بۆ ئەوەی یاریت لەگەڵ بکردایەو یاری لەگەڵ بکردیتایە.. جابریشﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، باوکم لە جەنگی ئوحوددا شەهید بووەو نۆ خوشکیشم هەیە، جگە لە من کەسیان نیە، هەر بۆیە نەمویست کچێك مارە بکەم، لە ترسی ئەوەی ناکۆکی لە نێوان ئەوو خوشکەکانمدا دروست نەبێت، بێوەژنێکم مارە کرد، تەمەنی لە خوشکەکانم گەورەترە، بۆ ئەوەی وەکو دایك هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکات..

پێغەمبەری خوداﷺ سەیری کرد، لە بەرامبەریدا گەنجێك وەستاوە، لە پێناو خوشکەکانیدا قوربانی داوە بە خۆشیەکانی ژیانی.. پاشان پێغەمبەری خوداﷺ ویستی قسەی خۆش‌و گاڵتەی لەگەڵ بکات، هەر بۆیە فەرمووی: لەوانەیە کاتێك هاوسەرەکەت هەواڵی نزیك بوونەوەمان لە شاری مەدینە ببیستێت، جێگەت بۆ رابخات‌و سەرین‌و پشتیشت بۆ دابنێت، واتە هەر چەندە بێوەژنێکت هێناوە، بەڵام تازە بووکەو بە گەرانەوەت دڵخۆش دەبێت‌و جێگەو رێگەت بۆ ئامادە دەکات..

ئا لەم کاتەدا جابرﷺ بیری هەژاری‌و نەداری‌و حاڵی خوشکەکانی کردەوەو فەرمووی: سەرین‌و پشتی؟! سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا سەرین‌و پشتیمان نیە!! پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: دەی إنشا ٱلله دەبن بە خاوەنی سەرین‌و پشتی‌و جێگەو رێگە..

پاشان ڕۆیشتن، پێغەمبەری خوداﷺ دەیویست پارەو سامانێك بە جابر ببەخشێتو فەرمووی: جابر..

جابریشﷺ فەرمووی: بەڵێ.. ئەی پێغەمبەری خودا گیانم بەقوربانت بێت، لە خزمەتتدام..

پێغەمبەی خوداﷺ فەرمووی: وشترەکەتم پێدەفرۆشیت؟ جابر بیری کردەوە، سەروەتو سامانەکەی هەر وشترەکەیەتیو ئەوەتا گورجوگۆڵو بەهێزیش بووەو وەکو پێشتر لاوازو بێتوانا نیە، بەڵام خۆ نابێت داواکەی پێغەمبەری خوداشﷺ ڕەت بکاتەوە، هەر بۆیە فەرمووی: بە چەند دەیکڕی ئەی پێغەمبەری خودا؟

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بە درهەمێك!!

جابرﷺ فەرمووی: بەدرهەمێك؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەی بە دوو درهەم..

جابر فەرمووی: نا.. کەمەو زەرەرمە!!

پێغەمبەری خوداﷺ بەردەوام پارەکەی بۆ زیاد دەکرد، هەتا گەیاندیە چل درهەم، واتە ئۆقیەیەك زێڕ.. جابرﷺ فەرمووی: ڕازیم، بەڵام بە مەرجێك هەتا دەگەینەوە مەدینە وشترەکە لە لای من بێت..

پێغەمبەی خوداشﷺ فەرمووی: باشە.. کاتێك گەیشتنەوە شاری مەدینە، جابر بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتو کەلوپەلەکانی لە سەر وشترەکە داگرتو پاشان چوو بۆ مزگەوت، بۆ ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ نوێژەکەی ئەنجام بدات، وشترەکەشی لە دەرەوەی مزگەوت بەستەوە.. کاتێك لە نوێژەکەیان تەواو بوونو پێغەمبەری خوداﷺ لە مزگەوت هاتە دەرەوەو بە بیلالی فەرموو: چل درهەم بدە بە جابرو بۆشی زیاد بکە.. بیلال درهەمەکانی دا بە جابر، جابریشﷺ درهەمەکانی هەڵگرتو بە دەستەکانی ئەمدیوو ئەودیوی دەکردو بیری دەکردەوە، بەو پارانە چ کارێك بکات؟! ئایا وشتری پێ بکرێتەوە، یان کەلوپەلی ماڵ، یان...

لە پڕ پێغەمبەری خوداﷺ ئاوڕی بۆ بیلال دایەوەو فەرمووی: بیلال وشترەکە بەرەو بیدەرەوە بە جابر.. بیلال وشترەکەی بردەوە بۆ جابر، کاتێك جابر وشترەکەی بینی، سەری سوڕماو لە دڵی خۆیدا وتی: دەبێت کڕینو فرۆشتنەکە هەڵوەشابێتەوە؟!

بیلال فەرمووی: جابر وشترەکەت بگرە.. جابریش فەرمووی: دەنگوباس چیە؟!

بیلال فەرمووی: پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی پێدام، وشترەکەت بۆ بگێڕمەوە..

جابر کاتێك گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرموو: من مەبەستم ئەوە نەبوو، کە وشترەکەت بە هەرزان لێبکڕم، بەڵکو مەبەستم ئەوە بوو، بزانم پێویستیت بە چەندێك پارە هەیە بۆ پێویستیو کاروبارەکانت..

ئای لەو هەڵسوکەوتو ڕەوشتە ناوازەیە!! قسەو باسێك لەگەڵ ئەو گەنجەدا باس دەکات، کە لەگەڵیدا بگونجێت، پاشان کە دەیەوێت پارمەتیەکی پێشکەش بکات، زۆر بە جوانیو ڕێزەوە پێشکەشی دەکات..

ڕۆژێکی تر گەنجێك لە گەنجە چاکەکارەکان، بە ناوی جلیبیب لە لای پێغەمبەری خوداﷺ دانیشتبوو، ئەم گەنجە، گەنجێکی زۆر هەژار بوو، زۆریش ناشیرین بوو..

ئایا پێغەمبەری خوداﷺ دەبێت چ بابەتێکی لەگەڵدا باس بکات؟! ئایا دەبێت باسی پلەو پایەو حەسەبو نەسەبی لەگەڵدا بکات؟! نەخێر، تەمەنی ئەم گەنجە پێویستی بە باسی ژنو ژنخوازیو ماڵو ماڵداریە.. هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ داوای لێکرد ژن بهێنێت.. ئەم هاوەڵە بەڕێزەش لە وەڵامدا وتی: منی لێقەوماوو ڕووتو ڕەجاڵ، کێ ژنم دەداتێ؟!

پێغەمبەری خوداشﷺ پێی فەرموو: بەڵام لەلای خودا ڕووتو ڕەجاڵو لێقەوماو نیت.. پێغەمبەری خوداﷺ لە هەلێك دەگەڕا بۆئەوەی ژنی بۆ بهێنێت، هەتا ڕۆژێك پیاوێکی ئەنصاری کچەکەی خستەڕوو، بۆ پێغەمبەری خوداﷺ، بۆئەوەی بۆ خۆی مارە بکات.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەی فلانە کەس کچەکەتم دەدەیتێ؟!

پیاوەکە وتی: بەڵێو بە سەر چاو..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بۆ جلیبیب..

پیاوەکە وتی: بۆ جلیبیب!! دەی با پرسێك بە دایکی بکەمو ڕایەکی ئەویش وەرگرم..

پیاوەکە چوو بۆ لای خێزانەکەیو وتی: پێغەمبەری خوداﷺ داوای کچەکەی کردووین..

خێزانەکەشی وتی: بەڵێو بە سەر چاو..

پیاوەکە وتی: ئاخر بۆ خۆی نیە..

خێزانەکەی وتی: ئەی بۆ کێ؟!

پیاوەکەی وتی: بۆ جلیبیب..

خێزانەکەی وتی: نا.. سوێند بە خودا نایدەم بە جلیبیب.. ئێمە بە فلانو فلانمان

نەدا، چۆن بیدەین بە جلیبیب!!
پیاوەکە هەستا بچێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ .. لەم کاتەدا کچەکەیان هاواری کردو وتی: کێ داخوازی منی لێکردوون؟!
وتیان: پێغەمبەری خودا ﷺ..
کچەکە وتی: ئایا داواکاری‌و فەرمانی پێغەمبەری خودا ﷺ رەد دەکەنەوە؟! بمدەنە دەست پێغەمبەری خودا ﷺ، بە دڵنیاییەوە خەسارم ناکات‌و بە زایەم نادات..
پیاوەکە چووەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەریی خودا ﷺ کەیفیی خۆتە..
پێغەمبەری خودا ﷺ ئافرەتەکەی لە جلیبیب مارە کردو دۆعای خێری بۆ کردن‌و لە خودا پارایەوە، کە خێریان بە سەردا برژێت‌و ژیانیان دوور خات لە نارەحەتی‌و زەحمەت..
چەند رۆژێکی کەم بە سەر هاوسەرگیریەکەیاندا تێنەپەریبوو، پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا بۆ یەکێك لە غەزاکان کەوتەرێ.. جلیبیبی تازە زاواش لەگەڵیان کەوتەرێ، کاتێك جەنگ کۆتایی هات‌و خەڵکی بە دوای یەکتردا دەگەران، بۆ ئەوەی بزانن کێ ماوەو کێ شەهید بووە، پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری لێدەکرن‌و دەیفەرموو: ئایا کەسێکتان لێ وون بووە؟! یان کەسێکتان لە دەست داوە؟!
وتیان: بەڵێ.. فلان‌و فلان شەهید بوون..
پێغەمبەری خودا ﷺ تا سێ جار ئەم پرسیارەی دووبارە کردەوەو هاوەڵانیش وەڵامیان دەدایەوەو دەیان فەرموو: بەڵێ ئەم کەسانەمان لێ شەهید بووە.. ئەمجارەیان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بەڵام جلیبیب دیار نیە!!
هاوەڵان هەستان‌و بەدوایدا گەران.. زۆر گەران، لە مەیدانی جەنگیشدا نەیان بینییەوە، پاشان لە شوێنێکی نزیکدا بینیانەوەو لە تەنیشتیەوە لاشەی حەوت بێباوەڕ کەوتبوو..
بەڵێ.. حەوت کەسی لە بێباوەڕان کوشتبوو، پاشان شەهید کرا بوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری لاشەکەی جلیبیبی دەکرد، پاشان فەرمووی: حەوت کەسی کوشتووەو پاشان شەهیدیان کردووە، جلیبیب خۆشەویستی منەو لە منەو منیش لە ئەوم، پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەر دەستەکانی هەڵیگرت‌و فەرمانی دا، گۆڕی بۆ هەڵکەنن..
ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: هەتا گۆڕەکەمان هەڵکەندو تەواو بووین، دەستە پیرۆزەکانی

پێغەمبەری خوداﷺ لە ژێر سەری جلیبیب دا بوو.. پاشان پێغەمبەری خوداﷺ بە دەستە پیرۆزەکانی لە ناو گۆڕەکەیدا داینا..

ئەنەسﷺ دەفەرمویت: سوێند بە خودا لە ناو شاری مەدینەدا هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە، ئەوەندە داخوازی بکرێت، وەك هاوسەرەکەی جلیبیب، لەدوای شەهید بوونی جلیبیب خەڵکی پێشبرکێیان دەکرد، بۆئەوەی داخوازی بکەن..

خودای پەروەردگاریش دەفەرمویت: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ النور. واتە: (جا ئەوەی فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەرەکەی بکات و لە خودا بترسێت و لە سەرپێچی و نافەرمانی خۆی بپارێزێت، ئا ئەوانە سەرفرازو بە ئاوات گەیشتوون)..

رۆژێکی تر پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ عائیشەی دایکی ئیمانداراندا (خودای لێ رازی بێت) دانیشتبوو، ئایا باسی جەنگی رۆمەکانی بۆ کرد؟! ئایا باسی ئەو چەکانەی بۆ دەکرد، کە لە جەنگدا بەکاریان دەهێنا؟!

نەخێر، خۆ لەم کاتەدا گفتوگۆی لەگەڵ ئیمامی ئەبوبەکرداﷺ نەدەکرد..

ئایا باسی هەژاری و نەداری موسڵمانانی بۆ کرد؟!

نەخێر، خۆ لەگەڵ ئیمامی عوسمانداﷺ قسەی نەدەکرد، بەڵکو بە سۆزێکی ژن و مێردایەتیەوە قسەی لەگەڵ کردو فەرمووی: من دەزانم تۆ چ کاتێك لێم رازیت و چ کاتێکیش نارازیت!!

عائیشە (خودای لێ رازی بێت) فەرمووی: چۆن دەزانیت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: کاتێك لێم رازی بیت، دەڵێیت: سوێند بە خودای محمدﷺ، بەڵام کاتێك لێم تورەو نارازی بیت، دەڵێیت: سوێند بە خودای ئیبراهیمﷺ..

عائیشەش (خودای لێ رازی بێت) فەرمووی: بەڵێ وایە..

ئایا ئێمە ئەمرۆ بەم شێوە، رەچاوی گوفتارو کردارمان دەکەین؟!

**تێڕوانین..**

بەو جۆرە لەگەڵ خەڵکیدا بدوێ، کە حەزی لێدەکەن..
نەك بەو جۆرەی، کە خۆت دڵت پێی خۆشە..



## لە یەکەم بە یەکتر گەیشتندا، نەرمو نیان بە..

لە دێر زەماندا، لە میسر وا باوبوو لە شەوی بووكو زاوایەتیدا، پشیلەیەکیان لە ژوورەکەدا دەشاردەوە، کاتێك زاوا دەچووە ژوورەوە بۆ لای بووك، بۆ ئەوەی هێزو توانای خۆی پیشانی بووك بدات، پشیلەکەی دەگرتو بە هەر دوو دەستی دەیخنکاند!!

دەزانی بۆچی ئەم کارەی دەکرد؟! لەبەر ئەوەی هەر لە یەکەم بە یەکگەیشتنو یەکتر بینیندا، ترس لە خەیاڵی هاوسەرەکەیدا وێنە بکاتو ئیتر بەردەوام لێی بترسێت!!

لە بیرم دێت، کاتێك زانکۆم تەواو کردو وەکو یاریدەدەری مامۆستا لە یەکێك لە کۆلێژەکاندا دامەزرام، یەکێك لە مامۆستا کۆنەکان، ئامۆژگاری کردمو پێی وتم: لە یەکەم وانەت لەگەڵ قوتابیەکانتدا، زۆر توندو تیژبەو بە چاوێکی سورەوە سەیریان بکە، بۆ ئەوەی لێت بترسنو هەر لە سەرەتاوە بە کەسایەتیەکی بەهێز دەربکەویت..

بە دڵنیاییەوە، لە لای زۆربەی خەڵکی، یەکەم بینینو بە یەکتر گەیشتن لە٧٠٪ی کەسایەتیت لە خەیاڵی بەرامبەردا تۆمارو جێگیر دەکات..

کۆمەڵێك ئەفسەر بۆ خولێکی مەشقو ڕاهێنان چوون بۆ ئەمریکا، لە یەکەم ڕۆژی خولەکەدا، ئەفسەرەکان لە هۆڵێکدا ئامادە بوونو خۆیان بە یەکتر دەناساندو گفتوگۆیان دەکرد، لەپڕ مامۆستا، یان ڕاهێنەرەکە هاتە ژوورەوەو چاوی کەوتە سەر یەکێك لە ئەفسەرە قوتابیەکان، کە هێشتا زەردەخەنە بە ڕوخساریەوە دیار بوو.. مامۆستاکە هاواری کردو وتی: بۆچی پێدەکەنیت؟!

قوتابیەکەش وتی: ببورە.. پێنەکەنیووم!!

مامۆستاکەش دەڵێت: بەڵێ، پێکەنیت، پاشان سەرزەنشتی دەکاتو پێی دەڵێت: تۆ مرۆڤێکی لاموبالاتیو پێویستە بە یەکەم گەشتی فڕۆکە بگەڕێیتەوە بۆ لای کەسوکارت، هیچ خۆشحاڵ نیم وانە بە کەسانی هاوشێوەی وەك تۆ بڵێمەوە..

قوتابیە هەژارەکەش، ڕەنگی تێکچوو، سەیری مامۆستاکەی دەکردو بە لای هاوەڵەکانیدا لای دەکردەوەو دەیویست کەمێك لە شەرمەزارییەکەی بشارێتەوە..

پاشان مامۆستاکە بە گرژیو تووڕەییەوە، ئاماژەی بۆ دەرگای ژوورەکە کردو وتی: بڕۆ دەرەوە.. قوتابیەکە بە شڵەژاویەوە ڕۆیشتە دەرەوە، پاشان مامۆستاکە سەیری سەرجەم قوتابیەکانی کردو وتی: من دکتۆر فلانم.. فلانە بابەتیشتان پێدەڵێم، بەلام پێش ئەوەی دەست بە وانەکەمان بکەین، دەمەوێت ئەم فۆرمە پڕ بکەنەوە، بە بێ ئەوەی ناوی خۆتان بنوسن.. فۆرمەکانی دابەش کرد، کە بریتی بوون لە هەڵسەنگاندنی مامۆستاو ئەم پرسیارانەی تێدا نوسرا بوو:

١- بۆچوونت چیە دەربارەی ڕەوشتی مامۆستاکەت؟

٢- بۆچوونت دەربارەی شێوازی وانە وتنەوەی؟

٣- ئایا بۆچوونی کەسانی تر قەبوڵ دەکات؟

٤- ئایا لە دەرەوەی چوارچێوەی وانە وتنەوە، حەز بە بینینو گفتوگۆکردنی دەکەیت؟

٥- ئایا ئامادەییت هەیە، جارێکی تر وانەی لەلا بخوێنی؟

لە بەرامبەر هەر پرسیارێکدا چەند هەڵبژاردنێك هەبوو: نایاب.. زۆر باشە.. باشە.. پەسەند.. لاواز..

قوتابیەکان فۆڕمەکانیان پڕ کردەوەو گێڕایانەوە بۆ مامۆستاکەو ئەویش لە تەنیشت خۆی داینا.. پاشان دەستی کرد بە باس کردنی بابەتەکەی، کە بریتی بوو لە کاریگەری هونەری مامەڵە کردن لە بواری وەزیفەدا، لە پڕ وتی: ئۆها!! بۆچی هاوەڵەکەتان لەم بابەتە بێبەش بکەین؟! هەر بۆیە چووە دەرەوە بۆ لایو تەوقەی لەگەڵ کردو بە ڕوویەکی خۆشەوە هێنایەوە ژوورەوە، پاشان وتی: پێش کەمێك بە بێ هۆیەکی گونجاوو ڕاستەقینە، من لە تۆ تووڕە بووم، بەلام من گرفتێکی تایبەتم هەبوو،کە بوو بە هۆی ئەوەی جامی تووڕەیی خۆم بە سەر تۆدا بڕێژم، هەر بۆیە داوای لێبوردنت لێدەکەم، تۆ قوتابیەکی خۆت یەکلایی کردۆتەوە بۆ فێر بوونی زانستو زانیاری، بەڵگەش بۆ ئەمە جێهێشتنی ماڵو منداڵو کەسوکارتە، ئامادەبوونیشت لەم شوێنە جێگەی سوپاسو پێزانینە، هەروەها سوپاسی هەمووتان دەکەمو مایەی شانازیمە کە وانە بە کەسانی وەك ئێوە دەڵێم..

پاشان کەمێك پێکەنیو هەندێك فۆرمی تازەی هێناو وتی: لەبەر ئەوەی

هاوڕێکەتان لە پڕ کردنەوەی فۆرمەکاندا بەشدار نەبوو، بە لاتانەوە چۆنە هەمووتان دوبارە فۆرمەکان پڕ بکەنەوە؟ فۆرمەکانی بە سەردا دابەش کردن، پڕیان کردنەوەو بۆیان گێڕایەوە، پاشان هەستا بە بەراورد کردنی فۆرمەکانی یەکەم جارو دووەم جار.. فۆرمەکانی یەکەم جار لێوان لێو بوو، لە هەڵبژاردن‌و پڕ کردنەوەی خانەی لاواز، بەڵام فۆرمەکانی دووەم جار، لاواز، تەنانەت پەسەندیشی تێدا نەبوو!!

مامۆستاکە دەستی کرد بە پێکەنین‌و پاشان وتی: ئەمەی کە بینیتان بەڵگەیەکی کرداری بوو، لە سەر کاریگەری خراپی هەڵسوکەوت کردنی ژینگەی کاری نێوان بەڕێوەبەرو کارمەندەکەی، هەروەها نێوان مامۆستاو قوتابیەکەی.. ئەوەش کە بەرامبەر هاوڕێکەتان ئەنجامدا، تەنها بۆ نواندن بوو، ویستم لە بەر چاوی ئێوەدا بە جێی بهێنم‌و ئەو قوتابیە هەژارە بوو بە قوربانی..

بڕوانن چۆن تێڕوانینی ئێوە بەرامبەر بە من گۆڕا، ئەمەش تەنها بە گۆڕینی هەڵسوکەوتی من بوو لەگەڵ ئێوە، سروشتی مرۆڤ بەم شێوەیەیەو دەبێت چاودێری ئەم سروشتەی مرۆڤ بکرێت‌و ئاوڕی لێبدەینەوەو ڕێزی بگرین، بە تایبەت لەگەڵ ئەو کەسانەدا، کە تەنها بۆ جارێك دەیان بینین‌و ڕووبەڕوویان دەبینەوە..

یەکەم مامۆستای مرۆڤایەتیﷺ لە یەکەم دیدارو بە یەکگەیشتندا، دڵی مرۆڤەکانی بە دەست دەهێناو دیل‌و کەمەندکێشی دەکردن.. لە دوای ڕزگار کردنی شاری مەککە، موسڵمانان بەهێزو بە توانا بوون‌و نوێنەرانی ناوچەکان، پێشبرکێیان دەکرد بۆ ئەوەی بێنە شاری مەدینەو بە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ بگەن.. نوێنەرانی هۆزی عبدالقیس، یەکێك بوون لەو نوێنەرانەی کە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بینیانی، پێش ئەوەی لە سەر وڵاخەکانیان دابەزن، دەست پێشخەری کردو پێی فەرموون: زۆر بەخێرهاتنتان دەکەین‌و بەخێربێن، کارێکتان بۆ دەکەین کە سەرشۆڕو پەشیمان نەبن.. ئەوانیش بەم بەخێرهاتنە زۆر خۆشحاڵ بوون‌و پەلەیان دەکرد، بۆ ئەوەی سڵاو لەپێغەمبەری خوداﷺ بکەن، پاشان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لە نێوان بە یەکگەیشتنی ئێمەو بەڕێزتاندا کۆمەڵێك لە بێباوەڕانی هۆزی (مضر) هەیەو جگە لە مانگە

حەرامەکان ناتوانین بێینە خزمەتت، بۆیە داوات لێدەکەین بە جوانترین کردار ئامۆژگاریمان بکەیت، بۆ ئەوەی بە جێبەجێ کردنی بچینە بەهەشتو بانگەوازی ئەو کەسانەشی پێبکەین، کە جێمان هێشتوون..

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: فەرمانتان پێدەکەم، بەوەی باوەڕ بە خودا بهێنن، ئایا دەزانن باوەڕ هێنان بە خودا چیە؟!

ئەوانیش وتیان: پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەزانن..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بریتیە لە شایەتیدان، بەوەی کە جگە لە الله هیچ خودایەکی ڕاستو دروست نیە، هەروەها ئەنجامدانی نوێژەکان، دەرکردنی زەکات لە ماڵو سەروەتو سامان، بەخشینی پێنج یەکی ئەو دەستکەوتانەی کە لە جەنگدا دەستتان دەکەوێت.. ڕێگریشتان لێدەکەم کە سرکە بکەنە ناو کولەکەوە، لەبەر ئەوەی دەبێت بە عارەق..

جارێکی تریان پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، لە گەشتێکدا دەبنو ڕێگەیەکی دوورو درێژ دەبڕن، هەتا لە کۆتایی شەودا لادەدەن بۆ ئەوەی بخەون.. کاتێك دەخەون، هەتا ڕۆژ دەبێتەوە خەبەریان نابێتەوە، یەکەم کەسیش ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ بەخەبەر دێت، پاشان ئیمامی عومەر ﷺ بەخەبەر دێت..

ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ لە لای سەری پێغەمبەری خوداوە ﷺ دادەنیشێتو بە دەنگێکی کەمێك بەرز دەست دەکات بە وتنی: الله أکبر، هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ بەخەبەر دێتو نوێژی بەیانییان بۆ ئەنجام دەدات، کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لە نوێژەکەی دەبێتەوە، ئاوڕ دەداتەوەو پیاوێك دەبینێت کە ئامادەی نوێژ نەبووە لەگەڵیان، هەر بۆیە پێی دەفەرموێت: چی ڕێگری لێکردی لەگەڵمان نوێژ نەکەی؟!

پیاوەکەش دەڵێت: تووشی لەش گرانی بوومو ئاویشم دەست نەکەوت.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێدەکات بە خۆڵ تەیەموم بکاتو پاشان نوێژەکەی ئەنجام بدات، دواتر فەرمان بە هاوەڵەکانی دەکات بکەونە ڕێ.. هاوەڵانیش بە هۆی نەبوونی ئاوەوە، زۆر لە نارەحەتیو تینوویەتیدا دەبنو هەر چەندێك دەڕۆن، تووشی هیچ بیرێك یان ئاوێك نابن.. هاوەڵان سکاڵای تینوویەتییان بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ هێنا، بۆ ئەوەی چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە..

پێغەمبەری خوداﷺ بانگی ئیمامی عەلیو پیاوێکی تری کردو داوای لێکردن بچن بە دوای ئاودا بگەڕێن..

ئیمامی عەلیﷻ لەگەڵ پیاوەکەی تردا ڕۆیشتنو بە دوای ئاودا دەگەڕان، لەم کاتەدا ئافرەتێکیان بینی، لە سەر وشترەکەی لە نێوان دوو مەرکانە ئاودا بوو.. پێیان وت: ئەو ئاوەت لە کوێ دەستکەوتووە..

ئافرەتەکەش وتی: نێوانی ئێوەو ئاوەکە شەوو ڕۆژێك دوورە.. پاشان پێیان وت: کەواتە بابڕۆین..

ئافرەتەکە وتی: بۆ کوێ؟!

وتیان: بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ ..

ئافرەتەکە وتی: بۆ لای ئەو پیاوەی کە ئاینەکەی خۆی گۆڕیووە؟!

دوو هاوەڵەکە لەگەڵ ئافرەتەکەدا درێژەیان بە قسە نەداو کەوتنە ڕێ.. ئافرەتەکە بە سەر وشترەکەیەوە لەگەڵیاندا کەوتە ڕێو گەیشتنە لای پێغەمبەری خوداﷺ و پرسیاری ئاوی لێکرد، ئافرەتەکەش وتی: ئاوەکە لێرەوە زۆر دوورەو ڕاشیگەیاند کە ئافرەتێکی لاوازەو دایکی کۆمەڵێك منداڵی بێباوكو هەتیوە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەستی بە سەر هەر دوو مەرکانە ئاوەکەدا هێناو پاشان داوای جامێکی گەورەی کردو ئاوی هەر دوو مەرکانەکەی تێکرد.. پاشان بانگی هاوەڵەکانی کرد بۆ ئەوەی بێن ئاو بخۆنەوە.. هەیان بوو ئاوی دەخواردەوەو هەیان بوو دەفرو کەلوپەلەکانی پڕ لە ئاو دەکردو ئافرەتەکەش سەیری ئاوەکەی دەکرد، کە چی لێدەکەن..

هاوەڵان ئاویان خواردەوەو دەفرو کەلوپەلەکانیان لێ پڕ کرد، ئاوەکە هیچ کەمی نەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ ویستی چاکەیەك لەگەڵ ئافرەتەکەدا بکات، بۆیە داوای لە هاوەڵانی کرد کە خواردنی بۆ کۆ بکەنەوە.. هاوەڵان خورمای عەجوەو ئاردی جۆیان بۆ کۆ کردەوەو کردیانە پڕیاسکەیەکەوەو بۆیان خستە سەر پشتی وشترەکەی، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: خۆ دەزانی کە لە ئاوەکەتمان کەم نەکردەوە، چونکە پەروەردگار تێر ئاوی کردینو تینوویەتی ڕەواندینەوە..

ئافرەتەکە بۆ لای کەسوکاری گەڕایەوە، کاتێك گەڕایەوە پێیان وت: بۆچی

دواکەوتیت؟! ئافرەتەکە وتی: تووشی دوو پیاو بووم‌و بردمیان بۆ لای ئەو پیاوەی کە دەڵێن ئاینەکەی خۆی گۆڕیووە، پاشان ڕووداوی ئاوەکەی بۆ باس کردن‌و وتی: سوێند بە خودا یان گەورەترین‌و بە تواناترین جادووگەرە لە نێوان ئاسمان‌و زەویدا، یان پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودایە.. پاشان لە دوای ئەو ڕووداوەوە ئافرەتەکەو هۆزەکەشی موسڵمان بوون‌و باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ هێنا.. رواه البخاري ومسلم..

بەڵێ.. ئەو ئافرەتە لە یەکەم دیداریدا، کەوتە ژێر کاریگەری پێغەمبەری خودا ﷺ وەو موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، بەڵکو هەڵسوکەوتی جوانی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو بە هۆی ئەوەی هۆزەکەشی موسڵمان بن..

لە ڕۆژێکی تردا پیاوێك دێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ و داوای ماڵ‌و سامانی لێدەکات، پێغەمبەری خوداش ﷺ ڕانە مەڕێکی زۆر گەورەی پێدەبەخشێت.. کاتێك پیاوەکە بە خۆی‌و ڕانە مەڕەکەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی، پێیان دەڵێت: ئەی گەل‌و هۆز، موسڵمان بن‌و باوەڕ بهێنن، بە دڵنیاییەوە محمد ئەوەندە بەخشندەیەو بە شێوەیەك ماڵ‌و سامان دەبەخشێت، هەرگیز لە نەبوونی‌و نەداری ناترسێت!!

ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموێت: کاتێك ئەو پیاوە هات، تەنها سەروەت‌و سامانی لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەویست، بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو، دینی خودای لە هەموو سەروەت‌و سامانی دونیا لە لا خۆشەویستترو بەڕێزتر بوو.. رواه مسلم..

**پێشنیار..**

یەکەم بە یەکتر گەیشتنت لەگەڵ خەڵکیدا، لە ٧٠٪ی وێنەی تۆیان لە خەیاڵدا تۆمار دەبێت، دەی لەگەڵ هەر مرۆڤێکدا بە شێوەیەك هەڵسوکەوت ئەنجام بدە، وەك ئەوەی یەکەمو کۆتا بە یەکتر گەیشتنتان بێت..

# خەڵکی هاوشێوەی کانزاکانی زەوین..

ئەگەر لە خەڵکی ورد بیتەوە، دەبینیت مرۆڤەکان بە هاوشێوەی زەوی، خاوەن سروشتی جیاوازن.. هەندێك لە مرۆڤەکان خاوەن سروشتێکی نەرم‌و نیانن.. هەیانە ڕەق‌و توندن.. هەیانە وەکو زەوییەکی بەپیت، بەخشندەو میهرەبانن.. هەیانە وەك زەوییەکی وشك‌و بێ پیت وان، کە نە ئاو دەگرێتە خۆی‌و نە هیچ ڕووەکێکیشی لێ سەوز دەبێت..

کەواتە مرۆڤەکان جۆراو جۆرن.. ئەگەر ورد بیتەوە دەبینیت کاتێك لەگەڵ چەند جۆرێك لە زەویدا هەڵسوکەوت دەکەیت، ڕەچاوو چاودێری جۆری زەویەکان دەکەیت، کاتێك بە سەر زەوییەکی وشك‌و ڕەقدا هەنگاو دەنێیت، زیاتر بەئاگاو لەسەرخۆییەوە دەڕۆیت، وەك هەنگاونانت بە سەر زەوییەکی نەرم‌و نیاندا.. لە هەنگاونانت بە سەر زەوی یەکەمدا زۆر ئاگاداری خۆت دەکەیت، بەڵام لە دووەمیاندا بە ئاسوودەیی‌و دڵئارامیەوە هەنگاو دەنێیت..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: «إن الله تعالى خلق آدم من قبضة قبضها من جميع الأرض، فجاء بنو آدم على قدر الأرض، فجاء منهم: الأحمر، والأبيض، والأسود، وبين ذلك، والسهل، والحزن، والخبيث، والطيب». رواه الترمذي وأبوداود. واتە: (پەروەردگار باوکە ئادەمی لە چنگێك خۆڵ دروست کرد، چنگە خۆڵەکەش لە هەموو بەشەکانی زەوی پێك هاتبوو، هەر بۆیە مرۆڤەکان هەیانە سوورن، هەیانە سپین‌و هەیانە ڕەش پێستن، لە نێوان ئەوانەشدا هەیانە مرۆڤی ئاسانکارن، هەشیانە غەمبارن، هەیانە پیس‌و بەدکارن، هەشیانە پاك‌و چاکەکارن)..

دەی کاتێك مامەڵەو هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت، ئاگاداربە، جا مامەڵەو هەڵسوکەوتەکەت لەگەڵ کەسە نزیکەکانتدا بێت، وەك باوك‌و دایك‌و هاوسەرو منداڵەکانت، یان لەگەڵ کەسانی تری وەك دراوسێ‌و هاوڕێ‌و فرۆشیارەکاندا بێت.. تێبینی ئەوە بکە کە سروشتی کەسەکان، کاریگەری دەبێت لە سەر بڕیارەکانیشیان، بۆ نموونە: ئەگەر لە نێوان تۆو هاوسەرەکەتدا کێشەیەك ڕووبدات‌و تۆش ڕاوێژو پرس‌و ڕا، بە یەکێك لە هاوڕێکانت بکەیت‌و بشزانیت، کە ئەو هاوڕێیەت، سروشتێکی ڕەق‌و

توندی هەیە، کاتێکیش باسی کێشەکەتان دەکەیت، بڵێیت، بە ڕاستی هاوسەرەکەم کێشەی زۆری هەیە لەگەڵمداو ڕێزم ناگرێت، ڕاوێژو پرسو ڕا بە جەنابتان دەکەم، چی بکەم باشە؟!

بە دڵنیاییەوە پێت دەڵێت، هیچ شتێك لەگەڵ ئافرەتاندا سوودی نیە، چاوسوور کردنەوەو توندو تیژی نەبێت.. هێزو توانای خۆتی پیشان بدە، خۆ تۆ لای خۆی پیاوی!! ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی گروکوڵێك لە ناخی تۆ بەربداتو لەوانەیە بە هۆی ئەو قسانەوە،ماڵو حاڵو ژیانی خۆت تێك بدەیت..

بە هەمان شێوە، بڕۆ بۆ لای هاوڕێیەکت، کە دەزانیت ئەو هاوڕێیەت کەسایەتیو سروشتێکی نەرمو نیانی هەیە، چیت بۆ هاوڕێی یەکەمت باس کرد، بە هەمان شێوە بۆ هاوڕێی دووەمیشتی باس بکەو داوای ڕاوێژو پرسو ڕای لێبکە، بە دڵنیاییەوە پێت دەڵێت، براکەم ئەو ئافرەتە دایکی منداڵەکانتە.. ژیانی خێزانییش بێ کێشەو گرفت نابێتو ئارام بگرەو هەرچیەك بێت خۆ هاوسەرو هاوبەشی ژیانتە..

سەیر بکە.. چۆن سروشتی کەسەکان کاریگەری لە سەر بڕیارەکانیان دروست کرد!! هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ ڕێگری کردووە، لەوەی دادوەرێك لە نێوان دوو کەسدا دادبینی بکات، لە کاتێکدا دادوەرەکە برسی، یان تینوی بێت، یان پێویستی بە سەرئاو هەبێت، لەبەر ئەوەی ئەم هۆکارانە گۆڕانکاری لە دەروونیدا دروست دەکەنو پاشانیش کار دەکەنە سەر چۆنیەتی بڕیاردان لە دادبینیەکەداو گۆڕانکاری دروست دەبێت..

لە نەتەوەو گەلانی پێشوودا، پیاوێکی خوێن ڕێژ هەبوو!! خوێن ڕێژ؟! بەڵێ.. خوێن ڕێژ!! بکوژی پیاوێك، یان دووان، یان دە نەبوو!! بەڵکو بکوژی نەوەدو نۆ کەس بوو.. ناشزانم چۆن لە تۆڵەی خەڵکی ڕزگاری ببوو، لەوانەشە ئەوەندە ترسناك بوو بێت، کەس نەی وێرا بێت نزیکی بکەوێت!! بە هەر حاڵ ئەم کابرایە نەوەدو نۆ کەسی کوشتبوو..

پاش ئەم هەموو گوناهو تاوانە، ڕۆژێك ئەم پیاوە بیر لەوە دەکاتەوە، کە بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو داوای لێخۆشبوونی لێ بکات.. بۆ ئەم مەبەستەش پرسیاری دەربارەی زیرەکترین کەسی سەر زەوی کرد، پیاوێکیان نیشاندا، کە بەردەوام خەریکی نوێژو خوداپەرستی بوو.. کاتەکانی بە گریانو پاڕانەوە بە سەر دەبردو کەسێکی زۆر دڵ نەرم بوو.. پیاوکوژەکە دەچێتە لای پیاوچاکەکەو لە بەردەمیدا دەوەستێت، پاشان

دەڵێت: من بکوژی نەوەدو نۆ کەسم، ئایا بۆم هەیە پەشیمان ببمەوەو بگەڕێمەوەو تەوبە بکەم؟!

گومانی پیاوچاکەکە بە شێوەیەك بوو، ئەگەر بە نەزانیش مێروولەیەکی بکوشتایە، دەبووایە ڕۆژەکانی بە گریانو پەشیمانی بە سەر ببردایە، ئەی دەبێت ئێستا وەڵامی کەسێك چۆن بداتەوە، کە بە دەستی خۆی نەوەدو نۆ کەسی کوشت بێت؟!

پیاوچاکەکە شڵەژاو بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: نەخێر تۆ ماف پەشیمانیو تەوبە کردنت نیە!! ماف پەشیمانیو تەوبە کردنو گەڕانەوەت بۆ لای پەروەردگار نیە!! ئەم وەڵامەش وەڵامێکی چاوەڕوان کراوە، بۆ کەسێك کە زۆر سۆزدارو نەرمو نیان بێت، هەر بۆیە کاتێك کابرای پیاوکوژ، گوێی لەم وەڵامە دەبێت، تووڕە دەبێتو چاوی سوور هەڵدەگەڕێتو هەر لەوێدا پیاوچاکەکەش دەکوژێتو ژمارەی کوژراوەکانی دەکات بە سەد کوژراوو دەڕوات.. ڕۆژەکان تێپەڕینو بۆ جارێکی تر پیاوکوژەکە لەگەڵ خۆیدا کەوتەوە ڕازو نیازو دوبارە ویستی تەوبە بکاتو بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار، ئەمجارەشیان پرسیاری دەربارەی زیرەکترین کەسی سەر زەوی کرد، پیاوێکی تری زیرەكو شارەزایان نیشانداو ئەمیش بەرەو لای کەوتە ڕێ، کاتێك گەیشتە لای پیاوچاکەکەو لە بەردەمیدا وەستا، پاشان پرسیاری لێکردو زۆر بوێرانە وتی: من سەد کەسم کوشتووە، ئایا دەتوانم تەوبە بکەمو بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگار؟!

پیاوچاکە زاناکەش لە وەڵامدا دەڵێت: پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگار، چ شتێك دەتوانێت ڕێگری تەوبەو پەشیمانیت لێبکات؟! ئەی بۆ ناتوانیت؟!

بە ڕاستی وەڵامێکی دڵخۆشکەری دایەوە!! زۆر ڕاستە، ئەی بۆ ناتوانێت پەشیمانی دەربڕێتو ڕوو بکاتەوە پەروەردگارو بە دڵو بە کوڵ داوای لێخۆشبوون لە خودا بکات؟! ئەو پەروەردگارەی لە ئاسمانە، هیچ هێزو توانایەك ناتوانێت ڕێگریت لێ بکاتو نەیەڵێت، بگەڕێیتەوە بۆ لایو پەشیمانی خۆتی بۆ دەربڕیت!! ئەم پیاوچاکە زانایە، لە سەر بنەمای شەرعو زانستو زانیاری ئەم وەڵامەی دایەوە، نەك لە سەر بنەمای هەستو سۆز.. پاشان بە پیاوکوژەکەی وت: بەڵام تۆ لە ناوچەیەکی خراپدایت!

سەیرە!! چۆن زانی، ئەو ناوچەیە ناوچەیەکی خراپە؟! لە سەر ئەو بنەمایە، ئەم زانیاریەی زانی، کە کوشتار لەو ناوچەیەدا زۆر بڵاو بووە، هەتا گەیشتووەتە ئاستێك

کەسێك نەبووە، پشتگیری لە لاوازو ستەم لێکراوان بکات..
بەڵێ.. وتی: تۆ لە زەوی‌و ناوچەیەکی خراپدایت، برۆ بۆ فلانە ناوچە، چونکە لەوێ کۆمەڵە کەسێکی لێیە، پەروەردگار دەپەرستن، تۆش لەگەڵیاندا خوداپەرستی بکە..
پیاوە تۆبەکارەکە بە دڵێکی گەڕاوە بۆ لای پەروەردگارەوە کەوتە ڕێ، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە ئەو ناوچەیەی کە دەیویست بۆی بچێت، گیانی سپارد.. هەر دوو فریشتەی ڕەحمەت‌و فریشتەی سزا دابەزین بۆ لای.. فریشتەی ڕەحمەت‌و بەزەیی وتی: ئەم پیاوە، پیاوێکی گەڕاوەو تۆبەکارە.. فریشتەی سزاش دەڵێت: بەڵام ئەم پیاوە هەرگیز هیچ کارێکی باشی ئەنجام نەداوە!!
خودای پەروەردگار لە شێوەی پیاوێکدا فریشتەیەکی بۆ ناردن، بۆ ئەوەی دادوەریان لە نێواندا بکات، دادبینەکەشی بریتی بوو لە پێوانە کردنی نێوان هەر دوو ناوچەکە، ناوچە خراپەکەی کە لێوەی هاتبوو، لەگەڵ ئەو ناوچە چاکەی کە دەیویست بۆی بچێت‌و کۆچی بۆ بکات، بۆ ئەوەی بزانن لە کام ناوچەیانەوە نزیکترە.. پەروەردگار نیگاو سروشتی بۆ زەوی ناوچە باشەکە کرد، کە بێنەوە یەك‌و لێك نزیك ببنەوە، هەروەها بۆ زەوی ناوچە خراپەکەش، لێك دوور بکەونەوە..
کاتێك زەوی هەر دوو ناوچەکەیان پێوا، بینییان لە ناوچە باشەکەوە زیاتر نزیکە، هەر بۆیە فریشتەی ڕەحمەت‌و بەزەیی، لەگەڵ خۆی بردی..
بە داخەوە دەبینین ئەو کەسانەش کە زاناو شارەزاو موفتین، زۆر جار دەکەونە ژێر کاریگەری هەست‌و سۆزو بەزەییانەوە..
لە بیرم دێت، دراوسێیەکمان هەبوو، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا زۆر ناکۆك بوو.. کێشەو گیروگرفتیان ئەوەندە زۆر بوو، کار گەیشتە ئەوەی ڕۆژێك تەلاقێکی هاوسەرەکەیدا، پاشان گێڕایەوەو بۆ جاری دووەم تەلاقێکی تری هاوسەرەکەیداو ئەمجارەش گێڕایەوەو هێنایەوە بۆ ماڵەوە.. هەر جارێك ئەو دراوسێیەمانم ببینیایە، ئاگادارم دەکردەوەو ئامۆژگاریم دەکردو پێم دەوت: منداڵەکانت وردن، ماڵ‌و حاڵ لە خۆت تێك مەدە، تەنها یەك تەلاقت ماوە، ئەگەر ئەو تەلاقەش بەکاربهێنیت، ئەمجارەیان ناتوانی هاوسەرەکەت بگێڕیتەوە، مەگەر شوو بە پیاوێکی تر بکاتەوەو پاشان بە ئارەزووی خۆی تەلاقی بدات‌و ئینجا تۆ مارەی بکەیتەوە، لە خودا بترسەو ئاگاداری خۆت بە!!
ڕۆژێك بە ڕوخسارێکی شڵەژاوەوە هات بۆ لام‌و وتی: یا شێخ، ناکۆکی‌و ئاژاوە کەوتە

نێوانمانەوەو تەڵاقی سێیەمیشمدا.. ئەم قسەیەیم بە لاوە سەیرو چاوەڕوان نەکراو نەبوو، بەڵکو ئەوەم بە لاوە زۆر سەیر بوو، کە وتی: ماموستایەکی خۆشەویستو بەڕێز ناناسی، بۆ ئەوەی فتوام بۆ بداتو هاوسەرەکەم بگێڕمەوە؟!

سەرسام بووم بە قسەکەی، پاشان بیرم کردەوەو لە حاڵی کەسانێك ورد بوومەوە، کە پێش کەمێك باسمان کردن، کە هەندێك کەس لە کاتی بڕیاردانو فتواکانیاندا، دەکەونە ژێر کاریگەری هەستو سۆزیانەوە..

کاتێك شارەزای سروشتی هەندێك کەس دەبیتو دەزانیت زۆر حەزی بە کۆکردنەوەی سەروەتو سامانو پارەو پووڵە، تەنانەت لە پێناو پێکەوەنانی پارەو پووڵدا ماڵو منداڵەکانیشی پشتگوێ دەخات، لەبەر ئەوە کاتێك بڕیارێك دەدات، لە لات سەیر نەبێت، کە بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو سروشتەی خۆیەوە، کە بریتیە لە حەزی زۆری بۆ سەروەتو سامان.. هەر بۆیە کاتێك داوای شتێکی لێدەکەیت، پێش ئەوەی داواکاریەکەتی پێ بڵێیت، دەبێت ئەوە بخەیتە خەیاڵی خۆتەوە، کە ئەو کەسە زۆر سەروەتو سامانی خۆشدەوێت، هەر بۆیە هەوڵبدە بەرەنگاری ئەو سروشتەی مەبەرەوەو دژی مەوەستە، هەتا ئەوەی دەتەوێت بە دەستی بهێنیتو داواکاریەکەت جێبەجێ بکات..

بۆ نمونە: گریمان دەچیت بۆ نەخۆشخانەیەك لە پڕ هاوڕێیەکی سەردەمی زانکۆت دەبینیتو میوانداری لێدەکەیت، بۆ ئەوەی بێت بۆ ماڵتانو میوانتان بێت، ئەویش ڕازی دەبێت، پاشان دەچیت بۆ بازارو شمەكو پێداویستیەکانی میوانداریەکە دەکڕیتو دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوەو خۆت ئامادە دەکەیتو پەیوەندی بە چەند هاوڕێیەکی ترتەوە دەکەیت، بۆ ئەوەی ئەوانیش ئامادەبنو هاوڕێکەی سەردەمی زانکۆشیان ببینن، لە نێوان ئەو کەسانەشدا، یەکێکیان کەسێکی ڕەزیلەو پارەو پووڵی زۆر خۆشدەوێت، پەیوەندی پێوە دەکەیت، یەکسەر دەڵێت: ئاها! خۆزگە دەمتوانی ئامادە بمو فلانە هاوڕێ ببینم، بەڵام بە داخەوە کارێکی زۆر گرنگم هەیە، سلاوی منی پێ بگەیەنەو لەوانەیە لە کاتێکی تردا بیبینم!!

کاتێك گوێت لەم قسانەی دەبێت، تێدەگەیت لەبەر ئەوە ئامادە نیە بێت بۆ میوانداریەکە، چونکە دەترسێت ناچار بێت ئەویش تۆو میوانەکانت بانگهێشت بکاتو پارەو پووڵێکی زۆر خەرج بکات.. هەر بۆیە تۆش پێی دەڵێیت: میوانەکان هەر ئەمشەو دەمێننەوەو بەیانی زوو دەڕۆن بۆ دەرەوەی ولات.. ئەویش دەڵێت:

ئۆها!! کەواتە کارەکانم دوا دەخەم‌و دێم بۆ ئەوەی بیان بینم!!

هەندێك کەس زۆر کۆمەڵایەتین‌و باپەندن بە ماڵ‌و منداڵ‌و خێزانیانەوەو ناتوانن لە دووریيان بژین.. داوای هەموو شتێکیان لێبکە، بەڵام داوای ئەوەیان لێ مەکە، کە لەماڵ‌و منداڵیان دوور بکەونەوە.. کەواتە داوای شتێك لە کەسێك مەکە، کە توانای جێبەجێ کردنی ئەو شتەی نەبێت..

هەندێك کەس جێگەی سەرسورمانن، کاتێك دەیانبینیت لە ڕاکێشان‌و بە دەست هێنانی هەموو جۆرە دڵ‌و دەروونێکدا، زۆر لێزان‌و شارەزان.. کاتێك لەگەڵ کەسانێکی ڕەزیل‌و چروکدا دەبن، نایان شکێنن‌و نارەحەتیان ناکەن، ئەو کاتەش لە لای ئەو کەسانە خۆشەویست دەبن.. کاتێك لەگەڵ کەسانێکدا دەبن، کە زۆر سۆزدارن، ئەمانیش بەو شێوە سۆزداریە هەڵسوکەوت دەکەن.. کاتێك لەگەڵ کەسانێکدا دەبن، کە حەزیان لە گاڵتەوگەپ‌و قسەی خۆشە، ئەمانیش دڵیان ناشکێنن‌و لە دوایشدا دەتوانن دڵ‌و دەروونی ئەو کەسانە بە دەست بهێنن‌و لە لایان خۆشەویست بن..

بە بیر و ئەندێشەت، کەمێك لەگەڵمدا بمێنەرەوەو سەیری هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خودا ﷺ بکە، کاتێك سوپای موسڵمانانی بەرەو ڕزگارکردنی شاری مەککە بە ڕێ دەکرد..

پێش ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە خۆی‌و سوپاکەیەوە بچێتە شاری مەککەوە، ئەبوسوفیان چوو بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ و موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند.. کاتێك موسڵمان بوو، عەباسی مامەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە پێغەمبەری خودا ﷺ ی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەبوسوفیان، پیاوێکە حەزی بەوە هەیە ڕێزی لێ بگیرێت‌و پلەو پایەیەکی پێبدرێت، بۆ ئەوەی شانازی پێوە بکات، کارێکی بۆ ئەنجام بدە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: زۆر باشە، هەر کەسێك بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە، ئەوا پارێزراو دەبێت.. هەر کەسێکیش دەرگای ماڵەکەی لە سەر خۆی پێوە بدات، ئەوا پارێزراو دەبێت.. هەر کەسێکیش بچێتە ناوکەعبەی پیرۆزەوە، ئەوا پارێزراو دەبێت..

کاتێك ئەبوسوفیان ویستی بگەڕێتەوە بۆ شاری مەککە، پێغەمبەری خودا ﷺ سەیرێکی ئەبوسوفیانی کرد، ئەو ئەبوسوفیانەی بێباوەڕانی هاندا بۆ ئەنجامدانی شەڕی بەدرو ئوحودو خەندەق.. ئەو ئەبوسوفیانەی لە ناو جەنگدا گەورە ببوو..

ئێستاش تازە موسڵمان بووەو باوەری هێناوە، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوداﷺ ویستی هێزو توانای سوپای موسڵمانان، نیشانی ئەبوسوفیان بدات.. پێغەمبەری خوداﷺ بانگی عەباسی مامەی کردو فەرمووی: ئەی عەباس، ئەبوسوفیان لە بەرزاییەکدا رابگرە، بۆ ئەوەی کاتێك سوپای موسڵمانان تێدەپەرن، بە چاوی خۆی هێزو توانای موسڵمانان ببینێت.. هەر لەشکرێك لە لەشکری سوپای موسڵمانان بە بەیداخو ئاڵای تایبەت بە خۆیانەوە دەهاتن..

کاتێك لەشکرێك تێدەپەری، ئەبوسوفیان دەیووت: عەباس ئەمانە کێن؟! عەباسیشﷺ دەیفەرموو: ئەمە لەشکری فلانە..

ئەبوسوفیان دەیووت: ئەی ئەمەیان؟!

عەباسیشﷺ دەیفەرموو: ئەمەش لەشکری فلانە.. یەك یەك لەشکرەکان تێپەرینو هەموو جارێکیش ئەبوسوفیان پرسیاری لە عەباسﷺ دەکرد، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ لەشکری سەوز پۆشەکاندا هات، کە پێکهاتبوو لە کۆچکەرانو پشتیوانان، جەستەیان بە زرێ داپۆشی بوو، جگە لە چاوەکانیان هیچ شوێنێکیان نەدەبینرا..

ئەبوسوفیان کاتێك ئەم لەشکرە گەورەیەی بینی، وتی: پاكو بێگەردی بۆ خودا، ئەی عەباس ئەمانە کێن؟! عەباسیشﷺ فەرمووی: ئەوە پێغەمبەری خودایەﷺ لە ناو کۆچکەرانو پشتیوانان‌دا.. پاشان ئەبوسوفیان وتی: سوێند بە خودا هیچ کەسێك ناتوانێت بەرەنگاری ئەمانە ببێتەوە، هەروەها دەڵێت: ئەی عەباس بە راستی هێزو سوپای برازاکەت گەورەو بەهێزە!! عەباسیشﷺ دەفەرموێت: ئەی ئەبوسوفیان ئەوە هێزو توانای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خودایەﷺ .. ئەبوسوفیانیش دەڵێت: بەڵێ وایە.. پاشان عەباسﷺ هاوار دەکاتو دەفەرموێت: ئەبوسوفیان پەلە بکەو فریای هۆزەکەت بکەوە!!

ئەبوسوفیانیش زۆر بە پەلە، بەرەو شاری مەککە دەگەرێتەوەو بە دەنگی بەرز دەڵێت: ئەی قورەیش، ئەوە محمد هاتو هیچ چارێکیشتان نیە، هەر کەسێکتان بێتە ماڵەکەی منەوە، پارێزراو دەبێت.. ئەوانیش دەڵێن: خودا بتکوژێت، هەمووومان لە ماڵی تۆدا چۆن جێگەمان دەبێتەوە؟! ئەبوسوفیان ئەمجارەیان دەڵێت: هەر کەسێکیش دەرگای ماڵەکەی لە سەر خۆی دابخات، پارێزراو دەبێت، هەر کەسێکیش بچێتە کەعبەی پیرۆزەوە، پارێزراو دەبێت.. خەڵکەکەش بەرەو ماڵەکانیانو بەرەو

کەعبەی پیرۆز بڵاوەی لێدەکەن..

بەرزیو پیرۆزی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ چۆن کاری کردە سەر ئەبوسوفیانو بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد، کە لەگەڵیدا گونجاو بوو..

لێرەدا دەمەوێت ئەوە بڵێم: پێش ئەوەی کەسێك بدوێنیت، پێویستە کەسایەتیو سروشتی ئەو کەسە بناسیت، لەبەر ئەوەی ئەگەر زانیاریت دەربارەی کەسایەتیو سروشتی ئەو کەسە هەبێت، ئەو کاتە یارمەتیت دەدات بۆ ئەوەی بتوانیت باشترو جوانتر گفتوگۆو هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەیت..

پێغەمبەری خوداﷺ بە مەبەستی ئەنجامدانی عومرە، لەگەڵ هەزارو چوار سەد موسڵماندا بەرەو شاری مەککە کەوتنە ڕێ، بۆ ئەوەی خەڵکیش بزانن، بۆ سەردانو بە گەورە زانینی ماڵی خودا دەڕۆن، حەفتا وشتریان بۆ سەربڕین لەگەڵ خۆیان برد.. موسڵمانان گەیشتنە نزیك شاری مەککە، بەڵام قوڕەیش ڕێگرییان لە چوونە ژوورەوەی موسڵمانان کرد، پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانی لە ناوچەیەك لایاندا، کە بە ناوچەی (حودەیبیە) ناسرا بوو.. قوڕەیش چەند پیاوێکیان نارد بۆ ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ دانوستان بکەن..

یەکەم کەس کە قوڕەیش ناردی، مکرزی کوڕی حفص بوو.. ئەم پیاوە قوڕەیشی بوو، بەڵام پابەندی پەیمانو ڕێکەوتننامە نەدەبوو، بەڵکو کابرایەکی خراپەکارو بەدخوو بوو.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئەم پیاوەی بینی، فەرمووی: ئەو پیاوە، پیاوێکی خراپو خیانەتکارە.. کاتێك دەستیان بە گفتوگۆ کرد، پێغەمبەری خوداﷺ بە شێوەیەك قسەی لەگەڵ دەکرد، کە لەگەڵیدا گونجاو بووایەو ئاگاداریشی کرد، کە بۆ ئەنجامدانی عومرە هاتوون، نەك بۆ جەنگ، هیچ پەیمانێکیشی لەگەڵ نەبەست، لەبەر ئەوەی دەیزانی ئەم پیاوە، شیاوی ئەو کارە نیە.. مکرز چۆن هاتبوو، بەو شێوەیەو بە بێ ئەنجام گەڕایەوە..

پاشان قوڕەیش حەلیسی کوڕی عەلقەمەیان نارد.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئەم پیاوەی بینی، فەرمووی: ئەم پیاوە لە هۆزێکدایە، کە زۆر خوداپەرستی دەکەن، دەی ئەو وشترو مەڕوماڵاتەی نیشان بدەن، کە بۆ سەربڕین هێناومانن، بۆ ئەوەی بیان بینێت.. کاتێك وشترو مەڕوماڵاتەکانی بینی، شڵەژا!! چۆن دەبێت ڕێگری لە کەسانێك بکرێت، کە دەیانەوێت بە مەبەستی عومرە سەردانی کەعبەی پیرۆز بکەن؟! حەلیس گەڕایەوەو قوڕەیشی لەوە ئاگادار کرد، کە بەڵێ محمدو هاوەڵانی

مەبەستیان ئەنجامدانی عومرەیە، نەك شەڕو كوشتار.. ئەوانیش پێیان وت: دانیشە، تۆ كەسێكی دێهاتیتو هیچ نازانیت.. حەلیس كاتێك گوێی لەم قسەیە بوو، تووڕە بوو، پاشان وتی: ئەی قورەیش، سوێند بە خودا لە سەر ئەم كارانە پەیمانمان لەگەڵدا نەبەستوون، ئایا ڕێگری لە كارێك دەكەن، كە بە گەورەدانانو ڕێزو شكۆی كەعبەی پیرۆزی تێدا بێت؟!

سوێند بە خودا، یان دەبێت واز لە محمدو هەموو ئەو كەسانە بهێنن، كە بە مەبەستی ئەنجامدانی عومرە، دەیانەوێت بێن بۆ مەككە، یان هەموو پیاوانی هۆزەكەم دەگێڕمەوە.. بێباوەڕانی قورەیشیش پێیان وت: بێدەنگ بەو وازمان لێ بهێنە، هەتا شتێك دەكەین، كە پێی ڕازی بین..

پاشان ویستیان عوروەی كوڕی مەسعودی سەقەفی بنێرن، عوروەش بە قورەیشیەكانی وت: ئەی قورەیش بینیتان ئەو كەسانەی كە بە نوێنەری خۆتان ناردتانن، جگە لە قسەی ڕەقو توندو تیژ، هیچی تریان بۆ نەهێنانەوە، دەشزانن ئێوە وەك باوك وان بۆ منو منیش وەك كوڕ وام بۆ ئێوە.. ئەوانیش وتیان: ڕاست دەكەیتو هیچ جێگەی گومان نیت، بەم شێوە ئەمجارەیان عوروەیان بە نوێنەری قورەیش نارد..

عوروە گەورەی هۆزەكەی بوو، خاوەن ڕێزو پلەو پایە بوو، كاتێك گەیشتە لای پێغەمبەری خوداﷺ، لە بەردەمیدا دانیشتو پاشان وتی: ئەی محمد گەنجو لاوەكانت كۆكردۆتەوەو هێناوتن بۆ سەر قورەیش، قورەیشیەكانیش پێستی پڵنگیان لەبەر كردووەو پەیمانیان داوە بە زۆرو بەهێز نایەڵن بچیتە مەككەوەو لە بەر چاویشمە بەیانی چیت بە سەر دێتو چۆن هاوەڵانت بە تەنها جێت دەهێڵن!!

ئیمامی ئەبوبەكرﷺ لەم كاتەدا لە پشت پێغەمبەری خوداوەﷺ وەستا بوو، فەرمووی: ئێمە پشت لە پێغەمبەری خوداﷺ دەكەینو جێی دەهێڵین؟!

عوروە زۆری لەلا سەیر بوو كەسێك بتوانێت ئاوا وەڵامی بداتەوە، هەر بۆیە وتی: ئەی محمد ئەمە كێیە؟!

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: ئەوە ئەبوبەكرە، ئەبوبەكر!!

لە دوای ئەمەوە عوروە، بە نەرمو نیانی لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ قسەی دەكردو دەستی بۆ ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ دەبرد.. موغیرەی كوڕی شوعبەی سەقەفی برازاشی لە پشت سەری پێغەمبەری خوداوەﷺ وەستا بوو، بە پارچەیەك ئاسنو زرێ ڕوخساری داپۆشی بوو، هەر كاتێك عوروە دەستی لە ڕیشی

پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ نزیك دەكردەوە، موغیرە بە شمشێرەكەی لە دەستی عوروەی دەداو دووری دەخستەوە.. جاری دووەمیش عوروە دەستی لە ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ نزیك كردەوە.. ئەمجارەش موغیرە بە شمشێر دەستی عوروەی دوورخستەوە.. كاتێك بۆ جاری سێیەم عوروە دەستی بۆ ڕیشی پێغەمبەری خوداﷺ درێژ كردەوە، موغیرە وتی: بە شمشێر دەستت ببڕم، یان دەستەكانت لە ڕوخساری پێغەمبەری خوداﷺ دوور دەخەیتەوە؟! عوروەش دەڵێت: هاوار بۆ من، بۆ ئاوا توورەیە؟! ئەی محمد ئەمەیان كێیە؟!

پێغەمبەری خوداشﷺ بە زەردەخەنەوە پێی دەفەرموێت: ئەوە برازاكەتە، موغیرەی كوڕی شوعبەی سەقەفی.. عوروەش دەڵێت: ئەی ستەمكار، دوێنێ نەبوو تۆ باوەڕت هێناو موسڵمان بوویت؟! پاشان عوروە هەڵدەستێتو دەگەڕێتەوە بۆ لای قوڕەیشو دەڵێت: ئەی گەلو هۆز.. سوێند بە خودا، بە نوێنەرایەتی چوومەتە لای پادشاكان.. بۆ لای قەیسەری ڕۆم.. بۆ لای نەجاشی.. كەسیانم نەبینیووە، بە هاوشێوەی محمد لە ناو دۆستو هاوەڵانیدا گەورەو بەڕێزو خۆشەویست بوو بێت!! بەم قسانەی عوروە، ترسێكی گەورە كەوتە دڵو دەروونی قوڕەیشەوەو ئەمجارەیان سوهەیلی كوڕی عەمریان نارد بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ..

سوهەیل كەوتە ڕێو كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە دوورەوە بینی، فەرمووی: كارەكەتان ئاسان بوو، پاشان ڕێكەوتننامەی حودەیبیە لە نێوانیاندا نوسراو مۆر كرا..

ئەمە بەشێك بوو لە زانیاری پێغەمبەری خوداﷺ لە بارەی جۆراوجۆری و جیاوازی دەربارەی خەڵكیو بەكارهێنانی شێوازو ڕێگەی گونجاو، بۆ هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ هەر تاكێكدا.. ئەمەش بە پێی سروشتی كەسەكان دەگۆڕێتو دەتوانیت هەستی پێ بكەی لە كاتی قسە كردندا، هەروەها لە كاتی مامەڵەو هەڵسوكەوتدا..

لە بیرم دێت، لە بەشێكی وتاری هەینیدا باسی شەهید كردنی ئیمامی عومەرمؓ كرد.. كاتێك گەیشتمە باسی چۆنیەتی لێدانی خەنجەرەكانی ئەبولۆلۆەی ئاگرپەرست لە جەستەی ئیمامی عومەرؓ، بەدەنگێكی بەرز هاوارم كردو وتم: لە پڕ ئەبولۆلۆە لە ناو میحرابەكەدا، هێرشی كردە سەر ئیمامی عومەرؓ، پاشان سێ خەنجەری لێدا.. خەنجەرێكیانی دا لە سنگیو دووەمیان لە سكی.. پاشان هەموو هێزی كۆكردەوەو زۆر بە توندی خەنجەری سێیەمی چەقاند بە ژێر ناوكیداو هەندێك لە ڕیخۆڵەكانی

هاتنە دەرەوە..

سەیری ئامادەبووانم دەکردو تێبینی ئەوەم کرد، کاریگەری قسەکانم لە سەریان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تریان جیاوازە.. هەیان بوو بە شێوەیەك چاوەکانیان ئەبلەق ببوو، وەك ئەوەی بە چاوەکانی خۆی سەیری ئەنجامدانی ئەو تاوانە گەورەیە بکات.. هەیان بوو دەگریا.. هەیان بوو هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆی پێوە دیار نەبوو، وەکو ئەوە وا بوو، گوێ بیستی چیرۆکی پێش خەوتن بێت!!

بە هەمان شێوەی پێشوو، دەتوانیت ڕووداوی شەهید کردنی حەمزەﷺ بە نمونە بهێنینەوە، کاتێك لە جەنگی ئوحوددا شەهیدی دەکەن‌و سکی لەت دەکەن‌و جگەری دەردەکەن‌و پاشان گوێچکەو لووتی دەبڕن، لە کاتێکدا حەمزەﷺ گەورەی شەهیدانی بەهەشتەو شێری خوداو پێغەمبەرەکەیەتیﷺ..

بە شێوەیەکی گشتی ژیان فێری کردم، خەڵکی وا هەیە زۆر نەزان‌و نەفامەو ناتوانێت کۆنترۆڵی قسەو هەڵسوکەوتەکانی بکات..

پیاوێك لەو جۆرە کەسانە، ڕۆژێك لە کۆڕو دانیشتنێکی گشتیدا دادەنیشێت‌و باسی ڕووداوێکی خۆی لەگەڵ دوکاندارێکدا دەکات، لە نێوان قسەکانیدا دەڵێت: کابرای دوکاندار، ئەوەندە گەورە بوو، هەر وەك گوێدرێژێك، پاشان وتی: وەکو خالید وابوو!! ئاماژەی بۆ پیاوێك کرد، کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو!! هەستی بەوە نەکرد چۆن خالیدی بە دوکاندارەکە چواند، لە کاتێکدا پێشتر وتبووی: دوکاندارەکە وەکو گوێدرێژ گەورەو زل بوو!!

پرسیارێك دێتە ئاراوە، کە بریتیە لەوەی: ئایا دەتوانیت گۆڕانکاری لە سروشت‌و هەڵسوکەوتی خۆتدا بکەیت، بۆ ئەوەی بتوانیت بە شێوەیەکی ئاسایی تێکەڵی خەڵکی بکەیت‌و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەیت؟!

ئیمامی عومەرﷺ، بە بەهێزی‌و بە توانایی ناسرا بوو.. ڕۆژێك پیاوێك لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کێشەو دەمەقاڵە دەکەوێتە نێوانیان، هەر بۆیە دەچێت بۆ لای ئیمامی عومەرﷺ، بۆ ئەوەی سکاڵای هاوسەرەکەی لە لا بکات، کاتێك لە بەردەم دەرگای ماڵی ئیمامی عومەرﷺ دەوەستێت‌و دەستی درێژ دەکات بۆ ئەوەی لە دەرگا بدات، گوێی لە دەنگە دەنگی هاوسەرەکەی ئیمامی عومەرﷺ دەبێت، کە بە سەر ئیمامی عومەرداﷺ هاوار دەکات‌و ئەویش بێدەنگەو نە لێی دەدات‌و نە هاواریشی بە سەردا دەکات!! پیاوەکەش پشت هەڵدەکات‌و دەیەوێت بڕوات، ئیمامی عومەریشﷺ هەست

دەکات کەسێك لە پشت دەرگاکەوە بووە، هەر بۆیە دێتە دەرەوەو بانگی پیاوەکە دەکاتو دەڵێت: ئەوە بۆ گەڕایتەوە؟!

پیاوەکەش دەڵێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، هاتم بۆ ئەوەی سکاڵای هاوسەرەکەمت لە لابکەم، کەچی گوێم لێبوو هاوسەرەکەی تۆ لەوەی من خراپتر هاوار هاوار دەکاتو دەنگت بە سەردا بەرز دەکاتەوە!!

ئیمامی عومەرﷺ لە وەڵامدا دەفەرموێت: کاکی برا، ئەوە هاوسەری ژیانمە.. خواردنم بۆ ئامادە دەکاتو جل‌وبەرگم بۆ دەشوات، ئایا نابێت لە سەر هەندێك لە کەم‌وکوڕیەکانی ئارام بگرم؟!

بەشێوەیەکی گشتی، هەندێك کەس هەن، چارەسەریان نیەو دەبێت لەگەڵیان بیگوزەرێنیتو ئارامگر بیت.. هەندێك کەس سکاڵای ئەوە لە باوکیان دەکەن، کە زۆر زۆر توورەیە.. یان مێردەکەی زۆر ڕەزیلە.. یان.. هتد.. زۆر ڕێگەو هۆکارم گرتە بەر، سوودی ئەوەم لێیان بینی، کە هەموو ڕێگەو هۆکارەکانم تاقی کردەوە، بەڵام بێ سوود بوون!!

ئەی چارەسەر چیە؟! چارەسەر ئەوەیە، لە سەر هەڵسوکەوتو گوفتارو ڕەفتاریان ئارامگر بینو خراپەکانیان لە دەریای چاکەکانیاندا نوقم بکەینو لە بەر چاوی خۆمان ونیان بکەینو چاکەکانیان بێنینە پێش چاومانو بە پێی توانا لەگەڵیاندا خۆمان بگونجێنین، لەبەر ئەوەی هەندێك کێشەو گرفت، چارەسەریان نیە..

**ئەنجام..**

هەبوونی زانیاری لە بارەی سروشتو هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەی کە تێکەڵییان دەکەیت، بە توانات دەکەن، بۆ ئەوەی خۆشەویستییان بە دەست بهێنیت..

# تاڵە مووەکەی معاویە ﷺ..!!

وانەی بیرکاری بە قوتابیانی کۆتا ساڵی دواناوەندی دەوتەوە.. هەستی بەوە کرد، کە هەندێك لە قوتابیەکان گوێ بە وانەکانیان نادەن‌و ئەرکەکانیان پشتگوێ دەخەن، هەر بۆیە ویستی بیان هێنێتەوە سەر ڕێگەو ئامۆژگاریان بکات..

ڕۆژێك چووە پۆلەوەو لە دوای دانیشتنی لە سەر کورسیەکەی بە وتەیەك تووشی شۆك‌و سەرسوڕمانی کردن‌و وتی: هەر یەکێکتان، پەڕتوکەکەی لە تەنیشتیەوە دابنێت‌و قەڵەم‌و کاغەز دەربهێنێت!!

هەموو وتیان: لەبەر چی مامۆستا؟!

مامۆستاکەش دەڵێت: تاقیکردنەوەیە.. تاقیکردنەوەیەکی کت‌وپڕ.. قوتابیەکان بە نارەزاییەوە، داوای مامۆستاکەیان جێبەجێ کرد.. لە نێوان قوتابیەکاندا قوتابیەکی بە جەستە گەورەو بە عەقڵ‌و ژیری بچوك هەبوو، کەسێکی بە کێشە بوو، زووش تووڕە دەبوو، بە دەنگی بەرز هاواری کردو وتی: مامۆستا.. نامانەوێت تاقیکردنەوە ئەنجام بدەین.. قوتابیەکە ئەم قسانەی زۆر بە تووڕەیی‌و بە دەنگێکی بەرز دەربڕی.. هەر بۆیە مامۆستاکە وروژاو تووڕە بوو، پاشان وتی: خۆ بە ئارەزووی تۆ نابێت، بە زۆر دەبێت تاقیکردنەوە ئەنجام بدەیت، تێگەیشتیت؟! ڕازیت باشە، ئەگەر نا بچۆرە دەرەوە!!

قوتابیەکەش تووڕە بوو، بە دەنگی بەرز هاواری کردو وتی: تۆ بچۆرە دەرەوە!! مامۆستاکە بەرەو ڕووی قوتابیەکە ڕۆیشت‌و دەستی کرد بەم قسانە، ئەی کەم ڕەوشت.. ئەی پەروەردە نەکراو.. ئەی..!! بەردەوامیش لێی نزیك دەبۆوە.. قوتابیەکەش ڕاپەڕی‌و بەرامبەری وەستا، پاشان ئەوە ڕوویدا کە ڕوویداو مەپرسە چی لە مامۆستاکە کرد!!

ئەم ڕووداوو کێشەیە گەیشتە بەڕێوەبەرایەتی دواناوەندیەکەو سزای قوتابیەکەش درا، بە لێشکاندنی دوو نمرە، لە نمرەی خوو ڕەوشت‌و پەیمان لێوەرگرتنی بە چاککردنی ڕەوشت‌و هەڵسوکەوتی..

مامۆستاکەش بوو بە قسەی سەر زمانی کەسانی باش‌و خراپ‌و بە نمونە دەیان

هێنایەوەو ببوو بە قسەو باسی هەموو قوتابیانی دواناوەندیەکە، کاتێك بە ڕاڕەوی دواناوەندیەکەدا دەڕۆی، بە گوێی خۆی گوێی لەوە دەبوو، کە چۆن قوتابیەکان گاڵتەیان پێدەکرد، هەتا وای لێهات چاری نەماو گواستیەوە بۆ دواناوەندیەکی تر..

هەمان کێشەو ڕووداو، بە سەر مامۆستایەکی تردا هات، بەڵام توانی زۆر بە باشی هەڵسوکەوت لەگەڵ کێشەو ڕووداوەکەدا بکات.. کاتێك چووە پۆلەوەو بە هەمان شێوەی مامۆستاکەی پێشوو، وتی: قەڵەمو کاغەز دەربکەن، تاقیکردنەوەی کتوپڕە.. لێرەش قوتابیەکی هاوشێوەی قوتابیەکەی پێشوو هەبوو، هاواری کردو وتی: مامۆستا بۆ تاقیکردنەوە بە ئارەزووی تۆیە؟!

بەڵام مامۆستاکە زۆر ژیرو تێگەیشتوو بوو، دەیزانی تووڕەییو توندو تیژی، بە تووڕەییو توندو تیژی چارەسەر ناکرێت، بە زەردەخەنەیەکەوە ڕووی کردە قوتابیەکەو وتی: خالید تۆ ناتەوێت، تاقیکردنەوە ئەنجام بدەیت؟!

خالیدیش بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد، نەخێر نامەوێت، تاقیکردنەوە ئەنجام بدەم..

مامۆستاکەش زۆر بە ئارامی وتی: زۆر باشە.. ئەوەی نایەوێت تاقیکردنەوە ئەنجام بدات، بە پێی یاساو ڕێسا هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەین.. دەی بنووسن، پرسیاری یەکەم: ئەنجامە نەزانراوەکانی ئەم هاوکێشەیە بدۆزەرەوە: س+ص=ع+١٥، پاشان پرسیارەکانی تریشی بۆ خوێندنەوە..

قوتابیەکە ئارامی نەماو هاواری کردەوەو وتی: دەڵێم نامەوێت تاقیکردنەوە ئەنجام بدەم..

مامۆستاکەش بە ڕوویەکی خۆشەوە سەیری کردەوەو زۆر بە ئارامی وتی: کەس ناچاری کردوویت، تاقیکردنەوە ئەنجام بدەیت؟! تۆ پیاویت، هەر خۆشت بەرپرسی کارەکانی خۆتی.. قوتابیەکە بیانوویەکی دەست نەکەوت، بۆ ئەوەی زیاتر تووڕە بێت، کەمێك ئارام بۆوەو قەڵەمو کاغەزی دەرهێناو دەستی کرد بە نوسینەوەی پرسیارەکان، پاشان لە سەر جوان هەڵسوکەوت نەکردن لەگەڵ مامۆستاکەیدا، لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی دواناوەندیەکەیەوە لێپرسینەوە لەگەڵ قوتابیەکەدا ئەنجام درا.. بیرم لەم دوو ڕووداوە کردەوە، پاشان بیرم لە جیاوازی توانای هەڵسوکەوتی ئەو دوو مامۆستایە کردەوە، کە

چۆن مامۆستای دووەم توانی گڕو بڵێسەی ئەو ئاگرو کێشە دابمرکێنێتەوە!!

تووڕەیی بە تووڕەیی وەڵامدانەوە، ئەنجامەکەی بریتی دەبێت لە گەورە بوون‌و تەقینەوەی کێشەو گرفتەکان.. ئاگر بە ئاگر زیاتر بڵێسەو گڕ دەسێنێت‌و تەشەنە دەکات.. بە هەمان شێوە، لە بەرامبەر نەرمی‌و لە سەرخۆیشدا، نابێت هەموو کاتێك نەرمی‌و لە سەرخۆیی بەکاربهێنرێت، بەڵکو دەبێت پەیوەندیت لەگەڵ خەڵکیدا، بە پێی تاڵە مووەکەی معاویە بێت!!

پرسیاریان لە معاویە‌ﷺ کردو وتیان: چۆن توانیت ماوەی بیست ساڵ ئەمیری ئیمانداران بیت، پاشان چۆن توانیت بیست ساڵی دیکە ببی بە پێشەواو خەلیفەیان؟! معاویەش‌ﷺ فەرمووی: تاڵە موویەکم لە نێوان هەر دوولاماندا دانابوو، کە سەرێکی تاڵە مووەکە بە دەستی منەوە بوو، سەرەکەی تریشی بە دەست ئەوانەوە بوو.. کاتێك ئەوان سەری تاڵە مووەکەی لای خۆیان ڕادەکێشا، من لە لای خۆمەوە تاڵە مووەکەم شل دەکردەوە، بۆ ئەوەی نەپچڕێت، کاتێکیش ئەوان سەری تاڵە مووەکەیان لە لای خۆیانەوە شل دەکرد، من لە لای خۆمەوە توندم دەکردو ڕام دەکێشا.. خودا لە معاویە ڕازی بێت، بە ڕاستی دانا بووە!!

باوەڕم وایە هیچ دوو هاوسەرێك، لە ژیانیاندا ناتوانن بەختەوەر بژین، ئەگەر بێتوو هەردووکیان توندو تیژو تووڕە بن، هەر وەك هیچ دوو هاوڕێیەکیش ناتوانن درێژە بە هاوڕێیەتیەکەیان بدەن، ئەگەر هەردووکیان لەگەڵ یەکتردا تووڕە بن‌و چاوپۆشی لە کەم‌وکوڕی یەکتر نەکەن..

بیرم دێت لە یەکێك لە بەندیخانەکاندا وتارێکم پێشکەش کرد، ئەو بەشەی کە من وتارەکەم تیادا پێشکەش کرد، تایبەت بوو بەو کەسانەی کە تاوانی کوشتنیان ئەنجام دابوو.. کاتێك کۆتاییم بە وتارەکەم هێناو تەواو بووم، بەندیەکان بەرەو جێگەو ڕێگەکانی خۆیان بڵاوەیان لێکرد، پیاوێك هات بۆ لام‌و سوپاسی کردم‌و خۆی پێناساندم‌و وتی: بەرپرسی چالاکیە ڕۆشنبیریەکانی بەشێکی بەندیخانەکەیە..

پرسیارم لێکردو پێم وت: ئەو هۆکارانە چین، کە بوونەتە هۆی ئەنجامدانی تاوانی کوشتن لە لایەن ئەم بەندیانەوە؟! ئەویش وتی: تووڕەیی.. تووڕەیی.. سوێند بە خودا، یا شێخ هەندێك لەم بەندیانە لە سەر چەند ڕیاڵێکی زۆر کەم، تاوانی کوشتنی

ئەنجامداوە، لەگەڵ فرۆشیارێك، یان لە بەنزینخانەیەك، لەگەڵ كرێكارێكدا دەمەقاڵەی بووەو پاشان دەستی چووەتە خوێنی مرۆڤێك و ئەو تاوانە گەورەیەی ئەنجامداوە..

ئا لەم كاتەدا ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوداﷺ بیرهاتەوە، كە دەفەرموێت: «لیس الشدید بالصرعة، إنما الشدید الذي یملك نفسه عند الغضب». متفق علیه. واتە: (بەهێزو توانا ئەو كەسە نیە، كە پاڵەوان و زۆرانباز بێت، بەڵكو بە دڵنیاییەوە بەهێزو بە تواناو پاڵەوان ئەو كەسەیە، كە لە كاتی تووڕەییدا، دان بە خۆیدا دەگرێت و هەڵە ناكات)..

بەڵێ.. پاڵەوان ئەو كەسە نیە، كە هەركەس زۆرانبازی لەگەڵدا بكات، بیخات بە زەویدا!!

نەخێر.. ئەگەر بەوە بووایە، ئەوا دەبووایە ئاژەڵ و درندەكان لە هەموو مرۆڤەكان زیاتر جێگەی شانازی بوونایە.. پاڵەوان ئەو كەسە ژیرەیە، كە دەزانێت چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ هەڵوێستەكاندا بكات.. دەزانێت چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ هاوسەرەكەیدا، لەگەڵ بەڕێوەبەرەكەیدا، لەگەڵ هاوەڵەكانیدا، بكات و ناشیان ڕەنجێنێت و هەرگیزیش نایان تۆرێنێت..

پێغەمبەری خوداﷺ لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت: «لایقضي القاضي وهو غضبان». رواه أبوداود والترمذي. واتە: (نابێت دادوەرێك، دادوەری بكات، لە كاتێكدا كە توورە بێت)..!!

هەروەها فەرمانمان پێدەكات، دەروونمان ڕابهێنین و پەروەردە بە خۆمان بكەین لە سەر ئارامی و خۆگری، هەروەك دەفەرموێت: «إنما الحلم بالتحلم». رواه دار القطني. واتە: (لەسەرخۆیی و ئارامی بە خۆ ڕاهێنان دەبێت)..

بەڵێ.. بە خۆ ڕاهێنان دەبێت.. كاتێك بۆ یەكەمجار دەتەوێت تووڕەیی خۆت لە دڵ و دەروونتدا خامۆش بكەیت و ڕقی خۆت بخۆیتەوە ١٠٠٪ ماندوو دەبیت، بەڵام لە جاری دووەمدا ٩٠٪ ماندوو دەبیت، لە جاری سێیەمدا ٨٠٪ و، هەروەها بەو شێوەیە خۆت ڕابهێنە، هەتا ئارامی و هێمنی و لە سەرخۆیی، دەبێتە سروشت و ئاكارو ڕەفتارت..

چیرۆكێكی خۆشتان دەربارەی تووڕەبوون بۆ دەگێڕمەوە، ڕۆژێك بۆ پێشكەش كردنی وتارێك ڕۆیشتم بۆ شاری (أملج) كە ٣٠٠كم لە باشوری جەددەوە دوورە.. لە

نێوان ئامادەبووواندا گەنجێك هەبوو، كە زۆر زوو تووڕە دەبوو.. ئەم گەنجە ڕۆژێك لە گەشتێكدا دەبێتو زۆر بە هێواشی ئۆتۆمبیلەكەی لێدەخوڕێت.. ئۆتۆمبیلێكیش لە دوایەوە دەڕوات، زۆر پەلەی دەبێتو دەیەوێت ڕێگەی بۆ چۆڵ بكات، ئەمیش ئاماژەیان بۆ دەكات، بۆ ئەوەی پەلە نەكەن.. ئۆتۆمبیلەكەی دواوە هەلێكی بۆ دەرەخسێتو زۆر بە خێرایی بە لای ئۆتۆمبیلی گەنجەكەدا دەست دەشكێنێتەوە، بەلاّم بە بێ ئەوەی بەر یەك بكەونو هیچ زیانێك لە كەسیان بكەوێت، تێدەپەڕێتو دەڕوات..

گەنجەكە بەم ڕەفتارە زۆر تووڕە دەبێت، لە كاتێكدا بەشتی زۆر لەمە كەمتریش تووڕە دەبوو، خێرایی ئۆتۆمبیلەكەی زیاد كردو كەوتە هاوارو هاوارو بە گڵۆپەكانی ئۆتۆمبیلەكەی ئاماژەی بۆ كردن، بۆ ئەوەی بوەستن، كاتێك وەستان، جامانەكەی سەری داناو پارچە ئاسنێكیشی بە دە ستەوە گرت، كە بۆ كردنەوەی برغوو بەكار دەهات، پاشان بەرەو ڕوویان هەنگاوی نا، لە كاتێكدا زۆر تووڕە ببوو، پارچە ئاسنەكەشی بە دەستەوە بوو.. ئۆتۆمبیلەكەی بەرامبەر وەستاو، سێ گەنجی بەهێزی لێ دابەزی، كە لە بەر هێزیو توندو تۆڵییان، جلو بەرگەكانیان لەبەریاندا توند ببوو، هەروەها لەبەر چوار شانەییان، دەستەكانیان لە شانیان دوور كەوتبوونەوە.. هەر بە ڕاكردن هەرسێكیان بەرەو لای گەنجەكە هاتن، لە كاتێكدا تێبینی ئەومیان كردو گەنجەكەیان بینی، كە بە تەمای شەڕە.. گەنجەكەش كاتێك ئەو سێ كەسە دەبینێت، دەشڵەژێو قوڕگی وشك دەبێتو دەیان بینێت سەیری ئاسنەكەی دەستی دەكەن، ئا لەم كاتەدا فریای خۆی دەكەوێتو زۆر بە نەرمو نیانیو لە سەرخۆیی دەڵێت: ببورن.. ویستم ئاگادارتان بكەمو پێتان بڵێم: ئەم ئاسنەتان لێكەوتە خوارێ..!!

یەكێكیان بە تووڕەییەوە، ئاسنەكەی لە دەست وەردەگرێتو بەرەو ئوتومبیلەكەیان دەڕۆنو ئەمیش بە دەستەكانی ماڵئاوایی لێكردن..!!

**هاوكێشە..**

تووڕەیی + تووڕەیی = تەقینەوە..

# کلیلی دڵەکان..

هەر دەرگایەك کلیلی تایبەت بە خۆی هەیە.. ئەو کلیلەش کە بۆ کردنەوەی دڵەکان گونجاوو لەبارە، بریتیە لە ناسینو بوونی زانیاری دەربارەی سروشتو هەڵسوکەوتی کەسەکان.. گرفتو کێشەی خەڵکی.. چاکسازیو چاککردنەوەی نێوانیان.. خۆپاراستن لە شەڕو زەرەرو زیانیان، هەموو ئەمانە ئاسانن، ئەگەر زانیاریت دەربارەی سروشتو هەڵسوکەوتی کەسەکان هەبێت..

گریمان گەنجێك لەگەڵ باوکیدا کێشەیەکی بۆ پێش دێت، هەتا وای لێدێت کێشەو گرفتەکەیان پەرە دەسەنێتو باوکەکە، کوڕەکەی لە ماڵ وەدەردەنێت، چەند جارێك گەنجەکە هەوڵی ئەوە دەدات، کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام باوکەکە ڕازی نابێت..

بە هیوای چاکسازی نێوانیان، دەچیت بۆ لای باوکیو بە هەندێك دەقی شەرعی باوکەکە دەدوێنیتو باسی گەورەیی گوناهی پچڕانی پەیوەندی نێوان خۆییو کوڕەکەی دەکەیت، بەڵام هیچ کاریگەرییەکی نابێتو هەر ئاوڕیشت لێناداتەوە، لەبەر ئەوەی زۆر تووڕە بووە.. پاشان دەتەوێت ڕێگەی تر بەکاربهێنیت.. کاتێك دەزانیت باوکەکە، کەسێکی زۆر بە بەزەییو سۆزدارە، ئەمجارەیان دەچیت بۆ لاییو پێی دەڵێیت: فلانە کەس، ئایا بەزەییت بە کوڕەکەتدا نایەتەوە؟! زەوی ڕاخستووە، لە سەری دەخەوێتو ئاسمانیشی داوە بە خۆیدا!! تۆش بۆ خۆت دەخۆیتو دەخۆیتەوە.. کوڕەکەشت شەو بە سەرماو ڕۆژ بە برسێتی دەکاتەوە.. کاتێك پاروویەك نان لە دەمت نزیك دەکەیتەوە، ئایا بیری کوڕەکەت ناکەیت؟!

کاتێك لە بەر گەرما کاتەکانی بە سەردەبات، یادی ناکەیت؟!

ئایا بیرت نایەت، کاتێك بچووك بوو، لە باوەشت دەگرتو دەتنووساند بە سنگتەوە؟!

ئایا بیرت نایەت، کاتێك ماچت دەکردو بۆنت پێوە دەکرد؟! ئایا رازی دەبێت، تۆ لە ژیاندا بیت‌و کوڕەکەشت پێویستیەکانی خۆی بەرێتە لای خەڵکی؟!

دەبینیت باوکەکە بەم قسانە هەست‌و سۆزی دەوروژێت‌و لە خاڵی بە یەکگەیشتن نزیك دەبێتەوە..

ئەگەر باوکەکەش کەسێك بێت، کە زۆر سەروەت‌و سامانی خۆش بووێت، دەتوانیت پێی بڵێیت: فلانە کەس ئاگاداربەو خۆت تووشی گیروگرفت مەکە، لەگەڵ کوڕەکەتدا ئاشت بەرەوەو بیگێڕەوە بۆماڵەوە، با لە ژێر چاودێری خۆتدا بێت.. دەترسم تووشی کارێکی خراپ بێت، یان دزییەك ئەنجام بدات، ئەوسا دادگاش تۆ ناچار دەکات، زەرەرو زیانەکانی کوڕەکەت ببژێریت..بە هەر حاڵ هەر چۆنێك بێت تۆ باوکی ئەویت!!

ئەمجارەیان تێبینی ئەوە دەکەیت، باوکە چاوچنۆك‌و ڕەزیلەکە، بەرەو ئەوە دەچێت کەمێك بە خۆیدا بچێتەوە..

ئەگەر لەگەڵ کوڕەکەشدا بتەوێت قسە بکەیت‌و بزانیت کە کوڕەکەش کەسێکە، لەو کەسانەی ماڵ‌و سامانیان زۆر خۆشدەوێت، ئەوا دەتوانیت پێی بڵێیت: فلانە کەس، تەنها باوکت بە کەڵکت دێت، سبەینێ کاتێك دەتەوێت ماڵ پێکەوە بنێیت‌و هاوسەرێك بۆ خۆت مارە بکەیت، جگە لە باوکت کێ خەمت لێدەخوات‌و پێویستیەکانت بۆ دابین دەکات؟!

ئەی کێ مارەییەکەت بۆ دەدات؟! ئەگەر ئۆتۆمبیلەکەت تێك بچێت، کێ بۆت چاك دەکاتەوە؟!

کاتێك نەخۆش دەکەویت، کێ خەرجی نەخۆشخانەت بۆ دەدات؟!

براکانت چۆنیان بووێت، ئاوا لە پارەو ماڵی باوکت سوودمەند دەبن.. خەرجیەکانیان.. دیاری‌و گەشت‌وگوزاریان.. تۆش ئاوا بۆ خۆت دانیشتوویت‌و لە دوورەوە سەیریان دەکەیت!! چ زەرەرێك دەکەیت، ئەگەر بچیت ناوچەوانی باوکت ماچ بکەیت‌و دەست بکەیتە ملی‌و ئاشتی بکەیتەوەو بە هێواشی وشەی ببوورەو بە داخەوە، بە گوێی باوکتدا بچرپێنی؟!

هەروەها ئەگەر ویستت ژن‌و مێردێك ئاشت بکەیتەوە، بە هەمان شێوەی

پێشوو، هەوڵبدەو بە دوای ئەو کلیلەدا بگەڕێ، کە دەتوانیت دەرگای دڵی هەر یەکێکیانی پێ ئاوەڵا بکەیت، بۆ ئەوەی بتوانیت کێشەکەیان چارەسەر بکەیتو لە یەکیان نزیک بکەیتەوە..

نمونەی هاوشێوەی ئەمانە زۆرن، وەك ئەوەی دەتەوێت مۆڵەت لە بەڕێوەبەرەکەت وەربگریت، دەشزانیت بەڕێوەبەرەکەت بە هیچ شێوەیەك بە لای پەیوەندیە کۆمەڵایەتیو سۆزداریەکاندا ناچێتو ئەوەی مەبەستیەتی تەنها کارکردنەو بەس!! لەم کاتە پێویستە پێی بڵێیت: پێویستم بە مۆڵەتی سێ ڕۆژ هەیە، بۆ ئەوەی تازە گەرییەك بە کارو چالاکیەکانم ببەخشم، هەست دەکەم بە هۆی زۆری کارەکانمەوە، بەرهەمی کارم سات لە دوای سات بەرەو کەمبوونەوە دەچێت، هەلێکم پێببەخشە بۆ ئەوەی پشوویەك بدەم.. تەنها سێ ڕۆژ مۆڵەتو بەس، بۆ ئەوەی چالاکیو هێزو توانام بۆ بگەڕێتەوەو بتوانم بە شێوەیەکی باش کارەکانم ئەنجام بدەم..

بەڵام ئەگەر کەسێکی کۆمەڵایەتی بوو، کەسێك بوو، کە زۆر بایەخی بە خێزان دەدا، ئەوا باشە پێی بڵێیت: پێویستم بە مۆڵەت هەیە، بۆ ئەوەی باوکم، یان دایکم، یان منداڵەکانم ببینم، لەبەر ئەوەی دەمێکە نەم بینیوون، وا هەست دەکەم من لە شیوو دۆڵێکدامو ئەوانیش لە شیوو دۆڵێکی تردان..

کەواتە بە باشی شارەزاییەکانت بەکار بهێنە، ئەوسا سبەینێ گوێت لە خەڵکی دەبێتو دەڵێن: بە ڕاستی هیچ کەسێکمان نەبینیووە وەکو فلانە کەس، لە ڕازی کردنی خەڵکیدا شارەزاو لێهاتوو بێت..!!

**ئەنجام..**

**هەموو مرۆڤێك کلیلی تایبەت بە خۆی هەیە.. هەبوونی زانیاریو ناسینی سروشتی مرۆڤەکانیش، ڕێگەت نیشان دەدەن، بۆ دۆزینەوەو ناسینی کلیلی گونجاوی هەر مرۆڤێك..**



# ڕەچاوکردنی هەستو سۆزەکان..

ژیانی خەڵکی تێکەڵە لە خۆشی و ناخۆشی.. ساغی و نەخۆشی.. دەوڵەمەندی و هەژاری.. بە هەمان شێوە بە پێی جۆراو جۆری ژیان و ڕووداوەکانیان، هەڵسوکەوتەکانیان جیاوازەو لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر لە گۆڕانکاریدان.. کاتێك کەسێك لە حاڵەتێکی جێگیرو خۆشدا بێت، ئامادەیە گوێ لە قسە خۆشەکانت بگرێت، هەروەها ئامادەیە گاڵتەوگەپت لەگەڵ بکات، بەڵام لە کاتی نارەحەتی و دڵتەنگیدا، بەم کارانە ڕازی نابێت..

پێکەنین و قسەی خۆش لە پرسەی ماتەمینی و غەمباریدا گونجاو نیە!! بەڵام دەتوانیت لەم کاتانەشدا، بە ئاماژەوە قسەیەکی خۆش تێکەڵ بە گفتوگۆکانی کۆڕو دانیشتنەکان بکەیت.. لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە کاتێك هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا دەکەین، ئاگامان لە سروشت و دڵ و دەروونیان بێت..

گریمان ئافرەتێك لە لایەن هاوسەرەکەیەوە تەڵاق دەدرێت، نە دایکیشی هەیەو نە باوك، شمەك و کەلوپەلەکانی کۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی بچێت بۆ لای براکەی و لە لای ئەو بژیت.. ئافرەتە تەڵاقدراوەکە، لەم بارودۆخەدا دەبێت، ئافرەتێکی دراوسێیان دێت بۆ لای.. ئافرەتە تەڵاقدراوەکە بە گەرمی بەخێرهاتنی دەکات و چاو قاوەی بۆ دەهێنێت.. ئافرەتە میوانەکە بۆ ئەوەی کەمێك دڵی ئافرەتە دڵشکاوەکە بداتەوە، دەیدوێنێت و قسەی لەگەڵ دەکات.. لە نێوان قسەکانیدا ئافرەتە تەڵاقدراوەکە بە ئافرەتە میوانەکە دەڵێت: دوێنێ لە دەرەوەی ماڵ بەرێزتانم بینی، خێر بوو؟!

ئافرەتە میوانەکەش دەڵێت: ئا.. ڕاست دەکەیت باوکی منداڵەکانم زۆر داوای لێکردم، بۆ ئەوەی لە دەرەوە نانی ئێوارە بخۆین، لە دوای نان خواردنیش، چووین بۆ بازاڕو جلوبەرگێکی جوانم بۆ بووکێنی خوشکەکەم کڕی، پاشان چووین بۆ زەڕەنگەرێك و بازنەیەکی جوانیشی بۆ کڕیم، کاتێکیش هاتینەوە بۆ ماڵەوە، منداڵەکانم بینی کەمێك بێتاقەت بوون، هەر بۆیە پەیمانی ئەوەی

پێدان، لە کۆتایی هەفتەدا گەشتو سەیرانێکیان بۆ ساز بکات..

ئافرەتە دڵشکاوو غەمبارەکەش کاتێك گوێی لەم قسانە دەبێت، بیری ئەوە دەکاتەوە، کە پاش کەمێکی تر دەبێت لەماڵی براکەیدا، درێژە بە ژیانی بداتو ناشزانێت پاشەڕۆژی چۆن دەبێت!!

پرسیارێك لێرەدا دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە: باس کردنی ئەو بابەتانە، بۆ ئافرەتێك کە لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا، شکستی هێنا بێت، دروستو گونجاوە؟! ئایا گومانت وایە، ئافرەتە دراوسێکە، لە لای ئەم ئافرەتە دڵشکاوو غەمبارە، خۆشەویست بێت؟! ئایا گومانت وایە، ئەم ئافرەتە حەز بە دانیشتنو گفتوگۆی ئەو دراوسێیەی بکات؟!

هەمووومان هاوڕاین لە یەك وەڵامداو دەڵێین: نەخێر.. دڵی ئەم ئافرەتە پڕ دەبێت لە ڕقو قینە، بەرامبەر بەو دراوسێیەی..

کەواتە: چارەسەر چییە؟! ئایا درۆی لەگەڵ بکاتو پێی نەڵێت، بۆچی لە دەرەوەی ماڵ بووە؟! نەخێر.. بەڵکو دەتوانێت زۆر بە کورتی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، وەك ئەوەی پێی بڵێت: بە ڕاستی بۆ هەندێك ئیشو کارو پێداویستی چوومە دەرەوە، پاشان دەیتوانی بابەتەکە بەرەو ئاراستەیەکی تر بەرێتو باسی ئارامگرتن لە سەر نارەحەتیەکانی بۆ بکات..

یان گریمان دوو هاوڕێ، کە هەردووکیان لە کۆتا پۆلی دواناوەندیدا دەبن، یەکێکیان نمرەیەکی باش بە دەست دەهێنێت، بەڵام ئەوی تریان دەرناچێتو لە چەند وانەیەکدا شکست دەهێنێت، یان دەردەچێت، بەڵام نمرەکانی ئەوەندە نزم دەبێت، لە هیچ زانکۆیەك ئەگەری وەرگرتنی نابێت..

ئایا بە دروستو گونجاوی دەزانیت، کاتێك قوتابیە سەرکەوتووەکە، قوتابیەکەی هاوڕێی دەبینێت، لە باسی وەرگرتنی قوتابیانی زانکۆدا ڕۆبچێتو باسی خۆشیەکانی ژیانی زانکۆی بۆ بکات؟!

بە هەموو شێوەیەك وەڵامەکەمان بریتیە لە: نەخێر..

کەواتە: چارەسەر چییە؟! چارەسەر ئەوەیە باسی قەرەباڵغیو جەنجاڵی ژیانی زانکۆی بۆ بکات.. باسی ئەوەی بۆ بکات، زۆرێك لەوانەش کە فۆڕمیان پڕکردۆتەوە ترسی ئەوەیان هەیە وەرنەگیرێن، هەتا وا لە هاوڕێکەی دەکات،

غەمو خەفەتەکانی کەم دەبێتەوەو حەز بە دانیشتن و گفتوگۆی دەکات و هەست دەکات ئەم هاورێیەی لە دڵ و دەروونی ئەمەوە زۆر نزیکە..

هەروەها کاتێك بە دووو هاورێت دەگەیت، کە یەکێکیان خاوەنی باوکێکی بەخشندەیەو پارەو پوولێکی زۆری بە سەردا دەرژێنێت، بەڵام ئەوەی تریان خاوەنی باوکێکی چروك و رەزیل بێت، دروست و گونجاو نیە لە بەر چاوی ئەمیان باسی بەخشندەیی و چاکی، باوکی ئەوی تریان بکەیت، لەبەر ئەوەی باس کردنی ئەم بابەتە، دڵی ئەمیان تەنگ دەکات و کێشەکانی لەگەڵ باوکیدا بیر دەهێنێتەوە، لە هەمان کاتیشدا وای لێدێت حەز بە دانیشتن و کۆڕو کۆبوونەوەت ناکات و هەوڵی ئەوە دەدات، لێت دوور بکەوێتەوە.. هەر بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ دڵی خەڵکانی ڕادەگرت و ڕەچاوی سروشت و دەروونیانی دەکرد، هەر وەك دەفەرموێت: «لاتطیلوا النظر إلی المجزوم». رواە إبن ماجة. واتە: (لە سەیرکردنی کەسانی گەڕ، یان بەڵەکدا ڕۆمەچن و زۆر سەیریان مەکەن)..

ئەو کەسانەی تووشی ئەم جۆرە نەخۆشیە دەبن، پێستی جەستەیان تێك دەچێت و ناشیرین دەبن، لەبەر ئەوە شتێکی گونجاوو جوان نیە، کاتێك بە لای کەسێکدا تێدەپەڕیت، کە تووشی ئەم نەخۆشیە بوو بێت، زۆر سەیری بکەیت و لێی ڕابمێنی، چونکە ئەو کەسە هەست بە غەمباری و دڵتەنگی دەکات..

پێغەمبەری خودا ﷺ لەوپەڕی سەرقاڵیدا، کەسی پشتگوێ نەخستووەو دڵ و دەروونی ڕاگرتوون.. کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی دەگەنە شاری مەککە، ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه دەستی باوکی دەگرێت و دەیهێنێت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ.. باوکی ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه پیاوێکی بە ساڵاچووی نابینا بوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم پیرەمێردە دەبینێت، جەستەی تەواو لاواز بووە.. ئێسقانەکانیشی بێ هێز بوون.. سەیری ئەبوبەکریشی رضي الله عنه دەکرد، کە چۆن لە باوکی دەڕوانێت، ئەو باوکەی کە بە هۆی ئیسلامەوە، چەندین ساڵە لێی دوورکەوتۆتەوەو لێی دابڕاوە.. پاشان ئاوڕی بۆ لای ئەبوبەکر رضي الله عنه دایەوەو پێی فەرموو: بۆچی باوکت لە ماڵەکەیدا بەجێ نەهێشت، بۆ ئەوەی من بچم بۆ لایی و سەردانی بکەم؟!

ئیمامی ئەبوبەکرﷺ دەیزانی کە پێغەمبەری خوداﷺ لەم کاتەدا لە جەنگدایەو سەرکردایەتی سوپای موسڵمانان دەکاتو زۆر سەرقاڵەو ئەوەندە کاتی نیە، تا بتوانێت سەردانی پیرەمێردێك بکات، بۆ ئەوەی بانگی بکات بۆ ئیسلامو ئاینی پەروەردگاری بۆ ڕوون بکاتەوە، هەر بۆیە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ پێویستە باوکم بێت بۆ خزمەتت، نەك تۆ بچیت بۆ لای ئەو..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بە نەرمو نیانییەوە ئەبوقوحافەی باوکی ئیمامی ئەبوبەکرﷺ ی دانیشاندو دەستی پیرۆزی بە سەر سنگیدا هێنا، پاشان فەرمووی: موسڵمان بەو باوەڕ بهێنە.. ڕوخساری ئەبوقوحافە گەشایەوەو پاشان وتی: أشهد أن لا إله إلا الله.. وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.. ئەبوبەکرﷺ زۆر خۆشحاڵ بوو.. بە ئەندازەی فراوانی هەموو دونیا، خۆشی دایگرت..

دووبارە پێغەمبەری خوداﷺ لە ڕوخساری ئەم پیرەمێردە ووردبۆوە، کە پیری هەموو مووەکانی سپی کرد بوو، پاشان فەرمووی: ڕەنگی مووەکانی ئەم پیاوە بگۆڕن، بەڵام نزیکی ڕەش مەکەونو مووەکانی ڕەش مەکەن..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ زۆر ئاگای لە دڵو دەروونی خەڵکی بوو.. ئەوەتا کاتێك سوپای موسڵمانان بۆ ئازاد کردنی شاری مەککە دەکەونە ڕێ، پێغەمبەری خوداﷺ سوپای بە سەر چەند بەشێکدا دابەش کرد بوو، ئاڵای هەر بەشێکیشی دابوو، بە دەستی کەسێکەوە، یەکێك لە ئاڵاکانی دابووە دەستی هاوەڵی بەڕێزو پاڵەوان، سەعدی کوڕی عوبادەﷺ.. هەڵگرتنی ئاڵاش، مایەی سەربەرزیو شانازی بوو، بۆ ئەو کەسەی کە ئاڵاکەی هەڵدەگرت، بەڵکو سەربەرزیو شانازی بوو، بۆ هۆزەکەشی..

سەعدی کوڕی عوبادە، کاتێك دەچێتە شاری مەککەوەو سەیری شارەکەو دانیشتووانەکەشی دەکات، ئەو شارەی کە دژایەتی پێغەمبەری خودایانﷺ کرد!! ئەو خەڵکەی کە بکوژی یاسرو سومەییە بوون!! ئەوانەی زۆر دڕندانە، ئازاری بیلالو خەبابیان دا!! ئا لەم کاتەدا بیری دەکردەوە، بە ڕاستی ئەم خەڵکە شایەنی ئەوەن کە تەمێ بکرێن، هەر بۆیە سەعدﷺ ئاڵاکەی دەستی شەکاندەوەو بە دەنگێکی بەرز هاواری کردو وتی:

اليوم يوم الملحمة..           اليوم تستحل الحرمة..

واتە: ئەمڕۆ ڕۆژی جەنگو کوشتارە.. هەروەها ڕۆژی حەڵاڵ بوونی قەدەغەکراوەکانە..

کاتێك قوڕەیش گوێیان لەم قسەیە دەبێت، نارەحەت دەبنو لە سەر دڵیان گران دەبێتو دەترسن کوشتاریان بکەن.. ئافرەتێکی قوڕەیش خۆی دەگەیەنێتە لای پێغەمبەری خوداﷺ و ترسو دڵەڕاوکێی خۆیانی لە سەعد، پێرادەگەیەنێت..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ گوێی لە سکاڵای ئافرەتەکە دەبێت، سۆزو بەزەیی دەجوڵێتو نایەوێت، کەسێك بێ هیوا بکات، کە سکاڵای خۆی بۆ لای هێنا بێت، لە هەمان کاتیشدا نەیدەویست، بە لێسەندنەوەی ئاڵاکە، سەعد تووڕە بکات، هەر بۆیە فەرمانی بە سەعد کرد، ئاڵاکە بدات بە دەستی قەیسی کوڕی.. قەیس بە ئاڵاکەی دەستیەوە، چووە شاری مەککەوەو سەعدی باوکیشی لە تەنیشتیەوە دەڕۆی.. بەم شێوەیە قوڕەیشو ئافرەتەکەشی لە خۆی ڕازی کردو سەعدیشی تووڕە نەکرد، لەبەر ئەوەی سەعدﷺ هەر بە سەرکردەیی مایەوە، تەنها ئاڵاکەی دەستیان دا بە کوڕەکەی..

بە ڕاستی جوانە!! چەند خۆشە بە بەردێك چەند پاسارییەك ڕاو بکەین؟! هەوڵ بدە کەس لە خۆت مەتۆرێنە.. سەرکەوتووبەو سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆت ڕابکێشە، ئەگەر داواکاریەکانیشیان پێچەوانەی سروشتی تۆ بوو..

ڕێکەوتن..

پێویستە هەڵسوکەوت لەگەڵ دڵەکان بکەین، نەك لەگەڵ جەستەو لاشەکان..

## بایەخو گرنگییان پێبدە..

خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی، حەز بەوە دەکەن بایەخو گرنگییان پێبدرێت.. هەر بۆیە هەندێك جار دەبینیت، هەندێك هەڵسوکەوت ئەنجام دەدەن، بۆ ئەوەی لایەکیان لێبکرێتەوەو هەست بە بوونیان بکرێت.. جاری واش هەیە داستانو پاڵەوانێتی تۆمار دەکەن، بۆ ئەوەی گرنگیان پێبدرێتو ببنە مایەی سەرسامی کەسانی تر..

بۆ نمونە: کاتێك پیاوێك بە ماندوویێتی، لە کارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو هەر چوار کورەکەی دەبینێت، کە هەریەکەیان سەرقاڵی کارێکن، گەورەکەیان کە تەمەنی پانزە ساڵە، سەرقاڵی سەیر کردنی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیە.. دووەمیان خەریکی خواردنە.. سێیەمیان خەریکی یاری کردنە.. چوارەمیشیان سەرقاڵی نوسینەوەی وانەکانی قوتابخانەی دەبێت..

باوکەکە بە دەنگێکی بیستراو سڵاویان لێدەکات، بەڵام وەکو پێویست بە دەمیەوە ناچنو پێشوازی لێناکەن.. یەکێکیان خەریکی خواردنو ئەوی تریان خەریکی سەیرکردنی تەلەفزیۆنەو ئەوەی تریشیان خەریکی یاری کردنە، تەنها چوارەمیان نەبێت، کاتێك باوکی دەبینێت، لە شوێنی خۆی هەڵدەستێتو دەست لە نوسینەوەی وانەکانی هەڵدەگرێتو بەرەو رووی باوکی هەنگاو دەنێتو زۆر بە گەرمی پێشوازی لێدەکاتو دەستی باوکیشی ماچ دەکات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای نوسینەوەی وانەکانی قوتابخانەی..

ئایا کام لە چوار منداڵە خۆشەویستی باوکی بە دەست دەهێنێت؟! دڵنیام هەمووومان دەڵێین: منداڵی چوارەمیان.. لەبەر ئەوە نا، کە لە هەموویان جوانترە، یان لەوانی تر زیرەكو وریاترە..

نەخێر.. لەبەر ئەوەی بەو هەڵسوکەوتەی دەریخست، کە باوکی لە لا، کەسێکی پڕ بە بایەخو گرنگە.. لەبەر ئەوە، چەندێك زیاتر بایەخ بە خەڵکی بدەیت، ئەوەندە لە لایان خۆشەویستو گەورە دەبیت..

پێغەمبەری ئازیزﷺ لە هەموو کەس زیاتر بایەخو گرنگی بە مرۆڤەکان دەدا.. کێشەو گرفتەکانیانی بە کێشەو گرفتی خۆی دەزانی.. هەروەها غەمو نارەحەتی هەر موسڵمانێکی بە غەمو نارەحەتی خودی خۆی دەزانی.. ئەوەتا ڕۆژێك پێغەمبەری

خوداﷺ لە سەر دوانگە وتاری دەدا، پیاوێك دێتە ژوورەوە، پاشان سەیری پێغەمبەری خوداﷺ دەكات و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ، پیاوێك هاتووە بۆ لات و پرسیارت لە بارەی ئاینەكەیەوە لێدەكات، لەبەر ئەوەی هیچ شارەزاییەكی دەربارەی ئاینەكەی نیە.. پێغەمبەری خوداﷺ ئاور دەداتەوە، پیاوێكی دەشتەكی دەبینێت، ئەوەندە ئامادەیی تیادا نیە چاوەڕوان بێت، هەتا وتارەكە كۆتایی پێدێت، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ وازی لە وتارەكەی هێناو لەگەڵ پیاوە دەشتەكیەكەدا، دەستی بە قسەكردن كرد، چونكە لەوانەیە تا كۆتایی هاتنی وتارەكە، پیاوەكە ڕانەوەستێت و بڕوات و جارێكی تریش نەگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ ..

ئەو پیاوە ئەوەندە پرسیارەكانی لە لا گرنگ بوو، وتارەكەی پێغەمبەری خودایﷺ بڕی..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ لە سەر دوانگەكەی دابەزی و لە بەرامبەر پیاوەكە دانیشت و بنەماكانی ئاینی ئیسلامی تێگەیاند، پاشان هەستا و گەڕایەوە سەر دوانگەكەی و پاشماوەی وتارەكەی تەواو كرد..

ئای لە گەورەیی و بەڕێزی ئەو پێغەمبەرە نازدارەﷺ !!

بەم ڕەوشتە جوانانە هاوەڵانی پەروەردە كرد، هەر بۆیە ئەوانیش زۆر گرنگیان بە یەكتر دەداو لە خۆشی و ناخۆشیەكانیاندا، بەشداری یەكتریان دەكرد، هەر وەك طلحەﷺ بەشداری نارەحەتیەكانی كەعبیﷺ كرد..

كەعبی كوری مالكﷺ پیاوێكی بە ساڵاچوو بوو.. لە دوای ئەوەی پیری ڕووی تێكردو ئێسقانەكانی لاواز بوون و چاوەكانی لە دەستدا، یادگاریەكانی تەمەنی لاوێتی دەگێڕێتەوە، كاتێك لە جەنگی تەبوكدا دواكەوت و بەشداری ئەو جەنگەی نەكرد.. جەنگی تەبوك، كۆتا جەنگ بوو، كە پێغەمبەری خوداﷺ بەشداری تێدا كرد.. پێغەمبەری خوداﷺ بانگی ئامادەكاری ئەو جەنگەی بە گوێی خەڵكیدا دا، هەروەها داوای بەخشینی سەروەت و سامانی لە موسڵمانان كرد، بۆ ئەوەی بەشداری لە بە ڕێكردن و پڕ چەك كردنی سوپای موسڵماناندا بكەن.. بەم شێوەیە سوپای موسڵمانان ئامادە بوو، ژمارەشیان گەیشتە سی هەزار جەنگاوەر.. ئامادەكاریەكانی جەنگەكەش، لە كاتێكدا بوو، كە ئاوو هەوا گەرم بوو.. سێبەریش زۆر خۆش بوو. ڕێگەكە زۆر دوورو درێژ بوو.. دوژمنەكەش زۆر بەهێزو بە توانا بوو.. ژمارەی موسڵمانانیش ئەوەندە زۆر بوو، نەدەتوانرا لە نوسراوێكدا تۆمار بكرێن..

كەعبﷺ دەفەرموێت: بەشداری كردنم لەو جەنگەدا زۆر ئاسان بوو.. لە باتی

ولاخێك، دووانم هەبوو.. كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بانگەوازی بەشداری كردنی ئەو جەنگەی دا بە گوێی موسڵماناندا، لە دڵی خۆمدا وتم: بەیانی دەچم بۆ بازاڕو هەموو پێداویستیەكانم دەكرمو پاشان پێیان دەگەمەوەو پەیوەندیان پێوە دەكەم..

بەیانی چووم بۆ بازاڕو گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو بە هەمان شێوە وتم: بەیانی دەڕۆمو پێیان دەگەم.. بەم شێوەیە، چەند ڕۆژێك تێپەڕیو لە جەنگەكە دواكەوتم.. بە شاری مەدینەدا دەگەڕام، جگە لە كەسانێكی دووڕوو، یان كەسانێك، كە خودای گەورە مۆڵەتی دابوون، كەسێكی ترم نەدەبینی..

بەڵێ.. كەعبﷺ دواكەوتو پێغەمبەری خوداشﷺ ، خۆیو سی هەزار موسڵمان بە ڕێگەوە بوون، هەتا گەیشتنە تەبوك.. پێغەمبەری خوداﷺ سەیری ڕوخساری هاوەڵانی كرد، یەكێك لە هاوەڵە چاكەكانی، كە بەشداری لە پەیمانی عەقەبەشدا كرد بوو، دیار نەبوو، هەر بۆیە فەرمووی: كوا كەعبی كوڕی مالك، یاخود كەعبی كوڕی مالك چی بەسەرهاتووەو چی كردووە؟! پیاوێك وەڵامی دایەوەو وتی: بە هۆی باخو باخاتو شوێنو جێگەی خۆشو خێزانەكانیەوە دواكەوت..

مەعازی كوڕی جەبەلیشﷺ دەفەرموێت: بە ڕاستی قسەیەكی خراپت كرد، ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ، سوێند بە خودا جگە لە چاكە هیچی ترمان لە كەعب نەبینیووە.. پێغەمبەری خوداﷺ بێدەنگ بوو..

كەعبﷺ دەفەرموێت: كاتێك جەنگەكە كۆتایی هاتو پێغەمبەری خوداﷺو هاوەڵانی گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، بیرم دەكردەوە چۆن لە ڕقی پێغەمبەری خوداﷺ خۆم ڕزگار بكەم، پاشان هاتمە سەر ئەوەی بە ڕاستگۆیی نەبێت، بە هیچ شتێك لەم ڕووداوە ڕزگار نابم..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ گەیشتەوە شاری مەدینەو سەرەتاش چوو بۆ مزگەوتە پیرۆزەكەیو دوو ڕكات نوێژی ئەنجامدا، پاشان لەگەڵ خەڵكەكە دانیشت، پاشان ئەوانەی لە جەنگەكە دواكەوتبوون، هاتنو هەریەكەیان بیانووی خۆی دەهێنایەوە، كە ژمارەیان لە هەشتا كەس زیاتر بوو..پێغەمبەری خوداﷺ پاساوو بیانووی ئاشكرای هەموویانی وەرگرتو داوای لێخۆشبوونیشی لە پەروەردگار بۆ كردنو نهێنی پاساوو بیانووەكانیشی گەڕاندەوە بۆ لای پەروەردگار..

پاشان كەعبی كوڕی مالكﷺ هات، كاتێك سڵاوی كرد، پێغەمبەر خوداﷺ بە تووڕەییەوە زەردەخەنەیەكی بۆ كرد..كەعب بەرەو لای پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆیشتو

لە بەردەمیدا دانیشت.. کاتێك دانیشت، پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرموو: بۆچی دواکەوتیت؟! ئایا وڵاخت نەکڕی، بۆ ئەوەی بەشداری جەنگەکە بکەیت؟!

کەعب لە وەڵامدا دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سوێند بە خودا، ئەگەر لە دونیادا لە لای هەر کەسێکی تر جگە لە تۆ دابنیشتمایە، دەمتوانی بە پاساوو بیانوو، خۆم لە تووڕەیی ڕزگار بکەمو چەندو چوونی لەگەڵ بکەم، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەزانیت، ئەگەر ئەمڕۆ درۆت لەگەڵ بکەمو بە هۆی درۆوە ڕازیت بکەمو لێم ڕازی بیت، ئەوا پەروەردگار لێم تووڕە دەبێت، ئەگەر بە ڕاستیشت لەگەڵت بدوێم، ئەوا هیوام وایە پەروەردگار لێم ببورێتو لێم ڕازی بێت.. ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سوێند بە خودا هیچ هۆکارێك نیە، کە بیانووی پێ بهێنمەوە.. سوێند بە خودا هیچ کاتێك وەکو ئەو کاتە بەهێزو هەبوو نەبووم، کە لەو جەنگەو لە تۆ دواکەوتم..

پاشان کەعبرضي الله عنه بێدەنگ دەبێت، پێغەمبەری خوداشﷺ ڕوو دەکاتە هاوەڵانیو دەفەرموێت: ئەمیان بە ڕاستی قسەی بۆ کردن، دەی هەستە، هەتا پەروەردگار بڕیاری خۆی دەدات..

کەعب هەستاو قاچەکانی بە دوای خۆیدا پەلکێش دەکرد..

بەڵێ.. بە غەمباری لە مزگەوت هاتە دەرەوەو نەیدەزانی پەروەردگار چ بڕیارێك دەدات.. کاتێك هۆزەکەی بەمەیان زانی، هەندێك لە پیاوە نزیکەکانی، شوێنی کەوتنو دەستیان کرد بە سەرزەنشت کردنیو پێیان وت: سوێند بە خودا، وا هەست دەکەین لەمەو پێش تۆ هیچ گوناهو تاوانێکت ئەنجام نەدابێت، تۆ پیاوێکی شارەزاو شاعیرو ڕەوان بێژی، نەدەتوانی وەکو دواکەوتووەکانی تر، لە بەردەم پێغەمبەری خواداﷺ بیانوویەك بێنیتەوەو خۆت ڕزگار بکەیت؟! بیانوویەکت باس بکردایە، هەتا پێغەمبەری خوداﷺ لێت ڕازی دەبوو، پاشان پەشیمانیت دەربڕیایەو داوای لێخۆشبوونت لە خودا بکردایە، خوداش لێت خۆش دەبوو!!

کەعبرضي الله عنه دەفەرموێت: ئەوەندە سەرزەنشتیان کردم، هەتا وام لێهات خەریك بوو بگەڕێمەوەو خۆم بە درۆ بخەمەوەو بیانوویەك دروست بکەم، پاشان پێم وتن: ئایا کەسی تر هەیە وەك من وابێت؟!

وتیان: بەڵێ.. مورارەی کوڕی ڕەبیعو هیلالی کوڕی ئومەییەش هەن.. ئەو دوو پیاوە، دوو هاوەڵی بەڕێز بوونو پەکێکیش بوون لە بەشداربووانی جەنگی بەدر.. پاشان وتم: سوێند بە خودا ناگەڕێمەوەو خۆشم بە درۆ ناخەمەوە..

کەعبرضي الله عنه بە دڵشکاویو غەمبارییەوە، گەڕایەوە بۆماڵەوە.. زۆری پێنەچوو، پێغەمبەری

خوداﷺ فەرمانی دا، کەس قسە لەگەڵ کەعبو دوو هاوەڵەکەیدا نەکاتو نەیان دوێنێت..

کەعبرضي الله عنه دەفەرموێت: وامان لێهات، خەڵکی لێمان دوور دەکەوتنەوەو لەگەڵماندا گۆڕانکاریان بە سەردا هاتو لێمان دوورە پەرێز بوون.. دەچووم بۆ بازاڕو تەنها کەسێک قسەی لەگەڵ نەدەکردم، وەك ئەوەی نەیان ناسیبێتم.. دوو هاوەڵەکەشم، کە هەمان کێشەی منیان هەبوو، لە ماڵەکانیاندا، هەر خەریکی گریان بوونو شەوو ڕۆژ هەر دەگریانو سەریان لە سەر ئەژنۆکانیان بەرز نەدەکردەوە، بەڵام من لەبەر ئەوەی گەنج بووم، دەردەچووم بۆ بازاڕو لەگەڵ موسڵماناندا ئامادەی نوێژەکانی مزگەوت دەبووم، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێك قسەی لەگەڵ نەدەکردم..

کاتێك دەچووم بۆ مزگەوتو سڵاوم لە پێغەمبەری خوداﷺ دەکرد، لە دڵی خۆمدا دەمووت: ئایا دەبێت وەڵامی سڵاوەکەمبداتەوە؟ دەبێت پێغەمبەری خوداﷺ لێوە پیرۆزەکانی جوڵاند بێت، یان نا؟! پاشان لە نزیکی پێغەمبەری خوداﷺ نوێژم دەکردو بە تیلەی چاو سەیرم دەکرد، کاتێکیش نوێژ تەواو دەبوو، ڕووم تێدەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ پشتی تێدەکردمو ڕووی لێ وەردەگێرام..

ڕۆژەکان تێپەڕینو ئازارەکان، ئازاری تریان بە دوای خۆیاندا دەهێنا.. غەمو خەفەت باڵی بە سەر پیاوێکدا کێشا بوو، کە گەورەو بەڕێزی هۆزەکەی بوو.. شاعیرێکی زۆر لێهاتوو بوو.. لە لای کاربەدەستو پادشاکان ناسراو بوو.. هۆنراوەکانی ئەوەندە بە ناوبانگ بوون، هەر کەسێك بەر گوێی بکەوتایە، ئاواتی بە بینینی خاوەنەکەی دەخواست..

کەعبرضي الله عنه هەرچەندە لە شاری مەدینەو لە ناو کەسوکارەکەیدا بوو، بەڵام هیچ کەسێك قسەی لەگەڵ نەدەکرد، تەنانەت کەس سەیریشی نەدەکرد، نامۆیىو نارەحەتیو غەمو ئازارەکان لە پەرسەندندا بوون، کەچی تاقیکردنەوەو بەڵایەکی تر، ڕووی لە کەعبرضي الله عنه کرد.. ئەمەش لە کاتێکدا بوو، لە بازاڕدا دەسوڕایەوەو پیاوێکی گاوری خەڵکی شامیش هاواری دەکردو دەیووت: کێ کەعبی کوڕی مالکم نیشان دەدات؟ خەڵکیش ئاماژەیان بۆ کەعب کردو نیشانیاندا، کابرا هاتو نامەیەکی لە پادشای غەسانەوە بۆ هێنا بوو..

سەیرە!! نامە لە پادشای غەسانەوە؟!

بەڵێ.. لەبەر ئەوەی دەنگوباسی ئەم ڕووداوەی کەعب گەیشتبووە شامو پادشاش گرنگی بەم ڕووداوە دابوو..

دەبێت ئەم پادشایە چی بووێتو داوای چی لە کەعب بکات؟! کەعبرضي الله عنه نامەکەی کردەوەو تیایدا نوسرا بوو: ئەی کەعبی کوڕی مالك، پێم گەیشتووە کە هاوەڵەت

هەڵسوکەوتی زبرو ناخۆشت لەگەڵ دەکات‌و دووری خستوویتەتەوە.. تۆ کەسێك نیت، شایەنی سوکایەتی پێکردن بیت، پەیوەندیمان پێوە بکەو چاوەڕێت دەکەین..

کاتێك کەعبﷺ نامەکەی خوێندەوە، فەرمووی: بێباوەڕان چاویان تێبڕیووم‌و تەماعیان تێکردووم، ئەمەش بەڵاو نارەحەتیەکی ترە!! پاشان بە خێرایی نامەکەی خستە تەنوورەوەو سوتاندی‌و بە هیچ شێوەیەك ئاوڕی بە لای بەڵێن‌و پەیمانەکانی پادشای غەساندا نەدایەوەو پشتگوێی خست..

بەڵێ.. دەرگای کۆشك‌و تەلاری پادشاکانی بە ڕوودا ئاوەڵا کرا.. داوای میوانداری‌و هاوەڵییان لێکرد.. لە کاتێکدا خەڵکانی شاری مەدینە ڕوویان لێ وەردەگێڕاو وەڵامی سڵاوەکەشیان نەدەدایەوە.. پرسیاری لێدەکردن‌و گوێی لە وەڵامیان نەدەبوو.. ڕوخسارەکان هەموو تووڕەییان پێوە دیار بوو.. بەڵام لای نەکردەوە بە لای بەڵێن‌و خۆشیەکانی بێباوەڕاندا.. شەیتانی نەفرین لێکراویش، نەیتوانی ختووکەی دڵە پاکەکەی بدات‌و بیکات بە بەندەی هەواو ئارەزووەکانی.. بەڵێ.. نامەکەی فڕێدایە ناو تەنوورو سوتاندی!!

ئازارو تاقیکردنەوەکان.. غەم‌و نارەحەتیەکان.. نامۆیی‌و دوورەپەرێزی خەڵکی، هەتا دەهات زیاتر دەبوون.. مانگێك بە سەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی، کەعبیشﷺ بەم هەموو نارەحەتی‌و ئازارەوە ژیانی دەگوزەراند.. لە هەموو لایەکەوە غەم گەمارۆی دابوو.. سروش‌و نیگای پەروەردگار، هیچ بڕیارێکی نەدابوو.. پێغەمبەری خوداشﷺ هیچ کارێکی ئەنجام نەدا.. کاتێك ڕۆژەکان بوون بە چل ڕۆژ، پێغەمبەری خوداﷺ پیاوێکی نارد بۆ لای کەعب، پیاوەکە لە دەرگای داو کەعبیشﷺ هاتە دەرەوە.. بەڵکو مژدەیەکی خۆشی هێنا بێت!!

پیاوەکە بە کەعبی وت: پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانت پێدەکات، لە هاوسەرەکەت دوور بکەویتەوە.. کەعبﷺ دەڵێت: تەڵاقی بدەم؟! پیاوەکە دەڵێت: نەخێر، بەڵام نزیکی مەکەوەرەوە.. کەعبﷺ دەچێتە ژوورەوەو بە هاوسەرەکەی دەڵێت: بچۆرەوە بۆماڵی باوکت، هەتا پەروەردگار بڕیاری خۆی دەدات.. پێغەمبەری خوداﷺ هەمان فەرمانی بە دوو هاوەڵەکەی کەعب ڕاگەیاند..

هاوسەری هیلالی کوڕی ئومەییە، دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هیلالی مێردم، پیاوێکی بە ساڵاچووی پیری لاوازە، ئایا مۆڵەتم دەدەیت، خزمەتی بکەم؟

پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: بەڵێ، بەڵام با نزیکت نەکەوێت..

ئافرەتەکەش دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ سوێند بە خودا بەردەوامو بە شەوو ڕۆژ خەریکی گریانەو هیچ جوڵەو ئارەزوویەکی تێدا نیە..

ڕۆژانێکی نارەحەتو گران بە سەر کەعبدا ﷺ تێپەڕی، هەتا وای لێهات بە خۆیدا دەچۆوەو لە باوەڕو ئیمانەکەی ورد دەبۆوە!! لەگەڵ موسڵماناندا قسە دەکات، بەڵام ئەوان هیچ وەڵامێکی نادەنەوە!! سڵاو لە پێغەمبەر خودا ﷺ دەکات، بەڵام گوێ بیستی وەڵامەکەی نیە!! ئەی بۆ کوێ بچێتو سەری خۆی بۆ کوێ هەڵبگرێت؟! ئەی ڕاوێژو پرسو ڕا بە کێ بکات؟!

کەعب ﷺ دەفەرموێت: کاتێك ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا، چووم بۆ لای ئەبوقەتادەی ئامۆزام.. ئەم ئامۆزایەم، خۆشەویسترین کەسم بوو.. کاتێك چووم بۆ لای، لە ناو ڕەزو باخەکەیدا بوو، بە سەر دیواری باخەکەدا سەرکەوتمو چوومە ناو باخەکەوەو سڵاوم لێکرد، سوێند بە خودا وەڵامی سڵاوەکەی نەدامەوە!!

وتم: ئەبو قەتادە، ئایا نازانی کە من، خوداو پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێت؟! بێدەنگ بوو، هیچ وەڵامێکی نەدامەوە.. دوبارە وتم: ئایا من، خوداو پێغەمبەرەکەیم خۆشناوێت؟! دوبارە بێدەنگ بوو.. بۆ جاری سێیەم وتم: ئەی ئەبو قەتادە، سوێندت دەدەم بە خودا، ئایا نازانی من، خوداو پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێت؟!

ئەمجارەیان وەڵامی دامەوەو وتی: خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانن.. کاتێك کەعب ﷺ ئەم وەڵامەی لە ئامۆزاو خۆشەویسترین کەسی بیست، کە نازانێت، ئایا ئیماندارە، یان نا؟! چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسكو لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیراو گەڕایەوە بۆماڵەوە..

بەڵێ.. بە تەنها لە ماڵەوە دانیشتو چاوەکانی بە چوار دیواری ماڵەکەیدا دەگێڕا.. هاوسەرەکەی لەوێ نەبوو، هەتا کەمێك پێکەوە دابنیشنو ڕازو نیازێك بکەن.. خزمو کەسوکارەکانیشی هەموو لێی دوورنو سەردانی ناکەن.. بە هیچ جۆرێك تەنها قسەیەکیشی لەگەڵ ناکەن.. وا پەنجا شەوو خەڵکی وەڵامی سڵاوەکەشی نادەنەوەو نایدوێنن.. بەڵام لە شەوی پەنجایەمینداو لە سێ یەکی کۆتا شەودا، لێخۆشبوونی پەروەردگار بۆ کەعبو دوو هاوەڵەکەی دابەزی..

ئوم سەلەمەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا موژدە بە کەعبی کوڕی مالك نەدەین؟!

پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: بەمشەوە قەرەباڵغی دروست دەبێتو خەومان

لێناکەوێت.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ نوێژی بەیانی بۆ موسڵمانان ئەنجام دەدات، لێ خۆشبوونی سێ هاوەڵەکە بە موسڵمانان ڕادەگەیەنێت، خەڵکیش بە پەلە دەڕۆن، بۆ ئەوەی ئەو مژدە خۆشەیان پێ ڕابگەیەنن..

کەعبرضي الله عنه دەفەرموێت: لە سەربانی ماڵەکەم خەریکی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بووم، پاشان دانیشتمو زیکرو یادی پەروەردگارم دەکرد.. زۆر غەمبار بووم.. فراوانی زەویم لە لا تەسك ببوو.. ئەوەی بە لامەوە زۆر سەختو گران بوو، ئەوە بوو، بمرمو پێغەمبەری خوداﷺ نوێژم لە سەر نەکات..

من لەم خەیاڵانەدا بووم، کەسێك بە دەنگێکی بەرز هاواری دەکردو دەیوت: ئەی کەعبی کوڕی مالك، مژدە بێت!! یەکسەر سەرم خستە سەر زەویو زانیم کە لە لایەن پەروەردگارەوە ڕزگاریم بۆ هاتووەو دەرووی لێ کردوومەتەوە.. پیاوێك بە سەر ئەسپەکەیەوە، بە خێرایی دەهات بۆ لام، بۆ ئەوەی مژدەم پێ بدات، بەڵام پیاوێکی تر لە سەر چیایەکەوە بە دەنگی بەرز، مژدەکەی پێڕاگەیاندم، لەبەر ئەوەی دەنگی پیاوەکەی سەر چیاکە، لە ئەسپی پیاوەکەی تر خێراتر بوو..

کاتێك ئەو پیاوەی هاواری بۆ کردمو مژدەکەی پێدام، گەیشتە لامو دوو دەستە بەرگم هەبوو، پێشکەشم کرد، سوێند بە خودا لەو دوو دەستە جلوبەرگە زیاترم نەبوو.. جلوبەرگێکم لە کەسێك خواستو بە پەلە بەرەو لای پێغەمبەری خوداﷺ کەوتمە ڕێ.. خەڵکی دەستە دەستە دەهاتنە پێشوازیمو پیرۆزباییان لێکردمو پێیان دەوتم: لێخۆشبوونی پەروەردگارت لێ پیرۆز بێت.. پاشان چوومە مزگەوتو پێغەمبەری خوداشﷺ لە ناو هاوەڵانیدا دانیشتبوو.. کاتێك بینیمیان، کەسیان هەڵنەستانو نەهاتن بۆ لام، تەنها طلحەی کوڕی عبیداللە نەبێت، هەستاو هات بۆ لامو باوەشی پێداکردمو پیرۆزبایی لێکردم، پاشان گەڕایەوە بۆ جێگەکەی خۆی.. سوێند بە خودا هەرگیز ئەو هەڵسوکەوتەی طلحەم لە یاد ناچێت..

بەرەو پێشەوە ڕۆیشتم، هەتا چوومە بەردەم پێغەمبەری خوداﷺو سلاوم لێکرد، ڕوخساری پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ لە خۆشیدا، وەکو پارچەیەك لە مانگ دەدرەوشایەوە.. کاتێك بینیمی، فەرمووی: مژدەت لێ بێت، ئەمڕۆ لە ڕۆژێکدایت، لە کاتی لە دایك بوونتەوە تا ئێستا، بە ڕۆژێکی ئاوا پڕ لە خێرو خۆشیدا تێ نەپەڕیوویت..

کەعبرضي الله عنه دەفەرموێت، منیش وتم: ئەو مژدە خۆشە لە لایەن تۆوەیە ئەی پێغەمبەری خودا، یان لە لایەن پەرروەردگارەوەیە؟

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: نەخێر.. لە لایەن پەروەردگارەوەیە، پاشان ئایەتە پیرۆزەکانی خوێندەوە، کە دەفەرموێت: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ التوبة. واتە: (سوێند بە خودا بە ڕاستی خودا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەرو کۆچبەران‌و پشتیوانان، ئەوای کە شوێنی پێغەمبەر کەوتن لە کاتی سەغڵەتی‌و تەنگانەدا، دوای ئەوەی کە خەریك بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت‌و (بێزاری دەربرێت)، لەوەو دوا تەوبەو پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بە ڕاستی ئەو پەروەردگارە، بە سۆزو میهرەبانە لەگەڵیاندا* هەروەها تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە (لە غەزای تەبووك) دواکەوتن، دوای ئەوەی کە زەوی چەندە فراوانە لێیان تەنگ بۆوە، خۆیشیان لە خۆیان بێزار بوون، دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەك نیە (لە خەشم‌و قینی خودا بیانپارێزێت) جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە، پاشان تەوبەی لێ وەرگرتن، تا تەوبە بکەن، بە ڕاستی هەر خودا تەوبە وەرگرو میهرەبانە)..

لە خۆشی ئەو موژدە خۆشەو ئەو لێخۆشبوونە مەزنە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هەموو ماڵەکەم پێشکەش بە خوداو پێغەمبەرەکەی بێت..

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: هەندێك لە سەروەت‌و سامانەکەت بۆ خۆت بهێڵەرەوە..

منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بە دڵنیاییەوە، پەروەردگارم بە هۆی ڕاستگۆییەوە، ڕزگاری کردم‌و لێم خۆشبووە، گەڕانەوەو پەشیمانیەکەشم ئەوەیە، هەرگیز جگە لە ڕاستگۆیی هیچ قسەیەك نەکەم..

بەڵێ.. پەروەردگار لە کەعب‌و دوو هاوەڵەکەی خۆشبوو.. ئەوەی ئێمە لێرەدا وەکو بەڵگەیەك پێویستمانە، ئەوەیە: کاتێك کە طلحهﷺ، کەعبی بینی، هەستاو لە باوەشی گرت‌و بە گەرمی پیرۆزبایی لێکرد، ئەم هەڵسوکەوتەش، بوو بە هۆی ئەوەی، طلحهﷺ زیاتر لە دڵی کەعبدا، جێگەی خۆی بکاتەوەو خۆشەویست بێت.. لە دوای کۆچی دوای طلحهﷺ و تێپەڕبوونی چەندین ساڵ، کەعبﷺ دەیفەرموو: سوێند بە خودا هەرگیز طلحه لە یاد ناکەم..

طلحه‌ﷺ چی کرد، وا دڵی کەعبی بۆ خۆی دەستەبەر کرد؟! تەنها هەڵسوکەوتێکی جوانی ئەنجامدا.. دەریخست کە کەعبﷺ لە لای گرنگیو بایەخی تایبەتی هەیە.. کاتێك کەعب خۆشحاڵ بوو، طلحه‌ﷺ بەشداری خۆشیەکەی کردو خۆشی ئەوی بە خۆشی خۆی زانی..

گرنگیدان بە خەڵکیو بەشداربوون لە خۆشیو ناخۆشیەکانیان، دەبێتە هۆی ئەوەی لە لایان خۆشەویست بیت.. کاتێك تۆ سەرگەرمی تاقیکردنەوەکانتیو نامەیەك بۆ مۆبایلەکەت دێتو تیایدا نوسراوە: موژدەم پێبدە لە تاقیکردنەوەکانتدا چۆن بووی؟ بڕوا بکە خەیاڵم لە لاتەو زۆریش لە پەروەردگار پاڕاوەمەتەوە، کە سەرکەوتووت بکات..

هاوڕێی خۆت: إبراهیم..

ئایا خۆشەویستیت بۆ ئەو هاوڕێیەت زیاتر نابێت؟! بە دڵنیاییەوە زیاتر دەبێت..

یان کاتێك باوکت لە نەخۆشخانە نەخۆشەو تۆش بە هۆیەوە زۆر سەرقاڵیت.. هاوڕێیەکت پەیوەندیت پێوە دەکاتو پێت دەڵێت: پێویستیتان بە هیچ شتێك نیە؟! بە هەموو شێوەیەك لە خزمەتتاندام.. تۆش سوپاسی دەکەیتو پاشان دوبارە ئێوارە پەیوەندیت پێوە دەکاتو دەڵێت: نەخۆشەکەتان پێویستی بە چی هەیە، بۆ ئەوەی بۆی بهێنم؟ دوبارە سوپاسی دەکەیتو پێی دەڵێیت: جگە لە دۆعای خێر، پێویستیمان بە هیچ شتێك نیە.. ئەو هاوڕێیەت زیاتر لە لات خۆشەویست نابێت؟! بێگومان خۆشەویست تر دەبێت..

بەڵام ئەگەر هاوڕێیەکی ترت پەیوەندیت پێوە بکاتو پێت بڵێت: فلانە کەس ئێمە وا دەڕۆین بۆ قەراغ دەریا بۆ گەشتوگوزار، لەگەڵمان نایەیت؟!

لە وەڵامدا تۆش دەڵێیت: بڕوا بکەن باوکم نەخۆشەو ناتوانم.. ئەمیش لە باتی ئەوەی داوای لێبوردن بکاتو پۆزش بهێنێتەوە، بۆ ئەوەی هەواڵی نەپرسیووە، بڵێت: دەزانم باوکت نەخۆشە، بەڵام ئەو لە نەخۆشخانەیەو پەرستاری لێیە، بۆ ئەوەی خزمەتی بکەنو بوونی تۆ لەوێ، هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنێت، وەرە با بڕۆین، خۆشی ببینەو مەلە بکە.. ئەم قسانەشی بە شێوازێکی پێکەنیناویو گاڵتەئامێزەوە کرد، وەك ئەوەی نەخۆشی باوکت، هیچ گرنگیەکی نەبێت.. ئایا بۆچوونت بەرامبەر ئەو کەسە چۆن دەبێت؟! بە دڵنیاییەوە ڕێزو خۆشەویستی ئەو کەسە لە لات کەم دەکات، لەبەر ئەوەی غەمو سەرقاڵیەکانی تۆی بە کێشەی خۆی نەزانی..

جارێکیان تووشی هەڵوێستو حاڵەتێکی زۆر ناخۆش بووم.. حاڵەتەکەش بەم شێوەیە بوو: بۆ گەشتێکی چەند ڕۆژە چووم بۆ شاری جەددەو زۆریش سەرقاڵ بووم.. کاتێك

لەوێ بووم، لە لایەن سعودی برامەوە نامەیەك بۆ مۆبایلەكەم هاتبوو، تیایدا نوسی بووی فلانە ئامۆزامان لە ئەڵمانیا كۆچی دوایی كردووە.. پەیوەندیم بە براكەمەوە كردو هەواڵی پێدام، فلانە ئامۆزامان، كە پیاوێكی بە ساڵاچوو بوو، دوو رۆژ لەمەوبەر بۆ چارەسەری دڵی چووبوو بۆ ئەڵمانیاو لە كاتی نەشتەرگەریدا كۆچی دوایی كردووەو بەم زووانەش تەرمەكەی دەهێننەوە بۆ فرۆكەخانەی ریاز.. منیش لە پەروەردگار بۆی پارامەوەو پاشان كۆتاییمان بە پەیوەندیەكەمان هێنا..

دوای دوو رۆژ كۆتاییم بە كارەكانم هێناو چووم بەرەو فرۆكەخانەو چاوەرێی بەرزبوونەوەی فرۆكەكەم دەكرد، بۆ ئەوەی بەرەو ریاز بكەومە رێ.. لەم كاتەدا هەندێك گەنجم بینی، ناسیمیانو هاتن بۆ لامو چاكیو چۆنییان لەگەڵ كردم.. ئەو گەنجانە بە شێوازێكی سەیرو جۆراوجۆر سەرو قژیان چاككرد بوو، منیش لە خۆشەویستیدا قسەی خۆشو گاڵتەم لەگەڵ دەكردنو باسی سەرو قژیانم دەكرد.. بە هۆی پەیوەندیەكی تەلەفۆنیەوە كەمێك سەرقاڵ بووم، كاتێك پەیوەندیەكەم كۆتایی هات، گەنجێك كە پانتۆڵو كراسێكی لەبەردا بوو، بینیمیو هات بۆ لامو بە گەرمی چاكیو چۆنی لەگەڵ كردم.. منیش سڵاوم لێكردو بە گاڵتەوە پێم وت: ئەو قیتو قۆزیو جوانیە چیە؟! دەڵێی تازە زاوای!!

ئەم قسانەو هەندێك قسەی تری لەم جۆرەم لەگەڵ كرد.. گەنجەكە كەمێك بێدەنگ بوو، پاشان وتی: نامناسی؟! من فلانە كەسم، ئێستا لەگەڵ تەرمی باوكمدا لە ئەڵمانیا هاتوومەتەوەو دەمەوێت لە نزیكترین گەشتی فرۆكەدا بەرەو ریاز بچم..

لە راستیدا وەكو ئەوە وابوو بەرمیلێك ئاوی سارد بكەن بە سەرمدا!! زۆر شەرمەزارو نارەحەت بووم.. باوكی مردووەو تەرمەكەی وا لە فرۆكەدایەو منیش بەم شێوەیە گاڵتەم لەگەڵ كردو پێدەكەنیم!! بە راستی شتێكی سەیر بوو!! كەمێك بێدەنگ بوومو پاشان وتم: بە داخەوە، بروا بكە ئاگاداری بارودۆخت نەبووم، چەند زۆرێكیشە لێرە چاوەرێم، خودا لە باوكت خۆش بێتو پاداشتی ئێوەش بداتەوە..

لە راستیشدا من گوناهبار نەبووم، كە ئاگام لە بارودۆخی ئەو گەنجە نەبوو.. لە ژیانمدا كەمێك نەبێت، ئەم بینی بوو، كاتێكیش كە بینی بووم، بە پانتۆڵو كراسەوە نەمبینی بوو.. لە جەددەش كاتێك بەو جلوبەرگەوەو لە ناو ئەو قەرەباڵغیەدا هات بۆ لام، بە خەیاڵمدا نەدەهات كە ئەوە فلانە كەس بێت.. كەواتە كاتێك كە دەتەوێت گرنگی بە خەڵكی بدەیت، دەبێت غەمو ناخۆشیەكانیان، بە غەمو ناخۆشی خۆت

بزانیت‌و هەردەم خێرو خۆشیت بۆیان بوویت..

هەر لەم ڕوانگەیەوە، هەندێك كۆمپانیای پێشكەوتوو دەبینیت، كە بەڕێوەبەرایەتیەكیان هەیە، بۆ پەیوەندیە گشتیەكان، كە كارەكانی بریتیە لە ناردنی نامەی پیرۆزبایی‌و پێشكەش كردنی دیاری لە بۆنەكاندا.. بەم شێوەیەش ئەو كۆمپانیایە لە لای خەڵكی خۆشەویست دەبێت‌و ژمارەی ئەندامەكانی زۆرتر دەبن..

كاتێك كەسێك دێتە شوێنێكی قەرەباڵغەوەو شوێنێكی چۆڵ نابینێت، بۆ ئەوەی دابنیشێت، تۆش لە تەنیشت خۆتەوە جێگەیەكی بۆ دەكەیتەوەو بانگی دەكەیت‌و پێی دەڵێیت: فلانە كەس فەرموو وەرە لێرە دابنیشە.. دڵنیابە هەست بەوە دەكات كە تۆ بایەخت پێداوەو ئەوساش خۆشی دەوێت..

پێغەمبەری خوداﷺ زۆر گرنگی بە خەڵكی‌و بە موسڵمانان دەدا، هەر وەك پێشتر باسمان كرد، چۆن وازی لە وتاری هەینی هێناو لە سەر دوانگەكەی هاتە خوارەوە، بۆ ئەوەی ئامۆژگاری كەسێك بكات، لەبەر ئەوەی ئەگەر پشتگوێی بخستایە، لەوانەیە هەتا مردن لە سەر ئەو نەزانیەی بمایاتەوەو لە ئاینەكەی شارەزا نەبووایە..

هەروەها كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ تەوقەی لەگەڵ كەسێكدا بكردایە، هەتا ئەو كەسە دەستی پێغەمبەری خودایﷺ بەرنەدایە، پێغەمبەری خوداﷺ دەستی بەرنەدەدا.. كاتێكیش قسەی لەگەڵ كەسێكدا بكردایە، بە تەواوی ڕووی تێدەكردو زۆر بە وردی گوێی لێدەگرت‌و بێدەنگ دەبوو..

**ئەزموون..**

كاتێك خەڵكی هەست بەوە دەكەن، كە نرخیان بۆ دادەنێیت‌و گرنگیان پێدەدەیت، خۆشیان دەوێیت‌و دڵو دەروونیان بە دەست دەهێنیت..



## با هەست بکەن، خێرو خۆشی ئەوانت دەوێت..

هەر چەندە دڵو دەروونت پڕ بێت لە خۆشەویستی.. هەر چەندە لە هەڵسوکەوتو بەکارهێنانی شارەزاییەکانتدا، زیاتر ڕاستگۆ بیت.. هەر چەندە خەڵکی زیاتر هەست بەوە بکەن، کە تۆ ئەوانت خۆش دەوێتو خێرو خۆشیت بۆیان دەوێت.. ئەوا زیاتر لە لای خەڵکی خۆشەویست تر دەبیتو دڵو دەروونیان داگیر دەکەیت..

پزیشکێکی ئافرەت هەبوو، بەردەوام عیادەکەی پڕ بوو لە نەخۆش.. نەخۆشەکان حەزیان دەکرد، بۆ چارەسەری نەخۆشەکانیان سەردانی بکەنو هەردەم پزیشکە ئافرەتەکەیان بە دۆستو هاوڕێیەکی خۆیان دەزانی.. هەمووئەمانەش بە هۆی بەکارهێنانی چەندان هۆکارو شارەزاییەوە بوو، کە پزیشکەکە توانی بووی بە هۆیانەوە دڵو دەروونی ئەو نەخۆشانە، بۆ لای خۆی ڕابکێشێت..

یەکێك لەو هۆکارو شارەزاییانەی کە پزیشکەکە بەکاری دەهێنا، بریتی بوو لەوەی: لەگەڵ سکرتێرەکەیدا لە سەر ئەوە ڕێککەوتبوون، کاتێك نەخۆشێك دەهات بۆ عیادەکە، سکرتێرەکە دەربارەی ناوی نەخۆشەکەو هەندێك شتی تایبەت، پرسیاری لە نەخۆشەکە دەکرد، پاشان لە دوای پێنج خولەك، بانگی نەخۆشەکەی دەکرد، بۆ ئەوەی بچێتە ژوورەوە بۆ لای پزیشکەکە.. سکرتێرەکەش زانیاریەکانی لە شێوەی فۆڕمێکدا دەدا بە پزیشکەکە، کاتێك پزیشکەکە زانیاریەکانی نەخۆشەکەی دەخوێندەوە، پرسیارو هەواڵ پرسینی دەربارەی نەخۆشیەکەیو منداڵە بچوکەکەیو وەزیفەو کارەکەی لێدەکرد.. نەخۆشەکەش هەستی بەوە دەکرد، کە بە ڕاستی ئەم پزیشکە گرنگی پێدەداتو خۆشی دەوێت.. ئەوەتا ناوی خۆییو منداڵەکەیو جۆری نەخۆشیەکەی هێشتا لەبیرماوە، لەبەر ئەوە نەخۆشەکە حەز دەکات سەردانی ئەم پزیشکە بکاتەوە..

ئایا بینیت پزیشکەکە چەند بە ئاسانی دڵو دەروونی نەخۆشەکانی بە دەست هێنا؟! دەشتوانی زۆر بە ڕاشکاوانەو بە ئاشکرا خۆشەویستی خۆت، بۆ کەسانی تر دەرببڕیت، جا ئەو کەسانە باوکت، یان دایکت، یان هاوسەرەکەت، یان منداڵەکانت، یان دراوسێو هاوەڵەکانت بن.. هەستو سۆزی خۆت مەشارەوەو پێیان بڵێ: خۆشم دەوێیت، دەتوانیت

پێی بڵێیت: تۆ لام خۆشەویست تری، لە زۆرێك لە خەڵكی.. ئەم قسەیەش نابێت بە درۆ، لەبەر ئەوەی ئەم کەسەت خۆشتر دەوێت، لە ملیۆنەها کەسی جولەکە.. ئایا وانیە؟! دەی کەسێکی زیرەكو شارەزاو وریابە..

جارێکیان چووم بۆ عومرە، لە کاتی تەوافو سەفاو مەروەدا، دۆعام بۆ هەموو موسڵمانان کرد، کە پەروەردگار دامەزراوو سەرکەوتوویان بکات.. پاشان چووم بۆ ئوتێلێك، بۆ ئەوەی تیایدا بمێنمەوە، کاتێك سەرم خستە سەر سەرینەکەم، نامەیەکی مۆبایلم نارد بۆ هەموو ئەو ژمارانەی لە مۆبایلەکەمدا بوون، کە ژمارەیان نزیکەی پێنج سەد ژمارە دەبوو، تیایدا نوسی بووم (ئێستا لە ئەنجامدانی عومرە تەواو بوومو خۆشەویستانم وە بیرهاتەوە، کە تۆش یەکێکی لەو خۆشەویستانەو لە بیرم نەکردووی‌و دۆعای خێرم بۆ کردووی)..

بە ڕاستی کاریگەرییەکی زۆر زۆری هەبوو، هەیان بوو بەم شێوە وەڵامی دامەوەو نوسی بووی: سوێند بە خودا کاتێك کورتە نامەکەتم خوێندەوە، دەستم کرد بە گریان.. سوپاست دەکەم کە منت لە یاد بووە.. یەکێکی تریان نوسی بووی: سوێند بە خودا نازانم چۆن وەڵامت بدەمەوە، بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم: خودای گەورە پاداشتی بەخێرت بداتەوە.. کەسێکی تریان نوسی بووی: داواکارم خودای پەروەردگار دۆعاو پاڕانەوەکانت وەربگرێت.. سوێند بە خودا ئێمەش هەرگیز لە یادت ناکەین..

بە ڕاستی ئێمە پێویستمان بەوە هەیە، کە یادی خەڵكی بێنینەوە، کە خۆشمان دەوێن‌و سەرقاڵیەکانی دونیا، ئەوانمان لەیاد ناکەن.. بە هەمان شێوەی نامەکەی پێشوو، دەتوانی لە نێوان بانگو قامەتدا، یان لە کۆتا کاتژمێری ڕۆژی هەینیدا، کە دۆعاو پاڕانەوەیان تیادا وەرگیراوە، بە دۆستو خۆشەویستانت بڵێیت: ئێوەم لە یادبووەو دۆعام بۆ کردوون.. خۆ ئەگەر لەم کارەشتدا نیەتت باش بێت، ئەوا نابێتە هۆی ڕووپامایی، بەڵکو دەبێتە هۆی زیاد کردنی سۆزو خۆشەویستی لە نێوان تۆو ئەو کەسانەدا..

لە یادمە، جارێکیان لە خێوەتگەیەکی هاوینەدا، لە شاری تائیف وتارێکم پێشکەشی کۆمەڵێك گەنج کرد، کە چاکەو دڵسۆزی لە ڕوخساریاندا دیار بوو، تەنها هەندێك گەنج نەبێت، لە دەوری خێوەتگەکە خەریکی یاری‌و گاڵتەوگەپ بوون.. وتارەکەم پێشکەش کرد، پاشان گەنجەکان لە دەورم کۆبوونەوەو چاكو چۆنییان لەگەڵ دەکردم، لە نێوانیاندا گەنجێك هەبوو، پانتۆڵێکی تەسکی لە پێدا بوو، سەرو قژی بە شێوەیەکی

سەیر چاك كرد بوو.. هاتە پێشەوەو سڵاوی كردو سوپاسی كردم، منیش زۆر بە گەرموگوڕی وەڵامی سڵاوەكەیم دایەوەو بە توندی دەستیم گوشیو پێم وت: ڕوخسارت لە كەسێكی بانگخواز دەچێت، گەنجەكەش زەردەخەنەیەكی كردو ڕۆیشت..

دوای دوو هەفتە لەپڕ پەیوەندیەكم پێوە كرا، كەسێك بوو دەیووت: نامناسیت؟! یاشێخ من ئەو كەسەم كە پێت وتم: ڕوخسات لە كەسێكی بانگخواز دەچێت، سوێند بە خودا بە ویستی پەروەردگار دەبم بە بانگخواز.. پاشان باسی ئەوەی بۆ كردم، لە دوای ئەوەی ئەو قسەیەی ئەو ڕۆژە، كە پێم وتبوو، ڕوخسارت لە كەسێكی بانگخواز دەچێت، چ هەستو سۆزێكی بۆ دروست بووە!!

ئایا نابینیت دەربڕینی هەستو سۆزو خۆشەویستی ڕاستەقینە، چ كاریگەریەكی هەیە؟! پێغەمبەری ئازیزﷺ بە ڕەوشتو ئاكارە ناوازەكانی دڵو دەروونی خەڵكی بە دەست هێنا..

ئیمامی ئەبوبەكرو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) دوو هاوەڵی گەورەو بە ناوبانگو بەڕێز بوون، ئەم دوو هاوەڵە لە ئەنجامدانی خێرو چاكەدا، پێشبڕكێیان دەكرد.. ئەڵام زۆربەی كات ئیمامی ئەبوبەكرﷺ پێش ئیمامی عومەرﷺ دەكەوت.. كاتێك ئیمامی عومەرﷺ دەیویست زوو بچێت بۆ مزگەوت، سەیری دەكرد ئیمامی ئەبوبەكرﷺ پێش ئەم لە مزگەوت ئامادە بووە.. كاتێك دەیویست هەژارێك تێر بكات، یان شەونوێژ بكات، دەیبینی ئیمامی ئەبوبەكرﷺ لە مێژە ئەم كارانەی ئەنجام داوەو پێشی كەوتووە..

ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ داوای لە موسڵمانان كرد، خێرو خێرات بكەنو ببەخشن، بۆ ئەوەی پێویستی موسڵمانان پڕ بكەنەوەو برسیو هەژارەكان تێر بن.. لەم كاتەدا ئیمامی عومەرﷺ بڕیاریدا نیوەی ماڵەكەی بكات بە خێرو پێشكەشی موسڵمانانی بكات، هەر بۆیە لە دڵی خۆیدا وتی: ئەمڕۆ پێش ئەبوبەكر دەدەمەوەو پێشی دەكەوم..

ئیمامی عومەرﷺ بە نیوەی ماڵەكەیەوە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ.. پێغەمبەری خوداشﷺ دەیزانی ئیمامی عومەرﷺ لەم كاتەدا چ پرسیارێكی پێخۆشە، هەر بۆیە پرسیاری لێكردو فەرمووی: عومەر چیت بۆ ماڵو منداڵەكانت جێهێشتووە..؟

ئیمامی عومەریشﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ چەندم

هێناوە، ئەوەندەم بۆ جێهێشتوون.. ئیمامی عومەرﷺ لە لای پێغەمبەری خوداﷺ دانیشتو چاوەڕێی ئیمامی ئەبوبەکریﷺ دەکرد..

بەڵێ.. ئیمامی ئەبوبەکریشﷺ هات، ماڵو سامانێکی زۆر گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێناو لە بەردەم پێغەمبەری خواداﷺ داینا.. ئیمامی عومەرﷺ لە جێگەکەی خۆی هەستاو سەیری بەخشینەکانی ئیمامی ئەبوبەکری دەکردو گوێشی لە وتووێژی نێوان ئەوو پێغەمبەری خوداﷺ گرت، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ پرسیاری کردو فەرمووی: ئەبوبەکر چیت بۆ ماڵو منداڵەکانت جێهێشتووە؟! ئیمامی ئەبوبەکریشﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ خوداو پێغەمبەرەکەیم بۆ جێهێشتوون، بەڵام ماڵو سامانەکەم هەموو هێناوە..

بەڵێ.. چوار یەکی یان نیوەی یان سێ یەکی ماڵەکەی نەهێنا، بەڵکو هەمووی هێنا..

ئیمامی عومەرﷺ هیچی پێ نەوترا، جگە لەوەی فەرمووی: هەرگیز ناتوانم پێش ئەبوبەکر بکەوم..

ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ پێشنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، نوێژەکەی شێوەیەك لە پەلە کردنی پێوە دیار بوو.. کاتێك نوێژەکە کۆتایی هات، پێغەمبەری خوداﷺ سەرسامیەکی بە ڕوخساری موسڵمانانەوە بینی، بۆیە پرسیاری کردو فەرمووی: وا دەزانم سەرسامیەکتان پێوە دیار بێت، لەوەی کە نوێژەکەم کورت کردەوەو درێژەم پێنەدا..

هاوەڵان فەرموویان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا..

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: کاتێك گوێم لە گریانی منداڵێك بوو، بەزەییم بە دایکیدا هاتەوەو نوێژەکەم کورت کردەوە..

ئایا بینیت پێغەمبەری خوداﷺ چۆن خۆشەویستی خەڵکی بە دەست دەهێنێت؟! ئایا بینیت ئیمامی ئەبوبەکرﷺو ئیمامی عومەرﷺ بە هۆی داوایەکی پێغەمبەری خوداوەﷺ چۆن ماڵو سەروەتو سامانەکەیان پێشکەشی موسڵمانان کرد؟!

**تۆ بە تەنها نیت..**

هەستو سۆزت پیشان بدەو بە ڕاشکاوانە بڵێ: خۆشم دەوێیتو خۆشحاڵم بە دیدارتو تۆ کەسێکی زۆر بە نرخی لە لام..

# ناوەکان لەبەر بکە..

لەبەرکردنی ناوی خەڵکی، شێوازێکە لە گرنگی پێدانیان.. چەند جوانە، کاتێك لە شوێنێکی وەك بانك، یان فرۆکە، یان میوانداریەکی گشتیدا، بە کەسێك دەگەیت و سەرەتای یەکتر ناسینێك لە نێوانتاندا دروست دەبێت، پاشان دوای ماوەیەك لە شوێنێکی تردا دەیبینیتەوەو سڵاوی لێدەکەیت و پێی دەڵێیت: سڵاوت لێ بێت فڵانە کەس.. بێگومان خۆشەویستیت لە دڵیدا چەکەرە دەکات، لەبەر ئەوەی بە ناوەکەی خۆیەوە سڵاوت لێکرد..

کاتێك لەگەڵ کەسێکدا بە یەك دەگەیت و بە ناوەکەی خۆیەوە بانگی دەکەیت، ئەو کەسە هەست بەوە دەکات، کە گرنگیت پێداوەو لە یادت نەکردووە.. جیاوازی بکە لە نێوان ئەو مامۆستایەی کە ناوی قوتابیەکانی لەبەر دەکات، لەگەڵ ئەو مامۆستایەی کە گرنگی بە ناوی قوتابیەکانی نادات و لەبەریان ناکات.. کاتێك مامۆستایەك بە ناوی خۆیەوە بانگی قوتابیەکەی دەکات و دەڵێت: نادەی فڵان هەستە، زۆر جیاوازە لەوەی کە تەنها بڵێت: ئا دەی هەستە..

لە وەڵامدانەوەی مۆبایل و تەلەفۆنیشدا، ئەو کەسەی کە پەیوەندی پێوە دەکەیت، پێت خۆشە بە ئەلو یان بە بەڵێ وەڵام بداتەوە، یان ناوت بهێنێت و بڵێت: سڵاو محمد..؟! بێگومان کاتێك ناوت دەهێنێت، پێش گوێت، دڵت دەبیستێت..

زۆر جار کاتێك لە وانە وتنەوە تەواو دەبم، زۆرێك لە قوتابیەکانم قەرەباڵغی دروست دەکەن و تەوقەو سڵاوم لێدەکەن.. منیش زۆر گرنگی بە ناوەکانیان دەدەم و پێیان دەڵێم: ناوی بەڕێزت؟ خودا پارێزراوت بکات، بەڕێزت..؟ پرسیاری ناوی هەموویانم دەکرد، بۆ ئەوەی بزانێت کە گرنگی پێدەدەم، ئەوانیش بە ڕوویەکی خۆشەوە وەڵامیان دەدامەوەو دەیان وت: برای خۆت زیاد.. کوری خۆت یاسر..

لە یادمە ڕۆژێك لە دوای چاکی و چۆنی، قوتابیەکانم ڕۆیشتن، پاشان یەکێکیان بە هۆی پرسیارێکەوە گەڕایەوە، کاتێك گەیشتە لام، یەکسەر وتم: سڵاو خالد.. ڕوخساری گەشایەوەو وتی: ماشاءالله، چۆن ناوم دەزانیت؟!

هەر بۆیە خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی، هەموو حەز دەکەن بە ناوی خۆیانەوە بانگ بکرێن.. ئاشکرایە ئەو کەسانەی لە بواری سەربازیدا کار دەکەن، زۆر جار ناویان لە سەر پارچە کانزایەك دەنوسرێت و لە سەر سنگیان هەڵدەواسرێت.. جارێکیان لە سەربازگەکاندا وتارێکم پێشکەش

کرد.. لە دوای وتارەکە، کەسانێکی زۆر هاتن بۆ ئەوەی سڵاوو چاکو چۆنیم لەگەڵ بکەن، بەڵام کەسێك لێم نزیك دەبۆوەو شەرمی دەکردو دوور دەکەوتەوە.. ئاورم بۆ دایەوەو سەیری ناوەکەیم کرد، کە بە سەر سنگیەوە بوو، پاشان دەستم بۆ درێژ کردو بە ناوەکەی خۆیەوە بانگم کردو سڵاوم لێکرد.. ڕوخساری گۆڕاو سەرسام بوو.. زەردەخەنە کەوتە سەر لێویو دەستی درێژ کردو وتی: هاا! چۆن ناوەکەمت زانی؟!

منیش وتم: برام.. ئەو کەسانەی خۆشمان دەوێن، پێویستە ناوەکانیشیان بزانین.. ئەم قسانە کاریگەرییەکی زۆریان لە سەر دروست کرد..

زۆرێك لە خەڵکی حەز دەکەن ناوی کەسانێکی زۆر لەبەر بکەن.. هۆکارەکانی لە بیرچوونەوەی ناوەکانیش، یان نەتوانینی لەبەرکردنیان زۆرن، لەوانەش: گرنگی نەدان بە کەسانی بەرامبەر، لە کاتی یەکتر بینیندا.. هەروەها سەرقاڵ بوون، لە کاتی یەکتر ناسیندا، یان گوێ نەدان بە ناوی کەسی بەرامبەر.. هەروەها بۆچوونی جیاواز دەربارەی کەسی بەرامبەر، وەك ئەوەی باوەڕت وا بێت، جارێکی تر ئەو کەسە نابینیتەوەو بە خۆت بڵێیت: ئیتر چ پێویستە ناوەکەی لەبەر بکەم؟! یان کەسی بەرامبەر کەسێکی ئاسایی بێتو گرنگی پێنەدەیتو باوەڕت وا بێت، هەرگیز کارێکت پێی نابێت، هەتا ناوەکەی لەبەر بکەیت..

چارەسەریش بۆ لەبیر نەچوونەوەی ناوەکان، بە چەند ڕێگەیەك دەبێت، لەوانە: گرنگی زۆر بە ناوەکان بدەیتو باوەڕت وا بێت، پاش چەند خولەکێکی تر پرسیارت دەربارەی ئەو ناوەوە لێدەکەن.. هەروەها کاتێك ناوی کەسی بەرامبەرت گوێ لێدەبێت، هەوڵ بدەیت بە وردی دیقەتی شێوەو ڕوخساری بدەیت.. هەروەها سەیری شێوازی گفتوگۆ کردنی بکەیتو سروشتی کەسەکە لە خەیاڵتدا تۆمار بکەیت.. هەروەها لە کاتی گفتوگۆ کردندا، هەوڵ بدە چەند جارێك ناوەکەی دووبارە بکەرەوە، وەك ئەوەی پێی بڵێیت: وایە ئەحمەد..؟ گوێت لێمە ئەحمەد..؟ لەگەڵمدای ئەحمەد..؟ ئەم دووبارە کردنەوەی ناوە، شتێکی زۆر گرنگە.. هەر بۆیە ئەگەر لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان ورد بیتەوە، دەبینیت پەروەردگار لە چەندان شوێندا پێغەمبەران بە ناوەکانی خۆیانەوە بانگ دەکات، بۆ نموونە: ﴿ يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَآ ...﴿٧٦﴾ ﴾.. ﴿ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَ ...﴿٤٦﴾ ﴾.. ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلۡأَرۡضِ ...﴿٢٦﴾ ﴾..

**بە کورتی..**

**بە لەبەرکردنی ناوەکەمو بانگ کردنم بە ناوی خۆمەوە، وام لێبکە هەست بکەم گرنگیم پێدەدەیت، بۆ ئەوەی منیش خۆشم بوویێت..**

## مژدەدەرو ڕووخۆش بە..

زۆرێك لەو هەڵسوكەوتو كارانەی كە ڕۆژانە ئەنجامیان دەدەین، لە پێناوی خەڵكیدایە، نەك لەبەر خۆمان.. كاتێك بانگ دەكرێیت بۆ میواندارییەك، جوانترین جل‌وبەرگ لەبەر دەكەیت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە سەرنجی خەڵكی بە لای خۆتدا ڕابكێشیت، نەك لەبەر ڕازی كردنو سەرنج ڕاكێشانی خۆت بۆ خۆت..

كاتێك خۆت ئامادە دەكەیت بۆ ئەوەی میوانداری كەسانێك بكەیت، زۆر هەوڵی جوان كردنی بەڕێوەبردنی میواندارییەكە دەدەیت، ئەمەش بۆ ڕاكێشانی سەرنجی خەڵكیە، نەك لەبەر خۆت، بەڵگەشمان ئەوەیە، ئەوەندەی گرنگی بە ژووری میوان دەدەیت، ئەوەندە گرنگی بە ژوورەكانی ناوەوەو ژووری منداڵەكانت نادەیت!!

كاتێك میوانداری كەسێك دەكەن، خۆتو هاوسەرەكەشت زۆر گرنگی بە خواردنو ڕازاندنەوەی خوانەكەتان دەدەن!! هەتا میوانەكانیشتان زیاتر جێگەی بایەخ و گرنگی بن، زیاتر ئێوەش خۆتان بۆ ئەو پێشوازیو میواندارییە ئامادە دەكەن.. كاتێكیش كەسانێك باسی جوانی جل‌وبەرگەكانمان، یان ڕازاوەیی ماڵەكانمان، یان بەلەزەتی خواردنەكانمان دەكەن، زۆر دڵخۆشو ئاسودە دەبین..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: «وليأت الناس الذي يحب أن يأتوا إليه».. واتە: (بەو شێوەیە هەڵسوكەوتو مامەڵە لەگەڵ خەڵكیدا بكە، كە حەز دەكەیت مامەڵەو هەڵسوكەوتت لەگەڵ بكەن)..

چۆن؟! كاتێك هاوڕێیەكت دەبینی، جل‌وبەرگێكی جوانی لەبەردایە، پێی بڵێ: ماشاءالله!! ئەمڕۆ چەند جوانیت!! دەڵێی تازە زاوایت!!

كاتێك كەسێك سەردانت دەكاتو بۆنێكی خۆشی لە خۆی داوە، دەستخۆشی لێ بكەو بڵێ: چەند بۆنێكی خۆشە!! چونكە بە دڵنیاییەوە، بۆ تۆ خۆی بۆنخۆش كردووە.. كاتێك كەسێك بانگت دەكات بۆ میواندارییەك، سوپاسی بكە، چونكە بە دڵنیاییەوە دایكی یان خوشكی یان هاوسەری ئەو كەسە، بە ئامادەكردنی ئەو خواردنو میواندارییەوە ماندوو بوونو چەندان كاتژمێریان لە چێشتخانە بەسەربردووە، بۆ ئەوەی خواردنێكی باش بۆ تۆ دروست بكەن..

کاتێك سەردانی ماڵی یەکێك لە هاورێکانت دەکەیتو دەبینیت بە شێوازێکی جوان کەلوپەلەکانی ماڵەوەیان رێك خستووە، سەرسامی خۆت دەربڕەو پێیان بڵێ: بە راستی بە شێوازێکی جوان ماڵەکەتان رێکوپێك کردووە، بەڵام ئاگاداربەو لە سنوری خۆی زیاتر، زیادەڕەوی مەکە لە دەربڕینی سەرسامی خۆت، چونکە زیادەڕەوی کردن لە پیاهەڵداندا، وەکو گاڵتەجارییەکی لێدێتو کەسی بەرامبەر وا دەزانێت گاڵتەی پێدەکەیت..

کاتێك لە دانیشتنێکی گشتیدا ئامادە دەبیتو کەسێك لە ئامادەبووان دەبینیت، کە زۆر بە لێهاتوویی‌و شارەزاییەوە، سەرنجی ئامادەبووانی بە لای خۆیدا راکێشاوەو دانیشتنەکەی گەرموگورو خۆش کردووەو بووەتە هۆی دڵخۆشی ئامادەبووان، ئەوا لە کاتی هەستانو ماڵئاواییدا دەستی بگرەو بڵێ: ماشاءالله..!! بە راستی لێهاتوویت..!! دانیشتنەکەت خۆش کرد..!! ئەم قسەو هەڵسوکەوتانە تاقی بکەرەوە، بزانە چۆن خۆشەویست دەبیت..

کاتێك هەڵوێستێکی جوان دەبینیت، وەك دەست ماچ کردنی باوکێك لە لایەن کوڕەکەیەوە، یان کاتێك کوڕێك دەبینیت، نەعل یان پێڵاو بۆ باوکی دادەنێت، ستایشی بکەو پیایدا هەڵبدەو ئافەرینی بکە.. هەروەها کاتێك هاورێیەکت دەبینی، زۆر گرنگی بە منداڵەکانی دەدات، یان زۆر بایەخ بە میوانەکانی دەدات، ئافەرینی بکەو زیاتر هانی بدە..

هەوڵ بدە ئەوەی لە دەروونتدا هەیە، کاتێك کە دەتەوێت ستایشی کەسێك بکەیت، دەری ببڕەو شەرم مەکە.. کاتێك سواری ئۆتۆمبیلی هاورێیەکت، یان سواری تەکسیەك دەبیتو تێبینی ئەوە دەکەیت کە زۆر بە باشی ئۆتۆمبیلەکەی بە پاكو خاوێنی راگرتووە، یان شۆفێرییەکەی زۆر سەرکەوتووە، دەستخۆشی لێبکەو زیاتر هانی بدە..

لەوانەیە پێم بڵێیت: ئەم شتانە زۆر ئاساییــن!! راست دەکەیت، بەڵام زۆر کاریگەرییان هەیە، لەبەر ئەوەی زۆر جار خۆم ئەم هەڵسوکەوتو شارەزاییانەم لەگەڵ کەسانێکی زۆردا تاقی کردۆتەوە، لەگەڵ گەورەو بچوکدا.. لەگەڵ کرێکارو مامۆستادا.. بەڵکو لەگەڵ کەسانێکیشدا، کە خاوەنی پلەوپایەی گەورەش بوون، پاشان بینیم کاریگەری سەرسوڕهێنەریان لە سەر دروست کردوون، بە تایبەت لە هەندێك کاروباردا، کە خەڵکی چاوەڕێی پیرۆزباییان لێبکەیت..

تازە زاوایەك، چەند رۆژێکە هاوسەری گواستۆتەوە، یان کەسێك بڕوانامەیەکی بەرز بە دەست دەهێنێت، یان خانوویەکی تازە دروست دەکات، هەموو ئەمانە چاوەڕێی بە چەند وشەیەکی جوان، پیرۆزباییان لێبکەیت.. دەی ئەوان چاوەڕێی چی لە تۆ دەکەن،

ئەوەیان بۆ ئەنجام بدەو بەو زمانە بدوێ کە پێیان خۆشە..

ئامۆزایەکی گەنجم هەبوو، بە ناوی عبدالمجید، دوای تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی، داوای لێکردم لەگەڵیدا بچم بۆ زانکۆ، بۆ ئەوەی ناوی تۆمار بکات.. بەیانیەکیان پەیوەندیم پێوە کردو بە ئۆتۆمبیلەکەم چووم بۆ ماڵیان، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ زانکۆ..

ئامۆزاکەم هەستێکی تایبەتی هەبوو، لەبەر ئەوەی بەرەو قۆناغێکی تازەی ژیانی دەچوو.. بیری لەو کۆلیژە دەکردەوە، کە وەری دەگرێت.. کاتێك سەرکەوتە ناو ئۆتۆمبیلەکەمەوە، یەکسەر بۆنێکی زۆر قورس، بڵاوبۆوە.. وا دیار بوو شوشە بۆنەکەی بە تەواوی بە سەر جل‌وبەرگەکانیدا ڕژاند بوو!! بە ڕاستی خەریك بوو بەو بۆنە بخنکێم!! جامەکانی ئوتومبیلەکەم کردەوە، بۆ ئەوەی کەمێك هەناسە بدەم!! هەستم کرد ئەو هەژارە لە خۆگۆڕین‌و خۆبۆنخۆش کردنیدا، زیادەڕەوی کرد بوو..

بە هەر حاڵ ئاوڕم بۆ دایەوەو بە زەردەخەنەیەکەوە پێم وت: ماشاءالله!! ئەم بۆنە خۆشە چیە؟! دەترسم کاتێك ڕاگری کۆلیژ، بۆنی ئەم بۆنە خۆشە بکات، یەکسەرو بە خێرایی‌و بە دەنگێکی بەرز هاوار بکات‌و پێت بڵێت: ئەوا وەرگیرایت..

بەم قسانەی من زۆر خۆشحاڵ بوو.. ڕەنگ‌و ڕوخساری گەشایەوەو زۆر بە دڵخۆشیەوە وتی: سوپاست دەکەم.. بڕوا بکە ئەم بۆنە، بۆنێکی زۆر گران بەهایەو زۆر بەکاری دەهێنم، بەڵام خەڵکی هەستی پێناکەن، پاشان بۆنی جل‌وبەرگەکانی کردو وتی: توخوا بە ڕاست، بۆنێکی خۆشم هەڵبژاردووەو هەستێکی جوانم هەیە؟!

لە دوای تێپەڕبوونی پانزە ساڵ بە سەر ئەم ڕووداوەداو دوای ئەوەی ئامۆزاکەم کۆلیژی تەواو کردو دامەزرا، هەڵوێستەکەی هەر لە یاد مابوو، زۆر جاریش بە گاڵتەوە بیری دەخستمەوە..

بەڵێ.. بە دەست هێنانی خۆشەویستی خەڵکی‌و جوولاندنی هەست‌و سۆزیان کارێکی زۆر ئاسانە.. بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەری خوداﷺ لە بەکارهێنانی شارەزاییەکان‌و بە دەست هێنانی خۆشەویستی خەڵکیدا، لە هەموو کەس شارەزاترو بە تواناتر بووە..

کاتێك ئازارو نارەحەتیەکانی موسڵمانان، لە مەککە زیادیان کرد، موسڵمانان بەرەو شاری مەدینە کۆچیان کردو ماڵ‌و حاڵیان هەموو جێهێشت، یەکێکیش لەو موسڵمانە کۆچکەرانە، عبدالرحمانی کوڕی عەوف بوو..

عبدالرحمنرضي الله عنه بازرگانێکی گەورەی شاری مەککە بوو، بەڵام زۆر بە هەژاری‌و نەداری هات بۆ شاری مەدینە.. وەك چارەسەرێکی خێرای کێشەی هەژاری موسڵمانە کۆچکەرەکان، پێغەمبەری خوداﷺ هەستا بە دروست کردنی برایەتی، لە نێوان هەر

موسڵمانێکی کۆچکەرو موسڵمانێکی پشتیوانانی شاری مەدینە..

عبدالرحمن‌و سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاریش، بوون بە برای یەکتر.. ئەو موسڵمانانە بە ڕاستی برای ڕاستەقینەی یەکتر بوون، دڵ‌و دەروونیان پاک‌و خاوێن بوو، هەر بۆیە سەعدﷺ بە عبدالرحمانی فەرموو: براکەم، من دەوڵەمەندترین کەسی شاری مەدینەم، ماڵ‌و سەروەت‌و سامانەکەم دەکەم بە دوو بەشەوە، بەشێکیان بۆ تۆو بەشێکیان بۆ خۆم.. دوو هاوسەریشم هەیە، کامیانت دەوێت، تەڵاقی دەدەم‌و پاشان لێتی مارە دەکەم.. عبدالرحمنﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: خودای پەروەردگار خێروبێری خۆی بە سەر ماڵ‌و خێزان‌و سەروەت‌و سامانتدا بڕێژێ، تەنها داوای ئەوەت لێدەکەم ڕێنماییم بکەیت‌و بازارم نیشان بدە..

ڕاستە عبدالرحمنﷺ ماڵ‌و سەروەت‌و سامانەکەی جێهێشتووەو هەژار کەوتووە، بەڵام خاوەن ژیری‌و شارەزاییەکی بازرگانی فراوان بوو..

بەڵێ.. عبدارحمنﷺ ڕێگەی بازاڕی گرتە بەرو دەستی بە کڕین‌و فرۆشتن کرد.. بەرە بەرە هەندێك سەروەت‌و سامانی کۆکردەوەو هاوسەری مارە کرد، پاشان سەردانی پێغەمبەری خوداﷺ کرد، لەم کاتەدا عبدالرحمنﷺ لەبەر ئەوەی تازە زاوا بوو، بۆنی زەعفەرانی لێدەهات، کە بۆنێکی ئافرەتانەیەو کەسانی تازە زاوا، ئەو بۆنەی تازە بووکیان لێدێت..

پێغەمبەری خوداﷺ لە هەلێك دەگەڕا بۆ ئەوەی دڵەکان کەمەندکێش بکات‌و خۆشەوستیان بە دەست بهێنێت، کاتێك هەندێك گۆڕانکاری بە عبدالرحمانەوە بینی، فەرمووی: هەواڵ‌و دەنگ‌وباس چیە؟!

عبدالرحمانیشﷺ بە ڕوخسارێکی گەشاوەوە وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئافرەتێکی خەڵکی شاری مەدینەم مارە کردووە.. پێغەمبەری خوداﷺ سەری سوڕماو لە دڵی خۆیدا دەیوت: چۆن توانیوویەتی ژن مارە بکات، لە کاتێکدا ماوەیەکی کەمە کۆچیان کردووە بۆ مەدینە!! پاشان پێی فەرموو: ئەی چیت بۆ کرد بە مارەیی؟

عبدالرحمنﷺ فەرمووی: بە ئەندازەی ناوکی خورمایەك ئاڵتونم بۆ کرد بە مارەیی.. پێغەمبەر خوداﷺ ویستی زیاتر دڵخۆش‌و کامەرانی بکات، هەر بۆیە پێی فەرموو: بەو بۆنەیەوە میواندارییەك پێك بهێنەو خواردن بدە بە میوانەکان.. پاشان پێغەمبەری خوداﷺ لە پەروەردگار بۆی پاڕایەوەو داوای کرد خێرو بەرەکەت بە سەر ماڵ‌و بازرگانیەکەیدا بڕێژێت..

عبدالرحمنﷺ دەفەرمویت: سوپاس بۆ خودا خێروبێرێکی زۆرم بە سەردا رژا، هەتا وام لێهات ئەگەر دەستم ببردایە بۆ بەردێك‌و بەرزم بکردایەتەوە، هیواو گومانم وابوو، زێرو زیوی لە ژێردا بێت..

پێغەمبەری خوداﷺ دڵی هەژاران‌و بێنەوایانیشی خۆش دەکردو گرنگی پێدەدان‌و وای لێدەکردن، کە هەست بە بوونی خۆیان بکەن.. کاتێك یەکێکی هەژار دیار نەبووایە، بە چاکە باسی دەکردو کردەوە باشەکانی بیری ئامادەبووان دەهێنایەوەو هانی دەدان، هەمان کاری ئەو کەسە ئەنجام بدەن..

لە شاری مەدینە، ئافرەتێکی رەش پێستی چاکەکار هەبوو.. ئەم ئافرەتە مزگەوتە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خودایﷺ گسك دەدا.. پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر جار کاری ئەم ئافرەتەی دەبینی، چەند رۆژێك ئەم ئافرەتە دیار نەما، پێغەمبەری خوداﷺ پرسیاری ئافرەتەکەی کرد..

هاوەڵان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەو ئافرەتە کۆچی دوایی کرد..

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: ئەی بۆ پێتان نەوتم؟!

هاوەڵان فەرموویان: ئەو ئافرەتە لە شەودا کۆچی دوایی کرد، حەزمان نەکرد بە خەبەرت بهێنین..

کاری ئەو ئافرەتە هەر چەندە بچوك بوو، بەڵام لە لای پەروەردگار گەورەو مەزن بوو، هەر بۆیە هەرچەندە تازە ئافرەتەکە نێژرابوو، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ سور بوو لە سەر ئەوەی نوێژی لە سەر بکات، هەر بۆیە فەرمووی: گۆڕەکەیم نیشان بدەن، هاوەڵان لەگەڵیدا رۆیشتن، هەتا بردیانە دیار گۆڕەکەو پێغەمبەری خوداشﷺ نوێژی لە سەر کرد، پاشان فەرمووی: ئەم گۆڕە زۆر تاریکە، بەڵام پەروەردگار بە هۆی ئەم نوێژەی منەوە روناکی دەکاتەوە..

توخودا پرسیارێکت لێدەکەم، ئەوانەی ئامادەی ئەم نوێژە بوون لە خزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ، دەبێت چ هەست‌و سۆزێکیان لەلا دروست بوو بێت؟! دەبێت چۆن هەوڵیان دابێت، هەمان کاری ئەو ئافرەتە، یان کاری گەورەتریش ئەنجام بدەن؟!

دەمەوێت بە گوێچکەتدا بچرپێنم‌و پێت بڵێم: ئاگاداربەو گڕو کڵپەی ئەو شارەزایی‌و لێهاتووییەی کە هەتە، نەیەڵی کەسانێکی روخێنەر خامۆشی بکەن!! کەسانێك کە هەر چەندە پیایاندا هەڵبدەیت‌و گرنگیان پێبدەیت‌و هانیان بدەیت، کە چی هیچ کاریگەریەکیان لە سەر دروست نابێت، یان کەسانێك هەن وەڵامی وتە جوان‌و ناسکەکانت

بە قسەی ڕەق‌و ناخۆش دەدەنەوە، بە هەندێك قسەو گوفتاریش دەدوێن، نە بۆنیان هەیەو نە تام‌و نە ڕەنگ!!

گەنجێك دەناسم بانگ کرا بوو بۆ میوانداریەکی زۆر گەورە.. گەنجەکە دەچێت بۆ بازاڕو لە ڕێگە دەچێتە دوکانێکی بۆن فرۆشەوەو وا خۆی دەردەخات، کە دەیەوێت بۆن بکڕێت، دوکاندارەکەش زۆر بە دەوریدا دێت‌و دەچێت‌و چەندان بۆنی گران بەهای پیشان دەدات‌و لەگەڵ پیشاندانەکانیشدا، بۆنیش لە جل‌وبەرگی گەنجەکە دەدات، بۆ ئەوەی حەزی بە کامیان بێت، ئەوەیان هەڵبژێرێت‌و بیکڕێت..

کاتێك جل‌وبەرگی گەنجەکە بە چەندان بۆنی گران بەها بە تەواوی بۆنخۆش دەبێت، بە دوکاندارەکە دەڵێت: سوپاست دەکەم، ئەگەر حەزم بە یەکێکیان کرد، دوایی دەگەڕێمەوە.. گەنجەکەش بە پەلە بەرەو میوانداریەکە دەکەوێتە ڕێ، لە ترسی ئەوەی نەوەکو بۆنە خۆشەکەی نەمێنێت.. بۆنیش، چ بۆنێك؟! ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیشت، گەنجەکە دەگاتە شوێنی میوانداریەکەو لە تەنیشت کەسێکەوە دادەنیشێت.. کەسەکەی تەنیشتی هیچ هەستێك دەرنابڕێت دەربارەی ئەو هەموو بۆنە خۆشەی کە لێی دێت، بە یەك وتەش نایدوێنێت!!

گەنجەکە خۆی بۆ ناگیرێت‌و بەوەی تەنیشتی دەڵێت: هەست بە هیچ بۆنێکی خۆش ناکەیت؟!

ئەویش دەڵێت: نەخێر..

گەنجەکەش دەڵێت: کەواتە بە دڵنیاییەوە لوتت گیراوە..!!

کەسەکەش زۆر بە ڕەق‌و زبری وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: ئەگەر لوتم بگیرایە، بۆنی عەرەقەکەتم نەدەکرد..!!

دوبارە پێت دەڵێم: قسەی ڕەق‌و ناخۆشی هەندێك کەس کارت تێنەکات‌و نەت ڕوخێنێت‌و کارت بە کاریانەوە نەبێت..

**دان پێدانان..**

مرۆڤ، هەر چەندە بگاتە ئەوپەڕی پلەی بەرزی سەرکەوتن، بەڵام هەر بە مرۆڤی دەمێنێتەوەو پێویستی بە ئافەرین‌و هاندان هەیە..

## ئاگاداربە: تەنها ئاماژە بە شتە جوانەکان بکە..

لە مێژەوە وتراوە: هەر شتێك لە سنوری خۆی زیادەڕەوی تیادا کرا، پێچەوانە دەبێتەوە.. وە هەر کەسێك پەلە لە هاتنی شتێك بکات، پێش ئەوەی کاتی خۆی بێت، سزاکەی بریتی دەبێت، لە بێبەش کردنی..

هەموو کات ئاماژە بە شتی جوان بکە.. ئاماژە بە کەسێك بکە، کە چاوەڕێیە سوپاس بکرێت.. لە هەمان کاتدا چاو لە هەندێك شت دابخە، کە جێگەی شەرمە، بۆ نمونە: دەچیت بۆ ماڵی هاورێیەکت و دەبینیت کورسیەکانیان زۆر کۆنە، ئاگاداربە پێشنیارێك پێشکەش مەکە، کە چارەت تاڵ بکات و گوێت لێ نەگیرێت.. مەڵێ: بۆچی ئەم کورسیانە ناگۆڕن؟! ئەوە بۆ نیوەی گڵۆپەکانتان لەکار کەوتون و کار ناکەن؟! بۆچی نایان گۆڕن؟! بۆیەی دیوارەکانتان کۆن بوون، بۆچی بۆیەیەکی تازەی ناکەن؟!

براکەم، کەس داوای بۆچوون و پێشنیاری لە تۆ نەکردووە!! بێدەنگ بە باشترە!! لەوانەیە نەتوانن دیوارەکانیان بۆیە بکەن و دەست کورت بن!! خۆ تۆ ئەندازیاری دیکۆرات نیت؟!

کاتێك کەسێك دەبینیت جل وبەرگەکانی کۆنە.. یان ساردکەرەوەی ئۆتۆمبیلەکەی کار ناکات، ئەگەر قسەی باش ناکەیت، باشترە بێدەنگ بیت..

دەگێڕنەوە پیاوێك دەبێتە میوانی پیاوێکی تر، ماڵی خانەخوێ تەنها نان و زەیتیان دەبێت، بۆ ئەوەی بۆ میوانەکەی دابنێن، کاتێك میوانەکە نان و زەیتەکە دەبینێت، دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ نان و زەیتەکەدا، جاترەش هەبووایە.. خاوەن ماڵ داوای لە خێزانەکەی دەکات، بەڵام دەستیان ناکەوێت.. خاوەن ماڵەکە دەچێت بۆ بازار، بۆ ئەوەی پەیدای بکات و پارەشی پێنابێت، لەبەر ئەوە خاوەن دوکانەکە داوای شتێکی لێدەکات، بە بارمتە لای بێت، بۆ ئەوەی بە قەرزر پێی بفرۆشێت..هەر بۆیە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو ئەو قاپەی دەستنوێژی تێدا دەگرێت، لەگەڵ خۆی دەیبات، بۆ ئەوەی بە بارمتە بیدات بە فرۆشیارەکە..

خاوەن ماڵ جاترەکە وەردەگرێت و دەیباتەوە بۆ ماڵەوە، بۆ ئەوەی دەرخواردی میوانەکەی بدات.. کاتێك میوانەکە لە نان خواردن دەبێتەوە، دەڵێت: سوپاس بۆ ئەو خودایەی خواردن و خواردنەوەی پێبەخشین و ڕەزامەندیشی کردووین، لە سەر ئەوەی کە پێی داوین..

خاوەن ماڵیش بە غەمبارییەوە دەڵێت: ئەگەر ڕازی بوویتایە بەوەی پەروەردگار پێی بەخشیوویت، قاپی دەستنوێژەکەم لە بارمتەدا نەدەبوو!!

هەروەها کاتێك سەردانی نەخۆشێك دەکەیت، پێویست ناکات زوو زوو دووبارەی بکەیتەوەو بڵێیت: ئۆو.. ڕەنگت چەند زەرد بووە؟! چاوت زۆر سوور بوە!! پێستیشت بە تەواوی وشك بۆتەوە!!

کاکی برا خۆ تۆ پزیشك نیت؟! ئەگەر قسەی باش ناکەیت، بێدەنگ بیت باشترە!!

هەروەها دەگێڕنەوە، پیاوێك سەردانی نەخۆشێك دەکات، پاشان پرسیاری جۆری نەخۆشەکە لە نەخۆشەکە دەکات، نەخۆشەکەش جۆری نەخۆشیەکەی پێدەڵێت، کە نەخۆشیەکەی ترسناك دەبێت.. پیاوەکە کە گوێی لەو نەخۆشیە ترسناکە دەبێت، هاوار دەکاتو دەڵێت: هاوڕێیەکم هەمان نەخۆشی تۆی گرتو مرد!! هاوڕێیەکی براکەشم بە هەمان شێوە!! دراوسێیەکی خوشکەکەشم، بە هەمان نەخۆشی کۆچی دوایی کرد!!

نەخۆشەکەش لە داخدا خەریك بوو شێت دەبوو.. کاتێك میوانەکە هەڵدەستێت بڕوات، بە نەخۆشەکە دەڵێت: پێویستیەك، دواکارییەکت نیە؟

نەخۆشەکەش لە وەڵامدا دەڵێت: داواکاریم ئەوەیە کە ڕۆیشتی، نەگەڕێیتەوە بۆ لامو کاتێکیش چووی بۆ لای نەخۆشێکی تر، زۆر باسی مردنی لەلا مەکەو مەیترسێنە..

پیرێژنێکیش دەچێت بۆ لای پیرێژنێکی نەخۆشی ناسیاوی، کاتێك کچەکانی پیرێژنە نەخۆشەکە دەبینێت، پێیان دەڵێت: وا دیارە دایکتان دەمرێتو لە ئێستاوە سەرەخۆشیتان لێدەکەمو پێتان دەڵێم: خۆتان خۆش بن..!!

خوشكو برای ژیرو وریا: ئاگاداربەو هەردەم هەوڵ بدە ئاماژە بە خۆشیو جوانیەکان بدەیتو دەستیان بخەیتە سەر، هەوڵ بدە چاوت لە ئاست ناشیرینیەکاندا دابخە.. خەڵکیش بەختەوەرو ئاسودە بکە، نەك دڵتەنگو غەمبار..

**کێشەو گرفت..**

ئەگەر ناچار بوویت، ئاماژە بە ناشیرینیو ناخۆشیەك بکەیت، وەك بوونی پەڵەو پیسیەك بە جلوبەرگی کەسێکەوە، یان بوونی بۆنێکی ناخۆش، ئەوا بە باشترینو جوانترین شێوە ئاگاداری بکەو لە دەربڕینیشیدا نەرمو نیانو زیرەكو وریابە..

## واز لەکارێك بهێنە، کە پەیوەندی بە تۆوە نەبێت..

لە جوانی مرۆڤی موسڵمان ئەوەیە، واز لە شتێك بهێنێت، کە پەیوەندی بەوەوە نەبێت..

ئەم دەستەواژەیە چەندە جوانە؟! ئەم وتە جوانە کێ فەرموویەتی؟! پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی..

بەڵێ.. واز لە کارێك بهێنە کە پەیوەندی بە تۆوە نیە.. قسەیەك مەکە کە پێویست ناکات بیکەیت.. کەسی وا هەیە بە پرسیاری ناپێویست بێزارت دەکات!! کاتێك کاتژمێرێك لە دەستتدا دەبینێت، پرسیار دەکاتو دەڵێت: چەندت پێداوە؟

تۆش لە وەڵامدا دەڵێیت: دیارییە..

دووبارە پرسیار دەکاتو دەڵێت: لە لایەن کێیەوە؟!

لە وەڵامدا دەڵێیت: لە لایەن یەکێك لە هاورێکانمەوە..

پرسیار دەکاتەوەو دەڵێت: هاورێی زانکۆتە، یان..؟!

تۆش پێی دەڵێت: ئاه.. بەڵێ هاورێی زانکۆمە..

پرسیار دەکاتەوەو دەڵێت: باشە.. بە چ بۆنەیەکەوە؟!

ئەمانەو چەندان پرسیاری تری ناپێویست، کە پێویست ناکات ئەوەندە بچێتە وردەکارییەوە!! سوێندت دەدەم بە پەروەردگار لەم کاتانەدا حەز ناکەیت، بە دەنگی بەرز هاوار بکەیتو بڵێیت: مەچۆرە ناو باسو خواسێکەوە، کە پەیوەندیان بە تۆوە نیە؟!

لە بیرم دێت، جارێکیان لەگەڵ هەندێك لە هاورێکانمدا، لە دوای نوێژی شێوان لە مزگەوت مابووینەوە.. لەپڕ مۆبایلی یەکێکمان زەنگی لێداو هاوسەرەکەی بوو، وتی: ئەلو.. ئەوە لە کوێی گوێدرێژ؟! (ئەوەندە بە دەنگی بەرز دەدوا، ئەوانەی دەوروبەریشی هەموو گوێیان لێیبوو چی دەڵێت)!!

هاورێکەشمان وتی: خودا پارێزراوت بکات.. (وا دیار بوو، گفتی ئەوەی بە هاوسەرەکەی دابوو، کە بیبات بۆ ماڵی باوکی)..

هاوسەرەکەی توورە دەبێتو دەڵێت: خودا پارێزراوت نەکات!! تۆ لەگەڵ هاورێکانتدا

دانیشتووی‌و منیش وا چاوەڕێت دەکەم؟! سوێند بە خودا تۆ وەکو گا وایت!!
هاوڕێکەشمان بۆ ئەوەی بە سەر خۆی نەهێنێت لە وەڵامدا وتی: خودا لێت ڕازی بێت، لە دوای نوێژی عیشا دەتبەم.. تێبینی ئەوەم کرد، وەڵامی هاوڕێکەمان هیچ پەیوەندیەکی بە قسەکانی هاوسەرەکەیەوە نەبوو، دەیویست بە سەر خۆی نەهێنێ‌و ئابرووی نەچێت، هەر بۆیە زوو پەیوەندیەکەی کۆتایی پێهێنا.. ئاوڕم بە لای ئامادەبووواندا دایەوەو گومانم وابوو، یەکێکیان پرسیار بکات‌و بڵێت: ئەوە کێ بوو؟! چی دەویست؟! ئەوە بۆ وا ڕەنگ‌و ڕوخسارت گۆڕا؟! بەڵام خودای گەورە پاراستی‌و باش بووکەس پرسیاری لێنەکرد..
هەروەها کاتێک سەردانی نەخۆشێك دەکەیت‌و پرسیاری دەربارەی نەخۆشیەکەی لێدەکەیت، ئەویش بە چەند وشەیەکی گشتی وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: سوپاس بۆ خودا، شتێکی ئاساییە، نەخۆشیەکی ئاسانەو کۆتایی دێت.. دەی تۆش تەنگی پێهەڵمەچنەو داوای وردەکاری لێمەکەو مەڵێ: ببورە.. بە شێوەیەکی دیاریکراو، نەخۆشیەکەت چیە؟! زیاتر بۆم ڕوون بکەرەوە..
سەیرە!! بۆچی ئاوا نارەحەتی دەکەیت؟! لەوانەیە حەز نەکات‌و شەرم بکات جۆری نەخۆشیەکەی ئاشکرا بکات.. ئەی نازانی لە جوانی مرۆڤی موسڵمان ئەوەیە، کە واز لە کارێك بهێنێت، کە پەیوەندی بەوەوە نەبێت.. مادام بەو شێوەیە وەڵامی دایەوە، پێویست بەوە ناکات درێژەی پێبدەیت.. مەبەستمان ئەوە نیە، کە بە هیچ شێوەیەك پرسیار لە نەخۆش نەکەیت!! نەخێر.. مەبەستمان ئەوەیە، نەچیتە وردەکارییەوە..
هەروەها کاتێک کەسێك لە بەر چاوی خەڵکی هاوار لە قوتابیەك دەکات‌و دەڵێت: ها.. ئەحمەد، دەرچوویت؟! ئەویش دەڵێت: بەڵێ.. ئەمیش پرسیار دەکاتەوەو دەڵێت: نمرەکەت چەندە؟! ئەی لە ڕیزبەندیەکەدا، ژمارە چەندی؟! ئەگەر ئەو کەسە بە ڕاستی خەمی هاوڕێکەیەتی، دەتوانێت بە تەنها پرسیاری لێبکات‌و پێویستیش ناکات بچێتە وردەکاریەوەو بڵێ: ئەوە بۆ لە زانکۆ وەرنەگیرایت؟!
نەخێر.. لەبەر چاوی خەڵکی ئەم قسانە مەکەو دوو بە دوو هەواڵی بپرسە، بەڵام ئاگاداربە، هیچ شتێك لە قەبارەی خۆی گەورەتر مەکە..
پێش ماوەیەك لەمەو بەر، بۆ پێشکەش کردنی چەند وتارێك، چووم بۆ شاری مەدینە.. لەگەڵ گەنجێکدا ڕێکەوتین لە سەر ئەوەی کە هەموو ڕۆژێك دوای عەسر،

هەر دوو کورەکەم، عبدالرحمن‌و إبراهیم بەرێت بۆ خولی قورئان لەبەرکردن‌و لە دوای نوێژی عیشاش بیان هێنێتەوە..

عبدالرحمن تەمەنی دەساڵێك بوو، ترسام ئەو گەنجە هەندێك پرسیاری ناپێویستی لێ بکات، وەك ئەوەی بڵێت: دایکت ناوی چیە؟ چەند برات هەیە؟ باوکت رۆژانە چەندت دەداتێ؟ هەر بۆیە عبدالرحمانم ئاگادار کردەوەو پێم وت: ئەگەر پرسیارێکی نەگونجاوی لێکردی بڵێ: پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: لە جوانی موسڵمانی مرۆڤ ئەومیە، واز لە شتێك بهێنێت، کە پەیوەندی بەوەوە نەبێت.. چەند جارێکیش فەرموودەکەم بۆ دوبارە کردەوە، هەتا لەبەری کرد..

کاتێك هەر دوو کورەکەم لەگەڵ گەنجەکەدا سەردەکەون‌و گەنجەکەش لە دوای سڵاو کردن، بۆ ئەوەی کەمێك بیان دوێنێت‌و کەمێك قسەی خۆشیان لەگەڵ بکات، پرسیار دەکات‌و دەڵێت: باوکت ئەمرۆ وتاری هەیە؟ عبدالرحمانیش زۆر هەوڵ دەدات، فەرمووده پیرۆزەکەی بیر بکەوێتەوە، بەڵام بە بیری نایەتەوەو بە دەنگی بەرز هاوار دەکات‌و دەڵێت: مەچۆرە ناو بابەتێکەوە کە پەیوەندی بە تۆوە نەبێت!!

گەنجەکەش دەڵێت: هیچ مەبەستێکم نیە، بەڵکو دەمەوێت ئامادەی وتارەکەی بم‌و سودمەند بم!! عبدالرحمن دوبارە هەمان وەڵامی دەداتەوە، کاتێکیش گەڕانەوە، عبدالرحمن بە شانازییەوە روداوەکەی بۆ گێڕامەوە، منیش دەستم کرد بە پێکەنین‌و بۆم روون کردەوەو تێم گەیاند کە جارێکی تر دەبێت چی بکات‌و چی بڵێت؟!

**شوێنی کار..**

هەوڵدان بۆ ئازادبوونی دەروون‌و بۆ ئەوەی نەچیتە ناو وردەکاری‌و پرسیاری ناپێویستی ژیانی خەڵکی، لە سەرەتادا زۆر نارەحەت‌و ناخۆشە، بەڵام لە کۆتاییدا مایەی خۆشی‌و ئاسودەییە..



# چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکەیت..؟!

جاری وا هەیە هەندێك کەس، بە بێ پرس و ڕا دەست دەبات بۆ مۆبایلەکەت و دەست دەکات بە خوێندنەوەی کورتە نامەکانی، یان سەیرکردنی وێنەکانی!!

جارێکیان هاوڕێیەکم لە میوانداریەك دەبێت، لە لای یەکێك لە دادوەرەکان، ئامادەبووانیش هەموو پیاوی بە ناوبانگ و ناودار دەبن.. هاوڕێکەم لە نێوان دوو کەسدا دادەنیشێت، لەبەر ئەوەی شوێنی دانیشتنەکەی تەنگ دەبێت و میوانەکانیش زۆر دەبن، مۆبایلەکەی لە گیرفانی دەردەهێنێت و لە سەر تەپڵەکەکەی بەردەمی دایدەنێت، کەسەکەی تەنیشتیشی، کە بەیەکەوە لە گفتوگۆدا بوون، مۆبایلەکەی هەڵدەگرێت و کاتێك سەیری شاشەی مۆبایلەکە دەکات، ڕوخساری تێکدەچێت و بە خێرایی مۆبایلەکە لە شوێنەکەی خۆی دادەنێتەوە!!

کاتێك هەستاین و سواری ئۆتۆمبیلەکەی بووم، مۆبایلەکەی لە تەنیشتیەوە دانابوو، بە هەمان شێوەی میوانەکە، دەستم برد بۆ مۆبایلەکەو سەیری شاشەکەیم کرد، دەستم کرد بە پێکەنین!! بەڵکو هەر زۆر پێکەنیم!!

دەزانی بۆ؟! زۆر بەی خەڵکی وێنەی نوسراوێك دەخەنە سەر شاشەی مۆبایلەکەیان، وەك ناوی خودا، یان ناوی خۆیان، یان هەر شتێکی تر، بەڵام هاوڕێکەی من نوسی بووی: مۆبایلەکەت بگێڕەوە شوێنی خۆی، هەی فزولی!!

کەسانێکی زۆر هەن، دەچنە ناو ژیانی تایبەتی خەڵکیەوەو پرسیار لە وردەکاری کاروبارەکانیان دەکەن.. ئایا شتێکی ئاساییە، کەسێك سواری ئۆتۆمبیلەکەت بێت و پاشان چەکمەجەی ئۆتۆمبیلەکەت بکاتەوەو سەیری شتەکانی ناوەوەی بکات؟! یان شتێکی جوانە، ئافرەتان جانتای یەکتری بکەنەوەو کەل و پەلەکانی ناوەوەی بەکاربهێنن؟!

بێگومان نەخێر!! ئەی چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم کەسانەدا بکەین؟! گرنگترین کارێك، ئەوەیە، ئەو کەسانە لە دەست نەدەین.. هەوڵ بدەین لەگەڵیاندا تێنەکەوین.. هەوڵ بدەین زۆر بە وریایی و زیرەکی لێیان دەرباز بین، بە بێ ئەوەی هیچ کێشەو گرفتێك لە نێوانماندا دروست بێت.. هەرگیز هەوڵ مەدە، دوژمنانت زۆر بکەیت و هاوەڵانت لە دەست بدەیت..

باشترین ڕێگەش بۆ ڕزگاربوون لەو کەسانە، بریتیە لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان بە پرسیارێکی تر، یان بابەتەکە بەرەو بوارێکی تر ئاراستە بکەیت، بۆ ئەوەی پرسیارەکەی بیر بچێتەوەو ڕزگارت بێت لە دەستی..

بۆ نمونە: کاتێك کەسێك پرسیارت لێدەکاتو دەڵێت: مانگانەکەت چەندە؟ بە زەردەخەنەوە وەڵامی بدەرەوەو بڵێ: بۆچی؟ وا دەزانیت وەزیفەیەکی زۆر بەرزم هەیە؟!

دوبارە پرسیار دەکاتەوەو دەڵێت: نا.. بەڵام دەمەوێت بزانم.. تۆش بڵێ: موچەی ئەم ڕۆژگارە هەمووی کێشەیە، هەموو کێشەکانیش بە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوتەوەیە!!

ئەویش دەڵێت: بە هۆی نەوتەوە؟!

تۆش بڵێ: ئەی چۆن؟! نەوت نرخەکان دیاری دەکات، ئەی نابینی لە پێناو بە دەست هێنانی نەوتدا، شەڕو جەنگەکان ڕوو دەدەن؟!

ئەویش دەڵێت: نا.. وا نیە.. هۆکارەکانی جەنگ زۆرنو ئەمڕۆ دونیا هەمووی لە شەڕو جەنگدایە.. بەم شێوەیە پرسیارەکەی یەکەمی بیر دەچێتەوە..

تۆ دەڵێی چی؟ ئایا بەم شێوەیە زۆر بە زیرەکی لە پرسیارەکەی دەرناچیت؟! بە هەمان شێوە ئەگەر پرسیاری کردو وتی: بۆ کوێ دەچیت؟

بڵێ: بۆ؟

ئایا لەگەڵم دێیت؟!

ئەویش ئەگەر وتی: نازانم!! بەڵام کەرۆیشتی ئاگادارم بکە، تۆش بڵێ: بەڵام ئەگەر هاتی، دەبێت تۆ پارەی هاتوچۆ بدەیت.. کاتێك باسی پارەی هاتوچۆ دێتە پێشێ، ئەوا باسە سەرەکیەکەی لە بیردەچێت، کە بریتی بوو لە پرسیار کردن دەربارەی ئەو شوێنەی کە بۆی دەچیت.. بەم شێوەیە بە بێ ئەوەی هیچ کێشەو گرفتێك ڕوو بدات، دەتوانی خۆت ڕزگار بکەیت..

**هەڵوێستەیەک..**

ئەگەر توشی کەسێك بوویت، کە زۆر دەچووە کاروبارە تایبەتیەکانتەوە، تۆ لەو باشتریەو بە شێوەیەکیش خۆتی لێ ڕزگار بکە، کە دڵی نەڕەنجێتو هەستی بریندار نەکەیت..

# ڕەخنەگر مەبە..!!

کەسێك سواری ئۆتۆمبیلی هاوڕێیەکی دەبێت، یەکەم وشە کە دەری دەبڕێت، دەڵێت: ئاه.. ئۆتۆمبیلەکەت چەندە کۆنە؟!

کاتێکیش ڕۆشتنەوە بۆ ماڵی هاوڕێکەی‌و کەل‌وپەلی ماڵەوەیانی بینی، وتی: ئۆه.. ئەوە کەل‌وپەلەکانت هەر نەگۆڕیووە؟!

کاتێکیش منداڵەکانی هاوڕێکەی دەبینێت، دەڵێت: ماشاءالله!! چەندە جوانن؟! بەڵام بۆچی جل‌وبەرگی باشترتان لەبەر نەکردوون؟!

هاوسەری هاوڕێکەی، لە دوای ئەوەی کاتێکی زۆری لە چێشتخانە بەسەربردووەو هەوڵێکی زۆریداوە، بۆ ئەوەی خواردنێکی خۆش دروست بکات، بەڵام ئەم کەسە لە باتی دەستخۆشی دەڵێت: ئەوە بۆ برنجتان لێناوە؟! خۆ بێ خوێشە!! من حەزم بەم خواردنە نیە!!

کەسی وا هەیە، دەچێتە دوکانی میوە فرۆشێکەوەو چەندان جۆر میوەی جوان دەبینێت، بەڵام دەڵێت: مانجۆ هەیە؟ دوکاندارەکەش دەڵێت: نەخێر.. مانجۆ تەنها لە هاویندا هەیە..ئەویش دەڵێت: ئەی شوتی؟ دوکاندارەکەش دەڵێت: نەخێر.. نیمانە.. کابرا ڕوخساری دەگۆڕێت‌و چارەی خۆی تاڵ دەکات‌و دەڵێت: تۆ هیچت لەلا نیە!! ئەی بۆ دوکانەکەت داناخەیت؟! ئەم قسە ناخۆشانە دەکات‌و دەڕوات‌و بیری دەچێت، ئەو دوکانە چەندان جۆر میوەی خۆش‌و جوانی تێدا بوو!!

بەڵێ.. هەندێك کەس بە ڕەخنەو گلەیی‌و گازندە بێزارت دەکەن‌و شتە جوانەکان نابینن.. چاویان لە ئاست خواردنێکی خۆش‌و بە تامدا دادەخەن، بەڵام ئەگەر تاڵە موویەکی تێدا بێت، ئەوا دەیبینن‌و باسی دەکەن!! کراسی سپی‌و پاك‌و خاوێن نابینن، تەنها ئەو دڵۆپە مەرەکەبە دەبینن، کە بێ ئەوەی هەستی پێبکەیت، لە نووکی پێنوسەکەتەوە دەرچووەو خاڵێکی ڕەشی لە سەر کراسەکەت دروست کردووە!! لە پەڕتوکێکی زۆر بە سوددا، تەنها هەڵەیەکی چاپ دەبینن!! کەس ڕزگاری نابێت لە ڕەخنەو گازندەیان.. بەردەوام تێبینیان هەیەو لە وردو درشت دەکۆڵنەوە..

کەسێك هەیە، ماوەیەکی زۆرە ناسیاوو دۆستی یەکین، لە سەردەمی دواناوەندی‌و زانکۆو هەتا ئێستاش پەیوەندیمان هەیە، بەڵام هەرگیز گوێم لە هاندان‌و ئافەرینێکی

نەبووا! لە هیچ شتێکیش ڕازی نەدەبوو..

جارێکیان پرسیارم دەربارەی یەکێك لە پەرتوکەکانم لێکرد، کە خۆم نوسی بووم‌و کەسانێکی زۆریش بە دڵیان بوو، سەدەها هەزاریشی لێ چاپ کرا بوو.. زۆر بە ساردییەوە وەڵامی دامەوەو وتی: باشە، بەڵام چیرۆکی نەگونجاوی تێدایەو نوسینەکەشی زۆر گەورەیەو شێوازی چاپەکەشی خراپەو ...هتد..

جارێکی تریان پرسیارم دەربارەی وتارخوێنێك لێکرد، تەنها ڕوویەکی باش‌و پرشنگداری ئەو وتارخوێنەی باس نەکردو وام لێهات ئیتر دەربارەی هیچ شتێك پرس‌و ڕای پێنەکەم..

ئەو کەسانەی کە زۆر ڕەخنە دەگرن‌و زۆر دەست لە کاروباری خەڵکی وەردەدەن، هەروەها ئەو کەسانەی کە جگە لە ڕەش سپی نابینن، ئەوا ئازاری دەروونی خۆیان دەدەن‌و کەسە نزیکەکانیشیان حەز بە دووریان دەکەن‌و حەز ناکەن لەگەڵیان دابنیشن..

إذا كنت في كل الأمور معاتباً رفيقك لن تلق الذي ستعاتبهُ..

بەڵێ.. ئەگەر لە هەموو کارو هەڵسوکەوتێکدا، لۆمەو سەرزەنشتی خەڵکی بکەیت، هیچ دۆست‌و هاوەڵێکت بە دەورەوە نامێنێت، هەتا لۆمەو سەرزەنشتی بکەیت..

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ... ﴿١٥٢﴾﴾ الأنعام. واتە: (کاتێکیش قسەو گوفتارتان کرد، ئەوە دادوەر بن‌و (لایەنی ناحەق مەگرن) ئەگەر خزمی نزیکیش بێت)..

عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: هەرگیز پێغەمبەری خودا ﷺ ڕەخنەی لە هیچ خواردنێك نەگرتووە، ئەگەر حەزی لێی بووایە دەیخواردو ئەگەر حەزیشی لێی نەبووایە، وازی لێدەهێنا..

بەڵێ.. لە سەر هەموو شتێك کێشەو گرفتی دروست نەدەکرد.. هەروەها ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموێت: سوێند بە خودا نۆ ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خودام ﷺ کرد، پێی نەوتم: بۆچی ئەوەو ئەوەت کردو ئەوەت نەکرد؟ هەرگیز ڕەخنەی لە هیچ شتێکیش نەگرتووە.. سوێند بە خودا، هەرگیز پێی نەوتووم: ئۆف.. ئەوە با وا بووایەو ئەوا با وا نەبووایە..

لێرەدا مەبەستی من ئەوە نیە، کە واز لە ئامۆژگاری کردن بهێنیت‌و لە هەموو هەڵەیەك بێدەنگ بیت، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە، لە هەموو شتێکدا ڕۆڵی وردبین مەبینە، بە تایبەت لە کاروباری ژیانی دونیایی خەڵکیدا..

ئەگەر کەسێك لە دەرگاکەت بدات، بەخێرهاتنی بکەیت‌و بیهێنیتە ژوورەوەو لە ژووری میوانەکەتان دایبنشێنیت، پاشان چای بۆ بهێنیت، ئەویش کاتێك چاوی بە چایەکە

دەکەوێت، بڵێیت: ئەوە بۆ پیاڵەکە پڕ نیە؟! تۆش بڵێت: پڕی دەکەم؟! ئەویش بڵێت: نا.. نا.. پێویست ناکات.. پاشان داوای ئاو بکات، کاتێك ئاوەکە دەخواتەوە، بڵێت: ئاوەکەتان گەرمە!! پاشان سەیری سپلێتەکە بکاتو بڵێت: هەواکەی سارد نیە!! ئایا ئەم کەسە لەلای تۆ چارەی گران نابێت؟! ئایا حەز ناکەیت، بڕواتو جارێکی تر نەگەڕێتەوە..

کەواتە خەڵکی حەزیان بە ڕەخنەگرتنی زۆر نیە، بەڵام دەتوانی ڕەخنەکانت بە ڕەنگێکی جوان پەردەپۆش بکەیتو پاشان پێشکەشی کەسانی تری بکەیت، یان دەتوانی نارەزاییەکانت بە شێوەی پێشنیار، یان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ دەربڕی.. پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك تێبینی لە سەر هەڵەی کەسێك هەبووایە، ڕاستەوخۆ پێی نەدەوت، بەڵکو دەیفەرموو: کەسانێك هەن فلاّنە کارو کردەوە ئەنجام دەدەن..

ڕۆژێك سێ گەنجی خوێن گەرم دێن بۆ شاری مەدینەو دەیانەوێت لە چۆنیەتی نوێژو خوداپەرستی پێغەمبەری خوداﷺ شارەزا بن، هەر بۆیە پرسیاریان لە هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوداﷺ کردو ئەوانیش لە وەڵامدا فەرموویان: پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆژی وا هەیە بەڕۆژوو دەبێتو ڕۆژی واش هەیە بەڕۆژوو نابێت.. شەونوێژیش دەکاتو بەشێکی شەویش دەخەوێت..

سێ گەنجەکە لە نێوان خۆیاندا وتیان: ئەوە پێغەمبەری خودایەﷺو پەروەردگار لە هەموو گوناهەکانی خۆش بووە، پاشان هەر یەکەیان بڕیاری خۆیانیاندا.. یەکێکیان وتی: من هەرگیز ژن ناهێنمو هەر خەریکی خوداپەرستی دەبم.. دووەمیان وتی: منیش هەموو ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبم.. سێیەمیان وتی: منیش شەوان ناخەومو هەر خەریکی شەونوێژ دەبم..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك ئەم قسانەی بیستەوە، چووە سەر دوانگەو لە دوای سوپاسو ستایشی پەروەردگار فەرمووی: بیستوومە هەندێك کەس (ناوی کەسەکانی نەهێنا) ئاواو ئاوایان وتووە!! بەڵام من نوێژیش دەکەمو دەشخەوم، بەڕۆژووش دەبمو بەڕۆژووش نابم، هەروەها ژیانی هاوسەرداریش پێك دەهێنمو ژنیش دەهێنم، هەر کەسێك واز لە سوننەتو ڕێڕەوی من بهێنێت، ئەوا لە من نیە. متفق علیه..

جارێکی تریان پێغەمبەری خوداﷺ سەرنجی هەندێك لە نوێژخوێنانیدا، لە نوێژەکانیاندا لە باتی ئەوەی سەیری شوێنی سوجدەکەیان بکەن، سەیری ئاسمانیان دەکرد.. پێغەمبەری خوداﷺ ناوی کەسی نەهێناو ئاماژەی بە کەس نەکرد، بەڵکو فەرمووی: هەندێك کەس لە نوێژەکانیاندا سەیری ئاسمان دەکەن، با واز لەو کارە بهێننو وانەکەن. رواه البخاري..

چەند جوانە دڵی کەس ئازار نەدەیت‌و ڕاستەوخۆ ڕەخنەی ئاراستە نەکەیت؟! کاتێك دەبینیت هاوسەرەکەت کەمێك ساردوسڕی دەکات، لە پاك‌و خاوێن ڕاگرتنی ماڵەکەتدا، دەتوانیت پێی بڵێیت: دوێنێ لەگەڵ هاوڕێکانمدا، میوانی هاوڕێیەکمان بووین، هەموو ئامادەبووان ستایشی پاك ڕاگرتنی ماڵەکەیان دەکرد.. یان کاتێك یەکێك لە منداڵەکانت دەبینی، لە کاتی نوێژدا ساردوسڕی دەکات‌و لە مزگەوت ئامادە نابێت، دەتوانیت پێی بڵێیت: بە ڕاستی کوڕی فلانە دراوسێمان، جێگەی سەرسوڕمانە، هەموو نوێژەکان لە مزگەوت ئامادەیەو نوێژەکانی بە جەماعەت ئەنجام دەدات!!

ماڤ خۆتە پرسیار بکەیت‌و بڵێیت: بۆچی خەڵکی خۆشیان بە ڕەخنە نایات؟! منیش لە وەڵامدا پێت دەڵێم: لەبەر ئەوەی کاتێك ڕەخنە دەگریت، ئەو کەسە هەست بە ناتەواوی دەکات‌و هەموو کەسیش حەز لە تەواوی‌و بێ کەم‌وکوڕی دەکات..

دەگێڕنەوە پیاوێکی ئاسایی هەبوو، حەزی دەکرد کەمێك خۆی دەربخات‌و فەرمانڕەوایی بکات، ئەگەر لە سەر شتێکی بچوکیش بێت.. ئەم پیاوە هەستا دوو تەرمۆزەی هێناو پڕی کرد لە ئاوی سارد، تەرمۆزەکانیش یەکێکیان سەوزو ئەوی تریان سور بوو.. پاشان لە ڕێگەیەکی گشتیدا دانیشت‌و هاواری دەکردو دەیوت: ئاوی سارد بە خۆڕایی.. ئاوی سارد بە خۆڕایی.. کاتێك کەسێکی تینوو بە ڕێگەکەدا دەڕۆیشت‌و ئاوە ساردەکەی دەبینی، بەرەو تەرمۆزەکان دەهات، ئەگەر لە تەرمۆزە سەوزەکە نزیك بووایەتەوە، پیاوەکە دەیوت: نا.. لە تەرمۆزە سورەکەیان بخۆرەوە.. کاتێك کەسێکی تر دەهات‌و لە تەرمۆزە سورەکە نزیك بووایەتەوە، کابرا دەیوت: نا.. لە سەوزەکەیان بخۆرەوە.. ئەگەر کەسێکیش بیوتایە: بۆچی؟! جیاوازیان چیە؟! کابراش لە وەڵامدا دەیوت: من بەرپرسی ئاوەکەم‌و هەر منیش بڕیار دەدەم..

ئەمە هەستی مرۆڤەو حەز بەوە دەکات، کە خەڵکی گرنگی‌و بایەخی پێبدەن‌و خاوەن بڕیار بێت..

**هەنگو مێش..!!**

وەکو هەنگ وابە، چونکە هەنگ تەنها لە سەر شتی پاك‌و خاوێن‌و جوان دەنیشێتەوە، نەکەی وەکو مێش وابیت، کە بەردەوام بە دوای شتی پیسدا وێڵ‌و سەرگەردانە..

## لە هەموو شتێکدا ڕۆڵی مامۆستا مەبینە..!!

جیاوازی لە نێوان سێ باوکدا بکە، کاتێك هەر یەکێکیان، کوڕەکانیان دەبینن، لە بەرامبەر تەلەفزیۆن دانیشتوون و تافیکردنەوەشیان هەیە..

یەکەمیان بە کوڕەکەی دەڵێت: محمد وانەکانت بخوێنە..

دووەمیان دەڵێت: ماجد ئەگەر وانەکانت نەخوێنیت، سوێند بە خودا لێت دەدەم و پارەو پوولیشت لێدەبڕم..

بەڵام سێیەمیان دەڵێت: ئەحمەد وانەکانت بخوێنیت، لە سەیرکردنی تەلەفزیۆن باشترە، وانیە؟!

کامیان بە شێوەیەکی جوان ئامۆژگاریان پێشکەشی کوڕەکەیان کرد؟! بێگومان سێیەمیان، لەبەر ئەوەی ئامۆژگارییەکەی بە شێوەی پێشنیار دەربڕی..

کاتێك کەسێك هەڵەیەك دەکات، بە شێوازێکی جوان ئاگاداری بکەرەوە.. بۆ نمونە: منداڵەکەت لە کاتی نوێژەکاندا، لە مزگەوت ئامادە نابێت، دەتوانیت پێی بڵێیت: ئایا دەتەوێت پەروەردگار بەهەشتت پێ ببەخشێت؟! بێگومان ئەویش دەڵێت: بەڵێ.. تۆش بڵێ: دەی کەواتە لە نوێژەکاندا، لە مزگەوت دوا مەکەوەو ئامادەبە..

ڕۆژێك لە ڕۆژان، هاوسەری کابرایەکی دەشتەکی، لە خێمەکەیانداو لە بیابانێکی چۆڵدا، ژانی منداڵ بوون دەیگرێت، پیاوەکەشی لە سەرووی هاوسەرەکەیەوە، دەوەستێت و چاوەڕێی هاتنە دونیای منداڵەکەی دەکات.. بەڵام کاتێك منداڵەکە لە دایك دەبێت، منداڵێکی ڕەش پێست دەبێت!! پیاوەکە سەیری خۆیی و هاوسەرەکەی دەکات، دەبینێت هەردووکیان سپی پێستن، ئەی دەبێت بۆچی منداڵەکەیان ڕەش پێست بێت؟! شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست دەکات و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: لەوانەیە ئەم منداڵە لە من نەبێت!! لەوانەیە پیاوێکی ڕەش پێست، داوێن پیسی لەگەڵ هاوسەرەکەمدا کرد بێت و ئەم منداڵە هی ئەو بێت!!

پیاوەکە دڵەڕاوکێی بۆ دروست دەبێت و بەرەو شاری مەدینە بە ڕێدەکەوێت و دەڕوات، هەتا دەگاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ و پێی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاوسەرەکەم منداڵێکی ڕەش پێستی بووەو لە ناو ماڵ و کەس و کاری ئێمەشدا، هەرگیز

کەسێکی ڕەش پێستمان نەبووە!!

پێغەمبەری خوداﷺ سەیری پیاوەکەی کردو دەیتوانی ئامۆژگاری بکات، بەوەی کە گومانی باش بە یەکتری بەرن‌و لە خۆوە ئافرەتان نابێت تۆمەتبار بکرێن، بەڵام ویستی شێوازێکی تری لەگەڵ بەکاربهێنێت، بە شێوەیەك پیاوەکە خۆی چارەسەری خۆی بکات‌و بە تەواوی ئەو گومانە لە دڵیدا نەهێڵێت.. پێغەمبەری خوداﷺ سەرەتا لە نمونەیەکەوە دەستی پێکرد، کە نزیك بێت لە وەڵامی پیاوەکەوە.. ئەو نمونەیە چی بوو؟ ئایا نمونەی بە درەخت‌و دارخورما، یان بە فارس‌و ڕۆم هێنایەوە؟!

نەخێر.. پێغەمبەری خوداﷺ جارێکی تر سەیری پیاوەکەی کردو شوێنەواری دەشت‌و دەری پێوە بینی.. هەروەها هەستی کرد، لە دڵەڕاوکێدایەو خەیاڵی بەو گومانەوە سەرقاڵە، کە دەربارەی هاوسەرەکەی هەیەتی.. پێغەمبەری خوداﷺ بە پیاوەکەی فەرموو: ئایا وشترت هەیە؟پیاوەکە وتی: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ڕەنگیان چۆنە؟پیاوەکە وتی: سورن..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئایا ڕەشیان تێدایە؟ پیاوەکە وتی: نەخێر..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەی بەچکە وشتری بەڵەك یان ڕەشیان تێدایە؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: مادام هەموویان سورن‌و هیچ ڕەنگێکی تریان تێدا نیە، ئەی بۆچی دایکە وشترە سورەکان، وشتری بەڵەك، یان ڕەشیان دەبێت، لە کاتێکدا وشترە نێرەکانیش هەموو سورن؟!

پیاوەکە کەمێك بیری کردەوەو ڕاما، پاشان وتی: لەوانەیە ئەم باوك‌و دایکە وشترانە، پێشتر باوك‌و دایکی جگە لە ڕەنگی سوریشان هەبوو بێت‌و شوێنەواری ئەو ڕەنگانە، لەمانیشدا مابێتەوە!!

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: دەی لەوانەیە یەکێك لە باپیرەکانت، یان باپیرە گەورەکانت ڕەنگیان ڕەش بوو بێت‌و شوێنەوارەکەی لە منداڵەکەتدا دەرکەوتبێت!!

پیاوەکە کاتێك گوێی لەم وەڵامە بوو، کەمێك بیری کردەوەو سەیری کرد وەڵامەکەی پێغەمبەری خوداﷺ هەمان شێوەی وەڵامەکەی ئەمە، هەر بۆیە دڵی پاك بۆوەو گومانەکەی ڕەویەوەو گەڕایەوە بۆ لای هاوسەرەکەی..

ڕۆژێکی تریان پێغەمبەری خوداﷺ باسی دەرگاکانی خێرو چاکەی بۆ هاوەڵانی دەکرد، لە نێوان وتە پیرۆزەکانیدا فەرمووی: کاتێك یەکێك لە ئێوە کاری ژن‌و مێردایەتی

لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئەنجام دەدات، ئەوا خێرو پاداشتی دەست دەکەوێت..

هاوەڵان سەریان سوڕماو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێمە ئەو کارە بۆ ئارەزووی خۆمان ئەنجام دەدەین، چۆن خێرو پاداشتمان دەست دەکەوێت؟!

پێغەمبەری خوداﷺ بە هەمان ڕاو بۆچوونی خۆیان وەڵامی دانەوە، وەڵامێك کە بەخێرایی هەموویان پێی ڕازی بوون.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئایا ئێوە ئەگەر ئارەزووی خۆتان لە حەرامدا خاڵی بکەنەوە، گوناهتان ناگاتێ؟!

هاوەڵان فەرموویان: بەڵێ.. گوناهمان دەگاتێ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەی بە هەمان شێوە، ئەگەر ئارەزووەکانتان لە حەڵاڵدا خاڵی بکەنەوە، ئەوا خێرو پاداشتتان دەستگیر دەبێت..

پێغەمبەری خوداﷺو هەزارو چوار سەد لە هاوەڵانی، بە مەبەستی ئەنجامدانی عومرە، بەرەو شاری مەککە کەوتنە ڕێ.. کاتێك نزیك شاری مەککە بوونەوە ڕووداوە بە ناوبانگەکەی حودەیبیەی لێکەوتەوە، کە بە ڕێکەوتنی موسڵمانان‌و بێباوەڕانی قورەیش کۆتایی هات.. نوێنەری قورەیشیش لەم ڕێکەوتنەدا، سوهەیلی کوڕی عەمر بوو، کە لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ لە سەر چەند خاڵێك پێکهاتن، لەوانەش:

١. موسڵمانان بە بێ ئەوەی عومرە ئەنجام بدەن، پێویستە بگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینە..

٢. ئەگەر کەسێکی خەڵکی شاری مەککە، موسڵمان بێت‌و بیەوێت‌و کۆچ بکات بۆ شاری مەدینە، ئەوا موسڵمانانی شاری مەدینە نابێت پەنای بدەن‌و وەری بگرن..

٣. بە پێچەوانەوە ئەگەر کەسێك لە ئیسلام پاشگەز بۆوەو ویستی پەیوەندی بە بێباوەڕانی مەککەوە بکات، ئەوا بێباوەڕان دەتوانن وەری بگرن‌و پەنای بدەن..

ئەمانەو چەندان خاڵ‌و مەرجی تر، کە لە ڕواڵەتدا شکستی موسڵمانانیان نیشان دەدا، بەڵام لە ڕاستیداو دواتر دەرکەوت، ڕێکەوتنەکە لە سودی موسڵمانان بوو، لەبەر ئەوەی هەر لەو کاتەشدا بێباوەڕانی قورەیش ترسێکی زۆریان لەو ژمارە زۆرەی موسڵمانان هەبوو، دەشیان زانی موسڵمانان لە توانایاندایەو ئەگەر بیانەوێت، دەتوانن شاری مەککە ئازاد بکەن، لەبەر ئەوە قورەیش نەرم‌و نیانیان دەنواندو بە چوار یەکی ئەو مەرجانەش ڕازی بوون، هەر بۆیە زۆرێك لە هاوەڵان لە مەرج‌و خاڵەکانی ڕێکەوتننامەکە نارەحەت‌و نارازی بوون، بەڵام چۆن بتوانن ئەو نارەزامەندیەیان دەربڕن، لە کاتێکدا ڕێکەوتننامەکە، لە لایەن پێغەمبەرێکەوە ئەنجامدراوە، کە هیچ قسەو کردارێك لە خۆوە ناکات‌و ناڵێت!!

ئیمامی عومەرﷺ بە لای ڕاستو چەپیدا دەیڕوانیو حەزی دەکرد ئەگەر بۆی بکرایە،کارێکی ئەنجام بدایە، هەر بۆیە خۆی بۆ نەگیراو چوو بۆ لای ئیمامی ئەبوبەکرﷺ، بەڵام سەرەتا بە ڕەخنەگرتن دەستی پێنەکرد، بەڵکو بە چەند شتێك دەستی پێکرد، کە هەردووکیان تیایدا هاورا بوونو هەموو وەڵامەکانی ئیمامی ئەبوبەکریشﷺ بریتی بوون لە: بەڵێ.. ڕاستە.. وایە..

ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر.. ئایا ئەوە پێغەمبەری خودا نیە؟! ئیمامی ئەبوبەکرﷺ فەرمووی: بەڵێ.. ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: ئایا ئێمە موسڵمانو ئەوانیش بێباوەر نین؟! ئیمامی ئەبوبەکرﷺ فەرمووی: بەڵێ.. ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: ئایا ئێمە لە سەر حەقو ڕاستی نینو ئەوانیش لە سەر ناحەق؟! ئیمامی ئەبوبەکرﷺ فەرمووی: بەڵێ..

ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: دەی ئیتر بۆچی بەم سوکایەتیە ڕازی بین؟!

ئیمامی ئەبوبەکریشﷺ فەرمووی: ئەی عومەر ئایا ئەوە پێغەمبەری خودا نیە؟! ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: بەڵێ.. ئیمامی ئەبوبەکریشﷺ فەرمووی: منیش شایەدی دەدەم کە پێغەمبەری خودایەﷺ، دەی شوێنی بکەوەو بە پێچەوانەیەوە هەڵسوکەوت مەکەو چۆن تەقەڵی دروومان یەك لە دوای یەك بە ڕێكوپێکی بە شوێن یەکدا دێن، ئاوا شوێن وتەو فەرمانەکانی بکەوە..ئیمامی عومەریشﷺ دوبارە فەرمووی: منیش شایەدی دەدەم کە پێغەمبەری خودایە..

ئیمامی عومەرﷺ ڕۆیشتو هەوڵی دەدا ئارام بگرێت، بەڵام نەیتوانیو خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوداﷺو پێی فەرموو: ئایا تۆ پێغەمبەری خوداﷺ نیت؟! پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: بەڵێ..

ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: ئایا ئێمە موسڵمان نینو ئەوانیش بێباوەڕ؟! پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بەڵێ..

ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: ئەی بۆچی بەم سوکایەتیە ڕازی بین؟! پێغەمبەری خوداﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: من بەندەو پێغەمبەری خودام.. هەرگیز بێفەرمانی پەروەردگارم ناکەمو ئەویش هەرگیز فەرامۆشم ناکات..

ئیمامی عومەرﷺ بێدەنگ بوو، موسڵمانانیش بەرەو شاری مەدینە گەڕانەوە.. پاشماوەیەك، قورەیش ڕێکەوتن نامەکەیان شکاند، پێغەمبەری خوداشﷺ بۆ ئازادکردنو پاککردنەوەی شاری مەککە لە بت پەرستی، کەوتە ڕێو ئیمامی

عومەریش ﷺ تێگەیشتو بۆی روون بۆوە، پێغەمبەری خوداﷺ هیچ کارێك لە خۆوە ئەنجام نادات و ئەو رێككەوتنەش بە فەرمانی پەروەردگار بووە..

ئیمامی عومەر ﷺ دەفەرموێت: بەردەوامو تا ئێستا بەرۆژوو دەبم و ماڵ و سامان دەبەخشم و نوێژی سوننەت ئەنجام دەدەم و بەندە ئازاد دەكەم، سا بەڵكو پەروەردگار لەو نارەزاییی و قسانەی ئەو كاتەم خۆش بێت.. بە ڕاستی ئیمامی عومەر ﷺ كەسایەتییەكی بەرزو بێ وێنە بوو!!

كاتێك منداڵەكەت دەبینی، زۆر بایەخ بە لەبەركردنی قورئان نادات و تۆش دەتەوێت هانی بدەیت، سەرەتا بەو وتەو ئامۆژگارییانە دەست پێبكە، كە هەردووكتان لە سەریان هاوڕان، وەك ئەوەی پێی بڵێ: ئایا ناتەوێت پەروەردگار خۆشتی بووێت؟! ئایا ناتەوێت لە بەهەشتدا، پلەت بەرز بێت؟! بە دڵنیاییەوە بە بەڵێ وەڵام دەداتەوە، ئەوسا تۆش بە شێوەی پێشنیار بڵێ: دەی كەواتە پێویستە پەیوەندی بە خولی لەبەركردنی قورئانی پیرۆزەوە بكەیت..

هەروەها كاتێك هاوسەرەكەت دەبینی، كەمێك لە باڵاپۆشیەكەیدا ساردوسڕی دەنوێنێت، سەرەتا بە هەندێك وتەو ئامۆژگاری لەگەڵیدا بدوێ، كە هەردووكتان لە سەری هاوڕا بن، وەك ئەوەی پێی بڵێ: من دەزانم كە تۆ ئافرەتێكی موسڵمان و كەسێكی چاكەخوازیت، بە دڵنیاییەوە ئەویش دەڵێت: بەڵێ.. سوپاس بۆ خودا.. ئەو كاتە دەتوانی ئامۆژگارییەكەت پێشكەش بكەیت و بڵێیت: دەی پێویستە زیاتر گرنگی بە باڵاپۆشی و داپۆشینی جەستەت بدەیت..

بەم شێوەیە چیمان لە خەڵكی بوێت، دەتوانین بە دەستی بهێنین، بە بێ ئەوەی هەستیشمان پێبكەن و پێمان بزانن..

**ترووسكەیەك..**

دەتوانیت هەنگوین بخۆیت، بە بێ ئەوەی شانەی هەنگیش تێك بشكێنیت..

# دارەکە لە ناوەڕاستەوە بگرەو هاوسەنگیش ڕابگرە..!!

مایەی ڕێزو سوپاسە کە پیشەی مامۆستایی‌و وانەبێژیت هەڵبژاردووە.. پەروەردگاریش شێوازێکی جوانی پێ بەخشیوویت، بۆ ئەوەی زیاتر پەرە بە پیشەکەت بدەیت.. قوتابیەکانیشت زۆریان خۆش دەوێیت، بەڵام هیوادارم بەیانیان لە دەوام دوا نەکەوویت..

تۆ کەسێکی زۆر قەشەنگ‌و جوانیت.. ماڵەکەشت زۆر ڕێك‌وپێکە.. نکۆڵیش لەوە ناکرێت، منداڵەکانت ماندووت دەکەن، بەڵام هیوادارم زیاتر گرنگی بە جل‌وبەرگیان بدەیت..

ئەم شێوازی ئامۆژگاریە، زۆر گونجاوو چاکە، لەبەر ئەوەی سەرەتا باسی لایەنە باشەکانی ئەو کەسە دەکەیت، کە رەخنەت لێی هەیە، پاشان لە هەڵەکەی ئاگاداری دەکەیتەوە.. کاتێك دەتەوێت ئامۆژگاری هەر کەسێك بکەیت، سەرەتا هەوڵبدە رەوشت‌و هەڵسوکەوت‌و لایەنە باشەکانی باس بکەیت، پاشان بە شێوازێکی نەرم‌و نیان‌و جوان لە هەڵەکەی ئاگاداری بکەرەوە، ئەوسا هەست دەکات بە چاوێکی پڕشنگدار سەیری دەکەیت‌و لە هەڵەو کەم‌وکوڕیەکانی ناگەڕێیت..

پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆژێك بە لای هەندێك لە هۆزەکاندا تێدەپەڕێت‌و بانگیان دەکات بۆ ئەوەی موسڵمان بن، بە جوانترین وشەو زاراوەش بانگی کردن، بۆ ئەوەی زیاتر بە دەم بانگەوازەکەیەوە بێن‌و موسڵمان بوونی خۆیان ڕابگەیەنن..

کاتێك بە لای یەکێك لەو هۆزانەدا تێپەڕی، بە ناوی هۆزی (بني عبدالله)، بانگی کردن بۆ ئەوەی موسڵمان بن‌و پێی وتن: ئەی هۆزی (بني عبدالله)، پەروەردگار ناوی باوکتانی جوان کردووەو بە باشترین ناو، ناوی ناوەو هیچ هاوبەش دانانێك لە ناوی باوکتاندا نیە، دەی هاوەڵ بۆ پەروەردگار بڕیار مەدەن‌و موسڵمان بن..

خالیدی کوڕی وەلید، پاڵەوان بوو.. نەك هەر پاڵەوانێکی ئاسایی، بەڵکو پاڵەوانێکی بەناو بانگی نێو پاڵەوانان.. دەبووایە هەزاران حسابی بۆ بکرایە.. پێغەمبەری خوداﷺ حەزی دەکرد موسڵمان بێت، بەڵام چۆن؟! خالید لە هەموو ئەو جەنگانەدا بەشداری کردبوو، کە لە دژی موسڵمانان ئەنجام درابوون!! بەڵکو لە جەنگی ئوحوددا، هۆکارێکی هەرە گەورەی شکانی موسڵمانانیش بوو..

ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئەگەر خالید بێت بۆ لامان، ئەوا ڕێزی دەگرین..ئەم وتەیەی پێغەمبەری خوداﷺ چۆن کاری کردە سەر خالید؟!

با چیرۆك و ڕووداوەكە لە سەرەتاوە باس بكەین: خالید یەكێك بوو لە گەورەو سەركردەكانی قورەیش و بێباوەڕان.. هیچ هەلێكی لە دەست نەدەدا، بۆ ئەوەی دژایەتی پێغەمبەرو هاوەڵانی بكات.. كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانی بۆ ئەنجامدانی عومرە بەرەو مەككە كەوتنە ڕێ، خالیدو چەند كەسێكیش لە بێباوەڕان بەرەو پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانی چوون و لە شوێنێكدا كە پێی دەوترا (عسفان)، پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانیانیان بینی..

خالید لێیان نزیك كەوتەوەو بۆ هەلێك دەگەڕا، تیرێك، یان ڕمێك، یان شمشێرێك بگەیەنێتە پێغەمبەری خوداﷺ و شەهیدی بكات.. هەر بۆیە زۆر چاودێری پێغەمبەری خودایﷺ كرد، پێغەمبەری خوداشﷺ لە بەرامبەر بێباوەڕانەوە، نوێژی نیوەڕۆی بۆ موسڵمانان ئەنجام دەدا، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ وەك ئەوەی ئاگای لە پیلانی بێباوەڕان بێت، نوێژی عەسری بە نوێژی ترس (صلاة الخوف) بۆ موسڵمانان ئەنجامدا.. موسڵمانانی كرد بە دوو بەشەوە، بەشێكیان لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ نوێژیان ئەنجام داو بەشەكەی تریان چاودێری و پاسەوانی پێغەمبەری خوداﷺ و ئەو موسڵمانانەیان دەكرد، كە لە نوێژدا بوون.. ئا لەم كاتەدا خالید دەڵێت: ناتوانین هیچ زەرەرو زیانێكی پێبگەیەنین!!

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانی بە لای ڕاستدا كەوتنە ڕێ، بۆ ئەوەی بە لای خالیددا تێنەپەڕن و لێی دوور بن.. بەم شێوەیە بەردەوام بوون، هەتا گەیشتنە ناوچەی حودەیبیەو ڕێكەوتن، لە سەر ئەوەی موسڵمانان ئەمساڵ عومرە ئەنجام نەدەن و بگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینەو ساڵی داهاتوو بێنەوە..

خالید سەیری كرد، ڕۆژ بە ڕۆژ پلەو پایەی قورەیش لە ناو عەرەبدا، لە دابەزین و كەمبوونەوەدایە، هەر بۆیە لە دڵی خۆیدا وتی: چ شتێك ماوەتەوەو بۆ كوێ بچم؟! بۆ لای نەجاشی بچم؟! نەخێر.. نەجاشی شوێن محمد كەوتووەو هاوەڵانی محمدیش لە لای ئەو بە ئارامی و ئاسوودەیی دەژین.. ئەی بۆ لای هەرقل بچم؟! نا.. ئاینی خۆم ناگۆڕم و نابم بە گاورو جولەكە!!

خالید لەم بیركردنەوەو خەیاڵانەدا بوو، بەڵام دوودڵ بوو.. بە هەر حاڵ ڕۆژەكان و مانگەكان تێپەڕین، هەتا بوو بە ساڵێك و كاتی ئەنجامدانی عومرەی موسڵمانان هاتە پێشەوەو بەرەو شاری مەككە كەوتنە ڕێ.. پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ئەنجامدانی عومرەی موسڵمانان بەرەو شاری مەككە كەوتنە ڕێ.. كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ئەنجامدانی عومرە هاتە شاری مەككەوە، خالید نەیتوانی ئارام بگرێت و بە چاوی خۆی موسڵمانان ببینێت، بە جل وبەرگی ئیحرامەوە بچنە شاری مەككەوە، هەر بۆیە بۆ ماوەی چوار ڕۆژ مەككەی جێهێشت و چووە

دەرەوەی شارەکە..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ عومرەکەی ئەنجامدا، سەیرێکی ڕێگەو خانوو ماڵەکانی مەککەی کردو یادگاریەکانی وەبیرهاتەوە، پاشان خالیدی کوڕی وەلیدی بیرهاتەوە، هەر بۆیە ئاوڕی بۆ لای وەلیدی برای خالیدی کوڕی وەلیددا دایەوە، کە لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ هاتبوو، بۆ ئەنجامدانی عومرەو پێی فەرموو: ئەوە خالید لە کوێیە؟! ئەم پرسیارە بۆ وەلید، کت‌وپڕ بوو، لە وەڵامدا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پەروەردگار دەیهێنێتەوە بۆ لات، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: «مِثلُه يجهل الأسلام!! ولو كان جعل نكايته وَحَدَّه مع المسلمين، كان خيراً له».. واتە: (چۆن دەبێت کەسێکی وەکو خالید، شارەزای ئیسلام نەبێت‌و ئیسلام نەناسێت‌و موسڵمان نەبێت!! ئەگەر بێتوو ئەو هێزو توانایەی لەگەڵ موسڵماناندا یەك بخات‌و لە خزمەت ئیسلامدا بەکاری بهێنێت، ئەوا بۆ خالید باشترو چاکتر بوو)..

پاشان فەرموی: ئەگەر بهاتایە بۆ لامان ڕێزمان دەگرت‌و لە پێش کەسانی تریشەوە دامان دەنا.. وەلید بەم قسانەی پێغەمبەری خوداﷺ دڵخۆش بوو، کەوتە گەڕان بە شاری مەککەدا، بۆ ئەوەی خالید بدۆزێتەوە، بەڵام نەیدۆزیەوە، کاتێك موسڵمانان ویستیان بگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینە، وەلید لە ڕۆشنایی وتە ناراستەوخۆکەی پێغەمبەری خوداوەﷺ نامەیەکی بۆ خالیدی برای ناردو تیایدا نوسی بووی: بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان.. بە ڕاستی شتێکی سەیرە، کە تۆ لە ئیسلام ڕادەکەیت، لە کاتێکدا کە خاوەنی ئەو هەموو ژیریەیت!!

پێغەمبەری خوداﷺ پرسیاری لێکردمو فەرمووی: خالید لە کوێیە؟ منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، خودا دەیهێنێتەوە بۆ لات، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەبێت کەسێکی وەکو خالید نەشارەزا بێت بەرامبەر ئیسلام!! خۆ ئەگەر خالید هێزو توانای خۆی لەگەڵ موسڵماناندا یەك بخات، ئەوا بۆ خالید باشترو چاکترە.. ئەگەر خالید بگەڕێتەوە بۆ لامان، ئەوا ڕێزی دەگرین‌و لە پێش کەسانی ترەوە، دایدەنێین.. برام پەلە بکە، چونکە چاکەو پاداشتی زۆرت لە دەستچووە..

خالید دەفەرموێت: کاتێك نامەکەم پێگەیشت، حەزم دەکرد موسڵمان بم‌و خۆشحاڵیش بووم، کە پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵی پرسی بووم.. لە خەویشمدا بینیم، لە زەویەکی تەنگ‌و تەسك‌و وشکەوە بەرەو زەویەکی سەوزایی فراوان ڕۆیشتم‌و لە دڵی خۆمدا وتم: بە ڕاستی ئەم خەوە ڕاست‌و دروستە..

کاتێکیش ویستم بڕۆم بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، وتم: کێ هاوڕێیەتی ئەو گەشتە پیرۆزەم دەکات؟! سەفوانی کوڕی ئومەیەم بینی‌و پێم وت: ئایا نابینی ئێمە هەموومان وەکو

بەرداش خەریکین یەکتر دەهارین؟! ئەوەتا محمدیش لە ناو عەرەبو عەجەمدا دەسەڵاتی پەیدا کردوەو دەرکەوت.. ئەگەر بچین بۆ لای محمدو شوێنی بکەوین، ئەوا ڕێزو گەورەیی محمد، دەبێتە مایەی ڕێزو گەورەیی بۆ ئێمەش..

سەفوان زۆر بە توندی نکوڵی کردو وتی: ئەگەر بە تەنهاش بمێنمەوە، ئەوا شوێنی ناکەومو باوەڕی پێناهێنم.. هەر بۆیە لێك جیابووینەوەو لە دڵی خۆمدا وتم: سەفوان لە جەنگی بەدردا باوكو برای کوژراوەو کەسێکی دڵ بریندارە.. پاشان عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهلم بینیو چیم بە سەفوان وت، بەویشم وت، ئەویش بە هەمان شێوەی سەفوان وەڵامی دامەوە، بەڵام پێم وت: بە کەس مەڵێ کە دەچم بۆ لای محمد.. ئەویش وتی: بە کەس ناڵێمو ئاشکرات ناکەم..

چوومەوە بۆماڵەوە، خۆم ئامادە کردو کەوتمە ڕێو لە ڕێگە عوسمانی کوڕی تەڵحەم بینی، ویستم پێی بڵێم، بەڵام لە دڵی خۆمدا وتم: ئەمیش باوکی بە دەستی موسڵمانان کوژراوە، پاشان وتم: چی دەبێت ئەگەر ئاگاداری بکەم؟! هەر بۆیە پێم وت: خۆم ئامادە کردووەو دەمەوێت بچم بۆ مەدینەو ئەوەی بە دوو کەسەکەی پێشووم وت، بەویشم وت، ئەویش ئامادەیی دەربڕیو ڕێکەوتین لە سەر ئەوەی لە شوێنێك بە یەك بگەین، بە ناوی (یأجج)، بڕیاریشماندا هەر کەسێکمان زووتر بگەینە ئەو جێگەیە، چاوەڕێی ئەوی ترمان بکەین..

پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، لەو شوێنەی دیاریمان کرد بوو، بە یەك گەیشتین، پاشان عەمری کوڕی عاصمان بە سەر وشترەکەیەوە بینیو وتی: سڵاوتان لێ بێت.. ئەوە بۆ کوێ دەچن؟! ئێمەش وتمان: ئەی تۆ بۆ کوێ دەچیت؟! ئەویش وتی: نا.. ئێوە بۆ کوێ دەچن؟! وتمان: دەمانەوێت شوێن محمد بکەوینو موسڵمان بین.. عەمریش وتی: دەی منیش هەر بۆ ئەوە دەچم.. هەرسێکمان ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە شاری مەدینە..

خالید دەفەرموێت: جوانترین جلوبەرگم لەبەرکردو بەرەو لای پێغەمبەری خوداﷺ کەوتمە ڕێو لە ڕێگە وەلیدی برامم بینیو پێی وتم: پەلە بکە.. پێغەمبەری خوداﷺ بە هاتنەکەت دڵخۆشەو چاوەڕێت دەکات.. بە پەلە کەوتینە ڕێو پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك لە دوورەوە ئێمەی بەدی کرد، زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی.. هەتا گەیشتینە بەردەمی، پێغەمبەری خوداﷺ ڕوخساری هەر گەشاوەو دەم بە خەندە بوو، سڵاومان لێکردو بە ڕوویەکی خۆشەوە، وەڵامی سڵاوەکەی داینەوە، پاشان وتم: أشهد أن لاإله إلا الله.. وأنك رسول الله.. ئەویش فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی ڕێنمایی کردیت.. بە دڵنیاییەوە من ژیریو داناییم لە تۆدا بەدی دەکردو هیوادار بووم، ئەو ژیریو داناییەت، تەنها بەرەو خێرو چاکەت

بەرێت..

پاشان وتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بەرەنگاری ڕاستی بوومەوە، داوات لێدەکەم لە پەروەردگار بپارێیتەوە، بۆ ئەوەی لێم خۆش بێت.. پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: موسڵمان بوون، دەبێتە هۆی سرینەوەی هەموو گوناهو تاوانەکانی پێشوو.. دوبارە وتم: دەی پێغەمبەری خوداﷺ داوای لێخۆشبوونم لە پەروەردگار بۆ بکە.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: خودایە لە خالیدی کوڕی وەلید خۆشبە.. لە هەموو ئەو کارانەشی خۆشبە، کە بووەتە هۆی ڕێگریو بەربەست لە بەردەم ئاینی پەروەردگار.. لە دوای ئەوە، خالید بوو بە یەکێك لە سەرکردە بە ناوبانگەکانی ئەم ئاینە پیرۆزە.. موسڵمان بوونەکەشی بە هۆی پەیامێکی ناراستەوخۆی پێغەمبەری خوداوەﷺ بوو.. ئای لە دانایی‌و میهرەبانی ئەو پێغەمبەرە نازدارەﷺ !!

دەی با ئێمەش لە بانگەوازکردنی خەڵکیدا، لێهاتووی‌و شارەزایی بەکاربهێنین‌و هەوڵ بدەین کاریگەرییان لە سەر دروست بکەین..کاتێك دوکاندارێك دەبینیت، جگەرە دەفرۆشێت‌و دەتەوێت ئاگاداری بکەیتەوەو پێی بڵێیت: جگەرە مەفرۆشەو حەرامە، سەرەتا باسی پاك‌و خاوێنی‌و ڕێك‌وپێکی دوکانەکەی بکە، هەروەها داوای خێرو قازانجی لە پەروەردگار بۆ بکەو پاشان باسی گرنگی پەیداکردنی ڕۆزی حەڵاڵی بۆ بکە، بۆ ئەوەی ئەو هەستەی بۆ دروست نەبێت، کە بە چاویلکەی ڕەشەوە لێی دەڕوانیت، بەڵکو هەوڵ بدە دارەکە، یان گۆچانەکە، لە ناوەڕاستەوە بگرە.. سەرەتا هەندێك لە شتە جوانەکانی باس بکە، پاشان لە هەڵەو کەم‌وکوڕیەکانی ئاگاداری بکەرەوە..

کاتێك بەرەو ڕووی کەسێك دەبیتەوە، بە چاکەکانی، خراپەکانی‌و بە جوانیەکانی، ناشیرینەکانی داپۆشە.. هەمیشە گومانی باش بە خەڵکی بەرە، بۆ ئەوەی هەست بکەن بە دادپەروەری هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەیت، ئەوسا هەمووان خۆشیان دەوێیت..

**نیگایەک..**

کاتێك خەڵکی ڕێنمایی‌و ئامۆژگاریەکانت وەردەگرن، کە باوەڕ بەوە بهێنن، وەك چۆن سەرنجی کەم‌وکوڕی‌و هەڵەکانیان دەدەیت، بە هەمان شێوە سەرنجی چاکەو جوانیەکانیشیان دەدەیت..

# هەڵەکان بە ئاسانی چارەسەر بکە..

ئەو هەڵانەی کە خەڵکی ئەنجامیان دەدەن، لە رووی گەورەیی‌و بچووکیانەوە جیاوازن.. هەڵەش هەر چەندێك گەورە بێت، شایەنی چارەسەرکردنە..

بەڵێ.. هەندێك جار هەرچەندە چارەسەرکردنی هەڵەیەك بێ سودە، کە ١٠٠٪ کارەکەی خراپ کرد بێت، بەڵام دەتوانرێت زیانەکانی کەم بکرێتەوە.. خەڵکانێك کە ژمارەیان کەم نیە، هەوڵ نادەن چارەسەری هەڵەکانیان بکەن، لەبەر ئەوەی گومانیان هەیە لەوەی کە ئایا چارەسەری هەڵەکانیان پێدەکرێت، یان نا؟!

جاری واش هەیە، ئەو رێگەو هۆکارەی کە لە چارەسەری هەڵەکەدا بەکاری دێنین، خۆی لە خۆیدا هەڵەیە..

کاتێك کەسێك کورەکەی دەکەوێتە هەڵەیەکەوە، سەرزەنشتی دەکات‌و هەڵەکەی لە سەر گەورە دەکات، هەتا کورەکەی وا هەست دەکات، کەوتووەتە ناو بیرێکی بێ بنی زۆر قوڵەوەو دەرچوون‌و رزگاربوونی مەحاڵە، ئیتر بێ هیوا دەبێت‌و لە سەر هەڵەکەی دەمێنێتەوەو ناتوانێت هەوڵی چارەسەر بدات..

پیاوێك دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ‌و پەیمانی کۆچ کردنی لەگەڵ دەدات‌و دەڵێت: من هاتووم بۆ لات، بۆ ئەوەی پەیمانت لە سەر کۆچ کردن پێبدەم.. کاتێك هاتم، دایك‌و باوکمم بە گریانەوە جێهێشت.. پێغەمبەری خوداﷺ سەرزەنشتی نەکردو کارەکەی بە خراپ باس نەکرد، لەبەر ئەوەی ئەم پیاوە بە نیەتێکی چاك هاتبوو.. پێغەمبەری خوداﷺ هەستی کرد، چارەسەری هەڵەی ئەو پیاوە ئاسانەو هیچ دژواریەکی تێدانیە، هەر بۆیە زۆر بە سادەییەوەو فەرمووی: بگەرێوە بۆ لایان‌و بیانخەرە پێکەنین، هەر وەك چۆن خستنە گریان.. بەم شێوەیە پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بە سادەو ساکاری پەنجەی خستە سەر هەڵەی کابراو چارەسەرەکەشی بۆ خستەروو..

رووداوێکی پر غەم‌و ئازارتان بۆ باس دەکەم، کە قورئانی پیرۆز شایەدی رووداوەکەیەو لێرەدا دوبارەی دەکەمەوە بۆ ئەوەی سودی لێوەربگرین.. پێغەمبەری خوداﷺ هەر کاتێك بچووایە بۆ گەشتێك، یان جەنگێك، تیروپشکی لە نێوان هاوسەرەکانیدا

دەکردو یەکێکیانی لەگەڵ خۆیدا دەبرد.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ویستی بچێت بۆ غەزای (بني مصطلق)، تیروپشکی لە نێوان هاوسەرەکانیدا کردو تیرو پشکەکەش بۆ عائیشەی دایکی ئیمانداران دەرچوو.. عائیشەی دایکی ئیماندارانیش (خودای لێ ڕازی بێت) لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ کەوتە ڕێ، ئەم ڕووداوەش لە دوای دابەزینی ئایەتی بالاپۆشی ڕوویدا..

بەڵێ.. دایکی ئیمانداران لە ناو کەژاوەکەیدا بوو، کاتێك کاروانەکە بۆ پێویستیەك لای بدایاو بوەستایە، دایکی ئیماندارانیش دادەبەزیو پێویستیەکانی خۆی جێبەجێ دەکردو پاشان سەردەکەوتەوەو دەچووەوە ناو کەژاوەکەی..

کاتێك جەنگەکە کۆتایی هات، پێغەمبەری خوداشﷺ بەرەو مەدینە کەوتە ڕێو لە نزیك مەدینە، لایداو بەشێك لە شەو مانەوە، پاشان فەرمانی بە موسڵمانان کرد، ئامادەی ڕۆیشتن بن، خەڵکەکەش دەستیان کرد بە خۆ ئامادە کردن، دایکی ئیماندارانیش بۆ پێویستیەکی، کەمێك دوور دەکەوێتەوە، کاتێك دەگەڕێتەوە، دەبینێت ملوانکەکەی ون بووە، هەر بۆیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ملوانکەکەی بدۆزێتەوە، زۆر دەگەڕێت بەڵام بێئاکام دەبێت، سەرەڕای ئەوەش درەنگ دەکەوێتو لە کاروانەکەی جێدەمێنێت.. کاروانەکەش کەژاوەکە ڕادەکێشنو دەیخەنە سەر وشتەکەیو وادەزانن دایکی ئیماندارانی تێدایەو دەکەونە ڕێ..

بە هەر حاڵ عائیشەی دایکی ئیماندران لە دوای گەڕانێکی زۆر ملوانکەکەی دەدۆزێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کاروانی موسڵمانان تیایدا لایان دابوو، بەڵام بە داخەوە دەبینێت، کەسی لێ نەماوە..

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: گومانم وابوو موسڵمانان دێنەوە بە شوێنمداو لەگەڵ خۆیان دەمبەن، هەر بۆیە لە جێگەی خۆم دانیشتم، بەڵام خەو زۆری بۆ هێنامو خەوم لێکەوت.. سوێند بە خودا ڕاکشا بووم، سەفوانی کوڕی معطل بە لامدا تێپەڕی، کە ئەویش بە هۆی پێداویستیەکی خۆیەوە، لە کاروانو سوپاکە دواکەوتبوو، کاتێك ڕەشایی مرۆڤێکی بینی، هات بۆ لامو ناسیمیەوە، لەبەر ئەوەی لە پێش دابەزینی ئایەتی بالاپۆشیشدا منی بینی بوو، کاتێك بینیمی وتی: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ.خێزانو هاوسەری پێغەمبەری خودا؟!

خێرا هەستامو بە سەرپۆشەکەم ڕوخسارم داپۆشی.. سوێند بە خودا بە تەنها یەك وشە نەیدواندومو قسەی لەگەڵ نەکردمو وشترەکەی دانیشاندو منیش سواربوومو

ئەویش ڕێشمەو لغاوی وشترەکەی بە دەستی گرتو بە پەلە ڕۆیشتین، خەڵکەکەش نەیانزانی کە من جێماوم، هەتا ڕۆژ بۆوە، کاتێك لە دوورەوە پیاوێکیان بینی، وشترێك بە دوای خۆیدا ڕادەکێشێتو وشترەکەش ئافرەتێکی بە سەرەوەیە، ئیتر کەسانی بوهتانکەرو پڕوپاگەندەچیش دەستیان بە وتی وتی کردو ئەوەی وتیان وتیان!! منیش ئاگام لە هیچ شتێك لەو قسەو باسانە نەبوو..

بەڵێ.. گەیشتینەوە شاری مەدینەو زۆری پێنەچوو، نەخۆش کەوتمو نەخۆشیەکەشم زۆر بە ئێشو ئازار بوو.. ئەو قسەو بوهتانانەش کە دەربارەی من وترا بوو، بە پێغەمبەری خودا ﷺ و باوکم گەیشتبوو، بەڵام کەمو زۆر هیچیان بە من نەدەوت، تەنها ئەوەندە نەبێت، هەستم بەوە کرد بوو، کە پێغەمبەری خودا ﷺ سۆزی بەرامبەرم کەم بۆتەوە!! چونکە پێشتر کاتێك نەخۆش بوومایە، زۆر لەگەڵم بە سۆزو میهرەبان دەبوو، بەڵام ئەمجارەیان وانەبوو!!

پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك دەیبینی دایکمم لە لایە، دەیوت: نەخۆشەکەتان چۆنە؟ لەمە زیاتر هیچی تری نەدەوت.. هەتا بە تەواوی هەستم پێکردو وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر مۆڵەتم بدەیت، دەچم بۆ ماڵی باوکم، بۆ ئەوەی دایکم خزمەتم بکات؟ ئەویش مۆڵەتیدامو ڕۆیشتم بۆ لای دایکمو ئاگاداری هیچ شتێکیش نەبووم، هەتا بیست ڕۆژ بە سەر نەخۆشیەکەمدا تێپەڕی..

شەوێك بۆ هەندێك پێداویشتی خۆم لەگەڵ دایکی مەستەحدا، کە کچی پوری باوکم بوو، چووینە دەرەوەو لە ڕێگە ئەو ئافرەتە قاچی لە شتێك هەڵکەوتو خەریك بوو بکەوێتو وتی: لەناوبچێت مەستەح.. منیش وتم: شتێکی خراپت وت!! جنێو بە پیاوێك دەدەیت، کە بەشداری جەنگی بەدری کردووە؟!

ئەویش لە وەڵامدا وتی: ئایا نەتبیستووە چی وتووە؟! کچەکەی ئەبوبەکر ئەو هەواڵە گەورەیەت پێنەگەیشتووە؟!

منیش وتم: کام هەواڵ؟! ئەوسا ئەوەی کە وترا بوو، بۆی گێڕامەوەو بۆی باس کردم.. سوێند بە خودا نەمتوانی پێداویستیەکەم جێبەجێ بکەمو گەڕامەوە، نەخۆشیەکەشم ئەوەندە پەرەیسەند، گومانم وابوو، گریان جگەرم دەبڕێت.. پاشان بە دایکمم وت: خودا لێت خۆش بێت، خەڵکی ئاواو ئاوایان وتووەو تۆش هیچت بۆ باس نەکردووم؟! لە وەڵامدا دایکم وتی: کچەکەم بە لاتەوە ئاسایی بێتو زۆر لە سەر خۆتی قورسو گران مەکە، بە خودا زۆر کەمن ئەو ئافرەتانەی کە جوان بوونو لە

لایەن مێردەکانیشیانەوە خۆشەویست بووبن و قسەو باسی لەم شێوەیەیان بۆ دروست نەکرا بێت..

وتم: پاک و بێگەردی بۆ خودا، خەڵکی ئەو قسەو باسانەیان لە بارەی منەوە وتووە؟! ئەو شەوە هەتا بەیانی بەشم هەر گریان بوو.. چاوم بۆ ساتێکیش لە فرمێسک وشک نەبوو، خەویش نەچووە چاوەکانم، پاشانیش هەر دەگریام و هەر دەگریام..

ئەوە حاڵی عائیشەی دایکی ئیمانداران بوو (خودای لێ ڕازی بێت).. تۆمەتبار کرا بە تاوانێکی زۆر گەورە، لە کاتێکدا تەمەنی لە پانزە ساڵ تێنەپەڕی بوو!! تۆمەتبار کرا بە تاوانێکی زۆر قێزەون!! بە ئەنجامدانی زینا تۆمەتبار کرا، لە کاتێکدا ئافرەتێکی زۆر پاک داوێن و بە ئابڕوو بوو!! هەروەها هاوسەری چاکترین و پاکترینی مرۆڤی سەر زەوی بوو، ئیتر چۆن ناپاکی بەرامبەر هاوسەرەکەی دەکات، لە کاتێکدا کە هاوسەرەکەی پێغەمبەری خودایە ﷺ !! هەر بۆیە لە ماڵی باوکیدا بەشی هەر گریان بوو..

بە هەمان شێوە پێغەمبەری خوداش ﷺ ژیانی لەگەڵ غەم و پەژارەدا دەگوزەراند.. جوبرائیلیش نەدەهات بۆ لای و قورئانیش لەو بارەیەوە دانەبەزی.. هەتا وای لێهات پێغەمبەری خودا ﷺ نەیدەزانی چی بکات و چۆن لەگەڵ ئەم ڕووداوەدا مامەڵە بکات، دووڕووەکانیش هەتا دەهاتن زیاتر تۆمەتەکەیان گەورەتر دەکردو قسەو باسی ناڕاست و ناڕەوایان دەربارەی ئابڕووی پێغەمبەری خودا ﷺ بڵاو دەکردەوە..

کاتێک ئەم باس و خواسە بڵاوبۆوەو درێژەی کێشا، پێغەمبەری خودا ﷺ وتاری بۆ موسڵمانان داو لە دوای سوپاس و ستایشی پەروەردگار فەرمووی: خەڵکینە کەسانێک بە هۆی ئەو قسەو باسە ناڕاستانەی دەربارەی هاوسەرەکانم دەیکەن، ئازارم دەدەن، سوێند بە خودا لە چاکە زیاترم لە هاوسەرەکانم نەبینیووە، دەربارەی پیاوێکیش قسە دەکەن، سوێند بە خودا لە چاکە زیاترم لێ نەبینیووە، لەگەڵ خۆشمدا نەیێت، هەرگیز نەچۆتە هیچ ماڵێك لە ماڵەکانم..

کاتێک پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم قسانەی فەرموو، سەرکردەی هۆزی ئەوس، سەعدی کوڕی موعاز فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو کەسانە ئەگەر لە هۆزی ئەوسن، ئەوا لە دەستیان ڕزگارت دەکەین و چاریان دەکەین، خۆ ئەگەر لە برایانی هۆزی خەزرەجیشن، ئەوا فەرمان فەرمانی خۆتە، سوێند بە خودا ئەوانە کەسانێکن، پێویستە لە ملیان بدرێت..

کاتێک سەرکردەی خەزرەجیەکان، سەعدی کوڕی عوبادە گوێی لەم قسانە بوو،

هەر چەندە پیاوێکی زۆر چاکیش بوو، بەڵام دەمارگیرییەك بۆ هۆزەکەی گرتی‌و وتی: سوێند بە خودا درۆ دەکەیت‌و لە گەردنیان نادەیت، ئەو قسانەشت لەبەر ئەوە کرد، چونکە دەزانیت ئەو کەسانە لە هۆزی خەزرەجن‌و ئەگەر لە هۆزەکەی تۆ بوونایە، ئەو قسانەت نەدەکرد!!

پاشان ئوسەیدی کوڕی حوزەیریش فەرمووی: سوێند بە خودا تۆ درۆ دەکەیت‌و دەبێت ئەو کەسانە بکوژین، بەڵام تۆ دووڕوویت، بۆیە بەرگری لە دووڕووەکان دەکەیت.. ئیتر خەڵکەکە وروژان‌و خەریك بوو کوشت‌و کوشتار ڕوو بدات، پێغەمبەری خوداش ﷺ هەر لە سەر دوانگە وەستا بوو، هەتا بێدەنگ بوون، کاتێکیش پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم حاڵەتەی بینی، لە سەر دوانگە دابەزی‌و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری کرد، ئەم ڕووداوەی لە لایەن خەڵکیەوە بۆ چارەسەر ناکرێت، هەربۆیە هەوڵیدا لە لایەن کەسە نزیکەکانی خۆیەوە، چارەسەرێك بۆ ئەم کێشەیە بدۆزێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ڕاو بۆچوونی ئیمامی عەلی‌و ئوسامەی کوڕی زەیدی وەرگرت..

ئوسامە رضي الله عنه زۆر باسی چاکەو ڕەوشت بەرزی عائیشەی دایکی ئیماندارانی کردو فەرمووی: ئەو قسەو باسانە هەمووی درۆیەو لە چاکە زیاتر، هیچم لە هاوسەرەکانت نەبینیووە..

بەڵام ئیمامی عەلی رضي الله عنه فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئافرەتان زۆرن‌و دەتوانیت ئافرەتی تر مارە بکەیت، پرسیار لە کەنیزەکەکەشی بکە، ئەوا ڕاستیت پێدەڵێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی بورەیرەی کەنیزەکی خاتوو عائیشەی کردو پێی فەرموو: هیچ شتێکت لە عائیشە بینیووە کە جێگەی گومان بێت؟! ئەویش لە وەڵامدا وتی: نەخێر.. سوێند بە خودا جگە لە خێرو چاکە، هیچم لێ نەبینیووە، تەنها ئەوەندە نەبێت ئافرەتێکی کەم تەمەن‌و بێ ئەزموونەو کاتێك کە هەویر دەشێلم‌و داوای لێدەکەم ئاگای لێ بێت، خەوی لێدەکەوێت‌و مەڕو بزن دێن لە هەویرەکە دەخۆن..

بەڵێ.. چۆن گومان لە عائیشەی دایکی ئیمانداران دەکرێت.. عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) ئەو ئافرەتەیە، کە پەروەردەکراوی دەستی ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه بوو، هەروەها هاوسەری بەرێزترین نەوەی باوکە ئادەمیش بوو.. چۆن گومان لە ئافرەتێك

دەكرێت، كە خۆشەویسترین كەسی پێغەمبەری خوداﷺ بێت؟! گومانیشی تێدا نیە پێغەمبەری خوداﷺ، كەسێكی خۆش ناوێت، كە پاك نەبێت!!

بە راستی عائیشە (خودای لێ رازی بێت) بە تاوانێكی زۆر گەورە تۆمەتبار كرا!! پەروەردگاریش بە تاقیكردنەوەیەكی زۆر گران، تاقی كردەوە، بۆ ئەوەی خێرو پاداشتو چاكەكانی زیاتر بێتو ئالتون ئاسا زاخاو بدرێتو بۆ هەتا هەتایی ناوبانگی بمێنێتەوەو پاكیو بێتاوانیەكەی باس بكرێتو ئەوە لە دوای ئەوە پەندو ئامۆژگاری لە رووداوەكەی وەربگرن..

رۆژگارەكان زۆر بە نارەحەتی بە سەر دایكی ئیمانداراندا تێدەپەرین.. ئازارەكان ژانو ئازاری تریان بە دوای خۆیاندا دەهێنا.. بە نەخۆشیو لە سەر جێگەكەی هەر ئەمدیوو ئەودیوی دەكردو بە دەم ئازارو غەمو پەژارەوە، دەتلایەوەو نە خەوی هەبوو نە خواردن..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ ویستی چارەسەری ئەو كێشەیە بكات، هەر وەك پەنای بردە بەر دەمراستو پیاوە ناودارەكان، بەڵام لە باتی چارەسەر، نزیك بوو شەرو كوشتار رووبدات، پاشان پەنای بردە بەر كەسە نزیكەكانیو پرسیاری لە ئیمامی عەلیو ئوسامە كرد، لەمانیش چارەسەرێكی گونجاوی دەست نەكەوت، هەر بۆیە ئەمجارەیان ویستی لە رێگەی عائیشە خۆیەوە، كۆتایی بە كێشەكە بهێنێت..

عائیشە (خودای لێ رازی بێت) دەفەرموێت: ئەو رۆژەو رۆژی پێشووتریش بە بەردەوامی فرمێسكم دەرشتو خەویش نەچووە چاوم، دایكو باوكیشم گومانیان وابوو، گریان جەرگم دەبرێت..

پێغەمبەری خوداﷺ بەرەوماڵی ئیمامی ئەبوبەكرؓ هات، لە دوای مۆڵەت خواستن، هاتە ژوورەوە، منو باوكمو دایكمو ئافرەتێكی تر بووین، لە دوای ئەو رووداوەوە، ئەوە یەكەمجار بوو پێغەمبەری خوداﷺ بێت بۆ ماڵی باوكم.. نزیكەی مانگێك بوو نەمبینی بوومو هیچ نیگاو سروشێكیش دەربارەی من دانەبەزی بوو..

پێغەمبەری خوداﷺ دانیشتو لە دوای سوپاسو ستایشی پەروەردگار فەرمووی: ئەی عائیشە دەربارەی تۆ، ئەوەو ئەوەم پێگەیشتووە، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ روونی كردەوەو فەرمووی: مرۆڤ هەر چەندە بكەوێتە هەڵەو تاوانەوە، بەڵام چارەسەركردنی قورسو مەحاڵ نیە.. ئەگەر تۆ بێتاوان بیت، ئەوا پەروەردگار بێتاوانیت ئاشكرا دەكات، ئەگەر تاوانێكیشت ئەنجام دابێت، بگەرێرەوە بۆ لای

پەروەردگارو داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، چونکە کاتێك بەندەیەك دان بە تاوانەکەیدا دەنێتو پەشیمان دەبێتەوە، ئەوا پەروەردگار لێی خۆش دەبێت.. بەم شێوەیە زۆر بە کورتی چارەسەرەکەی خستە ڕوو، هیچی تر درێژەی پێنەدا..

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە وتەکانی بۆوە، فرمێسکەکانی چاوم وشك بوونەوە، هەر وەك ئەوەی هەرگیز نەگریا بێتم، پاشان سەیری باوکمو دایکمم کردو چاوەڕێم دەکرد وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ بدەنەوە، بەڵام هیچیان نەوت، هەر بۆیە ڕووم کردە باوکمو وتم: لەبری من وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ بدەرەوە.. باوکیشم وتی: سوێند بە خودا نازانم چی بە پێغەمبەری خوداﷺ بڵێم!! پاشان بە دایکمم وت: لە بری من وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ بدەرەوە.. بە هەمان شێوەی باوکم ئەویش وتی: چی وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ بدەمەوە!!

بە ڕاستی ئەو نارەحەتیو غەمو پەژارەیەی لەو ڕۆژەدا ڕووی لە ماڵی ئیمامی ئەبوبەکرﷺ کرد بوو، بڕوا ناکرێت هەرگیز ڕووی لە هیچ ماڵێکی تر کرد بێت!! عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پاشان دەستم کردەوە بە گریانو وتم: نا.. سوێند بە خودا هەرگیز داوای گەڕانەوەو لێخۆشبوونو پەشیمانی لە خودا ناکەم لە سەر ئەو کارەی کە تۆ باسی دەکەیت.. سوێند بە خودا دەزانم ئەوەی دەربارەی من وتراوەو گوێتان لێ بووە، لە دەروونتاندا جێگیر بووە، خۆ ئەگەر بڵێم: بێتاوانم، ئەوا پەروەردگار دەزانێت کە بێتاوانمو بەڵام باوەڕم پێناکەن، خۆ ئەگەر دان بەو تاوانەدا بنێم کە نەمکردووەو بڵێم: کردوومەو پەروەردگاریش دەزانێت کە بێتاوانم، ئەوا باوەڕ بە قسەکەم دەکەن!! هەر بۆیە وتەکەی باوکی یوسف ﷺ دووبارە دەکەمەوەو دەڵێم: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾﴾ یوسف. واتە: (جا چارم تەنها خۆگرییو ئارامگرتنە بە جوانترین شێوە، هەر خوداش داوای کۆمەکی لێدەکرێت، لە سەر ئەو باسەی ئێوە دەیکەن)..

پاشان دەفەرموێت: لە جێگەکەم پاڵ کەوتمەوەو دەمزانی کە پەروەردگار پاکیو بێتاوانیەکەم دەردەخات، بەڵام سوێند بە خودا، گومانم وانەبوو، سروشی خودایی دابەزێتو لە ڕێی قورئانی پیرۆزەوە بێتاوانیم ئاشکرا بکاتو بۆ هەتا هەتایە، باسی من لە قورئاندا بخوێنرێتەوە، بەڵکو هیواخوازبووم پێغەمبەری خوداﷺ لە ڕێگەی خەوەوە لە بێتاوانیم ئاگادار بکرێتەوە!!

سوێند بە خودا، پێغەمبەری خوداﷺ لە جێگەکەی هەڵنەستا بوو، بەڵکو ئێمەش هەموومان لە جێگەی خۆمان بووین، هەتا پێغەمبەری خوداﷺ چووە ئەو حاڵەتەوە، کە لە کاتی نیگاو سروشی پەروەردگاردا بە سەری دەهات.. بە خودا من هیچ ترسم نەبوو، چونکە دەمزانی بێتاوانم‌و پەروەردگاریش ستەم لە کەس ناکات، بەڵام باوکم‌و دایکم لە ترسدا خەریك بوو گیانیان دەردەچوو، لەوە دەترسان ڕاستی ڕووداوەکە بۆ پێغەمبەری خوداﷺ دابەزێت..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هاتەوە سەر حاڵەتی ئاسایی خۆی، پێدەکەنی، پاشان عەرەقی ناوچەوانی سڕی‌و یەکەم وشەیەك کە وتی ئەوەبوو فەرمووی: عائیشە موژدە بێت، پەروەردگار ئایەتی دەربارەی بێتاوانیت دابەزاند.. منیش وتم: سوپاس بۆ خودا.. پەروەردگاریش ئەم ئایەتە پیرۆزانەی لە بارەی منەوە دابەزاند، کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾﴾ النور. واتە: (بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان (یاخود وا خۆیان نیشان دەدا کە لە خۆتانن) وا مەزانن کە ئەو بوختانە شەڕو خراپ بوو بۆتان، بەڵکو خێر بوو بۆتان (تا ئیماندار لە دووڕوو جیابێتەوەو ئیماندارانی دڵپاك وریا ببنەوە)، بێگومان تاوانی هەر کەس لەو بوختانچیانە لە گەردنی خۆیدایەتی، ئەو کەسەش سەرۆك‌و گەورەو هەڵبەستی بوختانەکەیە، سزایەکی سەخت‌و گەورە بۆی ئامادەیە* دەبووا هەر کە ئەو بوختانەتان بیست ئیمانداران لە پیاوان‌و ئافرەتان گومانی چاکیان بە خۆیان ببووایەو دڵنیابوونایە لە پاکی خۆیان‌و بیانوتایە ئەمە بوختانێکی ئاشکرایەو (کاری نارەوای وا لە دایکی موسڵمانان‌و لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ناوەشێتەوە)* دەبووا بوختانچییەکان چوار شایەتیان بۆ سەلماندنی بوختانەکەیان بهێنایە، کاتێك چوار شایەتیان نەهێنا، ئەوە ئیتر دیارە ئەوانە لای خوایش لە ڕیزی درۆزنەکاندان)..

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾﴾ النور. واتە: (بە ڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زیناو تاوان لە ناو ئەوانەدا، کە باوەڕیان هێناوە بڵاوببێتەوە، سزای پڕ ئێش‌و ئازار لەم جیهان‌و لەو جیهان بۆیان ئامادەیە‌و خودا خۆی

چاك دەزانێت (سەرەنجامی زیناو شەرواڵپیسی بەرەو كوێ دەچێت) ئێوە نایزانن)..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ چووە دەرەوە بۆ لای خەڵكی‌و وتاری بۆدان‌و ئەو ئایەتە پیرۆزانەی بۆ خوێندنەوە، كە سەبارەت بەو ڕووداوە هەڵبەستراوە دابەزی بوون، پاشان هەستا بە جێبەجێ كردنی سزا بە سەر هەموو ئەو كەسانەی كە بوختانەكەیان هەڵبەستبوو..

كەواتە پێویستە وەكو نەخۆشێك كە چۆن پێویستی بە چارەسەر هەیە، ئاوا هەڵسوكەوت لەگەڵ كەسێكدا بكەین، كە هەڵەیەكی ئەنجامداوەو هەڵەكەی لە سەر گەورە نەكەین، بۆ ئەوەی ئەو هەست‌و گومانەی بۆ دروست نەبێت، كە ئێمە بەو هەڵەیەی ئەو خۆشحاڵین.. كەسانی ئامۆژگاریكاری دڵسۆزیش ئەو كەسانەن، كە لە بایەخی خودی نەخۆشەكان بۆ خۆیان، زیاتر بایەخیان پێدەدەن‌و هەڵەكانیان بە هەڵەی خۆیان دەزانن..

پێغەمبەری خوداشﷺ دەفەرموێت: نمونەی من‌و نمونەی خەڵكی وەكو نمونەی پیاوێك وایە كە لە سەر لێواری ئاگرێك وەستا بێت، كاتێك ئاگرەكە دەوروبەری خۆی ڕوناك دەكاتەوەو پەپولەو زیندەوەرانیش بەرەو ئاگرەكە دەچن‌و پیاوەكەش هەوڵ دەدات نەیەڵێت بچنە ئاگرەكەوە، بەڵام ئەوان هەر خۆیانی تێدەكەن، منیش دەمەوێت ئێوە نەكەونە ناو ئاگرەوە، بەڵام ئێوە هەر خۆتانی تێدەكەن..

**ڕاو بۆچوون..**

جاری وا هەیە ئەو ڕێگەیەی كە دەمانەوێت هەڵسوكەوتی لەگەڵ هەڵەكاندا پێبكەین، زۆر گەورەترو هەڵەترە لە خودی هەڵەكە..

# ڕاو بۆچوونێکی تر..

هەر وەك چۆن سروشتو شێوازی خەڵکی لەگەڵ یەکتردا جیاوازن، بە هەمان شێوە لە ڕاو بۆچوونەکانیشیاندا جیاوازن.. کاتێك کەسێك هەڵەیەك دەکاتو تۆش ئامۆژگاری دەکەیت، بەڵام کاتێك ئامۆژگاریەکانت وەرناگرێت، بە دوژمنی خۆتی مەزانەو بە ئاسایی وەری بگرە..

هەروەها کاتێك دەتەوێت ئامۆژگاری هاوڕێیەکت بکەیت، بەڵام بە گوێت ناکات، هاوڕێیەتیەکەت مەگۆڕە بە دوژمنایەتی، بەڵکو بەردەوام بە سۆزو میهرەبان بە لەگەڵیدا، چونکە هەر هیچ نەبێت، ئەگەر لە سەر هەڵەکەشی بەردەوام بێت، لەوانەیە بە هۆی تۆوە هەڵەکەی زیاتر نەکات.. وتراویشە: هەندێك شەڕ لە هەندێکیان ئاسانترو سوکترن.. ئەگەر بە دەروونێکی پشوو درێژەوە، لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوتو مامەڵە بکەیتو لە سەر هەموو شتێکی گەورەو بچوك تووڕە نەبیتو هەڵنەچیت، ئەوا بە بەختەوەریو ئاسوودەیی ژیان بەسەردەبەیت..

عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: هەرگیز پێغەمبەری خودا ﷺ لەبەر خاتری خۆی، تۆڵەی لە هیچ کەسێك نەسەندۆتەوە.. هەرگیزیش بە دەستەکانی لە هیچ شتێکی نەداوە، نە لە ئافرەت، نە لە کارگوزار، تەنها مەگەر تۆڵەسەندنەوەکە لە پێناوی خودای پەروەردگاردا بوو بێت، یان کاتێك کە سووکایەتی بە سنورێك لە سنورەکانی پەروەردگار بکرایە، ئەوسا هەوڵی تۆڵەسەندنەوەی دەدا.. کەواتە: پێغەمبەری خودا ﷺ تووڕە دەبوو، بەڵام تووڕە بوونەکەی لە پێناوی خوادا بوو، نەك لەبەر بەرژەوەندی خۆی..

با لە دوو جۆر تووڕەیی تێبگەین.. گریمان یەکێك لە منداڵەکانت، بەیانیەك داوای دوو سەدو پەنجا، یان پێنج سەد دینارت لێدەکات، بۆ ئەوەی لە قوتابخانە خەرجی بکات، کاتێك جزدانەکەت دەگەڕێیت، جگە لە بیستو پێنج هەزاری، پارەی ترت پێنابێت، هەر بۆیە بیستو پێنج هەزاریەکی دەدەیتێو پێی دەڵێیت: پێنج سەد دیناری لێ خەرج بکەو ئەوەی تریم بۆ بگێڕەوەو چەند جارێکیش لێی دوبارە دەکەیتەوە.. کاتێکیش نیوەڕۆ لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە، بۆت دەردەکەوێت هەموو پارەکەی خەرج کردووە..

ئایا چی دەکەیت؟! تووڕە نابیت؟! بە دڵنیاییەوە لێی دەدەیتو چەند ڕۆژێکیش خەرجی نادەیتێ..

بەڵام ئەگەر ڕۆژێك لە دوای نوێژی عەسر بگەڕێیتەوە بۆماڵەوەو منداڵەکەت ببینیت، لە جیاتی چوونی بۆ مزگەوت، یاری بە کۆمپیوتەرەکەی دەکات، یان سەیری تەلەفزیۆن دەکات، ئایا بە هەمان شێوەی پێشوو تووڕە دەبیت‌و لێی دەدەیت؟!

بێگومان نەخێر.. بە دڵنیاییەوە تووڕە بوونی یەکەمت، بەهێزترو توندوتیژتر دەبێت، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ لە پێناوی خوادا تووڕە دەبوو.. زۆر جار ئامۆژگاری خەڵکی دەکردو لێشیان وەرنەدەگرت، کارەکەشی بە ئاسایی وەردەگرت، لەبەر ئەوەی دڵنیا بوو تەنها پەروەردگار ڕێنمایی بەندەکانی دەکات.. هەر بۆیە مەرج نیە، ئامۆژگاری هەر کەسێك بکەیت، لێت وەربگرێت‌و بە گوێت بکات..

پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانی بۆ جەنگی ڕۆمەکان، بەرەو تەبوك لە سەر سنوری شام کەوتنە ڕێ، کاتێك لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمەکان نزیك بوونەوە، پێغەمبەری خوداﷺ بە دوحیەی کەلبیدا نامەیەکی نارد بۆ هیرقلی پادشای ڕۆمەکان.. نوێنەرەکەی پێغەمبەری خوداﷺ گەیشتە لای هیرقل‌و نامەکەی پێغەمبەری خوداﷺ دایە، کاتێك هیرقل نامەکەی بینی‌و خوێندیەوە، بانگی قەسیس‌و بەتریکەکانی ڕۆمی کرد، پاشان دەرگای داخست‌و وتی: ئەو پیاوەی نامەکەی ناردووە، داوای یەکێك لەم سێ شتەمان لێدەکات:

١- یان ئەوەتا شوێنی کەوین‌و بچینە سەر ئاینەکەی..

٢- یان پارەو ماڵێکی بدەینێ‌و لە سەر زەوی‌و وڵاتی خۆمان بژین..

٣- یان ئەوەتا جەنگی لەگەڵ بکەین..

پاشان هیرقل وتی: سوێند بە خودا دەست بە سەر وڵات‌و زەوی‌و زارماندا دەگرێت، دەی با شوێن ئاینەکەی بکەوین‌و باوەڕی پێ بهێنین، یان پارەو سامانێکی بدەینێ‌و لە سەر خاکی خۆمان درێژە بە ژیان بدەین..

کاتێك ئامادەبووان گوێیان لەم قسانە بوو، کردیان بە نەڕەنەڕو هاوار هاوارو وتیان: داوامان لێدەکەیت واز لە ئاینەکەمان بهێنین؟! یان دەتەوێت ببین بە بەندەی دەشتەکیەکی حیجازی؟!

هیرقل کاتێك زانی بە گوێی ناکەن‌و ئەو کەسانەش، خەڵکێکی زۆریان لە پشتەو ئەگەر لێی هەڵگەڕێنەوە، بارودۆخی ئیمپراتۆریەتەکەی تێکدەچێت، هەر بۆیە هێوری کردنەوەو وتی: ئەو قسانەم بۆ تاقیکردنەوەی ئێوە کرد، بۆ ئەوەی بزانم تا چ ڕادەیەك پابەندی ئاینەکەتانن..

هیرقل دەیزانی محمدﷺ ئەو پێغەمبەرەیە، کە عیساعليه السلام موژدەی هاتنی داوە، بەڵام بە

داخەوە داروودەستەکەی بە گوێیان نەکرد، بۆ ئەوەی موسڵمان بوونی خۆی ڕابگەیەنێت.. هیرقل داوای پیاوێکی گاوری عەرەبی کرد، بۆ ئەوەی وەڵامی نامەکەی پێغەمبەری خوداﷺ پیا بنێرێتەوەو داوای لێکردو وتی: کاتێك گوێت لە قسەی ئەو پیاوە دەبێتو دەیبینیت، ڕەچاوی ئەم سێ خاڵە بکە:

١. کاتێك قسە دەکات، بزانە باسی ئەو نامەیە دەکات، کە بۆ منی نارد بوو؟!

٢. کاتێك کە نامەکەم دەخوێنێتەوە، بزانە باسی وشەی شەو دەکات؟!

٣. سەیری پشتی بکەو بزانە هیچ شتێك بە پشتیەوە هەیە، کە بتخاتە گومانو دوودڵیەوە؟! (مەبەست لە مۆری پێغەمبەرایەتیە)..

نوێنەرەکەی هیرقل لە شامەوە دەکەوێتە ڕێ، تا دەگاتە تەبوكو هەواڵی پێغەمبەری خوداﷺ دەپرسێتو هاوەڵانیش نیشانی دەدەن.. دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و نامەکەی دەداتێ.. پێغەمبەری خوداﷺ حەز دەکات ئەم پیاوە موسڵمان بێتو باوەڕ بهێنێت، بەڵام پیاوەکە دەمارگیری بۆ ئاینەکەی خۆی دەبێتو دەڵێت: من نوێنەری گەلەکەمم، خاوەن ئاینیشم، لە ئاینەکەشم لانادەم، هەتا نەگەڕێمەوە بۆ لای گەلو نەتەوەکەم..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئەم دەمارگیریەی لەو پیاوە بینی، هیچ تووڕە نەبوو، هیچ کێشەیەکی دروست نەکرد، بەڵکو پێکەنیو ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە، کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ القصص.

واتە: (بە ڕاستی ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ ناتوانیت ئیمانو باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو خودا هەر کەسێکی بووێت، دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاستو ئیمانی پێدەبەخشێت، خودایش ئاگادارە بەوانەی کە ڕێبازی هیدایەتیان گرتۆتە بەر)..

پاشان فەرمووی: نامەو پەیامم بۆ هەندێك لە پادشاکان ناردووەو دڕاندوویانە، سوێند بە خودا پەروەردگار ئەو پادشایانەو دەسەڵاتەکەشیان پارچە پارچە دەکات، نامەو پەیامیشم نارد بۆ پادشاکەی تۆ، وەریگرتو نەیدڕاند، لەبەر ئەوەی نامەکەی نەدڕاندم، هەتا ماوە خەڵکی بەڕێزەوە سەیری دەکەنو لە خێرو خۆشیشدا دەبێت..

لێرەدا نوێنەرەکە، ڕاسپاردەکەی هیرقلی بیرکەوتەوەو لە دڵی خۆیدا وتی: ئەمە یەکێکە لەو سێ ڕاسپاردەیە، کە هیرقل پێی وتبوو ڕەچاوی بکە، لە ترسی ئەوەی نەوەکو بیری بچێتەوە، تیرێکی دەرهێناو لە تەنیشت شمشێرەکەی ئەو ڕاسپاردەیەی نوسی..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ نامەکەی دا بە دەست پیاوێکی دەستە چەپیو نوێنەرەکە وتی: ئەوە کێیە نامەکەت بۆ دەخوێنێتەوە؟ وتیان: معاویەیە.. معاویەﷺ دەستی بە خوێندنەوەی

نامەکە کردو هیرقل لە نامەکەدا وتبووی: تۆ بانگمان دەکەیت بۆ بەهەشتێك، کە فراوانی ئەو بەهەشتە هێندەی فراوانی ئاسمانەکانو زەوی دەبێتو بۆ چاکەکارانو لە خودا ترسانیش ئامادەکراوە!! ئەی دۆزەخو ئاگر لە کوێنو چیان لێدێت؟! پێغەمبەری خوداﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: پاکیو بێگەردی بۆ خودا!! کاتێك خۆر هەڵدێتو ڕۆژ دەبێتەوە، شەوو تاریکی چیان لێدێت؟!

نوێنەرەکە خاڵی دووەمیشی بۆ دەرکەوت، دوبارە تیرێکی لە تورەکەکەی دەرهێناو لە سەر بەرگی شمشێرەکەی نوسی.. کاتێك معاویەﷺ لە خوێندنەوەی نامەکە بۆوە، پێغەمبەری خوداﷺ ئاوڕی بۆ لای نوێنەرەکە دایەوە، لە کاتێکدا کە ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەریشیﷺ وەرنەگرتو ئامادەش نەبوو باوەڕ بهێنێت، زۆر بە نەرمی فەرمووی: تۆ لەبەر ئەوەی نوێنەریت، مافت هەیە، ئەگەر شتێکم شك ببردایە، وەکو پاداشتێك پێشکەشم دەکردی، بەڵام ئێمە ڕێبوارینو وا دەبینی لە سەر ئەم لی بیابانە دانیشتووین!! ئیمامی عوسمانﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من دیاری پێشکەش دەکەمو پاداشتی دەدەمێو هەندێك جلوبەرگی دا بە پیاوەکە..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: کێ میوانداری ئەم پیاوە دەکات؟ گەنجێکی خەڵکی شاری مەدینە وتی: من.. گەنجەکەو پیاوەکە هەستانو کەوتنە ڕێ، بەڵام پیاوەکە هەر خەیاڵی لە لای خاڵی سێیەم بوو، چونکە ڕاسپاردەی هیرقل بوو، ئەویش مۆری پێغەمبەرایەتی بوو، لە نێوان شانیدا.. نوێنەرەکە چەند هەنگاوێك ڕۆی، لەپڕ پێغەمبەری خوداﷺ بانگی کردو فەرمووی: وەرە!! کاتێك پیاوەکە بە خێرایی گەڕایەوەو لەبەردەم پێغەمبەری خواداﷺ وەستا.. ئەو پارچە جلوبەگەی پێغەمبەری خوداﷺ دابووی بە شانیدا بەربۆوەو کەوتە خوارێو پشتی پیرۆزی دەرکەوت.. پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك پشتی دەرکەوتو جلەکانی کەوتنە خوارەوە، فەرمووی: لێرەوە دەست بەو کارە بکە، کە ڕایان سپاردوی، نوێنەرەکەی هیرقل دەڵێت: سەیری پشتیم کرد، لە نزیك ناو شانیەوە، مۆرێکم بە پشتیەوە بینی، هەر وەك چۆن، کەسێك کەڵەشاخیان لە پشتی بۆ گرت بێت!!

**بۆچوون..**

مەبەست ئەوەیە کە خەڵکی هەست بە هەڵەکانیان بکەن، بەڵام مەرج نیە لە بەرامبەری تۆدا هەڵەکانیان ڕاست بکەنەوە.. کەواتە: تووڕە مەبە..

# وەڵامی خراپە بە چاکە بدەرەوە..

زۆرجار کاتێك خەڵکی هەڵسوکەوتت لەگەڵ دەکەن‌و بەو شێوەیە مامەڵەت لەگەڵ دەکەن، کە خۆیان دەیانەوێت، نەك بەو شێوەیەی کە تۆ دەتەوێت.. کاتێك بە ڕوخسارێکی گەشاوەو لێوێکی بە خەندەوە، پێشوازی لە کەسێك دەکەیت، مەرج نیە ئەویش بە هەمان شێوە پێشوازی لە تۆ بکات، بەڵکو هەندێك جار تووڕەش دەبێت‌و گومانی خراپیشت پێدەبات‌و دەڵێت: بۆچی پێدەکەنیت؟!

کاتێك دیارییەك پێشکەشی کەسێك دەکەیت، مەرج نیە ئەویش دیاریت پێشکەش بکات.. کەسی وا هەیە، کاتێك دیاریەکی پێشکەش دەکەیت، لە باتی سوپاس کردن، لە ناو خەڵکیدا بە نەزان‌و گێل باست دەکات‌و دەڵێت: چەند نەفامەو ماڵ‌و سامانی خۆی، چۆن‌و لە چیدا بەفیڕۆ دەدات؟! کاتێك سوپاسی کەسێك دەکەیت، یان هانی دەدەیت، مەرج نیە ئەویش هەمان مامەڵە لەگەڵ تۆدا بکات، لەبەر ئەوەی پەروەردگار چۆن ڕزق‌و ڕۆزی دابەش کردووە، ئاواش ئاکارو ڕەوشتە جوانەکانی دابەش کردووە.. پەیام‌و پەیڕەوی پەروەردگاریش، بریتیە لە: ﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ فصلت. واتە: (بێگومان چاکەو خراپە وەك یەك نین، (تۆ ئەی باوەڕدار) بە جوانترین‌و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپەو نادروستی بکە، ئەو کاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی کە لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی‌و ساردیەك هەیە، دەبێتە دۆستێکی دڵسۆزو گیانی بە گیانی).. هەندێك لە خەڵکی چارەسەریان ئاسان نیەو چاکسازییان تێدا ناکرێت، کاتێك هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەیت، یان دەبێت ئارام بگریت، یان دەبێت لێیان دوورکەویتەوەو وازیان لێ بهێنیت..

دەگێڕنەوە پیاوێك بە ناوی ئەشعەب، لەگەڵ بازرگانێکدا دەچێت بۆ گەشتێك.. بازرگانەکە هەموو ئیش‌و کارەکان ئەنجام دەدات، خۆی ئاژەڵەکان ئاو دەدات، هەر خۆشی کەل‌وپەلەکان دادەگرێت، هەتا وای لێدێت بە تەواوی ماندوو دەبێت.. کاتێك دەگەڕێنەوە، لە ڕێگە لادەدەن بۆ ئەوەی نان بخۆن.. کە دادەبەزن، ئەشعەب

یەکسەر لە سەر زەویەکە خۆی درێژ دەکات‌و لێی رادەکشێت، بازرگانەکەش جێگە رادەخات‌و کەل‌وپەلەکان دادەگرێت، پاشان روو دەکاتە ئەشعەب‌و دەڵێت: هەستە هەندێك داروچیلکە کۆ بکەرەوە، منیش گۆشتەکە پارچە پارچە دەکەم..

ئەشعەبیش دەڵێت: بە هۆی دوورو درێژی رێگەوە، بە راستی ماندووم!! بازرگانەکە هەڵدەستێت‌و داروچیلکەش کۆ دەکاتەوەو دەڵێت: ئەی ئەشعەب هەستە ئاگر بکەرەوە..

ئەشعەب لە وەڵامدا دەڵێت: ئەگەر نزیك ئاگر ببمەوە دوکەڵ‌و تەپ‌و تۆزەکەی ئازارم دەدەن!! بازرگانەکە ئاگرەکەش دەکاتەوەو دەڵێت: دەی باشە وەرە لە وردکردنی گۆشتەکەدا یارمەتیم بدە..

ئەشعەب دەڵێت: دەترسم چەقۆکە دەستم ببرێت‌و ئازارم بدات.. پاشان بازرگانەکە دەڵێت: ئەشعەب دەی هەستە گۆشتەکە بکەرە مەنجەڵەکەوەو بیکوڵێنە..

ئەشعەب ئەمجارەشیان بیانوو دەهێنێتەوەو دەڵێت: زۆر چاوەڕێ کردنی خواردنەکە تا دەکوڵێت‌و پێدەگات، ئازارو نارەحەتم دەکات.. بازرگانەکە هەڵدەستێت فوو لە ئاگرەکە دەکات‌و گۆشتەکەش دەکوڵێنێت‌و زۆر زۆر ماندوو دەبێت، پاشان دادەنیشێت‌و دەڵێت: ئەشعەب هەستە سفرەو خوانەکە حازر بکە..

ئەشعەبیش دەڵێت: جەستەم زۆر قورس‌و گرانەو توانای ئەو کارەم نیە!! بازرگانەکە هەڵدەستێت‌و خواردنەکە ئامادە دەکات‌و دەڵێت: ئەشعەب مادام هەستە لە خواردنەکەدا هاوکاریم بکە..

ئەشعەبیش دەڵێت: ئەوەندە بیانووم هێنایەوەو بە گوێم نەکردی، شەرم دەکەم لە خواردنەکەشدا بە گوێت نەکەم، هەر بۆیە هەستاو دەستی کرد بە خواردن..

لە ژیاندا لەوانەیە تووشی کەسانی وەك ئەشعەب ببیت، بەڵام دڵتەنگ‌و غەمبار مەبەو بە هاوشێوەی چیاو شاخەکان خۆڕاگربە..

پێغەمبەری خوداﷺ بە ژیری لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوتی دەکرد، نەك بە هۆی بەزەیی‌و سۆزەوە، لە سەر هەڵەی خەڵکیش ئارامی دەگرت‌و نەرم‌و نیان دەبوو لەگەڵیان..

بڕوانە، ئەوا پێغەمبەری خوداﷺ لە ناو هاوەڵانیدا دانیشتووەو پیاوێکی دەشتەکی دێت‌و داوای یارمەتی دەکات، بۆ ئەوەی بیدات بە خوێنبایی، لەبەر

ئەوەی ئەم پیاوە، یان یەکێك لە کەس‌وکارەکەی کەسێکیان کوشت بوو.. پێغەمبەری خوداش ﷺ یارمەتی دەدات، پاشان پێی دەفەرموێت: چاکەم لەگەڵ کردی؟

پیاوە دەشتەکیەکەش لە وەڵامدا دەڵێت: نەخێر.. نەخێر.. هیچ چاکەت لەگەڵ نەکردم.. هاوەڵان هەندێکیان تووڕە بوون‌و ویستیان هەستن ئازاری بدەن، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ ئاماژەی بۆ کردن، کە وازی لێ بهێنن.. پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ هەستاو ڕۆیشتەوە بۆماڵەوەو پیاوە دەشتەکیەکەشی لەگەڵ خۆی بردو فەرمووی: تۆ هاتیت بۆ لامان، داوای یارمەتیت کرد، ئێمەش یارمەتیمان دایت، کە چی ئەوەی وتت، کە وتت!! پاشان هەندێك شتی تری پێداو ئەمجارەشیان فەرمووی: چاکەم لەگەڵ کردی؟

پیاوە دەشتەکیەکە، ئەمجارەیان وتی: بەڵێ.. چاکەت لەگەڵ کردم‌و خودا پاداشتت بداتەوە.. پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك گوێی لە ڕەزامەندی پیاوەکە دەبێت، سەرسام دەبێت!! پێغەمبەری خودا ﷺ حەزی کرد ئەو شتەی لە دڵی هاوەڵانیدا دروست بوو نەیهێڵێت، نەوەکو یەکێکیان لە شوێنێك یان لە ڕێگەیەك بەو پیاوە بگەن‌و ئازاری بدەن، هەر بۆیە بە پیاوەکەی فەرموو: نەوەکو لە دڵی هاوەڵانمدا شتێك دروست بوو بێت، لە لای من چیت وت، لە لای ئەوانیش دوبارەی بکەرەوە، بۆ ئەوەی هیچیان لە دڵدا نەمێنێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ و پیاوەکە چوونەوە بۆ لای هاوەڵان‌و پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە داوای لێکردین‌و بەشماندا، بەڵام لێمان ڕازی نەبوو، ئەوەشی وت، کە وتی، جارێکی تریش بەشمانداو ئێستا وا دەریدەخات، کە ڕازی بووە، پاشان رووی کردە پیاوەکەو فەرمووی: وانیە؟!

پیاوە دەشتەکیەکە وتی: بەڵێ.. وایەو خودا پاداشتی خێرت بداتەوە.. کاتێك پیاوەکە ڕۆی، پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی وانەیەك لە بە دەست هێنانی دڵی خەڵکی، فێری هاوەڵانی بکات، هەر بۆیە فەرمووی: نمونەی من‌و نمونەی ئەو پیاوە دەشتەکیە، وەکو پیاوێك وایە، کە وشترەکەی بەربوو بێت.. خەڵکیش بۆ ئەوەی بیگرنەوە، هەموو شوێنی بکەون‌و وشترەکەش زیاتر ڕا بکات‌و بترسێت.. خاوەن وشترەکەش بڵێت: واز لە من‌و وشترەکەم بهێنن، خۆم دەزانم چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەم‌و هەر خۆشم چاکی دەناسم.. پاشان پیاوەکە هەندێك گژوگیا دەهێنێت‌و

بەرەو لای وشترەکەی دەڕوات‌و بانگی دەکات، هەتا دەیگرێت‌و ڕێشمەو لغاوەکەی دەکاتەوە ملی..

خۆ ئەگەر لە سەر قسەکانی ئەو پیاوە بە گوێی ئێوەم بکردایەو وازم لێ بهێنایەو دەرم بکردایە، لەوانیە لە ئاینی ئیسلام هەڵبگەڕایەتەوەو بە بێباوەڕی بمردایەو بچووایەتە دۆزەخەوە..

نەرم‌و نیانی لە هەر شتێکدا هەبێت، بە دڵنیاییەوە جوانی دەکات، هەر شتێکیش نەرم‌و نیانی تیادا نەما، بە دڵنیاییەوە ناشیرین‌و ناحەز دەبێت.. ﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ فصلت. واتە: (بێگومان چاکەو خراپە وەك یەك نین، (تۆ ئەی باوەڕدار) بە جوانترین‌و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپەو نادروستی بکە، ئەو کاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی کە لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی‌و ساردیەك هەیە، دەبێتە دۆستێکی دڵسۆزو گیانی بە گیانی)..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ شاری مەککەی لە بتپەرستی ڕزگار کرد، بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا دەسوڕایەوە، پیاوێکیش بە ناوی فوزالەی کوڕی عومەیر، کە بە ڕووکەش خۆی بە موسڵمان نیشان دەدا، لە دوای پێغەمبەری خوداوەﷺ دەسوڕایەوەو بۆ هەلێك دەگەڕا، تا پێغەمبەری خوداﷺ بکوژێت!! کاتێك نزیك بۆوە، پێغەمبەر خوداﷺ لە مەبەستەکەی تێگەیشت‌و فەرمووی: تۆ فوزالەیت؟!

ئەویش وتی: بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: لە دڵی خۆتدا چیت دەوت؟!

ئەویش دەڵێت: هیچ.. بەڵکو زیکرو یادی خودام دەکرد!! پێغەمبەری خوداﷺ پێکەنی‌و فەرمووی: أستغفر الله..

فوزالە دەڵێت: پاشان پێغەمبەری خوداﷺ دەستی خستە سەر سنگم‌و دڵ‌و دەروونم ئارام بۆوە، سوێند بە خودا هێشتا دەستی لە سەر سنگم لانەبرد بوو، هەتا وام لێهات پێغەمبەری خودامﷺ لە هەموو دروستکراوەکانی خودا، لە لا خۆشەویستر‌و شیرینتر بوو.. لە دوای ئەم ڕووداوەوە، فوزالە بوو بە یەکێك لە هەرە پیاوچاکەکان..

پێغەمبەری خوداﷺ بە لێبوردن‌و لێخۆشبوون، دڵ‌و دەروونی خەڵکی بە دەست

دەهێنا، نەك بە ڕقو تۆڵەسەندنەوە.. لە سەر ئازارو نارەحەتیەكانیان ئارامی دەگرت، بۆ ئەوەی كاریگەرییان لە سەر دروست بكاتو بەرەو ڕوناكیو خێرو چاكە ڕێنماییان بكات..

ئەبوتالیبی مامەی پێغەمبەری خوداﷺ هەتا لە ژیاندا مابوو، زۆر ئازارو نارەحەتی لە پێغەمبەری خوداﷺ دوور دەخستەوە، بەڵام كاتێك كۆچی دوایی كرد، بێباوەڕانی قورەیش تەنگیان بە پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانی هەڵچنیو زۆر نارەحەتیان كردن.. هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ بیری لە شوێنێك دەكردەوە، پەنای بۆ بەرێت، بۆ ئەوەی هاوەڵانی كۆچی بۆ بكەن..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ئەوەی شوێنو جێگەیەك بۆ موسڵمانان بدۆزێتەوە، بەرەو شاری طائف كەوتە ڕێ، نەك هەر بە دەم بانگەوازەكەیەوە نەهاتن، بەڵكو شێتو منداڵانی ناوچەكەیان كۆكردەوەو كەوتنە بەردباران كردنی پێغەمبەری خوداﷺ و قاچە پیرۆزەكانیان بریندار كردو زۆر ئازاری چەشت، لە كاتێكدا پێغەمبەری خوداﷺ تەمەنی لە چل ساڵی تێپەڕی بوو..

پێغەمبەری خوداﷺ بە هەر شێوەیەك بێت دووركەوتەوەو ڕۆیشت، لە ژێر سێبەری دارخورمایەكدا دانیشت، بۆ ئەوەی پشوویەك بدات.. بیری دەكردەوەو لە دڵی خۆیدا دەیفەرموو: قورەیش دەریان كردم، ئێستا چۆن بچمەوە ناویان..؟! چۆن بتوانم بچمەوە بۆ شاری مەككە..؟! ئا لەم كاتەدا سەیرێكی ئاسمانی كردو بە كوڵو بە دڵ فەرمووی: أللهم إليك أشكو ضعف قوتي.. وقلة حيلتي.. وهوان على الناس.. ياأرحم الراحمين.. أنت رب المستضعفين.. وأنت ربي.. إلى من تكلني؟! إلى بعيد يتجهمُني؟! أم إلى عدوٍ ملكته أمري؟! إن لم يكن بك غضب عليَّ فلا أبالي.. ولكن عافيتك هي أوسع لي.. أعوذ بنور وجهك الذي أشرقت له الظلمات.. وصلح عليه أمر الدنيا والأخرة.. من أن تنزل بأي غضبك.. أو تحل عليَّ سخطك.. لك العتبى حتى ترضى.. ولاحول ولا قوة إلا بك..

واتە: خودایە سكاڵای بێهێزیو بێدەسەڵاتیم بۆ لای تۆ دێنم، خەڵكی بە بێتواناو بێپەنا سەیرم دەكەن.. ئەی لە هەموو خاوەن سۆزو بەزەییەكان، بەسۆزو بەبەزەیی تر.. تۆ پەروەردگاری لاوازو بێنەواو بێپەنایانی.. پەروەردگاری گەورەو خۆشەویستی منی.. دەمدەیتە دەستی كێ، ئەی پەروەردگار؟! دەمدەیتە دەست دوورێك، كە ڕووم

لێوەرچەرخێنیّ.. یان دەمدەیتە دەست دوژمنێك، كە كاری منی بە دەست بێت؟! ئەگەر لێم زیزو تورە نەبیت، من هیچ بەلامەوە گرنگ نیە!! بەڵام سۆزو بەزەیی تۆ، زۆر فراوانترە بۆ من.. بە روناكی تۆ، پەنا دەگرم لە هەموو تاریكیەكان.. پەنات پێدەگرم لە تورەییت، لێت دەپاڕێمەوەو سكالآت لەلا دەكەم، هەتا لێم رازی دەبیت، جگەلە تۆش هیچ پەناو هێزێك شك نابەم، ئەی پەروەردگارم..

كاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئەم رازو نیازەی لەگەڵ پەروەردگاریدا دەكرد، لەپڕ هەورێك هاتو سێبەری بۆ پێغەمبەری خوداﷺ كرد، هەورەكە جوبرائیلیشی لەگەڵدا بوو، جوبرائیل بانگی پێغەمبەری خودایﷺ كردو فەرمووی: ئەی محمد.. پەروەردگار وەڵامی ئەو خەڵكەی بیستو ئاگای لێبوو چیان لێكردی، ئەوا فریشتەی كێوەكانی بۆ ناردووی، چ فەرمانێكی پێدەدەی با بۆت جێبەجێ بكات..

پێش ئەوەی پێغەمبەری خوداﷺ هیچ وەڵامێك بداتەوە، فریشتەی كێوەكان بانگی كردو فەرمووی: سڵاوی خودات لێبێت ئەی پێغەمبەری خودا.. سڵاوی خودات لێبێت ئەی محمد.. پەروەردگار وەڵامی گەلو هۆزەكەتی بیست، من فریشتەی بەرپرسی هەموو كێوەكانم، پەروەردگار منی بۆ لای تۆ ناردووەو فەرمانت بە چیە؟! پاشان فریشتەكە فەرمووی: ئەگەر دەتەوێت هەموویان دەخەمە نێوان ئەو دوو شاخەوەو دەیان هاڕمو لەناویان دەبەم..؟! فریشتەكە چاوەڕێی وەڵام بوو، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەی نەبوو، بەڵكو فەرمووی: نەخێر.. هیوادارم، پەروەردگار لە نەوەو پشتی ئەو كەسانە، خەڵكانێك بێنێتە دونیاوە، كە خودا بپەرستنو هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن..

پەروەردگار دەفەرموێت..

﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ (٣٤) ﴾ فصلت.

# ڕازی بکە، بەوەی کە هەڵەیە، بۆ ئەوەی ئامۆژگاریەکانت وەربگرێت..

هەندێك کەس بەردەوام خەریکی دەربڕینی تێبینیو ڕێنماییو وابکەو وامەڕۆی خەڵکیە، هەتا وایان لێدەکات، هەست بە بێهیوایی دەکەن، بە تایبەت ئەگەر ئەو ڕاو بۆچوونو تێبینیانە، تەنها لە سەر بنەمای ویستو ئارەزووی تاکەکەسی کەسی ئامۆژگاریکار بێتو بەس..

کاتێك لە میوانداریيەکدا، کۆمەڵێك میوان بانگ دەکەیت، خۆتو ماڵو منداڵیشت زۆر ئەرکو ماندووبوون دەکێشنو هیلاك دەبن، بەڵام کەسێك کە خۆی بە ئامۆژگاریکار دەزانێت، دەیەوێت ڕاو بۆچوونەکانی خۆی بە سەر میوانەکاندا بسەپێنێتو بە ناوی ئەوانەوە دەری بڕێت، هەر بۆیە دەڵێت: براکەم بە ڕاستی میوانداریەکەت لە جێگەی خۆیدا نەبوو!! ماندووبوونەکەت بەفیڕۆچوو!! گومانم دەبرد، زۆر باشترو چاکتر میوانداری میوانەکانت بکەیت، بەڵام بە داخەوە!! تۆش دەڵێیت: بۆچی؟!

ئەویش دەڵێت: براکەم گۆشتەکە زۆر برژا بوو، من حەزم لە گۆشتی کوڵاوە!! زەڵاتەکەش ئەوەندەی ئاوی لیمۆ تێکرا بوو، ترش ببوو، هەر بۆیە من حەزم لێنەبوو!! شیرینیەکانیش تامیان خۆش نەبوو!! بە شێوەیەکی گشتی میوانەکانیش ڕازی نەبوون!! کەمێك خواردنیان خوارد، ئەویش تەنها لەبەر دڵی تۆ!!

بە دڵنیاییەوە ئەو کەسە لەبەر چاوت، ناحەزو ناشیرین دەبێتو بە هیچ شێوەیەکیش ئامۆژگاریەکانی وەرناگریت، لەبەر ئەوەی ڕەخنەو تێبینیەکانی لە سەر بنەمای بیرو بۆچوونو حەزی خۆیەتیو هیچیان لە جێگەی خۆیاندا نین!!

بە هەمان شێوە دەبینی کەسانێك دەیانەوێت بە ناوی ئامۆژگارییەوە، ڕاو بۆچوونی خۆیان لە بارەی چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵو چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هاوسەرو شێوازی دروست کردنی خانوو، هەروەها هەڵبژاردنی جۆری ئۆتۆمبیل، بە سەر کەسی بەرامبەردا بسەپێنن.. ئەگەر داوای ڕاو بۆچوونت لێکردن، ئەوا باشە، بەڵام با ئامۆژگاریت نەکەن، وەك ئەوەی ئامۆژگاری کەسێکی هەڵەکارو تاوانبار دەکەن..

پیاوێکی دەشتەکی لە ناو کۆمەڵێك پیاوچاکدا دادەنیشێتو باسەکەش دەربارەی چاکەکردن دەبێت لەگەڵ باوكو دایکدا.. پیاوە دەشتەکیەکەش گوێگر دەبێت، لەپڕ یەکێك لە دانیشتووان

ڕوودەکاتە پیاوە دەشتەکیەکەو دەڵێت: فلانە کەس: تۆ چۆن چاکە لەگەڵ دایکتدا دەکەیتو هەڵسوکەوتت لەگەڵیدا چۆنە؟

پیاوە دەشتەکیەکەش دەڵێت: زۆرباشم لەگەڵ دایکمدا، سوێند بە خودا هەرگیز بە قامچی لێم نەداوە!! واتە ئەگەر لێی بدەم، بە قامچی لێی نادەم، بەڵکو بە دەستو بە شتی تر لێی دەدەم!! ئەو هەژارە وا دەزانێت لە سەر ڕێگەی ڕاستو ڕەوانەو کارەکانی بێ هەڵەو بێ پەڵەن!! دەی ئەرمونیان بەو هەوڵبدە وای لێبکەیتو تێی بگەیەنە، کە کارەکەی هەڵەو تاوانە..

لە کاتی پێغەمبەری خوداﷺ ئافرەتێك هەبوو لە هۆزی بەنی مەخزوم، کەلوپەلی لە ئافرەتانی تر دەخواستو پاشان نکوڵی دەکردو نەیدەگێڕایەوە، هەتا وای لێهات فێری دزیش بوو، کاتێك باسەکەیان بردە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ، فەرمانی بڕینەوەی دەستی ئافرەتەکەیدا.. بە لای قورەیشەوە زۆر ناخۆش بوو، ئافرەتێك لە هەرە هۆزە گەورەکانیان لە سەر دزی دەستی ببڕێتەوە، هەر بۆیە ویستیان لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ وتوو وێژ بکەن، بۆ ئەوەی بڕیارەکەی بگۆڕێت..

هەر کەسێکیان دەست نیشان دەکرد، بۆ ئەوەی بینێرن بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، پەشیمان دەبوونەوە، هەتا ڕایان هەتا سەر ئەوەی، کە باشترین کەس بۆ ئەم کارە، ناردنی ئوسامەی کوڕی زەیدەرضي الله عنه، لەبەر ئەوەی لە لای پێغەمبەری خوداﷺ بە خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست ناسرا بوو..

ئوسامەرضي الله عنه خۆیی و باوکی لە ماڵی پێغەمبەری خوداﷺ گەورە ببوونو وەکو کوڕی ماڵەکەی لێهاتبوو.. هەر بۆیە دەستی بەقسەکانی کردو داوای کەمکردنەوەی بڕیارەکەی لە پێغەمبەری خوداﷺ کردو ڕوونی کردەوە کە ئەو ئافرەتە، لە ئافرەتە ناودارەکانی قورەیشە..

بەڵێ.. ئوسامەرضي الله عنه قسەی دەکردو پێغەمبەری خوداشﷺ گوێی دەگرت.. ئوسامەشرضي الله عنه بەردەوام هەوڵی دەدا پێغەمبەری خوداﷺ ڕازی بکاتو دەستی ئەو ئافرەتە نەبڕێت.. لە دوای تەواوبوونی قسەکانی، پێغەمبەری خوداﷺ سەیرێکی ئوسامەی کرد.. ئوسامە وتووێژی دەربارەی کارێك دەکرد، نەیدەزانی ئەو کارە نادروستو نارەوایە!!

پێغەمبەری خوداﷺ ڕوخساری گۆڕاو لە یەکەمین وشەدا، ویستی بۆی ڕوون بکاتەوە کە لە هەڵەدایەو فەرمووی: ئایا تکاو داواکاری ئەوەم لێدەکەیت، کە دەست لە سنورێك لە سنورەکانی پەروەردگار هەڵبگرم؟!

ئوسامەرضي الله عنه تێگەیشت کە پێغەمبەری خوداﷺ بۆچی وا تووڕە بوو.. هەڵەکەی خۆی بۆ ڕوون بۆوە، کە نەدەبوو قسە لە بڕیارێکدا بکات، کە پەروەردگار بڕیاری لە سەر دابێت، هەر

بۆیە بە خێرایی وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ داوای لێخۆشبوونم لە پەروەردگار بۆ بکە..

کاتێك شەو داهات، پێغەمبەری خوداﷺ هەستاو لە دوای سوپاس و ستایشی پەروەردگار، فەرمووی: گەل و نەتەوەکانی پێش ئێوە، بەوە لەناوچوون و فەوتان، کاتێك کەسێکی خاوەن پلەوپایەو ناوبانگ دزی بکردایە، وازیان لێدەهێناو سزایان نەدەدا، بەڵام کاتێك کەسێکی لاوازو بێدەسەڵات دزی بکردایە، سزایان دەدا.. سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر فاتمەی کچی محمد دزی بکات، دەستی دەبڕم.. پاشان فەرمانی داو دەستی ئافرەتەکەیان بڕی.. عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە دوای ئەم ڕووداوە، ئافرەتەکە گەڕایەوەو وازی لەو کارانەی هێناو پەشیمان بۆوە..

سەیرکەو بیربکەرەوە، ئەوەتا پێغەمبەری خوداﷺ سەرەتا هەوڵی ئەوەی دەدا، بە کەسی بەرامبەر بسەلمێنێت کە کارەکەی هەڵەیە، پاشان ئامۆژگاری دەکرد..

ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ لە ناو هاوەڵانیدا دانیشتبوو.. گەنجێك دێتە ژوورەوەو بەملاو لایدا دەڕوانێت، وەك ئەوەی بۆ کەسێك بگەڕێت، کاتێك چاوی بە پێغەمبەری خوداﷺ دەکەوێت، بەرەو ڕووی دەڕوات.. ئەوەی چاوەڕوانکراو بوو، ئەوە بوو کە ئەم گەنجە هاتووە بۆ ئەوەی گوێ بیستی وتەو ئامۆژگارییە بە نرخەکانی پێغەمبەری خوداﷺ بێت، بەڵام بە پێچەوانەوە بۆ ئەوە هاتبوو مۆڵەت لە پێغەمبەری خوداﷺ وەربگرێت..

مۆڵەت بۆ چ کارێك؟! بۆ فێربوونی زانست و زانیاری؟! نەخێر.. خۆزگە بۆ ئەوە بووایە!! ئەی بۆ تێکۆشان لە پێناوی خوداو ئەنجامدانی کاری چاکە هاتبوو؟! نەخێر..

دەزانی وتی چی؟! زۆر بە ڕاشکاوانە وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ مۆڵەتم بدە، بۆ ئەوەی زینا بکەم.. سەیرە!! ئاوا بە ئاسانی و بەڕاشکاوانە؟!

بەڵێ.. دەی مۆڵەتم بدە، بۆ ئەوەی زینا بکەم..

پێغەمبەری خوداﷺ سەیرێکی گەنجەکەی کرد، دەیتوانی بە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان، ئامۆژگاری بکات، هەروەها دەیتوانی وانەیەکی پێ بڵێت، باوەڕ لە دڵیدا دروست بکات و هەست و نەستی بلەرزێنێت، بەڵام شێوازێکی تری بەکارهێناو زۆر بە هێمنی فەرمووی: ئایا ڕازی دەبیت زینا لەگەڵ دایکتدا بکرێت؟! گەنجەکە شڵەژاو بیری کردەوەو پاشان وتی: نەخێر.. نەخێر.. پێم خۆش نیەو ڕازی نابم!! پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: دەی خەڵکیش پێیان خۆش نیە، زینا لەگەڵ دایکیاندا بکرێت..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئایا حەز دەکەیت زینا لەگەڵ خوشکتدا بکرێت؟! گەنجەکە بیری لە خوشکە پاك داوێنەکەی کردەوەو لە دڵی خۆیدا وتی: چۆن ڕازی دەبم زینا

لەگەڵ خوشکم بکرێت، هەر بۆیە بە خێرایی وەڵامی دایەوەو وتی: نەخێر.. هەرگیز ڕازی نابم!! دوبارە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەی خەڵکیش پێیان خۆش نیە، زینا لەگەڵ خوشکیاندا بکرێت..

پاشان فەرمووی: ئەی پێت خۆشە زینا لەگەڵ خوشکی دایكو باوکتدا بکرێت؟! گەنجەکەش بەردەوام دەیوت: نەخێر.. نەخێر.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەی ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە، بۆ خەڵکیش پێت خۆش بێت.. هەروەها ئەوەی بۆ خۆت پێت ناخۆشە، با بۆ خەڵکیش پێت ناخۆش بێت..

گەنجەکە هەستی بە هەڵەی خۆی کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ داوا لە پەروەردگار بکە، دڵو دەروونم پاك بکاتەوە.. پێغەمبەری خوداﷺ لە خودا دەپارایەوەو گەنجەکەش بەرەبەرە لە پێغەمبەری خوداﷺ نزیك بۆوە، هەتا لەبەردەمیدا دانیشت، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ دەستی پیرۆزی خستە سەر سنگی گەنجەکەو فەرمووی: پەروەردگار ڕێنمایی دڵو دەروونی ئەم گەنجە بکەو لە گوناهەکانی خۆشبەو داوێنی لە تاوانو خراپە بپارێزە..

گەنجەکە هاتە دەرەوەو وتی: سوێند بە خودا کاتێك چوومە لای پێغەمبەری خوداﷺ، هیچ شتێکم هێندەی زینا لە لا خۆش نەبوو، بەڵام کاتێك لە لای هاتمە دەرەوە، زینا بوو بە ناشیرینترینو بێزراوترین کار لەبەر چاوم..

سەیری پێغەمبەری خوداﷺ بکەو بزانە چۆن لەگەڵ ئەو گەنجەدا هەستو سۆزو خۆشەویستی بەکارهێنا، سەرەتا ئامۆژگاری کردو لە پەروەردگار بۆی پارایەوە، پاشان دەستی پیرۆزی خستە سەر سنگی گەنجەکەو دوبارە بۆی پارایەوە.. هەموو هۆکارێکی بەکارهێنا، بۆ ئەوەی چاکسازی لە بەرامبەرەکەیدا ئەنجام بدات.. دوای ئەوەی گەنجەکە هەستی بە گەورەییو ناحەزی ئەو تاوانە کرد، بە یەکجاری وازی هێناو بۆ هەمیشە پشتی تێکردو ڕووی لێوەرگێڕا..

**بنەما..**

کاتێك کەسی هەڵەکار، هەست بە ناشیرینیو ناحەزی تاوانەکەی دەکاتو باوەڕ بەوە دێنێت، کە پێویستی بە ئامۆژگاری کردن هەیە، ئەوسا زیاتریش ئامۆژگاریەکان وەردەگرێتو جێبەجێیان دەکات..



# سەرزەنشتم مەکە..!! کارەکە کۆتایی هات..!!

هەندێك کەس واگومان دەبەن، کاتێك کە لۆمەو سەرزەنشتی خەڵکی دەکەن، دەتوانن زیاتر لێیان نزیك ببنەوەو خۆشەویست بن!! یان وا هەست دەکەن ئەگەر زۆر ڕەخنە بگرن و لۆمەو سەرزەنشتی زیاتری خەڵکی بکەن، کەسایەتیان بەهێز دەبێت!!
بە داخەوە جاری واهەیە کەسانێك بە وردبین بە دوای هەڵەو کەموکوڕییەکانی خەڵکیدا دەگەڕێن و دواتریش زۆر بە خراپی لۆمەو سەرزەنشتیان دەکەن..
دەربڕینی لۆمەو سەرزەنشت کردنی خەڵکی، بەهێزیو زیرەکی نیە، بەڵکو کەسێك زیرەك و بەتوانایە، هەوڵ بدات لە لۆمەو لۆمەکاری خۆی بەدوور بگرێت و هەوڵ بدات کەسی بەرامبەر چاك بکات، بە بێ ئەوەی هەستی بریندار بکات.. جاری واش هەیە، پێویستە لە ئاستی هەندێك کاردا، چاومان دابخەین، بە تایبەت لە کارە دونیاییەکاندا..
لۆمەو سەرزەنشتیش، وەکو تیرێکی تیژ وایەو کەسی لۆمەکراو هەست بە کەموکوڕی دەکات، هەروەها هەوڵ بدرێت لە فەرمباڵغیو لەبەر چاوی خەڵکیدا ئامۆژگاری هیچ کەسێك نەکرێت، لەبەر ئەوەی ئامۆژگاری کردن لەبەر چاوی خەڵکی، بریتیە لە: شکاندن و سوك کردنی کەسی ئامۆژگاری کراو.. ئەگەر هەر ناچار بوویت لە ناو کۆمەڵ و فەرمباڵغیدا ئامۆژگاری کەسێك، یان چەند کەسێك بکەیت، ئەوا دەتوانیت بڵێیت: کەسانێك هەن فلانە ڕەوشتیان تێدایە، یان فلانە کاری خراپ ئەنجام دەدەن، ئەو کاتە ئەو کەسانەی ئەو ڕەوشت و کارانەیان تێدایە، ئامۆژگارییەکانت وەردەگرن و دڵیشیان نارەنجێت..
کەواتە: لۆمەو سەرزەنشت کردن، وەکو قامچیەکی بەهێز وایەو ئازارو ناڕەحەتی لە سەر پشتی کەسی لۆمەکراو، یان سەرزەنشت کراو دروست دەکات..
کەسانێك هەن خەڵکی لە خۆیان دەتۆرێنن، جا بە هۆی زۆر دەربڕینی لۆمەو سەرزەنشتیەکانیانەوە بێت، یان بە هۆی دەربڕینی لۆمەو سەرزەنشتی کارێکەوە بێت، لە کاتێکدا کارەکە تازە ڕوویدا بێت و تێپەڕیبێت و ئامۆژگاریو لۆمەو سەرزەنشت، هیچ کاریگەرییەکی نەما بێت..
بیرم دێت، پیاوێکی هەژار هەبوو، بە هۆی نەبوونیو نەدارییەوە، ماڵ و منداڵ و کەس وکاری جێهێشت و لە پێناوی دەستکەوتنی کارو بژێویدا، ڕووی کردە شارێکی ترو

لەوێ بوو بە شۆفێری شاحینە.. رۆژێك زۆر هیلاك و ماندوو دەبێت، بەڵام بە ناچاری سواری شاحینەکەی دەبێت و دەکەوێتە بڕینی ڕێگەی نێوان دوو شاری لە یەك دوور.. لە ڕێگە خەو شاڵاوی بۆ دێنێت، ئەمیش خێراتر شاحینەکە لێدەخوڕێت و ڕووبەڕووی ئۆتۆمبیلێکی بچوك دەبێتەوە، کە سێ سەرنشینی تێدا دەبێت، زۆر هەوڵ دەدات خۆی لابدات، بەڵام ناتوانێت و بەریەك دەکەون، تەم و مژ بەرز دەبێتەوە و ئۆتۆمبیلەکانی ڕێگە دەوەستن و دەگەنە سەر ڕووداوەکە.. پیاوە هەژارەکە لە شاحینەکەی دادەبەزێت، سەیری ئۆتۆمبیلە تێکشکاوەکە دەکات و دەبینێت سەرنشینەکانی هەموو مردوون..

خەڵکەکە مردووەکان دەردەهێنن و پەیوەندی بە ئۆتۆمبیلی فریاکەوتنەوە دەکەن، پیاوە هەژارەکەش چاوەڕێی هاتنی ئۆتۆمبیلی فریاکەوتن دەکات و بیری لە دوای ڕووداوەکە دەکردەوە، بیری لە بەندکردن و بژاردنەوەی خوێنی مردووەکان دەکردەوە.. بیری لە منداڵە بچوکە بێنازەکانی و هاوسەرە هەژارەکەی دەکردەوە.. غەم و پەژارە هاوشێوەی هەرەس هێنانی کێوێکی گەورە بە سەریدا کەوتبوو.. ئا لەم کاتە ناسکەدا، خەڵکی بە لایدا تێدەپەڕین و سەرزەنشتیان دەکرد..

سەیرە!! کەی ئێستا کاتی سەرزەنشت و لۆمە کردنە؟! ئایا ناتوانیت ئەو قسە ناخۆشانە کەمێك دوابخەیت؟!

یەکێك دەیوت: بۆ بە خێرایی دەڕۆی؟ ئەوە سزاو سەر ئەنجامی خێراییە!! یەکێکی تریان دەیوت: بە دڵنیاییەوە خەواڵوو بوویت و لەگەڵ ئەوەشدا لە سەر ڕۆیشتنەکەت بەردەوام بوویت!! ئەی بۆ نەوەستایت، کەمێك بخەویت؟! کەسێکی تریان دەیوت: نمونەی کەسانی هاوشێوەی تۆ، نابێت مۆڵەتی شۆفێریان پێبدرێت!!

ئەم قسانەو چەندان قسەو توانجی ناخۆشی ترو هاوارکردن و دەنگ بەرزکردنەوە، ڕووبەڕووی پیاوە هەژارەکە کرایەوە، پیاوەکەش بە کۆڵێك غەم و پەژارەو بە سەرسامی و بە بێدەنگی لە سەر تاشە بەردێك دانیشتبوو.. پاڵی دابۆوەو سەری خستبووە نێوان هەر دوو دەستیەوەو کتوپڕ بە لادا هات و ئەوەندەیان سەرزەنشت کرد، گیانی دەرچوو!!

ئەگەر کەمێك ئارامیان بگرتایە، ئەوا بۆ پیاوە هەژارەکەش و بۆ ئەوانیش باشتر بوو.. خۆت بخەرە جێگەی کەسی سەرزەنشت کراو، یان کەسی هەڵەکار، بە دڵنیاییەوە ئەگەر تۆ لە جێگەی ئەو بوویتایە، لەوانەیە لە هەڵەکەی ئەو هەڵەی گەورەترت ئەنجام بدایە..

پێغەمبەری خوداﷺ زۆر دڵی خەڵکی و هاوەڵانی ڕادەگرت، جارێکیان پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، لە خەیبەر دەگەڕایەوە، ڕێگەکە ئەوەندە دوورو درێژ

بوو، ماندووی کردبوون.. کاتێك شەو داهات، لە ڕێگە لایاندا بۆ ئەوەی کەمێك بخەون، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەگەر خەبەرمان نەبۆوە، کێ بۆ نوێژی بەیانی هەڵمان دەستێنێت؟ بیلالرضي الله عنه فەرمووی: من ئەی پێغەمبەری خوداﷺ..

پێغەمبەری خوداﷺ ڕاکشاو خەڵکەکەش دابەزین‌و خەوتن، بیلالیش دەستی کرد بە شەونوێژ، هەتا بە تەواوی ماندوو بوو، لەبەر ئەوەی ئەمیش ڕێگەیەکی دوورو درێژی بڕی بوو، هەر بۆیە دانیشت‌و پاڵی دا بە وشترەکەیەوە، بۆ ئەوەی پشوویەك بدات، بەڵام خەوی لێکەوت.. خەڵکەکە هەموویان هیلاك‌و ماندوو بوون، ئەوانیش‌و بیلالیشرضي الله عنه خەویان لێکەوت..

بەڵێ.. شەو ڕۆیشت‌و گزنگی بەیان سەری دەرهێنا.. کەس، کەسی خەبەر نەکردەوە، بەڵکو تیشك‌و تینی گەرمای خۆر، خەبەری کردنەوەو هەڵیساندن.. پێغەمبەری خوداﷺ بەخەبەرهات، پاشان خەڵکەکەش لە خەو هەستان، کاتێك خۆریان بینی، زانییان کاتی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی تێپەڕیووە، شڵەژان‌و ژاوەژاوو دەنگە دەنگ دروست بوو، هەموشیان سەیری بیلالیان دەکرد.. پێغەمبەری خوداﷺ ئاوڕی بۆ بیلال دایەوەو فەرمووی: بیلال ئەوە چیت لێکردین؟!

بیلالیشرضي الله عنه بەڕوونی وەڵامی دایەوە، بەڵام زۆر بەکورتی، فەرمووی: چی بە سەر ئێوە هات، ئەوەش بە سەر من هات، واتە: منیش مرۆڤم‌و ویستیشم نەخەوم، بەڵام نەمتوانی‌و هەروەك چۆن خەو بە سەر ئێوەدا زاڵ بوو، ئاواش بە سەر مندا زاڵ بوو.. پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: ڕاست دەکەیت، پاشان بێدەنگ بوو..

بەڵێ.. لۆمەو سەرزەنشت کردن، لێرەدا چ سودێکی هەیە؟! پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك خەڵکەکەی بەو شێوەیە بینی، فەرمووی: هەستن‌و بکەونە ڕێ.. خەڵکەکە خۆیان ئامادەکردو کەوتنە ڕێ، کەمێك ڕۆیشتن، پێغەمبەری خوداﷺ دابەزی‌و خەڵکەکەش بە دوایدا، پاشان دەست نوێژیان گرت‌و پێغەمبەری خوداﷺ نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، کاتێك سڵاویان دایەوە، خەڵکەکە هاتنە پێشەوە بۆ لایی‌و پرسیاری ئەوەیان لێکرد، ئەگەر بیریان چوو نوێژەکەیان بکەن، یان خەبەریان نەبۆوە، چی بکەین؟! پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: کاتێك خەبەرتان بۆوە، یان بیرتان هاتەوە، نوێژەکانتان ئەنجام بدەن..

ژیری‌و دانایی پێغەمبەری خوداﷺ، چەندە بەرزو جوانە؟! بە ڕاستی مامۆستاو قوتابخانەیە بۆ هەموو سەرکردەیەك.. وەکو هەندێك بەرپرس‌و لێپرسراوی ئەمڕۆ نەبوو،

کە هەمیشە بە گۆچانی لۆمەو سەرزەنشت، لە ژێردەستەکانیان دەدەن!! پێغەمبەری خوداﷺ بە پێی ژیری و تێگەیشتنی کەسی بەرامبەر قسەی دەکرد، هەروەها لەگەڵ دەرونیاندا دەدوا، نەك لەگەڵ جەستەو لاشەیان، لەبەر ئەوەی دەیزانی ئەوانە مرۆڤن..

لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا، رۆمەکان سوپایەکی گەورەیان کۆکردەوەو بۆ شەهیدکردنی پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵە ئازیزەکانی، لە سنورەکانی شامەوە کەوتنە رێ.. موسڵمانەکانیش بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو سوپایە کۆبوونەوە، هەتا ژمارەیان گەیشتە سێ هەزار جەنگاوەر.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: زەیدی کوڕی حارسە دەبێت بە ئەمیرو سەرکردەتان.. ئەگەر شەهید بوو، جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب، دەبێتە سەرکردەتان، ئەگەر ئەویش شەهید بوو، عبداللەی کوڕی رەواحە دەبێتە سەرکردەتان..

سوپای موسڵمانانماڵئاوایی و خوداحافیزیان کردو کەوتنەڕێ، خەڵکەکەش دەیان وت: خوداتان لەگەڵ.. پەروەردگار بتان پارێزێت و بە چاکەکاری و سەلامەتی بتان گێڕێتەوە بۆ لامان..

بەڵێ.. سوپای موسڵمانان کەوتە رێ، هەتا گەیشتنە جێگەی جەنگی (مؤتە) لە خاکی شام و هەواڵیان بیست هیرقل لەگەڵ سوپایەکی سەد هەزار جەنگاوەریدا کەوتوونەتە رێ و بەرەو روویان دێن، سوپای رۆمەکان لەگەڵ سوپای هۆزەکانی تریشدا، کە ژمارەی ئەوانیش سەد هەزار جەنگاوەرێك دەبوو، یەکیان گرتبوو، ببوونە دوو سەد هەزار سەرباز..

کاتێك موسڵمانان راستی ئەم هەواڵەیان بۆ دەرکەوت، لە ناوچەیەك بە ناوی (معان) دوو شەو مانەوەو چاوەڕێیان دەکرد، بۆ ئەوەی بزانن چی بکەن؟! هەندێکیان وتیان: با نوسراوێك بۆ پێغەمبەی خوداﷺ بنێرین و لە ژمارەی دوژمنان ئاگاداری بکەین، ئەوسا یان جەنگاوەری ترمان بۆ دەنێرێت، یان فەرمانمان بە کارێك پێدەدات و ئێمەش جێبەجێی دەکەین، زۆربەی جەنگاوەرانی موسڵمانانیش، راو بۆچوونیان لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا بوو..

عبداللەی کوڕی رەواحەﷺ هەستاو فەرمووی: ئەی خەڵکینە.. ئەوەی ئێستا حەزتان لێی نیەو لێی رادەکەن، هەر ئەوەیە کە لە پێناویدا کەوتنە رێ و حەزتان لێی دەکرد.. ئایا لە شەهیدی رادەکەن؟! لە تێکۆشان لە پێناوی خوادا پشت هەڵدەکەن؟! ئێمە بە پشت بەستن بە زۆری و کەمی ژمارەمان، لەگەڵ خەڵکیدا ناجەنگین، بەڵکو بەهۆی ئەم ئاینە پیرۆزەوە دەجەنگین، کە پەروەردگار بە هۆیەوە رێزی لێناوین.. دەی هەڵمەت بەرن، لە دوو پاداشت یەکێکیانتان هەر دەست دەکەوێت، یان شەهیدی، یان سەرکەوتن..

موسڵمانان کەوتنە ڕێ، هەتا لە سوپای بێشوماری ڕۆمەکان نزیك بوونەوە، لە ناوچەی (مۆتە).. ئەبوهورەیرە‌ﷺ کە ئامادەی ئەو جەنگە بوو، دەفەرموێت: کاتێك لە بێباوەڕان نزیك بووینەوە، ژمارەیەك جەنگاوەرمان بینی، کە هەرگیز شتی وامان نەبینی بوو!! ژمارەیان زۆر زۆر بوو، چەكو کەلوپەلو ئاوریشمو زێڕو زیوێکی زۆریشیان پێبوو، بە شێوەیەك تووشی سەرسورمان بووم!!

سابتی کوڕی ئەرقەم‌ﷺ پێی وتم: ئەبوهورەیرە، دەبینم سەرت سوڕماوە لە زۆری ژمارەی سوپای بێباوەڕان؟! منیش وتم: بەڵێ.. ئەویش وتی: تۆ لە جەنگی بەدردا لەگەڵمان نەبوویت، خۆ ئێمە لەو جەنگەدا بە زۆری ژمارەمان سەرنەکەوتین!!

بەڵێ.. جەنگەکە دەستی پێکردو زەیدی کوڕی حارسە‌ﷺ شەهید بوو.. پاشان جەعفەر‌ﷺ ئاڵاکەی بە دەستی ڕاستی گرتو سەرکردایەتی سوپای موسڵمانانی گرتە دەست.. بێباوەڕان بە شمشێر لە دەستی ڕاستیانداو قرتاندیان.. پێش ئەوەی ئاڵای موسڵمانان بکەوێتە سەر زەوی، بە دەستی چەپی گرتی.. بێباوەڕان دەستی چەپیشیان قرتاند.. ئەمجارەیان بە هەردوو قۆڵی ئاڵاکەی گرتو نەیهێشت بکەوێتە سەر زەوی، هەتا بێباوەڕان شەهیدیان کرد، لە کاتێکدا تەمەنی سیو سێ ساڵ بوو.. عبداللەی کوڕی عومەر‌ﷺ دەفەرموێت: لەو ڕۆژەدا چوومە دیار جەعفەرو بە دیارییەوە وەستام، پەنجا برینی شیرو ڕمو تیرم بە جەستەیەوە بینی، هیچ یەکێك لەو بەرکەوتنو برینانە، لە دواوە نەبوون، بەڵکو هەمووی لە پێشەوە بەرکەوتبوو!! هەر بۆیە پەروەردگار پاداشتی دایەوەو لە باتی دەستە براوەکانی، لە بەهەشتدا دوو باڵی پێبەخشی، بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی بۆ کوێی پێخۆشە، پێی بفرێتو لە شەقەی باڵ بدات..

پاشان عبداللەی کوڕی ڕەواحە‌ﷺ ئاڵای موسڵمانانی گرتە دەستو بە سواری ئەسپەکەی بەرەو پێشەوە چوو.. بەردەوام بوو لە کوشتاری بێباوەڕان، هەتا ئەمیش شەهید بوو، ئاڵاکەش کەوتە سەر زەویو موسڵمانان شڵەژانو بێباوەڕانیش دڵخۆش بوون.. پاشان سابتی کوڕی ئەرقەم‌ﷺ ئاڵاکەی هەڵگرتەوەو هاواری کردو وتی: ئەی موسڵمانان ئەمە ئاڵاکەیەو پیاوێك بۆ خۆتان دەست نیشان بکەن.. موسڵمانانیش، ئەوانەی کە گوێیان لێبوو، هەموو هاواریان کردو وتیان: خۆت ئەو کارە بگرە دەستو ببە بە سەرکردەی موسڵمانان.. بەڵام سابت ڕەدی کردەوەو وتی: من بەو کارە هەڵناستم..

موسڵمانان تێکرا خالیدی کوڕی وەلیدیان دیاری کرد، کاتێك خالید‌ﷺ ئاڵای موسڵمانانی گرتە دەست، بە شێوەیەك کەوتە گیانو کوشتاری بێباوەڕان، هەر وەك خۆی دەفەرموێت:

نۆ شمشێر بە دەستمەوە شکا.. پاشان خالید ﷺ سوپاکەی کەمێك لاداو ڕۆمەکانیش بەرەو لای سەربازگەکانیان کشانەوە.. خالید ترسا ئەگەر بە شەو سوپای موسڵمانان بەرەو مەدینە بگێڕێتەوە، ڕۆمەکان شوێنیان بکەون، هەر بۆیە کاتێك ڕۆژ بۆوە، گۆڕانکاری لە سوپای موسڵماناندا ئەنجامدا، بە شێوەیەك پێشڕەوانی سوپاکەی هێنایە دواوەو ئەوانەی دواوەشی بردە پێشەوە، هەروەها بەشی لای ڕاستو چەپیشی ئاڵوگۆڕ پێکرد..

کاتێك دوبارە جەنگ دەستی پێکردەوە، ڕۆمەکان ڕوخساری جیاوازیان بینیو شڵەژانو گومانی ئەوەیان برد، شەو جەنگاوەرانی یاریدەدەر، پەیوەندیان بە سوپای موسڵمانانەوە کردووەو سەربازی تازەیان پێگەیشتووە، هەر بۆیە ترسیان لێنیشتو موسڵمانان کوشتارێکی زۆریان لێکردن، لە کاتێکدا تەنها دوانزە موسڵمان لەو ڕۆژەدا شەهید بوون.. پاشان لە دەمەو ئێوارەدا خالید ﷺ گۆڕەپانی جەنگەکەی جێهێشتو سوپاکەی بە ئاڕاستەی شاری مەدینە، بەڕێکرد..

کاتێك گەیشتنەوە شاری مەدینە، ئافرەتانو منداڵانی شارەکە خۆڵیان بەرەو ڕوخساری جەنگاوەرانی سوپای موسڵمانان هەڵدەداو دەیان وت: ئەی ڕاکردووان.. ئەی هەڵهاتووان.. بۆ ڕاتان کردو هەڵهاتن؟!

پێغەمبەری خوداﷺ دەیزانی، موسڵمانان ئەوەی لە توانایاندا بووە، لەو جەنگەدا ئەنجامیان داوەو جگە لە کشانەوەش، هیچ چارێکی تریان نەبووە، هەر بۆیە فەرمووی: ئەوانە ڕاکردوو نین، بەڵکو بە ویستی خودا خۆیان ئامادە دەکەنەوەو دوبارە هێرش دەبەنەوە بۆ سەر بێباوەڕان..

بەڵێ.. بە کورتی کۆتایی پێهێنا.. ئەوانە پاڵەوان بوون، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مرۆڤ بوون، کارەکەش لە سەرووی توانای ئەمانەوە بوو، ئیتر پێویست بە لۆمەو سەرزەنشت ناکات؟!

پێغەمبەری خوداﷺ بەردەوام بەم شێوەیە هەڵسوکەوتی دەکردو خۆی لە لۆمەو سەرزەنشت بە دوور دەگرت..

کاتێك بێباوەڕان، هەواڵی ئەوەیان بیست، کە پێغەمبەری خوداﷺ خۆیو سوپاکەی بۆ ئازادکردنی شاری مەککە کەوتونەتە ڕێ، ترسو دڵەڕاوکێ دایگرتن.. پێغەمبەری خوداﷺ نوێنەرێکی نارد، کە پێیان بڵێت: هەر کەسێك دەرگایماڵەکەی لە سەر خۆی پێوە بدات، ئەوا پارێزراو دەبێت.. هەر کەسێکیش بچێتە کەعبەی پیرۆزەوە، پارێزراو دەبێت.. هەر کەسێکیش بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە، پارێزراو دەبێت..

بەڵام چەند کەسێك لە بێباوەڕان، کۆبوونەوەو لە شوێنێکدا بە ناوی (خەندەمە) خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای موسڵمانان ئامادە کرد.. ئەو کەسانەش بریتی بوون لە: سەفوانی کوڕی ئومەییەو عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهلو سوهەیلی کوڕی عەمرو حەماسی کوڕی قەیسو هەندێك کەسی تر..

کاتێك حەماسی کوڕی قەیس خەریکی ئامادەکردنی شمشێرو کەرەستەکانی دەبێت، خێزانەکەی پێی دەڵێت: ئەوە خۆت بۆچی ئامادە دەکەیت؟! حەماسی کوڕی قەیسیش دەڵێت: بۆ گیانی محمدو هاوەڵەکانی.. خێزانەکەشی دەنگوباسی بەهێزی موسڵمانانی بیست بوو، هەر بۆیە دەڵێت: سوێند بە خودا، وا نابینم هیچ هۆزو کۆمەڵێك بتوانێت ڕووبەڕووی محمدو هاوەڵانی بێتەوە!!

حەماسی کوڕی قەیسیش دەڵێت: هیوام وایە، هەندێکیان لێ بە دیل بگرمو بیانکەم بە خزمەتکاری خۆم.. پاشان دێتە دەرەوەو بەرەو ئەو ناوچەیەی کە پێیان دەوت (خەندەمە) کەوتە ڕێ.. کاتێك گەیشتە ئەوێ، بینی هاوەڵەکانی هەموو ئامادەن، تەنها ئەوەندە ماوە، ڕووبەڕووی موسڵمانان ببنەوە..

بەڵێ.. جەنگو کوشتارەکە ڕووبەڕووی شمشێری خودا، خالیدی کوڕی وەلید ﷺ بووەوەو لە ساتێکی زۆر کەمدا، دوانزە یان سیانزە، لەو بێباوەڕانە کوژران.. کاتێك حەماسی کوڕی قەیس ئەمەی بینی، ئاوڕی بۆ لای سەفوانو عیکرەمە دایەوە، بینی وا بەرەو ماڵەوە ڕادەکەن، هەر بۆیە ئەمیش لەگەڵیاندا کەوتە ڕاکردنو هەڵهاتو بە پەلە خۆی کرد بە ماڵداو هاواری لە خێزانەکەی کردو وتی: دەرگام لە سەر دابخە، چونکە ئەوان دەڵێن: هەر کەس دەرگای ماڵەکەی لە سەر خۆی پێوە بدات، ئەوا پارێزراو دەبێت.. خێزانەکەشی دەڵێت: ئەی تۆ نەتوت: تێکیان دەشکێنمو هەندێکیان لێدەکەم بە خزمەتکار؟! حەماسیش لە وەڵامدا بەم چەند دێڕە هۆنراوەیە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت:

| | |
|---|---|
| إنـكِ لـو شـهدت يـوم الخندمـة | إذ فـرَّ صفـوان وفـرَّ عكرمـة |
| وأبـو يزيـد قائـم كالمؤتمـة | واسـتقبلتهم بالسـيوف المسلمة |
| يقطعـن كل سـاعد وجمجمـة | ضـربـاً فلايسـع إلا غـمغمـة |
| لهـم نهيـت خلفنـا وهمهمـة | لـم تنطقـي في اللـوم أدنى كلمة.. |

بەڵێ.. ڕاستە، ئەگەر ئەو ئافرەتە ئامادەی ئەو جەنگە ببووایەو بیبینیایە، چۆن پاڵەوانی وەك سەفوانو عیکرەمەش هەڵهاتنو ڕایان کرد، ئەوسا سەرزەنشتو گلەیی لە

مێردەکەی نەدەکرد!!

ڕۆژێك سواری ئۆتۆمبیلی گەنجێك بووم، گەنجەکە لە لێخوڕینی ئۆتۆمبیلدا زۆر شارەزاو لێهاتوو بوو.. پرسیارم کردو وتم: دەبینم زۆر شارەزای لە لێخوڕینی ئۆتۆمبیلدا، ئەی بۆچیو چۆن تووشی ئەو ڕووداوی پێکدادانە بوویت؟! گەنجەکە وتی: دەبووایە ئەو ڕووداوە هەر ڕووی بدایە!!

وتم: سەیرە!! بۆچی؟! دوبارە وتی: دەبووایە ڕووی بدایە، لەبەر ئەوەی کاتێك بە سەر پردێکدا دەڕۆیشتمو زۆریش خێرا بووم، ڕیزێك ئۆتۆمبیل لە بەرامبەرمدا وەستا بوون، نەمدەزانی بۆ وەستاون، بە هۆی ڕوودانی ڕووداوێکەوە بوو، یان خاڵی پشکنینی لێ بوو، نازانم!! هەر بۆیە کەوتمە نێوان سێ هەڵبژاردنەوە، یان دەبووایە لامبدایەو لە سەر پردەکەوە بکەوتمایەتە خوارەوە، یان بە توندی پێم بە ئیستۆپی ئۆتۆمبیلەکەمدا بنایەو ئەوساش کۆنترۆڵی ئۆتۆمبیلەکەم لە دەست دەداو بە ئارەزووی خۆی یاری دەکردو لە ڕێگەکە لایدەدا، یان ئەوەتا حاڵەتی سێیەمم هەڵبژاردایە..

وتم: سێیەمیان چی بوو؟! وتی: حاڵەتی سێیەم ئەوە بوو لە یەکێك لە ئۆتۆمبیلەکانی بەرامبەرم بدەم، هەر بۆیە ئەمیان لە دوو حاڵەتەکەی تر کەم زیانتر بوو، هەر بۆیە حاڵەتی سێیەمم هەڵبژاردو پێکدادانەکە ڕوویدا، بەڵام ئۆتۆمبیلەکەم هێواش کردەوەو هەرزانترینو کۆنترین ئۆتۆمبیلی بەرامبەرم هەڵبژاردو خۆم پیاکێشا.. پاشان پێکەنیو منیشی خستە پێکەنین..

بیرم کردەوەو لە دڵی خۆمدا وتم: جێگەی گلەییو سەرزەنشت نیە، لەبەر ئەوەی هەڵبژاردنەکانی بەرامبەری دیاری کراو بوون!!

کەواتە: هەندێك کێشەو گرفت هەیە، چارەسەری نیە، وەك ئەوەی کەسێك باوکێکی توڕەی هەیە، بە چەندان ڕێگەو شێواز ئامۆژگاری کردووە، هیچ سودی نەبووە، ئیتر چی بکات؟!

**لاکردنەوە..**

خۆت لە جێگەی ئەو کەسە دابنێ، کە لۆمەو سەرزەنشتی دەکەیتو وەکو ئەویش بیربکەرەوە، پاشان بڕیاری بە سەردا بدەو لۆمەو سەرزەنشتی بکە..

# پێش ئامۆژگاری، دڵنیابە لە بوونی هەڵە..

کاتێك پەیوەندی پێوە کردم، تورەیی بە دەنگیەوە دیار بوو، بەڵام هەوڵی دەدا بە گوێرەی توانا تورەییەکەی بشارێتەوەو دەرینەخات، ئەم شێوازە قسەکردنەی ئێستای، زۆر جیاواز بوو، لەو شێوازەی کە لە سەری ڕاهاتبوو، گومانم برد شتێکی لە لا دروست بوو بێت..

لە سەرەتای قسەکانیدا باسی کێشەو ناکۆکیو دووبەرەکی کرد، لە نێوان خەڵکیدا.. پاشان بە دەنگێکی زبرو بەرز، چەند جارێك ئەم وشانەی دوبارە کردەوە: تۆ لای خۆی بانگخوازیت!! هەروەها فێرخوازی زانستو زانیاریت!! کردەوەو هەڵسوکەوتو گوفتارت، جێگەی سەرنجی خەڵکیە!!

کاتێك گوێم لەم وشانە بوو، وتم: خۆزگە ڕاسەوخۆ بچوویتایەتە ناو بابەتەکەوە، لە مەبەستت تێناگەم!! لە وەڵامدا وتی: مەبەستم لەو وتارەیە کە لە ڕۆژی...و لە فلانە جێگە پێشکەشت کرد..

سەرم سورماو سەرسام بوومو وتم: ئەمە کەی؟! وتی: سێ هەفتە لەمەو پێش..

وتم: ساڵێك زیاترە نەچووم بۆ ئەو جێگەیەی کە باسی دەکەیت!! وتی: با چوویتو دەربارەی ئەو بابەتانەش وتارت دابوو..

پاشان بۆم ڕوون بۆوە، ئەم دۆستەم هەندێك پڕوپاگەندەی دەربارەی من بیستووەو یەکسەر بە ڕاستی زانیووەو لە سەر ئەو بنەمایە، ئامۆژگاری منی کردو بەو شێوەیەش قسەی لەگەڵ کردم.. ڕاستە من ئێستاش خۆشم دەوێت، بەڵام لە جاران کەمترو لەبەر چاویشم کەمێك گۆڕاوە، لەبەر ئەوەی بۆم دەرکەوت، بە خێرایی بڕیار دەداتو لە ئەنجامدانی هەڵە، دڵنیا نیەو ئامۆژگاری خەڵکیش دەکات، لە کاتێکدا کەسی ئامۆژگاری کراو ئاگای لەو هەڵەیە هەر نیە!!

چەندن ئەو کەسانەی بە هۆی بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندەو هەواڵی ناڕاستەوە

هەڵوێست وەردەگرن‌و لە سەر بنەمای ئەو هەڵە ناڕاستانە ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن، پاشان بۆیان ڕوون دەبێتەوە، دوای گومان‌و کۆمەڵە هەواڵێکی ناڕاست کەوتوون.. بە داخەوە جاری وا هەیە ئەو گومان‌و پڕوپاگەندانە لە دڵ‌و دەروونندا جێگیر دەبن، لە کاتێکدا هیچ بنەمایەکی ڕاستی‌و دروستیان نیە..

جاری وا هەیە بڵاو دەبێتەوە، کە فلانەکەس ئەوەو ئەوەی ئەنجامدا، دەی پێش ئەوەی لەو بارەیەوە قسە بکەیت، لە ڕاست‌و دروستی هەواڵەکە دڵنیابە.. ئەم ڕێڕەوەش، ڕێڕەوی پێشەوای مرۆڤایەتیە ﷺ..

پیاوێکی شێوە ئاڵۆزو سەرو قژ ئاڵۆسکاو، دێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەیەوێت ئامۆژگاری ئەم پیاوە بکات، بۆ ئەوەی دەستێك بە خۆیدا بهێنێت‌و کەمێك شێوەو ڕوخساری ڕێك‌وپێك بکات، بەڵام دڵنیا نەبوو، کە ئەم پیاوە، پیاوێکی هەژارو نەدار نیەو خاوەنی ماڵ‌و سەروەت‌و سامانە، هەر بۆیە پرسیاری کردو فەرمووی: ماڵ‌و سەروەت‌و سامانت هەیە؟ پیاوەکەش دەڵێت: بەڵێ.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: چ جۆرە ماڵ‌و سامانێك؟ پیاوەکە دەڵێت: لە هەموو جۆرە ماڵ‌و سامانێك، لە وشتر.. لە ئەسپ‌و مایین.. لە مەڕو بزن.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: دەی ئەگەر خودای گەورە ماڵ‌و سەروەت‌و سامانێکی پێبەخشیت، با شوێنەواری ئەو بەخشینەت بە سەرەوە ببینێت..

لە ساڵی هاتنی نوێنەرانی گەل‌و هۆزەکان، هەندێك لە خەڵکی دەهاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ و پەیمانیان پێدەدا، هەندێك بە بێباوەڕی دەهاتن، جا یان موسڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیاند، یان ڕێکەوتن نامەیان مۆر دەکرد..

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ لە ناو هاوەڵانیدا دەبێت‌و نوێنەرانی هۆزی سەدەف، دێن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ کە ژمارەیان سیانزە بۆ نۆزدە کەسێك بوو، کاتێك دێنە کۆڕو دانیشتنەکەی پێغەمبەری خوداو ﷺ، بە بێ سڵاوکردن دادەنیشن، پێغەمبەری خوداش ﷺ پرسیاریان لێدەکات‌و دەفەرموێت: ئایا ئێوە موسڵمانن؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: دەی بۆ سڵاوتان نەکرد؟ ئەوانیش هەڵدەستن‌و پاشان دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خودا

سڵاوو بەزەیی پەروەردگارت لێ بێت.. پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: هەروەها سڵاوو بەزەیی پەروەردگار لە ئێوەش بێت، پاشان فەرمووی: دانیشن.. دانیشتن و پاشان هەندێك پرسیاریان کرد، لەوانەش پرسیاری کاتەکانی نوێژیان لە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد..

لە سەردەمی ئیمامی عومەردا ﷺ کاتێك خاکی موسڵمانان فراوان بوو، ئیمامی عومەر ﷺ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی کرد بە ئەمیرو لێپرسراوی شاری کوفە.. خەڵکی ئەم شارە خەڵکێکی گێرەشێوێن بوون، هەر بۆیە سکاڵا نامەیەکیان لە سەر سەعد ﷺ نوسی و ناردیان بۆ لای ئیمامی عومەر ﷺ، کە پڕ بوو لە گلەیی و گازندە، هەتا وتبوویان: نازانێت بە چاکی نوێژەکەشمان بۆ ئەنجام بدات..

کاتێك ئیمامی عومەر ﷺ نامەکەی خوێندەوە، لە بڕیارداندا پەلەی نەکرد، ئامۆژگاری سەعدیشی نەکرد، چونکە لە ڕاست و دروستی ئەو گلەیی و گازندانە، دڵنیا نەبوو، بەڵکو هەستا بە ناردنی محمدی کوڕی مەسلەمە بۆ کوفەو نامەیەکیشی پیادا نارد بۆ سەعدو داواشی کرد لەگەڵ سەعددا پرسیار لە خەڵکەکە بکەن و لە گلەییەکانیان بکۆڵنەوە..

محمدی کوڕی مەسلەمە گەیشتە شاری کوفەو سەعدی لە باس و خواسەکە ئاگادار کرد، پاشان لەگەڵ سەعددا ﷺ، لە مزگەوتی شاری کوفە نوێژی کردو پرسیاری دەربارەی سەعد، لە خەڵکەکە کرد، خەڵکەکەش هەموو جگە لە چاکە، هیچیان دەربارەی سەعد نەوت، پاشان چوو، بۆ مزگەوتی (هۆزی عبس)، محمدی کوڕی مەسلەمە هەستاو دەربارەی سەعد پرسیاری لە خەڵکەکە کردو ئەوانیش زۆر ستایشی سەعدیان کردو هیچ ڕەخنەو کەم و کوڕییەکیان باس نەکرد، محمدی کوڕی مەسلەمەش فەرمووی: جگەلە سوپاس و ستایش، هیچ شتێکی تری لەبارەوە نازانن؟! ئەوانیش وتیان: جگەلە چاکە هیچی تری لە بارەوە نازانین.. محمدی کوڕی مەسلەمە، بەردەوام پرسیاری لە خەڵکەکە دەکرد، هەتا پیاوێك لە کۆتایی مزگەوتەکەوە، بە ناوی ئوسامەی کوڕی قەتادە هەستاو وتی: سەعد بە یەکسانی سەیری خەڵکی ناکات و کێشەو گرفتەکانیش

بە دادگەری چارەسەر ناکات..

سەعد سەری سوڕماو وتی: من بەو شێوەیەم؟! پیاوەکە وتی: بەڵێ.. سەعدﷺ فەرمووی: پەروەردگار ئەگەر ئەم بەندەیەت درۆ دەکات، تەمەنی درێژ بکەیت‌و بە هەژاری ژیان بە سەربەرێت‌و توشی نارەحەتی‌و تاقیکردنەوەی بکەیت، پاشان سەعد لە مزگەوتەکە هاتە دەرەوەو گەڕایەوە بۆ شاری مەدینەو لە پاش چەند ساڵێك کۆچی دوایی دەکات..

بەڵام پیاوەکە مایەوە هەتا نزاو پاڕانەوەکانی سەعدﷺ هاتنەدی، تەمەنی زۆر درێژ بوو، هەتا بە تەواوی پیر بوو، ئێسقانەکانی لاواز بوون، پشتیشی چەمیەوە، ئەوەندەش هەژارو نەبوو بوو، هەتا لە ناوەڕاستی ڕێگەدا دەبینرا، سواڵی دەکردو داوای یارمەتی لە خەڵکی دەکرد، ئەوەندە پیر ببوو برۆکانی چاویان داپۆشی بوو، توشی نارەحەتی‌و بەڵاو پاشەڕۆژ ڕەشیش بوو، ئەمەش لە کاتێکدا بوو، بەو تەمەن‌و شکڵ‌و شێوەیەوە، کە ئافرەتانی دەبینی، دەستی بۆ درێژ دەکردن، خەڵکیش کە ئەم هەڵسوکەوتە ناشیرینەیان لێدەبینی، هاواریان بە سەردا دەکردو جنێویان پێدەدا..

لە کۆتایشدا خۆی بە خۆی دەوت: ئەی چی بکەم؟! کەسێکی خڵەفاوی وەك من، توشی گیرابوونی نزاو پاڕانەوەی پیاوچاکێکی وەك سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بووم‌و ئەمە هاتنەدی پاڕانەوەکانی ئەوە لە سەر من!!

وتەیەک..

ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی بە درۆزن بناسرێت‌و خۆی گوناهبار بکات، کە هەرچی بیستی باوەڕی پێبکات‌و بیگێڕێتەوە..



# بە نەرمی لێم بدە..!!

مەبەستمان لەو قسانەی کە کردمان، ئەوە نیە، کە هەرگیز ڕەخنەو پێشنیارو گلەییمان نەبێت!! نەخێر.. بەڵکو کەسانێکی وا هەن پێویستیان بەومیە، چەندان جار لۆمەو سەرزەنشت بکرێن، وەك: کوڕەکەت.. هاوسەرەکەت.. هاوڕێکەت، بەڵام دەتوانیت لە کاتێکی گونجاودا سەرزەنشتیان بکەیتو پێشنیارەکانی خۆتیان بۆ دەربڕی، یان دەتوانیت چەند شێوازێك بەکاربهێنیت، کە برینداروناڕەحەتیان نەکەیت..

واز لە کەسی لۆمەکراوو سەرزەنشت کراو بهێنەو شەرمەزاری مەکەو ئابڕووی مەبە!! موسڵمانان لە دوای ڕزگارکردنی شاری مەککە، لە ناو عەرەبەکاندا بوون بە خاوەن هێزو پلەوپایە، خەڵکانێکی زۆریش بەرەو ئیسلام دەهاتنو موسڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیاند.. پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ موسڵماناندا بەشداری جەنگی حونەینیان کردو ژمارەشیان نزیکەی دوانزە هەزار جەنگاوەر بوو.. بێباوەڕان لە پێش موسڵماناندا خۆیان گەیاندبووە شیوو دۆڵەکانی حونەینو خۆیان تیایدا شاردبۆوە..

هەر لە سەرەتای دەست پێکردنی جەنگەکەوە، کاتێك موسڵمانان چوونە ناو شیوو دۆڵەکانی حونەینەوە، بێباوەڕان لە هەموو لایەکەوە بۆیان دەرپەڕینو هێرشیان هێناو بە تیرو ڕمو بەرد، بەربوونە گیانی سوپای موسڵمانان، موسڵمانان شڵەژانو زۆرێکیان هەڵهاتنو بێباوەڕان باڵادەستی خۆیان لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا نیشاندا..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئاوڕی دایەوەو بینی، خەڵکەکە وا ڕادەکەنو خوێن جۆگەلەی بەستووەو موسڵمانان شڵەژاون، فەرمانی بە عەباسی مامەی کردو پێی فەرموو، هاوار بکاتو بانگی موسڵمانە کۆچکەرەکانو پشتیوانەکان بکات، ئەوانیش بە دەم بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوداوەﷺ هاتن، هەتا هەشتا

کەسێك لە دەوری پێغەمبەری خوداﷺ کۆبوونەوەو هێرشیان بۆ بێباوەڕان بردو پەروەردگار سەرکەوتنی پێبەخشینو جەنگەکە کۆتایی هات..

کاتێك دەستکەوتەکان کۆکرانەوەو لەبەر دەستی پێغەمبەری خوداﷺ دانران، ئەوانەی کە هەر زوو ڕایان کردو لە تیرو شیرو ڕم دەترسان، یەکەمین کەسێك بوون، کە هاتنە پێشەوەو داوای دەستکەوتیان لە پێغەمبەری خوداﷺ کردو دەیان وت: بەشی خۆمان لە دەستکەوتەکان بدەرێ!!

سەیرە!! ئێوە بەشتان لە کوێ بوو، لە کاتێکدا هەڵهاتنو نەجەنگان؟! ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بانگی نەکردنو وەڵامتان نەدایەوە؟! بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ بەم شێوەیە بیری نەکردەوەو ئەوەندە نەچووە وردەکارییەوە، لەبەر ئەوەی ماڵو سەروەتو سامانی دونیا، لە لای ئەو هیچ نرخو بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو..

بەڵێ.. هەموو هاتنە پێشەوەو دەیان وت: بەشی خۆمانمان پێبدە، هەتا ئەوەندە زۆر بوون قەرەباڵغیەکی زۆریان دروست کردو ڕێگەکەیان تەسكو تەنگ کردەوە، ناچار پێغەمبەری خوداﷺ خۆی گەیاندە لای درەختێكو لە ئەنجامی قەرەباڵغیەکەدا، جلوبەرگی سەرەوەی پێغەمبەری خوداﷺ لە لقی دارەکە گیر بوو، پاشان جلوبەرگەکەی کەوتە خوارەوەو سكو پشتی پیرۆزی بەدەرکەوت، بەڵام تورە نەبوو، بەڵکو زۆر بە هێمنیو لەسەرخۆیی ئاوڕی دایەوەو فەرمووی: خەڵکینە جلوبەرگەکەم بۆ بگێڕنەوە، سوێند بەو خودایەی کە گیانی منی بە دەستە، ئەگەر بە ئەندازەی دارەکانی (کێوی توهامە) مەڕومالاتو ماڵو سامانم لەبەر دەستدا بێت، بە سەرتاندا دابەشی دەکەم، پاشان نە بە چروکیو نە بە ترسنۆکیو نە بە درۆزنی نامبیننو ئەم ئاکارانە، لە ئاکاری من نینو لە منەوە دوورن..

بەڵێ.. ئەگەر چروكو ڕەزیل بووایە، ئەوا ئەو سەروەتو سامانانەی بۆ خۆی هەڵدەگرت!!

ئەگەر ترسنۆکیش بووایە، لەگەڵ هەڵهاتوواندا، هەڵدەهاتو ڕای دەکرد!!

ئەگەر درۆزنیش بووایە (پەنا بە خودا)!! ئەوا پەروەردگار سەرکەوتنی

پێنەدبەخشی!!

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، بە لای گۆڕستانێكدا تێدەپەڕێت و ئافرەتێك دەبینێت، لە لای گۆڕێك دانیشتووەو دەگریەت، پێغەمبەری خوداش ﷺ پێی دەفەرموێت: لە خودا بترسەو ئارام بگرە.. ئافرەتەكەش بە چاوی فرمێسكاوییەوەو بە بێ ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ بناسێت، دەڵێت: وازم لێبهێنە، تۆ ئاگات لە من نیە، چیم بە سەر هاتووە!!

پێغەمبەری خودا ﷺ بێدەنگ بوو، وازی لە ئافرەتەكە هێناو ڕۆیشت، لەبەر ئەوەی هەستی كرد، ئافرەتەكە لە حاڵەتێكی ناسكدایەو بە گونجاوی نەزانی لەوە زیاتر ئامۆژگاری بكات..

هەندێك لە هاوەڵان ئاوڕیان بۆ لای ئافرەتەكە دایەوەو وتیان: ئەوە پێغەمبەری خودا بوو !!

ئافرەتەكە لە قسەكانی پەشیمان بۆوەو كەوتە شوێن پێغەمبەری خودا ﷺ هەتاگەیشتە ماڵیان و هیچ دەرگاوانێكی لە بەر دەرگا نەبینی.. كاتێك ڕۆیشتە ژوورەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ نەمناسیت، ئێستا ئارام دەگرم.. پێغەمبەری خودا ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: بە دڵنیاییەوە ئارامگرتن، لە سەرەتای بەركەوتن و ڕوودانی ناڕەحەتیەكەدا دەبێت.. متفق علیه..

**بە نەرمی..**

پەروەردگار لە هەموو كارێكدا، فەرمانی بە چاكە كردووە، كاتێك كوشتار ئەنجام دەدەن، بە جوانی ئەنجامی بدەن، كاتێك ئاژەڵێك سەردەبڕن، بە چاكی و بە جوانی سەری ببڕنو چەقۆكەی دەستتان تیژ بكەن، بۆ ئەوەی سەربڕاوەكە زۆر ئازار نەچێژێت..

# لە کێشەو گرفتەکان، ڕا بکە..!!

وا گومان دەبەم، ئەگەر بچێت بۆ نەخۆشخانەو پشکنینی سەرەتایی بۆ جەستەی ئەنجام بدات، دەیان نەخۆشی لێ دەردەکەوێت، ئاسانترینیشیان بریتی دەبێت، لە نەخۆشیەکانی شەکرەو فشاری خوێن!!

ئەو هەژارە، زۆر ئازاری دەروونی خۆی دەدات، لەبەر ئەوەی بەردەوام داوای نمونەیی و ناوازە بوون، لە خەڵکی دەکات!! خۆی لە هاوسەرەکەی تورە دەکات، لەبەر ئەوەی یەکێك لە قاپە تازەکان بە دەستیەوە شکا!! ئەوە لە بیری چووە هۆڵەکە گسك بدات!! خۆ لە کاتی ئوتوکردندا، کراسە تازەکەی سوتاندم!!

بەهەمان شێوە لەگەڵ منداڵەکانیشیدا.. چۆن دەبێت خالید تائێستا خشتەی لێکدانی لەبەر نەکردبێت؟! سەعد نەیتوانیووە لە خوێندنەکەیدا، بگاتە پلەی نایاب!! سارەو هیندیش، ئەوە هەر مەپرسە!!

ئەمە حاڵ و گوزەرانیەتی لەماڵەوە، لە دەرەوەش حاڵ و گوزەرانی زۆر خراپترەو گومانی خراپ بە هاوەڵەکانی دەبات.. عبداللە کاتێك باسی ڕەزیلی و چروکی کرد، مەبەستی من بوو!! ئەحمەدی هاورێم کاتێك باسی ئۆتۆمبیلی کۆن و ڕزیوی کرد، مەبەستی لە ئۆتۆمبیلەکەی من بوو!! بەڵێ.. مەبەستی لە ئۆتۆمبیلەکەی من بوو، لەبەر ئەوەی کاتێك کە قسەی دەکرد، سەیری منی دەکرد!!

بەڵێ.. خەیاڵ و بیرکردنەوەی ئەم هەژارە، بەم شێوەیە بوو..

پەندێك هەیە دەڵێت: ئەگەر ژیان و بارودۆخ ملکەچت نەبوون، تۆ ملکەچی بارودۆخ و ژیان بە..

ئاسیاوێکی گوندنشینم هەبوو، زۆرجار ئەو قسانەی دەکرد، کە لە باپیرەیەوە فێری ببوو، یەکێك لەو قسانەش ئەوە بوو، کە دەیوت: پاشێخ دەستێك کە نەتدەتوانی بیچەمێنیتەوە، تەوقەو چاك و چۆنی لەگەڵ بکە.. کاتێك بیرم لەم قسەیە کردەوە، بۆم دەرکەوت ڕاست دەکات، ئەگەر بێتوو ئێمە دڵ و دەروونمان لەسەر لێبوردەیی، یان چاو داخستن لە سەر هەندێك کار، ڕانەهێنین و لە هەموو ڕووداوو گوفتارو کردارێکدا، گومان و شیکردنەوەو وردبوونەوە بەکاربهێنین، ئەوا زۆر هیلاك و ماندوو دەکەین و

خۆمان دەفەوتێنین!

گەنجێك كە لە بەهاری تەمەنیدا دەبێت، دێت بۆ لای مامۆستایەكی ئاینیو داوای لێدەكات یارمەتی بدات، بۆ ئەوەی هاوڕێو هاوسەری ژیانی هەڵبژێرێت، مامۆستاكەش دەڵێت: پێتخۆشە هاوسەری ژیانت چۆن چۆنی بێت؟!

گەنجەكەش دەڵێت: دەمەوێت زۆر شۆخو شەنگ بێت.. قسەو گوفتار شیرین بێت.. سەرو قژی وەك ئاوریشم وابێت.. بۆن خۆش بێتو باڵابەرز بێت.. خواردنی دەستی زۆر بەتام بێت.. كاتێك سەیری بكەم، دەمەوێت دڵخۆشو شادومانم بكات.. كاتێك لێی دوور بم، پارێزگاری لە ماڵو پیرۆزیەكانم بكات.. هەرگیز سەرپێچیم نەكاتو هیچ كات لە خراپەو شەری نەترسم.. خاوەن دینداریو زانستو زانیاریش بێت!! ئەم گەنجە دەیویست خاڵی بەهێزی چەندان ئافرەت، لە یەك ئافرەتدا كۆ بكاتەوە..

مامۆستاكەش دەڵێت: كورم ئەوەی تۆ داوای دەكەیت، لە یەك شوێن شك دەبەم.. گەنجەكە دەڵێت: لە كوێ؟! مامۆستاكە دەڵێت: لە بەهەشتدا، بەڵام لە دونیادا دەبێت لێبوردنت هەبێتو هەموو چاكیو جوانیەكان لە یەك كەسدا بە ئاسانی كۆنابنەوە!!

بەڵێ.. دەبێت دەروونمان لە سەر لێبوردەیی ڕابهێنینو بەرامبەر هەندێك لە كێشەو گرفتەكان چاوپۆشی بكەین..

ئازاری دەروونی خۆت مەدەو بە وردبین بە دوای كێشەو گرفتەكاندا مەگەڕێ.. زۆر مەچۆرە وردەكارییەوەو ئاكۆكیەكان مەورووژێنە.. ڕۆژێك بە سەر هاوڕێیەكتدا هاوار دەكەیتو دەڵێیت: ئەو قسانەی دەیكەیت، مەبەستت منە!! بە سەر كوڕەكەتدا هاوار دەكەیتو دەڵێیت: دەتەوێت بە تەمبەڵیەكەت، نارەحەتو غەمبارم بكەیت!! بە هاوسەرەكەت دەڵێیت: بە ئەنقەست ماڵو منداڵەكەت، پشتگوێ دەخەیت!!

بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ بەردەوامو هەمیشە لێبوردە بووەو هەوڵی داوە، چێژو خۆشی لە ژیانی ببینێتو بە ڕقو كینە، ئازاری خۆی نەدات.. جاری وا هەبووە، پێغەمبەری خوداﷺ بە برسیەتی چۆتەوە بۆ ماڵەوەو پرسیاری كردووەو فەرموویەتی: هیچ خواردنێكتان لە لا هەیە؟! ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوەو وتوویانە: نەخێر.. پێغەمبەری خوداشﷺ فەرموویەتی: دەی كەواتە ئەمڕۆ بە ڕۆژوو دەبم.. كاتێك وتوویانە هیچمان نیە، هیچ كێشەو گرفتێكی دروست نەكردووەو نەیوتووە: بۆ خواردنێكتان دروست نەكردووە؟! ئەی بۆ ئاگادارتان نەكردم، بۆ ئەوەی خواردن بكڕم؟!

بەڵێ.. کەواتە بەرۆژوو دەبم.. رواه مسلم..

لەگەڵ خەڵکیشدا بە جوانترین شێوەی دڵ فراوانیو لێبوردەیی هەڵسوکەوتی دەکرد، هاوەڵێکی بەڕێز بە ناوی (کلثومي کوڕی حصین) دەفەرموێت: شەوێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ، لە جەنگی تەبوکدا، دەڕۆیشتمو بە هۆی دوورو درێژی ڕێگەشەوە باوێشکم دەداو خەریك بوو خەوم لێدەکەوت.. ئەو وشترەی کە لە سەری بووم، لە وشترەکەی پێغەمبەری خوداﷺ نزیك دەبۆوە، منیش لە ترسی ئەوەی ئەوەکو ئازاری قاچی پێغەمبەری خوداﷺ بدات، زوو زوو دوورم دەخستەوە، هەتا خەوم لێکەوتو وشترەکەم لە وشترەکەی پێغەمبەری خوداﷺ نزیك بۆوەو قاچی پیرۆزی پێغەمبەری خودایﷺ ئازاردا..

ئەو هاوەڵە بەڕێزە بە پەشۆکاویەوە، بەخەبەردێتو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە.. پێغەمبەری خوداشﷺ وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت، فەرمووی: بڕۆ.. بڕۆ.. نەیفەرموو: خۆ ڕێگە فراوانە، بۆ شان بە شانی من دەڕۆیت؟! یان نەیفەرموو: لەم ڕێگە گەورەو فراوانەدا، جێگەت نابێتەوە؟! نەخێر.. هیچ شتێك لەم قسانەی نەوتو دەروونی خۆشیو ئەو هاوەڵە بەڕێزەشی ئازار نەدا..

ڕۆژێکی تریان پێغەمبەری پێشەواﷺ لە ناو هاوەڵانیدا دەبێتو ئافرەتێك، قوماشێکی بە دیاری بۆ دەهێنێتو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، ئەم دیارییەم بە دەستی خۆم چنیووەو بۆم هێناوی، بۆ ئەوەی لەبەری بکەی..

پێغەمبەری خوداشﷺ لەبەر ئەوەی زۆر پێویستی پێی بوو، ڕۆیشتەوە بۆماڵەوەو لەبەری کردو پاشان گەڕایەوە بۆ ناو هاوەڵانی.. کاتێك هاتەوە، پیاوێك پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، ئەو جلوبەرگەی بەرتم دەدەیتێ؟ پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ، بە پەلەو یەکسەر گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو جلوبەرگەکەی داناو قەدی کردو جلوبەرگە کۆنەکەی خۆی لەبەر کردەوەو ناردی بۆ پیاوەکە..

خەڵکەکە کاتێك ئەمەیان بینی، وتیان: بە ڕاستی کارێکی باشت نەکرد!! بۆ داوات لێکرد؟! خۆ تۆ دەزانی هەر کەس داوای هەر شتێکی لێبکات، دەیداتێو دەست نانێت بە ڕوویەوە!! پیاوەکەش لە وەڵامدا وتی: سوێند بە خودا بۆ ئەوە داوام لێکرد، بۆ ئەوەی کاتێك کە مردم، بیکەن بە کفن بۆم..

بەڵێ.. کاتێك ئەو پیاوە کۆچی دوایی کرد، کەسوکارەکەی بە جلوبەرگەکەی

پێغەمبەری خوداﷺ کفنیان کرد.. رواه البخاري..

شەوێك پێغەمبەری خوداﷺ پێش نوێژی عیشای بۆ هاوەڵانی ئەنجام دەدا، حەسەن‌و حوسەینی کچەزای پێغەمبەری خوداﷺ هاتنە ژوورەوە بۆ ناو مزگەوت‌و بەرەو لای باپیرەیان هەنگاویان نا، پێغەمبەری خوداشﷺ لە نوێژدا بوو، کاتێك دەچووە سوجدە، هەر دوو منداڵەکە دەچوونە سەرپشتی پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ، کاتێکیش پێغەمبەری خوداﷺ دەیویست سەری لە سوجدە بەرز بکاتەوە، زۆر بە نەرمونیانی هەردووکیانی لە سەر پشتی دادەگرت‌و لە تەنیشت خۆیەوە دایدەنان، کاتێکیش دەچووە سوجدە، دوبارە دەچوونەوە سەر پشتی، هەتا نوێژەکە تەواو بوو، بەم شێوەیەیان دەکرد، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ سلاوی دایەوەو هەردووکیانی لە سەر رانی پیرۆزی دانا..

ئەبوهورەیرەﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بیان بەمەوە بۆ لای دایکیان؟ پێغەمبەری خوداﷺ پەلەی نەکرد، پاش کەمێك ئەوسا پێیانی فەرموو: بڕۆنەوە بۆ لای دایکتان، ئەوانیش هەستان‌و گەڕانەوە بۆ ماڵەوە.. رواه أحمد..

رۆژێکی تریان بە هەمان شێوە، پێغەمبەری خوداﷺ پێش نوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، کاتێك دەچێتە سوجدە، حەسەن، یان حوسەین دەچێتە سەر پشتی پێغەمبەری خوداﷺ، پێغەمبەری خوداشﷺ دڵی نایات دایبەزێنێت، هەر بۆیە سوجدەکەی زۆر درێژ دەکاتەوە، کاتێك نوێژەکە تەواو دەبێت، هاوەڵان دەپرسن‌و دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەوە چی بوو، هەرگیز سوجدەکانت بەم شێوەیە نەبووە؟! ئایا نیگاو سروشتی پەروەردگارت بۆ دابەزی؟! پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: نەخێر.. هیچ نەبوو، بەڵام کورەکەم لە سەر پشتم بوو، حەزم نەکرد پەلەی لێبکەم‌و دایبەزێنم.. رواه الحاكم..

رۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ بە برسێتی دەچێت بۆ ماڵی ئوم هانئی کچی ئەبوطالب‌و دەفەرموێت: خواردنێکت لە لایە، بۆ ئەوەی بیخۆم؟ ئەویش دەڵێت: تەنها هەندێك پارچە نانی رەق‌و وشك نەبێت، هیچم لە لانیەو شەرمیش دەکەم بۆتی بهێنم.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: بچۆ بیهێنە.. کاتێك دەیهێنێت، پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ ئاودا تێکەڵی دەکات‌و پاشان لە ئوم هانئی ئامۆزای دەپرسێت، ئایا هیچ پێخۆرێکتان نیە؟ ئەویش دەڵێت: تەنها کەمێك سرکەمان هەیە.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: بیهێنە.. سرکەکە دەهێنێت‌و دەیکات بە سەر نان‌و ئاوەکەداو دەست دەکات بە خواردنی، پاشان سوپاسی پەروەردگاری دەکات‌و

دەڵێت: سرکە باشترین پێخۆرو خواردنە.. رواه الطبراني..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ ئاوا بە سادەیی‌و ساکاری، ژیانی بەسەر دەبرد..

جارێکی تریان پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج دەکەونە رێ، کاتێك لە رێگە لادەدەن، پێغەمبەری خوداﷺ دەچێت دەست نوێژ دەگرێت‌و پاشان دەست دەکات بە نوێژ کردن.. جابری کوری عبداللهؓ دێت‌و لە لای چەپی پێغەمبەری خوداوەﷺ دەست دەکات بە نوێژ کردن، پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر بە ئارامی‌و لەسەرخۆیی، بەرەو دەستە راستی خۆی دەیهێنێت‌و لە تەنیشتیەوە دەیوەستێنێت‌و لە سەر نوێژەکەیان بەردەوام دەبن.. پاشان جەباری کوری صخرؓ دێت‌و لە لای چەپی پێغەمبەری خوداوەﷺ دەست دەکات بە نوێژ کردن، ئەمجارەیان پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بە ئارامی هەردووکیان دەگرێت‌و بە هێمنی پاڵ بە هەردووکیانەوە دەنێت‌و دەیان بات بەرەو دواوە، بۆ ئەوەی لە پشتیەوە بوەستن‌و درێژە بە نوێژەکەیان بدەن.. رواه مسلم..

رۆژێکی تر، ئافرەتێك کۆرپەیەکی تازە لە دایك بوو دەهێنێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، بۆ ئەوەی دۆعای بۆ بکات.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ منداڵەکە دەکاتە باوەشی، یەکسەر میز دەکات‌و جل‌وبەرگەکانی پێغەمبەری خوداﷺ تەڕ دەکات.. پێغەمبەری خوداﷺ داوای ئاو دەکات‌و دەیکات بە سەر شوێنی میزەکەدا، جگە لەمە هیچ کارێکی تر، یان هیچ قسەیەکی نەکرد.. تورە نەبوو، ناوچەوانی نەدا بەیەکداو خۆی گرژو مۆن نەکردو کارەکە کۆتایی هات..

ئیتر بۆچی دڵ‌و دەروونمان ئازار بدەین‌و کێچێك بکەین بە گایەك؟! لەبەر ئەوەی مەرج نیە، هەموو ئەو رووداوانەی لە دەوروبەرت روودەدەن، لە١٠٠٪ بە دڵی تۆ بێت‌و پێیان خۆشحاڵ‌و ئاسودە بیت!!

وإن تجد عيباً فسدَّ الخللا          جل من لاعيب فيه وعلا..

بەڵێ.. ئەگەر کەم‌وکوڕییەکت بینی، داپۆشەو گەورەی مەکە، لەبەر ئەوەی تەنها پەروەردگار، بێ هەڵەو کەم‌وکوڕییە..

هەندێك لە خەڵکی، هەندێك باوك‌و دایك، هەندێك لە مامۆستایان، بە هۆی تورەییانەوە ئازاری دەروونی خۆیان دەدەن‌و کێشە بچوکەکان زۆر گەورە دەکەن.. هەڵە شاراوەکان، هەروەها کەم‌وکوڕییە نادیارەکان، دەرمەخەو لێبوردەبەو با دڵ‌و دەروونت فراوان بێت‌و پۆزشی بەرامبەر وەربگرە، بە تایبەت پۆزشی ئەو کەسانەی هیچ

بەرژەوەندییەکیان لەگەڵتدا نیەو تەنها لەبەر خۆشەویستی پۆزشت بۆ دەهێننەوەو داوای لێبوردنت لێدەکەن..

ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ لە سەر دوانگە ئامۆژگاری ئیماندارانی دەکرد، لەپڕ بە دەنگێکی زۆر بەرز، کە ئافرەتان لە ماڵەکانی خۆیانەوە گوێیان لێبوو، هاواری کردو فەرمووی: ئەی ئەو کەسانەی بە زمانو سەرزارەکی باوەڕتان هێناوە، بەڵام باوەڕ نەچووەتە دڵتانەوە، غەیبەتی موسڵمانان مەکەنو بە دوای عەیبوعارو کەموکورییەکانیاندا مەگەڕێن، لەبەر ئەوەی هەر کەسێك شوێن عەیبوعاری براکەیدا بگەڕێت، ئەوا پەروەردگار بە دوای عەیبوعارو کەموکورییەکانیدا دەگەڕێت، هەر کەسیش پەروەردگار بە دوای عەیبوعارو کەموکورییەکانیدا بگەڕێت، ئەوا سوكو ڕیسوای دەکات، ئەگەر لە ناو ماڵەکەی خۆشیدا بێت.. رواه أحمد وأبوداود..

بەڵێ.. مەبە بە ڕاوچی بۆ هەڵەو کەموکوری خەڵکیو بە دوای عەیبوعاریاندا مەگەڕێو لێبوردەبە.. پێغەمبەری خوداﷺ هەمیشە سوور بوو لە سەر ئەوەی کێشەو گیروگرفتەکان گەورە نەکرێنو نەوروژێنرێن.. ئەوەتا پێغەمبەری خوداﷺ لە ناو هاوەڵە ئازیزەکانیداو لە کۆڕو دانیشتنو کەشێکی ئارامدا دانیشتووەو بە هاوەڵانی دەفەرمووێت: کەس لە بارەی هاوەڵەکانمەوە قسەیەکم بۆ نەهێنێت، چونکە من دەمەوێت بە سنگێکی پاکەوە بێمە ناوتان.. رواه أبوداود..

**دەروونت ئازار مەدە..**

ئەو تەپوتۆزەی لە سەر دڵو دەروونتە، مەیوروژێنە، لەبەر ئەوەی ئارامو جێگیرە.. ئەگەر وروژا، لوتت بگرە، با ئازارت نەداتو چێژو خۆشیش لە ژیانت ببینەو بەختەوەر بژی..



## دان بە هەڵەکانتدا بنێو خۆ بە گەورەزان مەبە..

چارەسەری زۆرێك لەو کێشەو گرفتو دوژمنانەیەتیانەی، کە بە هۆیەوە ساڵێك، یان دوو ساڵ، بەڵکو جاری وایە لەوانەیە بە درێژایی هەموو تەمەن درێژە بکێشێت، بریتیە لەوەی کە کەسێك، بە بەرامبەرەکەی بڵێت: من هەڵە بووم‌و داوای لێبوردنت لێدەکەم..

کاتێك وشەیەکی دڵ شکێن بە سەر زارتدا دێت، یان پەیمانێك نابەیتە سەر، پەلە بکەو پێش ئەوەی پشکۆی رقی بەرامبەر بگەشێتەوە، بە ناوی لێبوردن‌و پۆزش هێنانەوە، رق‌و کینەی دەروونی بکوژێنەرەوەو بڵێ: بە داخەوە.. حەق بە تۆیە.. جگە لە چاکە هیچ شتێکی ترت لێ چاوەڕێ ناکەم.. بەم قسانەو چەندان قسەی جوانی تر، دەتوانی رێگە بە تەشەنە کردنی ناکۆکیەکان بگرێت‌و دڵ‌و دەروونی بەرامبەر، ئاشت بکەیتەوە..

چەند جوانە خەڵکی گوێیان لەم وشە جوانانە بێت‌و خۆ بە کەمزان بین‌و بەرگی خۆ بە گەورەزانین، لەبەرماندا داماڵین!!

ناکۆکیەك دەکەوێتە نێوان دوو هاوەڵی بەرێزی وەك بیلال‌و ئەبوزەڕەوە، هەردووکیشیان هاوەڵی نزیکی پێغەمبەری خودانﷺ، بەڵام مرۆڤن.. ئەبوزەڕ رضي الله عنه تورە دەبێت‌و بە بیلال رضي الله عنه دەڵێت: ئەی کوری رەش پێست، یان ئەی کوڕی ژنە رەشەکە.. بیلالیش رضي الله عنه سکاڵای خۆی دەباتە لای پێغەمبەری خوداﷺ..

پێغەمبەری خوداشﷺ بانگی ئەبوزەڕ دەکات‌و پێی دەفەرموێت: ئایا ئەو قسەیەت بە بیلال وتووە؟! ئەبوزەڕیش دەڵێت: بەڵێ..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئەی بۆ ناوی دایکیت هێنا؟! ئەبوزەڕ لە وەڵامدا دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك کەسێك قسەو جنێو بە کەسێك دەدات، باسی باوك‌و دایکیشی دەکات‌و ئەوانیش دەهێنێتە نێو ناوانەوە.. پێغەمبەری خوداﷺ پێی دەفەرموێت: تۆ کەسێکی هێشتا نەریتی نەفامیت تێدا ماوە..

ئەبوزەڕ رضي الله عنه رەنگی دەگۆڕێت‌و دەڵێت: تا ئێستاش خۆ بەگەورەزانینم تیادایە؟! پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: بەڵێ.. پاشان پێغەمبەری خوداﷺ بەرنامەیەکی

زۆر بە نرخی پێشکەش کردن، بۆ ئەوەی پاپەندبن پێوەیی و پەیرەوی بکەن، هەر بۆیە فەرمووی: بە دڵنیاییەوە ئەو کەسانەی کە پەروەردگار خستوویەتیە ژێر دەستتانەوە، براتانن.. هەر کەسێك، برایەکی لەژێر دەستدا بوو، لەو خواردنەی دەرخوارد بدات، کە خۆی دەیخوات.. لەو جل‌وبەرگەشی لەبەر بکات، کە خۆی لەبەری دەکات.. با کارێکیشی پێنەکات، کە لە توانایدا نیە، ئەگەر نا، با خۆشی یارمەتی بدات..

ئەی ئەبوزەرﷺ لە دوای ئەو رووداوە، چی کرد؟!

بەڵێ.. ئەبوزەرﷺ کەوتە رێ، هەتا گەیشت بە بیلال‌و داوای لێبوردنی لێکردو لەبەر دەستی بیلالدا دانیشت، پاشان لە زەویەکە نزیك بۆوە، هەتا ڕوومەتی خستە سەر زەوی‌و وتی: دەی بیلال قاچت بخەرە سەر ڕوومەتم.. رواه مسلم..

بەڵام بیلالێك لەبەر دەستی پێشەوای مرۆڤایەتیدا پەروەردە بوو بێت، چۆن کاری وادەکات؟! چۆن دەروونی خۆیشی‌و ئەبوزەریش نارەحەت‌و غەمبار دەکات؟!

نەخێر.. نەخێر.. بە دڵێکی فراوانەوە، لێبوردنی ئەبوزەری وەرگرت‌و گەردنی ئازاد کرد.. هاوەڵان ئاوا گڕو گەرمی کێشەو ناکۆکیەکانی نێوانیان خامۆش دەکردو نەیان دەهێشت تەشەنە بسەنێت..

لە نێوان ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەردا (خودایان لێ ڕازی بێت) ناکۆکیەك دروست دەبێت‌و ئیمامی ئەبوبەکرﷺ، ئیمامی عومەرﷺ توڕە دەکات.. ئیمامی عومەرﷺ بە توڕەییەوە هەڵدەستێت‌و دەڕوات.. کاتێك ئیمامی ئەبوبەکرﷺ ئەمە دەبینێت، پەشیمان دەبێتەوەو دەکەوێتە شوێن ئیمامی عومەرﷺ و داوای لێبوردنی لێدەکات، بەڵام ئیمامی عومەرﷺ ئاوڕ ناداتەوە.. ئیمامی ئەبوبەکریشﷺ هەر بە دوایدا دەڕوات‌و بەردەوام داوای لێبوردنی لێدەکات، هەتا دەگەنە بەر دەرگای ماڵی ئیمامی عومەر، ئیمامی عومەرﷺ دەچێتە ژوورەوەو دەرگاکە بە ڕووی ئیمامی ئەبوبەکرداﷺ دادەخات..

ئیمامی ئەبوبەکرﷺ بەرەو لای پێغەمبەری خوداﷺ دەکەوێتە ڕێ‌و پاشان بە بێدەنگی دادەنیشێت‌و پاش کەمێك ئیمامی عومەریشﷺ پەشیمان دەبێتەوەو بە دڵێکی سپی‌و پاکەوە، بەرەو کۆڕو مەنزڵی پێغەمبەری خوداﷺ دەکەوێتە ڕێ، کاتێك دەگاتە لای پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانی، سڵاو دەکات‌و لە تەنیشت پێغەمبەری خوداوەﷺ دادەنیشێت‌و ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوەو باسی ئەوەش دەکات، کە چۆن ئیمامی ئەبوبەکرﷺ داوای لێبوردن‌و لێخۆشبوونی کردووە، بەڵام ئەم پشتی تێکردووەو

رازی نەبووە..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گوێی لەم قسانە دەبێت، تورە دەبێت.. ئیمامی ئەبوبەکریشﷺ کاتێك تورە بوونی پێغەمبەری خوداﷺ دەبینێت، دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سوێند بە خودا من ستەمم لەو کردو خەتای من بوو، بەردەوام بەرگری لە ئیمامی عومەرﷺ دەکردو پۆزشی دەهێنایەوە.. پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئایا واز لە هاوەڵەکەم ناهێنن؟! کاتێك بە خەڵکیم وت: من پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودام، هەمووتان، پێتان وتم: درۆ دەکەیت، بەڵام تەنها ئەبوبەکرﷺ وتی: راست دەکەیتو باوەری پێهێنام.. رواه البخاري..

ئاگاداربە، لەو کەسانە نەبیت کە هەوڵی چاکسازی خەڵکی دەدەن، بەڵام خۆیان لە دەست دەدەن، ئەگەر هاتوو کەسێك بوویت، لەو کەسانەی کە ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن، یان خەڵکی شوێن گوفتارو رەفتارەکانیان دەکەون، وەك مامۆستا بۆ قوتابیەکانی، یان باوكو دایك بۆ منداڵەکانیان، ئەوا بزانە تۆ لە ژێر چاودێریدایتو خەڵکی هەڵسوکەوتو کردارو گوفتارەکانت بەهەند وەردەگرن، دەی تۆش بە گوێرەی توانات، هەتا پێت دەکرێت ئاگات لە خۆتو لە ئاکارو گوفتارەکانت بێت..

ئیمامی عومەرﷺ رۆژێك جلوبەرگی بە سەر خەڵکیدا دابەش کردو هەر کەسێك یەك پارچەی بەرکەوت، پاشان چووە سەر دوانگە بۆ ئەوەی وتاری هەینی پێشکەشی موسڵمانان بکاتو سەرەتای وتارەکەی بەوە دەست پێکردو فەرمووی: پەروەردگار لە سەر پێویست کردوون، کە ملکەچیو گوێرایەڵیم بکەن.. پیاوێك لە ئامادەبووان هەستاو وتی: نە ملکەچیت دەکەینو نە گوێرایەڵیشت دەبین..

ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: بۆچی؟! پیاوەکە وتی: لەبەر ئەوەی تەنها یەك پارچە جلوبەرگت دا بە ئێمە، کە چی خۆت دوو پارچە جلوبەرگت لەبەردایە!! ئیمامی عومەرﷺ چاوی بە ئامادەبوواندا گێرا، وەك ئەوەی بە دوای کەسێکدا بگەرێت، کاتێك عبداللەی کوری بینی، فەرمووی: ئایا پارچە جلوبەرگەکەی خۆتت نەدا بە من، بۆ ئەوەی ئامادەی وتاری هەینی بم پێوەی؟

عبدالله فەرمووی: بەڵێ، بەشە جلوبەرگەکەی خۆمم پێدایت..

پیاوەکە کاتێك گوێی لەم قسەیە بوو، دانیشتو وتی: ئا ئێستا ملکەچو گوێرایەڵ دەبین.. کێشەو گرفتو گومانەکەش کۆتایی هاتو گەورە نەکرا..

خۆشەویستەکەم پەلەم لێ مەکە، منیش لەگەڵ تۆی بەرێزدا هاورام لە سەر ئەوەی

شێوازی دەربڕینی نارەزایی ئەو پیاوە، بەرامبەر ئیمامی عومەرﷺ گونجاوو شیاو نەبوو، بەڵام سنگ فراوانی ئیمامی عومەرﷺو بە ئاسایی وەرگرتنی ئەو هەڵوێستە جێگەی سەرسوڕمان‌و سەرسامییە.. بڕوانە چۆن چۆن ئاوی بە ئاگری گوماندا کردو کۆتایی بە کێشەکە هێنا!!

ئەگەر دەتەوێت خەڵکی پێشنیارو ئامۆژگارییەکانت وەربگرن، جا ئەو کەسانە هاوسەر، یان منداڵ، یان دۆست‌و هاوڕێ‌و خوشك‌و برابن، یان هەر کەسێکی تر بن، دەبێت تۆش ئامۆژگاری‌و پێشنیاری خەڵکی پەسەند بکەیت‌و هەرگیز خۆت بە گەورە نەزانیت..

کاتێك کەسێك زۆر بە هاوسەرەکەی دەڵێت: زیاتر گرنگی بە منداڵەکان بدە.. نان‌و چێشت‌و خواردنت با چاکتر بێت.. ژوورەکان ڕێك‌وپێك بکەو...هتد.. لە بەرامبەریشدا هاوسەرەکەی بەم وتە جوانانە وەڵام بداتەوەو بڵێت: بە سەر چاو.. بە ویستی خودا.. فەرمان، فەرمانی بەڕێزتەو....هتد، بەڵام ئەمجارەیان‌و لە ڕۆژێکی تردا بە مێردەکەی بڵێت: منداڵەکان کاتی تاقیکردنەوەیانەو زیاتر پێویستیان بەوە هەیە، لە ناویاندا ئامادەییت هەبێت، هەوڵ بدە کاتێك لەگەڵ هاوەڵانتدا دەچیتە دەرەوە، زۆر دوانەکەویت.. بەڵام مێردەکەی کاتێك گوێی لەم ئامۆژگارییە جوانانە دەبێت هاوار بکات‌و بڵێت: دوا دەکەوم یان نا، ئەوە کاری تۆ نیەو خۆت لە ئیشی من هەڵمەقورتێنە..

پرسیارت لێدەکەم‌و پێت دەڵێم: ئایا ئەو هاوسەرە بەڕێزە، جارێکی تر بە هاوشێوەی جارەکانی پێشوو، ئامادەیی تێدا دەبێت، ئامۆژگاری‌و پێشنیارەکانی مێردەکەی وەربگرێت‌و جێبەجێیان بکات؟! بە دڵنیاییەوە نەخێر..

کەسی وریاو زیرەك، ئەو کەسەیە کەلێن‌و کەلەبەرو بۆشایی دیوارەکانی ماڵەکانی دەگرێت، بۆ ئەوەی بوار نەدات، خەڵکی شك‌و گومانی بۆ دروست بکەن‌و بە کێشەو گرفتەکانی بزانن‌و بۆ ئەوەی نەبێت بە بنێشتە خۆشەی سەر زاری خەڵکی..

بیرم دێت یەکێك لە ڕێکخراوە بانگخوازییەکان، بانگهێشتی هەندێك بانگخوازی کرد، بۆ کۆبوونەوەو پێشکەش کردنی وتارو ئامۆژگاری لە وڵاتی ئەلبانیا.. سەرۆکی ڕێکخراوە بانگخوازییەکانی ئەلبانیاش ئامادەی کۆبوونەوەکە بوو، کاتێك بینیمان سەرمان سوڕما، لەبەر ئەوەی تەنها تاڵە موویەك بە ڕوخسارییەوە نەبوو!! بە سەرسامییەوە سەیری یەکترمان دەکرد، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە نوێنەرایەتی بانگخوازان دەکەن، وا باوە کە ڕیشیان هەبێت، لە کاتێکدا کە ئەم سەرۆکی ڕێکخراوە بانگخوازییەکانیش بوو!!

کاتێك کۆبوونەوەو کۆنفرانسەکە دەستی پێکرد، بە پێکەنینەوە وتی: ئامادەبووان، من کەسێکی کۆسەمو بە هیچ شێوەیەك ڕیشم نیە، با ئاگاداربن.. کاتێك گوێمان لە وتەکەی بوو، بە دەمیەوە پێکەنینو سوپاسمان کرد، لەبەر ئەوەی شكو گومانەکەی لە دڵ دەرکردین..

پێغەمبەری خوداﷺ لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزاندا، لە مزگەوتە پیرۆزەکەیدا دەمایەوەو خۆی بۆ خوداپەرستی یەکلایی دەکردەوە، یەکێك لە هاوسەرەکانی دێت بۆ لایی‌و کەمێك دەمێنێتەوەو پاشان هەڵدەستێت، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆماڵەوە، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ پێی خۆش نەبوو، بەو شەوە تاریکە بە تەنها بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، هەر بۆیە هەستاو لەگەڵیدا کەوتە ڕێ، بۆ ئەوەی بیباتەوە بۆ ماڵەوە.. کاتێك لە ڕێگە دەرۆیشتن، دوو پیاو بە لایاندا تێپەڕین.. دوو پیاوەکەش کاتێك پێغەمبەری خودایانﷺ بینی ئافرەتێکی لەگەڵدایە، ڕۆیشتنەکەیان خێراتر کرد..

پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ئەوەی نەیەڵێت، گومان لە دڵو دەروونی ئەو دوو پیاوەدا دروست بێت، پێی فەموون: ئەوە فلانە کەسی هاوسەرمە لەگەڵمدا..

دوو پیاوەکەش وتیان: سبحان الله!! ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئایا ئێمە گومان لەوە دەکەین، کە ئافرەتی نامەحرەمت لەگەڵدا بێت؟!

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: شەیتان بە هەموو ئەو شوێنانەی مرۆڤدا دەڕوات، کە خوێنیان تێدا هاتوچۆ دەکاتو لەوە ترسام گومانی خراپ بخاتە دڵتانەوە.. متفق علیه..

**ئازایەتی..**

ئازایەتی ئەوە نیە، لە سەر هەڵەکانت سور بیت، بەڵکو ئازایەتی ئەومیە، دان بە هەڵەکانتدا بنێیتو هەوڵ بدەیت دوبارەی نەکەیتەوە..

# کلیلی هەڵەکان..

هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هەڵەکاندا پێویستی بە هونەرو لێزانینە.. هەموو دەرگایەکیش، کلیلی تایبەت بە خۆی هەیە.. بۆ چوونە ژوورەوەی دڵەکانیش، دەبێت ڕێگەو دەروازەی تایبەت بە خۆیان بگرینە بەر..

ئەگەر کەسێك کەوتە هەڵەیەکی گەورەوەو هەواڵی ئەو هەڵەیەش لە ناو خەڵکیدا بڵاوبۆوەو کێشەکە بوو بە مایەی باسو خواسی خەڵکیو چاودێری ئەوەیان لێکردی، بۆ ئەوەی بزانن چی دەکەیتو هەڵوێستت چۆن دەبێت، هەوڵبدە بە شتێکەوە سەرقاڵیان بکە، بۆ ئەوەی کاتو ماوەیەکت هەبێت، تا لێکۆڵینەوە دەربارەی کێشەکە ئەنجام دەدەیتو سەرەداوێکت دەست دەکەوێت..

پێغەمبەری خوداﷺ لە کاتی گەڕانەوەی، لە یەکێك لە جەنگەکاندا، لەگەڵ هاوەڵانیدا لە شوێنێك لادەدەن، بۆ ئەوەی پشوویەك بدەن.. موسڵمانە کۆچکەرەکان، گەنجێك بە ناوی جەهجاهی کوڕی مەسعود دەنێرن، بۆ ئەوەی ئاویان لە بیرێك بۆ هەڵبگۆزێت.. بە هەمان شێوە موسڵمانە پشتیوانەکانیش گەنجێکیان بە ناوی سەنانی کوڕی وەبری جوهەینەوە بۆ هەمان کار نارد.. هەر دوو گەنجەکە لە سەر ئاو، کێشە دەکەوێتە نێوانیانەوە، هەتا گەنجە جوهەینەکە هاواری لە پشتیوانەکان کردو داوای یارمەتی لێکردن، جەهجاهیش بە هەمان شێوە هاواری بۆ کۆچکەران کردو داوای یارمەتیو بە دەنگەوە هاتنی لێکردن.. هەر دوولا وروژانو ناکۆکیەکە تەشەنەی کردو گەورە بوو، خەڵکەکەش تازە لە جەنگ گەڕابونەوەو هەمووان تیرو شیر بە دەست بوون..

پێغەمبەری خوداﷺ ویستی کێشەکە کپ بکاتەوە، بەڵام سەرۆکی دووڕووەکان، عبداللەی کوڕی سەلول، هەوڵیدا پشکۆی کێشەو ناکۆکیەکە، بگەشێنێتەوەو وتی: پەنامانداو خاکی خۆمان بە ڕوویاندا ئاوەڵا کردو زۆرو بەهێزمان کردن.. هەر وەك وتراویشە: سەگ قەڵەو بکەیت، دەتخوات، بەڵام برسی بکەیت، ملکەچت دەبێتو شوێنت دەکەوێت!! پاشان ئەو ناپاکە وتی: سوێند بە خودا، کاتێك گەڕاینەوە بۆ مەدینە، سەردارو ڕێزدارەکان (کە مەبەستی خۆیان بوو) سوكو ڕیسواکان شار بە دەردەکەن (کە مەبەستی لە پێغەمبەرو هاوەڵە کۆچکەرەکان بوو).. پاشان ڕووی کردە لایەنگرانیو

وتی: خۆتان بە دەستی خۆتان واتان لە خۆتان کردو ماڵو خاکو سەروەتو سامانتان خستە بەردەمیان، ئەگەر واتان نەکردایە، دەچوون بۆ شوێنو جێگەو ڕێگەیەکی ترو نەدەهاتن بۆ سەر خاکو ناوی ئێوە..

ئەم خراپەکارە، لە هەرەشەو پیلانە شەیتانیەکانی بەردەوام بوو، لایەنگرە دووڕووەکانیشی پشتگیریان لێدەکردو هانیان دەدا..

کاتێک پیلانگێڕان ئەم قسانەیان دەکرد، گەنجێک بە ناوی زەیدی کوڕی ئەرقەم گوێی لەم قسانە دەبێتو ئەم هەواڵە بە پێغەمبەری خوداﷺ رادەگەیەنێت، لەو کاتەشدا کە هەواڵەکە دەهێنێت، ئیمامی عومەرﷺ لە لای پێغەمبەری خوداﷺ دەبێت، هەر بۆیە تورە دەبێتو دەڵێت: ئەو دووڕووە چۆن دەتوانێت ئاواو ئاوا بڵێتو بەو شێوازە ناشیرینە لە بارەی پێغەمبەری خوداﷺو هاوەڵانیەوە بدوێت؟!

ئیمامی عومەرﷺ دەیزانی بە کوشتنی ئەو دووڕووە، ئاژاوەکە کۆتایی دێت، بەڵام بە لایەوە باش بوو، ئەو کەسەی بەو کارە هەڵدەستێت، لە پشتیوانان بێت، نەک لە کۆچکەران، هەر بۆیە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ فەرمان بە عوببادی کوڕی بشیر بدە، بۆ ئەوەی بیکوژێت..

بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ زۆر دانا بوو، دەیزانی کاتەکە کاتی ئەوە نیەو خەڵکەکە لە جەنگ هاتوونەتەوەو هێشتا کاریگەریو گەرمەوگوڕی کوشتارو جەنگیان بە سەرەوە ماوەو شتێکی باش نیە زیاتر ئەو کاریگەرییەیان قوڵ بکاتەوەو ئاژاوەکە گەورەتر بێت، هەر بۆیە فەرمووی: عومەر چۆن دەبێت، ئەی نازانی دوایی خەڵکی دەڵێن: محمد هاوەڵانی خۆی دەکوژێت!! نەخێر.. بەڵکو بە خەڵکەکە بڵێ: با بکەونە ڕێ..

خەڵکەکە بۆ ئەوە لایان دابوو، پشوویەک بدەنو بە فێنکی بکەونە ڕێ، لەم کاتی گەرماو خۆرەتاوەدا چۆن دەتوانن درێژە بە ڕۆیشتن بدەن؟! لەبەر گەرماو تیشکی خۆر ڕۆیشتنیش، هیچ کاتێک لە ڕەوشتی پێغەمبەری خوداﷺ نەبوو، بەڵام بە هەر حاڵ خەڵکەکە کەوتنە ڕێو سەرۆکی دووڕووەکانیش، هەواڵی ئەوەی پێگەیشت، کە زەیدی کوڕی ئەرقەم، قسەکانی گەیاندووە بە پێغەمبەری خوداﷺ، هەر بۆیە بەرەو لای پێغەمبەری خوداﷺ کەوتە ڕێو دەستی کرد بە پاکانەو سوێندی خواردو وتی: بە هیچ شێوەیەک قسەی وام نەکردووەو ئەو گەنجەش، کە ئەو قسانەی بۆ هێناویت درۆ دەکات..

لەبەر ئەوەی عبداللەی کوڕی ئوبەی سەلول گەورەی هۆزەکەی بوو، هەندێک لە موسڵمانە پشتیوانەکان بەرگریان لێکردو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لەوانەیە ئەو

گەنجە بە تەواوی لە قسەکان تێنەگەیشتبێت‌و عبداللەی کوڕی ئوبەی وای نەوتبێت..

پێغەمبەری خوداش ﷺ لە ڕۆیشتنی خۆی بەردەوام بوو، ئاوڕیشی بۆ کەس نەدایەوە، هەتا یەکێك لە گەورە پیاوانی پشتیوانان بە ناوی ئوسەیدی کوڕی حوزەیر هات‌و سڵاوی لە پێغەمبەری خودا ﷺ کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە ڕاستی لە کاتێکی ناخۆش‌و نارەحەتی ئاوادا دەکەویتە ڕێ؟! هەرگیز نەمان بینیووە لە کاتی ئاوادا بکەویتە ڕێ!!

پێغەمبەری خودا ﷺ ئاوڕی دایەوەو فەرمووی: ئایا پێت نەگەیشتووە، هاوەڵەکەتان چی وتووە؟! ئەویش وتی: کام هاوەڵ؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: عبداللەی کوڕی ئوبەی.. ئوسەید دەڵێت: چی وتووە؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: وتویەتی ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مەدینە سەردارو بەڕێزەکان، سوك‌و ڕیسواکان شار بەدەر دەکەن..

ئوسەید تورە دەبێت‌و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ سوێند بە خودا ئەگەر بتەوێت تۆ دەتوانیت ئەو شار بەدەر بکەیت‌و بە خودای گەورە ئەو سوك‌و ڕیسوایەو تۆ سەردارو بەڕێزیت، پاشان وتی: لەگەڵیدا نەرم‌ونیان بە، لەبەر ئەوەی وا دەزانێت تۆ نەتهێشتووە ببێت بە پادشاو گەورەی هۆزەکەی.. پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ قسەیەکی تری نەکردو درێژەی بە ڕۆیشتنەکەی دا..

خەڵکەکەش مقۆمقۆیان تێکەوت‌و دەیان وت: بۆچی لەم کاتە گەرم‌و نارەحەتەدا بکەوینە ڕێ؟!

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چی وەڵامدانەوە؟! چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو حاڵەتەدا کرد؟! دەنگ‌وباسەکە بڵاوبۆوەو خەڵکەکەش کەم‌و زیاد، قسەیان دەربارەی ڕووداوەکە دەکرد.. سوپای موسڵمانان خەریك بوو بشڵەژێت، بە لای کۆمەڵە هۆزێکیشدا دەڕۆیشتن، کە دوژمنی سەرسەختی موسڵمانان بوون..

پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی سوپای موسڵمانان خەریك‌و سەرقاڵ بکات، بۆ ئەوەی ئەو کێشەیەیان بیر بەرێتەوە، هەر بۆیە بەو گەرمایە خەڵکەکەی خستە ڕێ، بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن، هەتا خۆرئاوا بوو..خەڵکەکە گومانیان برد، پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ نوێژو پشوودان لابدات، بەڵام تەنها چەند ساتێکی کەم بۆ ئەنجامدانی نوێژ لایانداو دوبارە کەوتنەوە ڕێ..

بەڵێ.. ئەو شەوە، هەتا بەرەبەیان بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن‌و پاشان نوێژی بەیانییان

ئەنجامداو دوبارە کەوتنەوە ڕێو زۆر ماندوو بوونو تیشكو گەرمای خۆریش زۆر ناڕەحەتی کردن، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هەستی کرد، خەڵکەکە تەواو ماندوو بوونو تاقەتی قسەو باسیان نەماوە، فەرمانی پێدان کاروانەکە بخەنو پشوو بدەن، خەڵکەکە ئەوەندە هیلاكو ماندوو بوون، کاتێك لە وڵاخەکانیان دابەزینو کەوتنە سەر زەوی، یەکسەر خەویان لێکەوت، ئەمەش بۆ ئەوەی سەرقاڵ بنو وتە ناشیرینەکانی ئەو دووڕوومیان بیر بچێتەوە..

پاشان هەستان لە خەوو دوبارە کەوتنەوە ڕێ، هەتا گەیشتنەوە شاری مەدینەو هەر کەسەو ڕووی کردە ماڵی خۆیو بڵاوەیان لێکرد.. لە دوای گەڕانەوەیان بۆ شاری مەدینە، پەروەردگار لەو بارەیەوە ئەم ئایەتە پیرۆزانەی دابەزاند، کە دەفەرموێت:

﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ ۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَـٰكِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾ المنافقون. واتە: (ئەوانە کەسانێکن دەڵێن بە خەڵکی: ماڵو سامان مەبەخشن بەو کەسانەی کە لە دەوری پێغەمبەری خودان، تا بڵاوەی لێ بکەن!! (مەبەستیان هەژارانی کۆچبەرانە، ئەی نازانن) هەرچی گەنجینەکان هەیە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەر خودا خاوەنیانە، بەڵام دووڕووەکان ئەم ڕاستیە تێناگەنو لە نهێنیەکان سەر دەرناکەن* ئەو دووڕووانە دەڵێن: سوێند بە خودا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە (دیارە کە بەو حاڵەشەوە بەشداری غەزایان کردووە، بە ناچاریی، یان بۆ تەماعو ئاشوب نانەوە) دەبێت ئەوەی کە دەسەڵاتدارو بەڕێزو پیاوماقوڵە، ئەوە دەر بکات لە شار، کە بێ ڕێزو بێ دەسەڵاتە، ئەو دووڕووانە نازانن کە: عیززەتو دەسەڵاتو پایەداری هەر شایستەی خوداو پێغەمبەرەکەیو ئیماندارانە)..

پێغەمبەری خوداﷺ ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوێندەوەو پاشان گوێچکەی زەیدی کوڕی ئەرقەمی گرتو فەرمووی: زەید ئەو پەیمانو قسەیەی بردە سەر کە بە هەر دوو گوێی خۆی گوێی لێ بوو..

ئیتر خەڵکەکە کەوتنە لۆمەو سەرزەنشتی عبداللەی کوڕی ئوبەی.. پێغەمبەری خوداشﷺ ڕووی کردە ئیمامی عومەرو فەرمووی: دەبینی عومەر ئەگەر ئەو ڕۆژە بتکوشتایە، چەندین خوێن دەڕژا، ئەمڕۆش ئەگەر فەرمان بدەم دەتوانی بیکوژی.. پاشان بێدەنگ بوو، هیچیشی بە سەر خۆی نەهێناو هیچ کارێکیشی نەکرد، ببێتە هۆی

خوێن ڕشتن و ناکۆکی..

جاری وا هەیە، کاتێك کە کەسێك هەڵەیەك ئەنجام دەدا، ئەگەر لەبەر چاوی خەڵکیش بێت، پێویست دەکات ئامۆژگاری بکەیت و پێی بڵێیت: ئەو کارەت هەڵەیە، بەڵام بە شێوازێکی جوان و گونجاو.. ئەی ئەگەر هەڵەکە تەنها تایبەت بوو بە کەسی هەڵەکارەوە، دەبێت چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین؟!

شەوێك پێغەمبەری خوداﷺ دەچێت بۆ ماڵی خاتوو عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) بە هێواشی نەعلەکانی دادەنێت و دەچێتە ژوورەوەو لە سەر جێگەکەی خۆی کەمێك رادەکشێت و وا گومان دەبات، کە خاتوو عائیشە خەوتووە، زۆر بە ئارامی هەڵدەستێت و نەعلەکانی لە پێ دەکات و دەرگاکە دەکاتەوەو دەچێتە دەرەوەو لە دوای خۆی دەرگاکە پێوە دەداتەوە، کاتێك عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) ئەمە دەبینێت، وا دەزانێت دەچێت بۆ لای یەکێك لە خێزانەکانی تری، هەر بۆیە خۆی دەپێچێتەوەو بە بێ ئەوەی هەستی پێبکات، بە شوێنیدا دەکەوێتە ڕێ..

پێغەمبەری خوداﷺ لەو تاریکیەی شەودا، بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتن، هەتا دەگاتە گۆرستانی بەقیع.. کاتێك دەگاتە گۆڕستانەکە، دەوەستێت و لە گۆڕەکان ورد دەبێتەوەو سەیریان دەکات.. سەیری گۆڕی هاوەڵە خۆشەویستەکانی دەکات، ئەو هاوەڵانەی لە سەر خوداپەرستی و بە تێکۆشەری ژیان و بەشەهیدیش سەریان نایەوەو ژیانی دونیایان جێهێشت.. ئەو هاوەڵانەی، کە ئێستا وا بە ئارامی لە ژێر خۆڵی گۆڕستانی بەقیعدا ڕاکشاون، ئەو هاوەڵانەی کە پەروەردگار لێیان ڕازی بوو..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ سەیری گۆڕەکانی دەکرد و بیری لێدەکردنەوە، پاشان هەر دوو دەستی بەرز کردەوەو ماوەیەکی زۆر بۆیان پارایەوەو داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگار بۆ کردن..

دایکی ئیماندارانیش لە دوورەوە سەیری پێغەمبەری خودایﷺ دەکرد.. کاتێك بینی وا پێغەمبەری خوداﷺ خەریکە دەگەڕێتەوە، زۆر بەپەلە بۆ ئەوەی هەستی پێنەکات، بەرەو ماڵەوە گەڕایەوەو خۆی کرد بە جێگەکەیداو وەکو خەوتوو خۆی نیشاندا، بەڵام لە ماندوێتی ڕێگەکەدا، دڵی زۆر بەپەلە لێیدەداو دەنگی هەناسەی دەهات..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هاتەوە بۆ ماڵەوە، گوێی لە دەنگی هەناسەی عائیشە بوو، فەرمووی: ئەوە چیە عائیشە؟! عائیشەش (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: هیچ نیە..

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: پێم دەڵێیت، یان پەروەردگار پێم بڵێت و ئاگادارم

بکات؟! عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) ئاگاداری کردو پێی وت: غیرە گرتوویەتی‌و ویستوویەتی بزانێت بۆ کوێ دەچێت..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: گومان دەبەیت پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی ستەمت لێبکەن؟! پاشان پێغەمبەری خوداﷺ هۆکاری ڕۆیشتنەکەی بۆ ڕوون کردەوەو فەرمووی: جوبرائیلﷺ هات بۆ لام‌و کاتێك تۆی بینی جل‌وبەرگی خەوت لەبەردایە، بانگی کردم‌و منیش وامزانی خەوتوویت‌و نەمویست خەبەرت بکەمەوەو ترسام لەوەی بترسیت، کاتێك چووم بۆ لای، فەرمانی پێدام بچم بۆ گۆڕستانی بەقیع‌و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەم..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ کەسێکی زۆر نەرم‌ونیان‌و لەسەرخۆ بووەو هەرگیز هەڵەکانی گەورە نەدەکردو کەسێکی لێبوردەو لێخۆشبوو بووەو زۆر جار دووبارەی دەکردەوەو دەیفەرموو: «لايفرك مؤمن مؤمنة، إن كره منها خلقاً، رضي منها آخر». رواه مسلم. واتە: (هیچ مێردێك نابێت هاوسەرەکەی لە لا بێڕێزو سوك بێت، لەبەر ئەوەی ئەگەر ڕەوشتێکی ناشیرینی تیادا بێت، ئەوا چەندان ڕەوشتی جوانی تیادایە کە جێگەی ڕەزامەندی مێردەکەی بێت)..

بەڵێ.. نابێت لەبەر ڕەوشتێکی ناشیرین، بە تەواوی ڕقمان لە هاوسەرەکانمان بێتەوە، چونکە ئەگەر هەندێك ڕەوشتی ناشیرینیان هەبێت، خاوەنی چەندان ڕەوشتی جوانیشن.. کاتێك هەڵەیەکیان لێدەبینین، با کارە جوانەکانیان بهێنینە بەر چاومان، ئەو کاتە هەرگیز لێیان بێزار نابین‌و ڕقمان لێیان نابێت‌و ناکۆکی‌و دووبەرەکی دروست نابێت..

**ڕۆشنایی..**

ئەو کەسە جێگەی سەرزەنشت نیە، کە ئامۆژگاری وەرناگرێت‌و پەسەندی ناکات، بەڵکو ئەو کەسە جێگەی سەرزەنشە، کە ئامۆژگارییەکە بە شێوازێکی جوان‌و گونجاو پێشکەش ناکات..

# یەك، یەك، ئامۆژگارییان بكە..

ئەگەر هەڵەیەك لە لایەن كۆمەڵێك كەسەوە ئەنجامدرا بوو، ئەوا لە بنەڕەتدا وا پێویستە، هەموویان پێكەوە ئامۆژگاری بكەیتو لە هەڵەكەیان ئاگاداریان بكەیتەوە، بەڵام جاری وا هەیە، وا پێویست دەكات هەر یەكەیان بە تەنها ئامۆژگاری بكەیتو هەڵەو كەموكورییەكەیان بۆ روون بكەیتەوە..

بۆ نموونە: كاتێك دەچیتەوە بۆ ماڵەوە، دەبینی برایەكت لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانیدا خەریكی گفتوگۆكردنە، دەربارەی گەشت كردنیان بۆ یەكێك لە وڵاتان، ئەو وڵاتەش یەكێكە لەو وڵاتانەی، كەم كەس هەیە گەشتی بۆ بكاتو تووشی خراپەو كاری ناڕەوا نەبێت.. تۆش دەتەوێت ئامۆژگارییان بكەیت، بەڵام چۆن چۆنی؟!

دەتوانیت بچیتە لایانو بە دوو سێ وشە ئامۆژگارییان بكەیتو بێیتە دەرەوە، بەڵام زۆر ئەگەری ئەوەی نیە، كە بە گوێت بكەنو واز لە گەشتەكەیان بهێنن.. بەڵام ئەگەر بێتوو بە جیا جیا ئامۆژگارییان بكەیت، زیاتر ئەگەری ئەوەی هەیە، ئامۆژگارییەكانت جێگەی خۆی بگرێت..

كاتێك هەڵدەستنو لێك جیا دەبنەوە، دەتوانیت لەگەڵ ئەو كەسەیاندا قسە بكەیت، كە لە هەموویان بە ژیرترو داناتری دادەنێیتو پێی بڵێیت: فلانە كەس، بیستوومە بەتەمان بچن بۆ فلانە وڵات، منیش تۆ لە هەموویان بە ژیرتر دەزانم، خۆشت باش دەزانیت ئەو وڵاتەی كە ئێوە بەتەمان گەشتی بۆ بكەن، پڕە لە بەڵاو تاقیكردنەوەو لەوانەیە ئێوەش تووشی ئەو گێژاوی خراپەو تاوانانە ببن، پێت چۆنە تووشی پاداشتێكی گەورە بیت، ئەمەش بەوەی، داوا لە هاوڕێكانت بكەیتو پێشنیاری ئەوە بكەیت، كە گەشتەكەتان بگۆڕن بۆ وڵاتێكی ترو كاتەكانتان لەگەڵ دەریاو ڕووبارەكاندا بەسەربەرنو بە دووریش بن لە گوناهو تاوانو خراپە..

بە دڵنیاییەوە وتەكانت تا ڕادەیەك كاریگەرییان لە سەری دەبێت، پاشان بچۆ بۆ لای یەكێكی تریانو بە هەمان شێوە ئامۆژگاری بكە، پاشان بچۆ بۆ لای كەسی سێیەمو ئامۆژگاری ئەویش بكە، بە بێ ئەوەی هەست بە یەكتر بكەن.. بەم شێوەیە كاتێك كۆدەبنەوەو یەكێكیان پێشنیاری ئەوە دەكات، كە گەشتەكەیان بگۆڕن بۆ وڵاتێكی تر، دەبینیت هەموو ئەوانەی تریش پشتگیری دەكەنو تۆش بە شێوازێكی گونجاو، توانیت بە سەر ئەو كێشەیەدا سەركەویتو

ئامۆژگاریەکانت جێگەی خۆیان گرت..

یاخود ڕۆژێك دەبینیت، منداڵەکانت هەموو کۆبونەتەوە، یان لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیاندا سەیری دیمەنێکی ڤیدیۆیی خراپ دەکەن، یان بە مۆبایلەکانیان سەیری وێنەی خراپ دەکەن، لەم کاتەدا پێویستە هەریەکەیان بە جیا جیاو بە تەنها ئامۆژگاری بکەیت، لەبەر ئەوەی ئەو تاوانو خراپەیەیان لە لا ئاسایی نەبێتەوەو شەرمیان لێی نەشکێت..

ئایا هاوشێوەی ئەم نمونانە لە ڕێژینی پێغەمبەری خوداﷺ بوونیان هەیە؟

بەڵێ.. بوونیان هەیە.. کاتێك ناکۆکیەکانی نێوان پێغەمبەری خوداﷺ و قورەیش زیادی کرد، قورەیشیەکان کۆبوونەوەو بڕیاری دەنگ دابڕینیان لەگەڵ موسڵماناندا ڕاگەیاندو نوسراوێکیان نوسیو ڕایانگەیاند، کە نابێت کڕینو فرۆشتنو ژنو ژنخوازی، لەگەڵ موسڵماناندا بکرێت..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانی لە دۆڵێکی وشكو برنگدا، گەمارۆ دران‌و ئەوەندە برسی‌و تینوو کران، گەڵای داریان دەخوارد، تەنانەت ڕۆژێك یەکێك لە هاوەڵان دەچێت دەست بە ئاو بگەیەنێت، کاتێك دەست بە ئاو دەگەیەنێت، میزەکەی بەر شتێك دەکەوێت‌و دەنگێك دروست دەکات، کاتێك هەڵی دەگرێتەوە، دەبینێت پارچەیەك پێستەی وشترە، لەگەڵ خۆیدا دەیباتەوەو لە دوای شۆرین‌و پاککردنەوەی، بە ئاگر دەیبرژێنێت، پاشان پارچە پارچەی دەکات‌و دەیخاتە ئاوەوەو خواردنی سێ ڕۆژی پێ بە ڕێ دەکات!!

موسڵمانان چەندان مانگ بەو شێوەیە بە سەر دەبەن‌و تووشی نارەحەتیەکی زۆر دەبن، هەتا پێغەمبەری خوداﷺ بە مامەی ڕادەگەیەنێت‌و دەفەرموێت: مۆرانە نوسراوو پەیماننامەکەی قورەیشی هەموو خواردووە، تەنها ئەم دێرە نەبێت کە نوسراوە: بە ناوی خودا.. ئەبوطالیبی مامەشی سەرسام دەبێت‌و دەڵێت: ئایا خوداکەت ئەم هەواڵەی پێڕاگەیاندوی؟!

پێغەمبەری خوداشﷺ دەفەرموێت: بەڵێ.. ئەبوتالیب دەکەوێتە ڕێ‌و دەچێت هەواڵەکە بە بێباوەڕانی قورەیش دەدات‌و دەڵێت: ئەی قورەیش، برازاکەم هەواڵی پێداوم کە مۆرانە نوسراوەکەتانی خواردووە، ئەگەر وا بوو ئەوا کۆتایی بە دەنگ دابڕین‌و گەمارۆکەتان بهێنن، ئەگەر واش نەبوو، ئەوا برازاکەم دەدەمە دەستتان، چی لێدەکەن بیکەن..

بێباوەڕانی قورەیشیش وتیان: ئێمە ڕازین.. کاتێك نوسراوەکەیان هێنا، پێغەمبەری خوداﷺ چی فەرموو بوو، هەر وا بوو، هەر بۆیە کاتێك ئەو هەواڵە ڕاستەی پێغەمبەری خودایانﷺ بیست، ڕق‌و کینەیان زیاتر پەرەی سەندو توورە بوون‌و گریان تێبەر بوو!!

بەڵێ.. پەیمان‌و بەڵێنەکەیان نەبردەسەرو ڕاستیان نەکردو گەمارۆی سەر موسڵمانانیش هەر بەردەوام بوو، هەتا نزیك بوو هەموو موسڵمانەکان تیابچن..

لە ناو بێباوەڕانی قورەیشدا، کەسانێکی بە بەزەیی هەبوون، لەوانەش: هیشامی کوڕی عەمر، کە کەسێکی بەڕێزی هۆزەکەی بوو، ئەم پیاوە بارە وشتری پڕ لە خواردنی بە شەو دەبرد بۆ موسڵمانانو کاتێك لە دۆڵەکە نزیك دەبۆوە، ڕێشمەی وشترەکەی دەکردەوەو بەرەو رووی دۆڵەکە بەرەڵای دەکرد..

ڕۆژەکان تێپەڕینو هیشام سەیری کردو ڕووانی، ناتوانێت هەموو شەوێك خواردن بۆ موسڵمانە گەمارۆدراوەکان بنێرێت، لەبەر ئەوەی موسڵمانەکان زۆر بوون، هەر بۆیە بڕیاریدا هەوڵ بدات، بۆ ئەوەی نوسراوە پڕ جەورو ستەمەکە هەڵبوەشێنێتەوە، هەر چەندە دەیزانی نوسراوەکە لە لایەن هەموو قورەیشەوە ڕەزامەندی لە سەر دراوەو هەڵوەشاندنەوەی ئاسان نیە، هەر بۆیە هەوڵیدا بە جیا جیاو یەك یەك، لەگەڵ هەندێك لە گەورە بێباوەڕانی قورەیشدا گفتوگۆ بکات..

هیشام هەستاو چوو بۆ لای زوهەیری کوڕی ئەبی ئومەییەو پێی وت: ئەی زوهەیر، ئایا ڕازی دەبیت، بۆ خۆت خواردنی خۆش بخۆیتو جلوبەرگی جوان لەبەر بکەیتو ژن بهێنیت، بەڵام خاڵوانەکانیشت بەو شێوەیە بژین، کە دەیبینیتو دەیزانیت؟! سوێند بە خودا ئەگەر خاڵوانەکانی ئەبوجەهل بەو شێوەیە ژیانیان بە سەر ببردایە، ئەوا ئەبوجەهل هەرگیز بەو حاڵە ڕازی نەدەبوو..

زوهەیر سۆزی جوڵاو وتی: ئەی هاوار هیشام!! چی بکەم باشە؟! من بە تەنهاو هەر خۆمم، سوێند بە خودا ئەگەر پیاوێکی ترم لەگەڵدا بووایە، هەوڵی هەڵوەشاندنەوەیم دەدا.. هیشامیش لە وەڵامدا وتی: دەی منیش دووەم کەسم.. زوهەیریش دەڵێت: دەی کەسی سێیەمیش پەیدا بکە..

هیشام دەڵێت: دەی با ئەم کارە بە نهێنی بمێنێتەوە، پاشان دەچێت بۆ لای موتعەمی کوڕی عەدی، کە پیاوێکی ژیرو دانا بوو.. کاتێك دەچێتە لای، پێی دەڵێت: ئەی موتعەم، ئایا تۆ ڕازی دەبیت پشتگیرو پشتیوانی ئەو زوڵمو ستەمەی قورەیش بیت؟!

موتعەمیش دەڵێت: ئەی هاوار من هەر خۆممو بە تەنها چی بکەم؟! هیشام دەڵێت: منیش دووەم کەسم.. ئەویش دەڵێت: دەی کەسی سێیەمیش پەیدا بکە.. هیشام دەڵێت: زوهەیری کوڕی ئەبی ئومەییەش کەسی سێیەمە.. ئەمجارە موتعەم دەڵێت: دەی بە دوای کەسی چوارەمدا بگەڕێ.. زوهەیریش دەڵێت: دەی با ئەم کارە نهێنی بێتو کەس نەزانێت، پاشان دەچێت بۆ لای ئەبو بوختەری کوڕی هیشامو ئەوەی بە دوو هاوەڵەکەی پێشووی وت، بە ویش دەڵێت.. ئەویش هەستو سۆزی دەجوڵێتو دەڵێت: بۆ ئەم کارە، کەسی تر هەیە پشتگیریمان بکات؟!

هیشام دەڵێت: بەڵێ.. منو سێ کەسی تر هەینو ناوەکانیانی پێدەڵێت.. ئەویش دەڵێت:

دەی کەسی پێنجەمیش پەیدا بکە.. هیشام ئەمجارەیان دەچێت بۆ لای زومعەی کوڕی ئەسوەدو ئەویش ڕازی دەکات، پاشان هەموویان ڕێدەکەون لە سەر هەڵوەشاندنەوەی نوسراوەکەو زوهەیر دەڵێت: سەرەتا من قسە دەکەمو ناڕازی بوونی خۆم دەردەبڕم، پاشان ئێوەش هەستنو پشتگیریم بکەن..

بەڵێ.. هەموویان دەچن بۆ کۆڕو دانیشتنی بێباوەڕان، لە نزیك کەعبە.. زوهەیر دوای ئەوەی حەوت جار بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێتەوە، هاوار دەکاتو دەڵێت: ئەی خەڵكو دانیشتووانی شاری مەککە، ئایا دەبێت ئێمە خواردن بخۆینو جلوبەرگ بپۆشین، بەنو هاشمیش لەناوبچنو برسیو ڕووتو ڕەجاڵ بن؟! سوێند بە خودا دانانیشمو وازناهێنم، هەتا ئەو نوسراوە پڕ لە جەورو ستەمە پارچە پارچە نەکرێتو نەدڕێنرێت..

ئەبوجەهلی باوکی نەزانیو جەورو ستەم هاوار دەکاتو دەڵێت: درۆ دەکەیت، سوێند بە خودا نابێت بدڕێنرێت.. لەم کاتەدا زومعەی کوڕی ئەسوەد هەڵدەستێتو دەڵێت: تۆ درۆ دەکەیت، کاتێکیش کە ئەو نوسراوەت نوسی، ئێمە هیچمان ڕازی نەبووین.. ئەبوجەهل ئاوڕی دایەوەو ویستی وەڵامی بداتەوە، بەڵام لەپڕ ئەبوبوختەری هەستایە سەر پێو وتی: زومعە ڕاست دەکات، ئێمە بە نوسینی ئەو نوسراوە ڕازی نینو دانیشی پێدا نانێین..

ئەمجارەیان ئەبوجەهل ویستی وەڵامی ئەبوبوختەری بداتەوە، بەڵام موتعەمی کوڕی عەدی بواری نەداو هاواری کردو وتی: تۆ درۆ دەکەیتو ئەمان ڕاست دەکەن، ئێمە هەموو بێبەرین لەو نوسراوە، هیشامی کوڕی عەمریش هەستاو وتەکانی ئەوانی دوبارە کردەوە.. ئەبوجەهل سەرسام بوو، کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان وتی: ئێوە هەمووتان لە سەر ئەم کارە ڕێککەوتوونو قسەتان لێوە کردووە..

پاشان موتعەمی کوڕی عەدی بەرەو کەعبە ڕۆیشت، بۆ ئەوەی نوسراوکە بدڕێنێت، بینی مۆرانە هەموو نوسراوەکەی خواردووە، تەنها ئەم دێڕە نەبێت کە نوسرا بوو: بە ناوی خودا..

**زیرەکو لێهاتوو بە..**

پزیشکی بە توانا، سەرەتاو پێش ئەوەی دەرزیەکەی دەستی بچەقێنێت، بە پەنجەکانی دەستی شوێنی گونجاوی بۆ هەڵدەبژێرێت..

# ئازاردانی دڵو دەروون..!!

لە یادگارییەکانم: ڕۆژێك لەگەڵ چەند هاوەڵێکمدا چووین بۆ گەشتو گەڕان، کەسێکمان لەگەڵدا بوو، بە ناوی خالید، ئەم هاوەڵەمان ئاستی بینینی چاوەکانی زۆر لاواز بوو، ئێمەش هەمووومان خزمەتمان دەکرد، ئاوو خورماو قاوەمان لێ نزیك کردبۆوە، بۆ ئەوەی بۆ خۆی دانیشێتو پشوو بدات، بەڵام ئەو هەر دووبارەی دەکردەوەو دەیوت: هەر دەبێت یارمەتیتان بدەمو دەمەوێت لەگەڵتاندا کار بکەم.. دەی کارێك بە منیش بسپێرن.. ئێمەش دەمان وت: نابێتو ناکرێت، تۆ بۆ خۆت پشوو بدە..

مەڕەکەمان سەربڕیو گۆشتەکەیمان پارچە پارچە کردو خستمانە مەنجەڵەکەوەو ئامادەمان کرد بۆ ئەوەی بیکوڵێنین، بەڵام هێشتا ئاگرمان نەخستبووە ژێریو سەرقاڵی دانانی ڕەشماڵو ئامادەکردنی کەلوپەلەکان بووین.. لەپڕ ئازایەتیو هەستی کارکردن، وای لە خالید کرد، کارێك بکات، کە خۆزگە ئەو کارەی هەر نەکردایە!!

بەڵێ.. خالید هەستاو بەرەو لای مەنجەڵەکە کەوتە ڕێ، کاتێك گۆشتەکەی ناوی بینی، وایزانی یەکەم کارێك، کە بۆ کوڵاندنی گۆشت پێویستە بریتیە لەوەی سەرەتا ئاوی تێبکەیت، هەر بۆیە بەرەو لای کەلوپەلەکانی ناو ئۆتومبیلەکە هەنگاوی نا.. کەلوپەلەکانیش بریتی بوون لە: مۆلیدەی کارەبا.. گلۆپ.. چوار دەبەی پڕ لە ئاو.. چەند دەبەیەکی بەنزینو چەندان شتی تر.. خالید دەست بۆ نزیکترین دەبە دەباتو قلْپی دەکاتە ناو مەنجەڵەکەوە، هەتا یەکێك لە هاوەڵانمان فریای دەکەوێت، نیوەی دەبەکەی تێدەکات، ئەو هاوەڵەمان هاواری لێدەکاتو دەڵێت: نەکەی خالید.. نەکەی..

خالیدیش دەڵێت: وازم لێ بهێنن با منیش کارێك بکەم.. بە هەر شێوەیەك بێت، دەبەکەمان لێسەندو هەمووومان لە پێکەنینێکی گریاناویدا نقوم بووین، لەبەر ئەوەی ئەو دەبەیەی کە خالید قلْپی کردە ناو مەنجەڵەکەوە، بەنزین بوو نەك ئاو!! هەر بۆیە لە باتی گۆشتی کوڵاو، نانو چامان خوارد، بەڵام گەشتەکەشمان تێك نەچوو، بەڵکو یەکێك بوو لە خۆشترین گەشتەکانی ژیانمان، بۆچی دەروونی خۆمان بە هۆی کارێکەوە ئازار بدەین، کە تازە ڕوویداو تێپەڕی..

ئەگەر دەتەوێت چێژوخۆشی لە ژیانت ببینیتو بەختەوەر بژیت، ئەوا کار بەم

بنەمایە بکە، کە دەڵێت: گرنگی بە کاروبارە بچوك و لاوەکییەکان مەدە.. ئێمە هەمووومان زۆر جار ئازاری دەروونی خۆمان دەدەین و خۆمان تووشی غەم و خەفەت دەکەین، لە کاتێکدا کە هەموومان دەزانین، غەم و خەفەت هیچ لە کێشەو گرفتەکان چارەسەر ناکەن..

گریمان ڕۆژێك دەچیت بۆ ئاهەنگێکی ژن گواستنەوە، جل و بەرگێکی زۆر جوانت لەبەرکردووە، هەتا وات لە خۆت کردووە، زۆر لە زاواش جوانترو سەرنج ڕاکێشتر بیت.. لەپڕ منداڵێك لە دواوە، جامانەو کڵاوەکەت ڕادەکێشێت و بەری دەداتەوەو دیمەنێکی پێکەنیناویت بۆ دروست دەبێت، ئایا چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم ڕووداوە دەکەیت؟!

زۆربەمان بە شێوەیەك هەڵسوکەوت دەکەین، کە چارەسەری ڕووداوەکە ناکات، وەك ئەوەی شوێنی منداڵەکە بکەویت و بکەویتە هاوار هاوارو جنێوو قسەی ناشیرین.. سەرەنجامیش ئەوە ڕوودەدات، کە منداڵەکە مەبەستی بوو، ئەویش بەوەی دەیویست بەو کارەی سەرنجی ئامادەبووان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و کێشەو گرفتێك دروست بکات..

لە ڕاستیدا تۆ بەم کارەت، ئازاری منداڵەکە نادەیت، بەڵکو ئازاری خۆت دەدەیت..

بە هەمان شێوە خۆت جوان کردووەو دەتەوێت بچیتە داخوازی ئافرەتێك و کاتێك لە دەرگای ماڵەوەتان دێیتە دەرەوە، لەپڕ ئۆتۆمبیلێك بە خێرایی دەڕوات و جل و بەرگەکانت پیس دەکات، ئایا کاتێك جنێو بە شۆفێری ئۆتۆمبیلەکە دەدەیت و دەست دەکەیت بە هاوار هاوار، خۆت ئازار نادەیت؟!

هەروەها پێویست ناکات هەمیشە یادی ئەو ناخۆشی و ناڕەحەتیانە بکەینەوە، کە لە ژیانماندا تووشمان هاتوون..

پێغەمبەری ئازیزﷺ لە ژیانیدا تووشی چەندان ڕووداوی ناخۆش و پڕ ئێش و ئازار بووە، ئەوەتا ڕۆژێك لەگەڵ خاتوو عائیشەی هاوسەریدا دادەنیشێت و لە دوای کەمێك بێدەنگی، خاتوو عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) لێی دەپرسێت و دەڵێت: ئایا هیچ ڕۆژێکی ناخۆشترت، لە ڕۆژی جەنگی ئوحود بینیووە؟!

پێغەمبەری خوداﷺ ڕووداوی جەنگی ئوحودی بیرکەوتەوە، ئای لەو ڕۆژە ناڕەحەت و پڕ ئێش و ئازارە!!

ئەو ڕۆژەی حەمزەی مامەو خۆشەویستی تیادا شەهید کرا..

ئەو ڕۆژەی سەرەڕای شەهیدکردنی مامەی، بێباوەڕان لوت و گوێچکەیان بڕی و سکیان هەڵدڕی..

ئەو ڕۆژەی ددانە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوداﷺ تیادا شکاو خوێن بە ڕوخساری پیرۆزیدا هاتە خوارەوە..

ئەو ڕۆژەی بە بەرچاویەوە، هاوەڵانی شەهید کران..

ئەو ڕۆژەی کاتێك گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، حەفتا لە هاوەڵە خۆشەویستەکانی لەگەڵ نەما بوون و شەهیدکرا بوون..

ئەو ڕۆژەی کاتێك گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، بینی وا منداڵە بێباوکەکان و ئافرەتە مێرد شەهیدکراوەکان، بە دوای خۆشەویستەکانیاندا دەگەڕێن.. بە ڕاستی ڕۆژێکی زۆر دژوارو ناڕەحەت بوو..

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) چاوەڕێی وەڵامی پرسیارەکەی دەکرد، پێغەمبەری خوداﷺ دوای ڕامانێك، وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ئەوەی لە لایەن هۆزەکەتەوە تووشم هات، لە ڕۆژی پەیمانی عەقەبە، ناڕەحەت و ناخۆشتر بوو لە جەنگی ئوحود، پاشان باسی ڕووداوی تائیفی بۆ کرد.. ئەو ڕووداوەی، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ پەنای بۆ خەڵکی تائیف بردو داوای کۆمەکی و پشتیوانی لێکردن، بەڵام ئەوان بە درۆیان خستەوەو کەوتنە بەردباران کردنی..

پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ ئەوەی تووشی چەندان ڕووداوی پڕ ئێش و ئازاری تریش ببۆوە، بەڵام لە هەمان کاتدا چێژو خۆشیشی لە ژیان دەبینی، لەبەر ئەوەی ئازارەکانی ئەو ڕووداوانە ڕۆیشتن و بەسەرچوون و خێرو پاداشتەکانیان مایەوە..

کەواتە: بە خەم و خەفەت، خۆت مەکوژە.. چونکە بە دڵنیاییەوە بە خەم و خەفەتەکانت، ناتوانیت خەڵکی ئازار بدەیت و لەناویان بەریت، سەرەنجامیش تەنها خۆت زەرەر دەکەیت و خۆت ناڕەحەت دەبیت..

ئەحنەفی کوری قەیس گەورە هۆزی بەنی تەمیم بوو، ئەم پیاوە بە هۆی بەهێزی، یان بە هۆی ماڵ و سامانەوە نەببوو بە گەورەی هۆزەکەی بەڵکو بە هۆی ژیری و نەرم و نیانی و لەسەرخۆییەوە، ببوو بە گەورەی هۆزەکەی..

هۆزێك هەبوو، زۆر ڕقیان لێی بوو، هەر بۆیە کابرایەکی گێل و نەفامیان بە کرێ گرت و پێیان وت: ئەمە هەزار درهەمە، بچۆ بۆ لای گەورەی هۆزی بەنی تەمیم و بکێشە بە ناو چاویدا..

کابرای نەفام کەوتە ڕێ، ئەحنەفیش لەگەڵ هەندێك لە پیاوانی هۆزەکەیدا دانیشتبوو، پیاوەکە لێی نزیك بۆوە، هەتا گەیشتە بەردەم ئەحنەف، ئەحنەفیش

سەری لە کابرا نزیك دەکاتەوەو وا دەزانێت بە هەواڵێك، یان بە موژدەیەك دڵخۆشی دەکات، بەڵام کابرای نەفامو نەزان، دەستی بەرز دەکاتەوەو هەتا دەتوانێت زلەیەك بە ڕوخساری ئەحنەفدا دەکێشێت، زلەیەك کە نزیك بوو ڕوومەتی ئەحنەف بتەقێنێت!!

ئەحنەف سەیرێکی کابرای کردو زۆر لەسەرخۆو بە هێمنی وتی: بۆچی پیاتا کێشام؟!

کابراش لە وەڵامدا دەڵێت: فڵانە هۆز، هەزار درهەمیان پێدام، بۆ ئەوەی لە گەورەی هۆزی بەنی تەمیم بدەم..

ئەحنەفیش دەڵێت: ئاه.. ئینجا خۆ من گەورەی هۆزی بەنی تەمیم نیم!! کابراش وتی: سەیرە!! ئەی کێ گەورەی ئەو هۆزەیە؟!

ئەحنەف بە دەستی ئاماژە بۆ پیاوێکی زۆر تورەو بەهێز دەکاتو دەڵێت: ئەو پیاوە گەورەی هۆزی بەنی تەمیمە، پیاوەکەش ئەوەندە کەسێکی زۆر تووڕەو نالەبار دەبێت، تووڕەییو خراپەکانی بەشی نەتەوەیەکی دەکرد..

کابرای نەفام بەرەو ڕووی پیاوە تووڕەکە دەکەوێتە ڕێ، کاتێك لێی نزیك دەبێتەوە، زلەیەکی لێدەدات، بەڵام پێش ئەوەی دەستی بکێشێتە دواوە، کابرا تووڕەکە شمشێرەکەی هەڵدەکێشێتو دەستی دەقرتێنێت!!

لە کۆنیشدا وتراوە: سەرکەوتوو ئەو کەسەیە، کە لە کۆتاییدا پێدەکەنێتو دڵخۆش دەبێت!!

**ئەنجام..**

هەڵسوکەوت کردنو بەکارهێنانی هەندێك شێوازی نەشیاو، نەك هەر چارەسەری کێشەو گرفتەکان ناکەن، بەڵکو ئازارو ناڕەحەتیشت بۆ دروست دەکەن..

## هەندێ: کێشەو گرفت، چارەسەریان نیە..

چەندین کەس دەبینین، کاتێك سواری ئۆتۆمبیلەکەیان دەبن، توورە دەبن‌و جاری واش هەیە بە ئۆتۆمبیلەکەیاندا دەکێشن‌و ئاخ‌و ئۆف هەڵدەکێشن‌و دەڵێن: بەردەوام شەقامەکان جەنجاڵ‌و قەرەباڵغە!!

کەسانێك هەن، کاتێك بە تەنهاش بە ڕێگەدا دەڕۆن، ئەوەندە توورەن، خەریکە بە گڕی خۆیاندا بچن‌و نارەزایی دەردەبڕن‌و دەڵێن: ئای لە دەست ئەم گەرمایە!! جاری وا هەیە لەگەڵ فەرمانبەرێکدا، لە یەك فەرمانگە کار دەکەن، هەموو ڕۆژێك کاتێك دەیبینی دڵت دەگرێت‌و بە هەندێك قسەی لا بە لاو ناپێویست سەرقاڵت دەکات، وەك ئەوەی دەڵێت: بە ڕاستی ئیش‌و کارەکانمان زۆر زۆرن!! ئاه.. تاکەی موچەکەمان بۆ زیاد ناکەن؟! هەندێك کەسی تر بەیانیان بە ڕوویەکی ترش‌و تاڵەوە دێن بۆ سەر کارەکانیان‌و بە تووڕەییشەوە دەڕۆنەوە..

بە کورتی: دەبێت هەموومان دان بەوەدا بنێین، لە ژیانی ڕۆژانەماندا هەر یەك لە ئێمە تووشی هەندێك گرفت دێین، کە چارەسەریان نیە، لەبەر ئەوە دەبێت بە سنگێکی فراوانەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین‌و خۆمانیان لەگەڵ بگونجێنین‌و چێژو خۆشی لە ژیانی دونیا ببینین..

بەڵێ.. پێویستە چێژ لە خۆشیەکانی دونیا ببینین‌و هەوڵی ژیانێکی بەختەوەر بدەین..

ئاگاداربەو وریابە بارودۆخی ژیانت، کاریگەری لە سەر هەڵسوکەوتت، لە سەر ئیش‌و کارت، لە سەر هاوڕێ‌و هاوسەرو منداڵەکانت دروست نەکەن، ئەو کەسانە چ تاوانێکیان هەیە، تا بە هۆی کارێکی تۆوە تووشی ئازارو نارەحەتی ببن، کە هیچ پەیوەندیەکیان پێیەوە نیەو هۆکارێکی کێشەو گرفتەکەش نین‌و چارەسەریشیان لە لا نیە؟!

وا لە خۆت مەکە، کاتێك کە بتبینن غەم‌و خەفەتیان بیربکەوێتەوە، هەر

بۆیە پێغەمبەری ئازیزﷺ ڕێگری کردووە، لە کاتی مردنی خۆشەویستێکدا، بە دەنگی بەرز بگریێت‌و هاوار بکەیت، یان یەخەو جل‌وبەرگ لەبەر خۆتدا بدڕێنیت‌و سەرو قژو ڕوخسارت بڕنیتەوە..

بۆچی؟! لەبەر ئەوەی مردوو پێویستی بەوەیە، بشۆردرێت‌و کفن‌و دفن بکرێت‌و نوێژی لە سەر بکرێت‌و دۆعای خێری بۆ بکرێت، نەك گریان‌و هاوار هاوارو لەخۆدان.. چونکە ئەم کارانە، جگەلە گۆڕینی خۆشیەکان بۆ غەم‌و خەفەت، هیچ شتێکی تریان پێناکرێت..

پیاوێك لەگەڵ هاوڕێیەکیدا بە ڕێگەیەکدا دەڕوات، هاوڕێیەکەی ئاوڕ دەداتەوەو دەڵێت: بە ڕاستی ئەمڕۆ زۆر زۆر ساردە!!

پیاوەکە دەڵێت: دەی بەم قسەیەی کردت، گەرمت بۆوە؟!

ئەویش دەڵێت: نەخێر..

پیاوەکەش دەڵێت: دەی چ سودێکت لەو قسەیە بینی؟! ئەگەر لە باتی ئەو قسەیە (سبحان الله)یەکت بکردایە، زۆر باشتر بوو.. بە ڕاستی پیاوێکی داناو تێگەیشتوو بووە..

**ژیانت بە سەربەرە..**

بە شوێن گرفتو کێشەدا مەگەڕێ‌و لە کارە بچوکەکان ورد مەبەرەوە، بەڵکو چێژو خۆشی لە ژیانت ببینە..



## بە هۆی غەمو خەفەتەوە، خۆت لە ناو مەدە..

لە زانکۆ قوتابییەکم هەبوو، ناوی سەعد بوو.. هەفتەیەکی تەواو دیار نەماو نەهات بۆ زانکۆ.. پاشان کە بینیمەوە، پرسیارم دەربارەی دیار نەبوونەکەی لێکردو لە وەڵامدا وتی: هیچ نەبوو، کەمێك سەرقاڵ بووم..

غەمو ناڕەحەتی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو، هەر بۆیە دوبارە پرسیارم لێکردو وتم: چی ڕوویداوەو چی بووە؟! وتی: کوڕێکم هەیە تووشی لە نەخۆشی لە دەستدانی جگەر بووەو چەند ڕۆژێکیش لەمەوبەر، خوێنەکەشی تووشی پیس بوون هاتو ئەو پیس بوونەش، دزەی کرد بۆ ناو مێشکی..

منیش لە دوای وتنی: لاحول ولا قوة إلا بالله ئامۆژگاریم کردو وتم: ئارام بگرەو داواکارین پەروەردگار شیفای بدات، خۆ ئەگەر شتێکیشی لێهات، إنشاء الله دەبێتە مایەی پاداشتی ڕۆژی دوایت..

قوتابییەکەم وتی: یاشێخ کوڕەکەم حەڤدەساڵە.. منیش وتم: خودا شیفای بداتو براکانی تری ساغو پارێزراو بکات..

کەمێك سەری داخستو پاشان وتی: یاشێخ تەنها ئەو کوڕەم هەیەو هیچی تر.. خودا جگە لەو کوڕە منداڵی تری پێنەداوم، ئەویش ئاوایە کە دەیزانیت..

بە ڕاستی حاڵەتەکەی زۆر کاریگەر بوو، بەڵام هەر چۆنێك بێت پێم وت: سەعد زۆر بە کورتی، پێت دەڵێم: بە غەمو خەفەت خۆت لە ناو مەدە، چونکە بە دڵنیاییەوە هیچ شتێکمان تووش نابێت، تەنها ئەو شتانە نەبێت، کە پەروەردگار بڕیاری لە سەرداوە.. پاشان کەمێك غەمی سەر شانی سوك بووو ڕۆیشت..

بەڵێ.. پێویست ناکات بە هۆی غەمو خەفەتەوە، خۆت بکوژیت، لەبەر ئەوەی غەمو خەفەت، ناتوانن کۆتایی بە ئازارو ناڕەحەتییەکان بهێنن..

ماوەیەك لەمەوبەر، چووم بۆ شاری مەدینەو لەوێ هاوڕێیەکم بینی بە ناوی خالیدو پێی وتم: بۆ سەردانێکی دکتۆر عبدالله نەکەین؟ وتم: بۆچی..

چی ڕوویداوە؟! وتی: بۆ ئەوەی سەرەخۆشی لێبکەین، لەبەر ئەوەی خۆی بە هۆی کاروباری زانکۆوە نەیتوانیبوو بچێت و لە مەدینە مابۆوەو کوڕە گەورەکەی هەموو ماڵ و منداڵەکەی بردبوو بۆ ئاهەنگێکی هاوسەرگیری و لە گەڕانەوەیاندا تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بوون و هەر هەموویان کە پانزە کەس بوون، دەمرن!!

دکتۆر عبداللە تەمەنی لە پەنجا ساڵ تێپەڕی بوو، بەڵام بە هەر شێوەیەك بێت، مرۆڤەو هەست و سۆزی هەیە، بەڵکو وەکو هەر یەکێك لە ئێمە، لە سنگیدا دڵێك و دوو چاوی هەیە، کە دەتوانن بگرین و فرمێسیك بڕێژین.. خاوەنی دەروونێکیشە خۆشی و ناخۆشی ڕووی تێدەکات..

کاتێك ئەم هەواڵە دڵتەزێنەی پێدەگات، نوێژیان لە سەر دەکات و بە دەستی خۆی دەیان خاتە گۆڕەوەو دەیان نێژێت..

پانزە کەسی خانەوادەیەك!! بە ڕاستی کەم نیە!! ئێستا بە تەنها لە ماڵەکەیدا دێت و دەچێت.. یاری منداڵەکانی دەبینێت، پەرش و بڵاوبوونەتەوە، لەبەر ئەوەی دوو کچەکەی نەماون، تا یاریان پێبکەن.. کاتێك سەیری جێگەی خەوەکەی دەکرد، ڕێك نەخرا بوون، لەبەر ئەوەی هاوسەرە بە سۆزەکەی نەما بوو، تا ڕێکیان بخات.. پاسکیلی کوڕەکەی دەبینی بێ جوڵە وەستا بوو، لەبەر ئەوەی یاسری کوڕی نەما بوو، تا لێی بخوڕێیت و سواری ببێت.. بە هەمان شێوە سەردانی ژووری کچ و کوڕە گەورەکانی دەکردو کەل و پەلەکانیانی بە بێنازی دەبینی..

پاك و بێگەردی بۆ خودای تاك و تەنهاو بە دەسەڵات.. بە ڕاستی پیاوێکی ئارامگر بوو!! کاتێك میوانان و ئەو کەسانەی کە بۆ سەرە خۆشی دەهاتن، وات دەزانی ئەمیش یەکێکە لەو کەسانەو لەوە دەچوو، کە هیچ نارەحەتیەکی بە سەر نەهاتبێت و هەمیشە وتەی سەر زمانی بریتی بوو لە: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ..

تەمەن و بوون و ژیان و مردن، هەر لە لای خودایە.. بە ڕاستی کەسێکی زۆر ژیر بوو، خۆ ئەگەر بەم شێوەیە لەگەڵ ئەو کارەساتەدا، هەڵسوکەوتی نەکردایە، ئەوا بە غەم و خەفەت خۆی لە ناو دەبردو نەیدەتوانی درێژە بە ژیان بدات..

کەسێك دەناسم، هەمیشە بە دڵخۆشی و کامەرانی دەیبینم، کاتێکیش لە ژیان و

گوزەرانی وردبوومەوە، بینیم خاوەنی کارێکی زۆر ئاسایی بوو، لە خانوویەکی بچوکی کرێشدا دەژیاو ئۆتۆمبیلێکی کۆنیشی هەبوو، خاوەنی کۆمەڵێك منداڵی زۆریش بوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەمیشە دەم بە خەندە بوو.. کاتێك دەتبینی خۆشت دەویستو بە بەختەوەری دەژیاو خۆشی لە ژیان دەبینی..

بەڵێ.. پێت دەڵێم: بە هۆی غەمو خەفەتەوە خۆت مەکوژە.. زۆر سکاڵا دەرمەبڕەو خەڵکی تووشی بێ هیوایی‌و تارمایی مەکە، وەك چۆن پیاوێك منداڵێکی کەمئەندامی هەبێتو هەر کاتێك بتینێت، غەمبارت بکاتو بڵێت: منداڵەکەم ناساغە.. دڵم زۆر بۆی تەنگە.. ئای کە منداڵێکی هەژارو داماوە!! کەسانی وا هەن ئەوەندە غەمو نارەحەتیەکانیان دوبارە دەکەنەوە، بە تۆ بێت حەز دەکەیت، هاوار بکەیتو بڵێی: باشە.. باشە.. تێگەیشتم.. بیبڕەوە..!!

یان ئافرەتی وادەبینی، بەردەوام سکاڵا لە لای مێردەکەی دەکاتو دەڵێت: خانووەکەمان زۆر کۆنە.. ئۆتۆمبیلەکەمان کەڵکی نەماوە.. جل‌وبەرگەکانمان هەموو کۆن‌و ڕزیوون.. ئەم سکاڵایانە، جگە لە زیاد کردنی خەمو ئازارەکان، چ سودێکی تریان هەیە؟!

کەواتە: تەمەنت بە ئاهو حەسرەتو غەم لە ناو مەبە..

رۆشنایی..
بۆ ئەوەی بە بەختەوەری بژیت، بە ئەندازەی بەڕەکەی خۆت، پێت ڕابکێشە..

## بە بەشی خودا ڕازی بە..

لە گەشتێکمدا بۆ یەکێك لە وڵاتەکان، بۆئەوەی چەند وتارو ئامۆژگاریەك پێشکەش بکەم، ئەو وڵاتەش بەناوبانگ بوو بەوەی، کە نەخۆشخانەی زۆر گەورەی تێدایە بۆ نەخۆشیە دەروونیەکان .. ئەو نەخۆشیانەی کە خەڵکی بە شێتی ناوی دەبەن..

بەیانیەکەی دوو وتارم پێشکەش کردو هێشتا کاتژمێرێکی مابوو بۆ نوێژی نیوەڕۆ.. عبدالعزیزیشم لەگەڵ بوو، کە یەکێك بوو لە بانگخوازە بەناوبانگ‌و دیارەکان..

کاتێك کە لە ئۆتۆمبیلدا بووین.. لام کردەوە بە لایداو وتم: مادام کاتمان بەدەستەوەیە، حەز دەکەم بچم بۆ شوێنێك..

وتی: بۆ کوێ؟ وتم: نەخۆشخانەی نەخۆشیە دەروونیەکان..

پێکەنی‌و وتی: بۆچی؟! دەتەوێت لە عەقڵ‌و ژیریت دڵنیا بیت!! وتم: نا، بەڵکو سودی دەبێت بۆمان‌و پەندو ئامۆژگاری لێ وەردەگرین.. زیاتر نیعمەتەکانی خودای پەروەردگارمان بۆ دەردەکەوێت.. عبدالعزیز بێدەنگ بوو.. بیری لە حاڵی ئەو نەخۆشانە دەکردەوە.. هەستم کرد زۆر غەمبار بوو.. چونکە کەسێکی زۆر نەرم‌ونیان‌و بەسۆز بوو.. زیاد لە پێویست کەسێکی سۆزدار بوو..

چووین بۆ ئەوێ‌و ڕوومان کردە بینایەك، کە وەك ئەشکەوت وا بوو.. بە درەخت چواردەوری گیرابوو.. وەکو شێوەی تارمایی‌و شەبەحێك دەردەکەوت.. یەکێك لە پزیشکەکان پێشوازی لێکردین.. بەخێرهاتنی کردین‌و پاشان بە نەخۆشخانەکەدا گێڕاینی..

پزیشکەکە دەربارەی نارەحەتی‌و ناخۆشی نەخۆشەکان، دەستی بە قسەکردن کردو وتی: ئەوەی من بۆتانی باس دەکەم، وەك ئەوە نیە کە بە چاوی خۆتان ببینن.. پاشان بردمانی بۆ یەکێ لە ڕاڕەوەکان.. لێرەو لەوێ گوێ بیستی چەندان هاوارو دەنگە دەنگ بووین.. ژووری نەخۆشەکان بەمبەرو ئەوبەری ڕاڕەوەکەدا دابەشکرا بوو..

لە لای ڕاستدا بە لای ژوورێکدا ڕۆیشتین.. سەیری ژوورەکەم کردو بینیم، زیاتر لە دە جێگەی جۆڵی تێدایە.. تەنها جێگەیەك نەبێت، کە پیاوێکی لە سەر ڕاکشا بوو، پیاوەکە دەست‌و قاچی دەجوڵاند.. ڕووم کردە پزیشکەکەو لێم پرسی: ئەمە چیە؟!

وتی: شێتە.. توشی پەرکەمیش دێت.. لە ماوەی پێنج، یان شەش کاتژمێرێکدا

پەرکەم لێی دەدات.. وتم: لاحول ولا قوە إلاّ بالله.. لەکەیەوە بەم شێوەیەیە؟!

وتی: دە ساڵ زیاترە.. هەستو سۆزم لە دەروونمدا شاردەوەو بە بێدەنگی هەنگاوم ناو رۆیشتم.. لەدوای چەند هەنگاوێك، بە لای ژوورێکی تردا ڕۆیشتین، کە دەرگاکەی داخرا بوو.. لە دەرگای ژوورەکەدا، کرانەوەیەك، یان پەنجەرەیەکی بچوك هەبوو.. پیاوێك لە ژوورەوە دیار بوو.. هەندێك ئاماژەی بۆ کردین، بە لاّم لێی تێنەگەیشتین.. چاوم بە ژوورەکەدا گێڕا.. زەویو دیوارەکانی ڕەنگێکی کاڵیان هەبوو.. پرسیارم کرد ئەمەیان چیە؟!

وتی شێتە.. وتم: دەزانم شێتە.. ئەگەر شێت نەبوایە لێرە نەمان دەبینی.. چیرۆكو بەسەرهاتی ئەمەیان چیە؟!

وتی: ئەم پیاوە کاتێك دیوار دەبینێ، تورە دەبێتو بە دەستو قاچی لە دیوارەکان دەداو جاری واش هەیە سەری بە دیوارەکاندا دەکێشێت.. ڕۆژێك پەنجەکانی دەشکێت.. ڕۆژێك قاچی.. ڕۆژێك سەری.. ڕۆژێك.. و.. نەمانتوانی چاری بکەین.. هەر بۆیە هەروەك دەیبینی لەم ژوورەدا بەندمان کردووە.. زەویو دیوارەکانیشمان بە ئیسفەنج داپۆشیوە.. چۆن دەیەوێت، با بە دیوارەکاندا بکێشێت..

پاشان پزیشکەکە بە بێدەنگی لە پێشمانەوە ڕۆیشت.. منو عبدالعزیزیش، وەستابووینو لەبەرخۆمانەوە قسەمان دەکردو دەمان وت: (الحمدلله الذي عافانا مما إبتلاك به).. پاشان ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە ژوورێك، کە زیاتر لە سی پیاوی تێدا بوو.. هەریەکە بە شێوازێك.. هەیانبوو بانگی دەدا.. هەیانبوو گۆرانی دەوت.. ئەوی تریان سەمای دەکرد.. ئەوی تر هەر ناوڕی دەدایەوە..

لە نێوانیاندا سێ کەس هەبوون، کە لە سەر کورسی دایان نیشاندبوونو دەستو قاچیان بەسترابوونەوەو سەیری ئەملاو ئەولایان دەکردو هەوڵی کردنەوەی خۆیان دەداو نەیان دەتوانی.. سەرم سوڕماو لە پزیشکەکەم پرسی: ئەمانە چین؟! بۆچی تەنها ئەم سیانە بەستراونەتەوە؟!

وتی: ئەمانە هەر شتێك لە پێشیانەوە بێت لێی دەدەن.. پەنجەرەو دەرگا دەشکێنن.. لەبەرئەوە، هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە بەم شێوەیە دەیان بەستینەوە.. وتم: ماوەی چەنێکە بەمشێوەیەن؟!

وتی: ئەوەیان دە ساڵە.. ئەوی تر حەوت ساڵە.. ئەوی تریان تازەیە، پێنج ساڵە.. هەر بیرم دەکردەوە.. سوپاس بۆ ئەو خودایەی، کە ئێمەی پاراستووە لەوەی کە ئەوان

توشی بوون.. پرسیارم کردو وتم: دەرگای چوونە دەرەوەی نەخۆشخانە لە کوێوەیە؟

وتی: ژوورێك ماوە.. پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدایە.. وەرە.. دەستی گرتم‌و بردمی.. سەرەتا ئەوەی بینیم، هاوشێوەی ژوورەکانی تر بوون.. چەند نەخۆشێك، هەریەکەی بە شێوازێك.. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسورمان بوو.. پیاوێك بوو، تەمەنی زیاتر لە پەنجاساڵ دەبوو.. سەری سپی ببوو.. بە چیچکانەوە لە سەر زەوی دانیشتبوو.. خۆی کورژ کردبۆوە.. بە تیلەی چاو سەیری دەکردین.. بە ترس‌و لەرزەوە ئاوڕی دەدایەوە.. ئەمانە هەمووی ئاسایی بوون .. بەڵام ئەوەی ترساندمی‌و بە تەواوی وروژاندمی‌و بەلامەوە نامۆ بوو، ئەوە بوو کە پیاوەکە ڕوت‌وقوت بوو.. هیچ جل‌وبەرگێکی لەبەردا نەبوو.. تەنانەت عەورەتیشی بە دەرەوە بوو.. ڕەنگم گۆڕاو یەکسەر لام کردەوە بە لای پزیشکەکەدا..

کاتێك بینیمی چاوم سور هەڵگەڕاوە، پێی وتم: ئارام بە.. بۆت باس دەکەم بۆچی ئاوایە.. ئەم پیاوە هەرکاتێك جل‌وبەرگمان لەبەردەکرد، بە ددانەکانی دەیدڕاندو دەیویست قووتیان بدات.. ڕۆژانە زیاتر لە دە دەست جل‌وبەرگمان لەبەر دەکرد، بەڵام دەیدڕاندو بەم شێوەیە دەمایەوە کە دەیبینی.. ئێمەش بە هاوین‌و زستان، بەم شێوازە وازمان لێهێناوە.. ئەو کەسانەش کە بەدەوریەوەن شێتن‌و عەقڵیان پێناشکێت، کە بۆچی ئاوایە..

هاتمە دەرەوە.. نەمتوانی زیاتر ئارام بگرم.. بە پزیشکەکەم وت: دەرگاکەم پیشان بدە بۆئەوەی بچمە دەرەوە..

وتی: هەندێك بەشی تر ماوە.. وتم: ئەوەی بینیمان بەسە..

پزیشکەکە ڕۆیشت‌و منیش لە تەنیشتیەوە.. بە بێدەنگی دەڕۆیشتین، لەپڕ لای کردەوە بە لامدا، وەك ئەوەی بیری شتێکی بکەوێتەوە، کە بیری چوو بێت‌و وتی: یاشێخ لێرە پیاوێك هەیە، بازرگانێکی گەورەیە.. سەدان ملیۆن پارەی هەیە.. توشی نەخۆشیەکی عەقڵی بووە.. ماوەی دوو ساڵە منداڵەکانی هێناویانە بۆ ئێرە.. پیاوێکی تری لێیە ئەندازیارە لە کۆمپانیای ... کەسێکی تری لێیە کە ...

پزیشکەکە بە دەم ڕێگەوە، هەر قسەی بۆ دەکردین.. دەربارەی هەندێك کەس بۆمان دەدوا، کە زەلیل بوون، لەدوای ئەوەی خاوەن پلەوپایە بوون.. هەندێکی تر لەدوای دەوڵەمەندی هەژار کەوتبوون..

دەڕۆیشتم‌و هەر بیرم دەکردەوە.. پاك‌و بێگەردی بۆ خودا، کە ڕزق‌و ڕۆزی لە نێوان بەندەکانیدا دابەش کردووە.. بەوەی کە بیەوێت دەبەخشێت، یان لێی دەگرێتەوەو پێی

نابەخشێت.. هەندێك جار خودای گەورە ماڵو سەروەتو سامانو پلەوپایەو ناوبانگ بە کەسێك دەبەخشێت، بەڵام ژیریو عەقڵی لێوەردەگرێتەوە.. دەبینیت لە زۆربەی کەس دەوڵەمەندترە.. لە زۆربەی کەس جەستەی بەهێزترە، بەڵام لە نەخۆشخانەی دەروونی، یان لە شێتخانە بەند کراوە..

کەسی واش هەیە پلەوپایەی بەرزی هەیە.. ماڵو سامانی زۆر.. عەقڵو ژیریەکی گەورە، بەڵام لەشی ساغ نیەو نەخۆشە.. کەسانێك دەبینی بیست، یان سی ساڵە، لە سەر جێگە کەوتوون، بەبێ ئەوەی ماڵو سامانو پلەوپایە، هیچ سودێکیان پێ بگەیەنن.. ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾﴾ القصص. واتە: (هەر پەروەردگاری تۆیە هەرچیەکی بوێت دروستی دەکاتو هەڵیدەبژێرێت، خەڵکی ئەو دەسەڵاتەیان نیەو سەرپشك نەکراون، پاکیو بێگەردیو بڵندی بۆ خودایە، لە بەرامبەر ئەو شتانەدا کە نەفامان دەیکەن بە شەریكو هاوەڵ)..

هەر بۆیە ئەو کەسانەی کە توشی تاقیکردنەوەو بەڵایەك هاتوون، زۆر بە خێرایی پێویستە بزانن، کە لە لایەن پەروەردگارەوە دیارییەکیان پێبەخشراوە.. ئەگەر ماڵو سامانی زۆری پێنەبەخشیوی، بە دڵنیاییەوە لەش ساغی پێبەخشیوی.. ئەگەر لەش ساغی پێنەبەخشیوی، بە دڵنیاییەوە ژیری پێبەخشیوی..

لە هەموو نیعمەتەکانیش گەورەتر، ئەوەیە کە باوەڕو ئیمانی پێبەخشیوی.. دەی پیرۆزت بێتو خۆشی بۆ خۆت، کە لە ژێر سایەی ئیسلامدا دەژیتو لە ژێر سایەی ئیسلامیشدا دەمریت.. دەی پڕ بە دەنگو بە بەرزی هاوار بکەو بڵێ: سوپاس بۆ خودا.. سوپاس بۆ خودا..

پێغەمبەری خودا ﷺ عەمری کوڕی عاصی بە سەرکردایەتی سوپایەك نارد، بۆ شام.. کاتێك موسڵمانان گەیشتنە شام، بینیان ژمارەی سوپای دوژمنان زۆر زۆرە، هەر بۆیە داوای کۆمەکیو پشتیوانییان لە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد، پێغەمبەری خوداش ﷺ ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحی ﷺ کرد، بە سەرکردەی ئەو جەنگاوەرانەی کە بۆ کۆمەکیو پشتیوانی، ناردنی بۆ شام..

سوپاکەی ئەبوعوبەیدە ﷺ زۆربەی ئەو موسڵمانە کۆچکەرانە بوون، کە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا موسڵمان ببوون، ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەریش (خودایان لێ ڕازی بێت) لە ڕیزی ئەو سوپایەدا بوون.. کاتێك سوپاکەی ئەبوعوبەیدە ﷺ کەوتە ڕێ، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووی تێکردو فەرمووی: لەگەڵ عەمردا، با ناکۆکیو جیاوازی

نەکەوێتە نێوانتانەوە..

کاتێك ئەبوعوبەیدەﷺ بە خۆیی و سوپاکەیەوە گەیشتە شام، عەمرﷺ پێی فەرموو: تۆ بۆ کۆمەکی و پشتیوانی سوپایەك نێردراوی، کە من سەرکردەیم.. ئەبوعوبەیدەش لە وەڵامدا دەفەرموێت: نەخێر.. تۆ سەرکردەی سوپای خۆت بەو منیش سەرکردەی سوپای خۆم دەبم.. ئەبوعوبەیدەﷺ کەسێکی نەرم و نیان و لەسەرخۆ بوو، حەزی نەدەکرد لە پێناو ژیانی دونیادا، کێشەو گرفت دروست بکات..

ئەمجارەشیان عەمر فەرمووی: تۆ بۆ کۆمەکی و پشتیوانی من نێردراویت.. ئەبوعوبەیدەش فەرمووی: ئەی عەمر، پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرمووم: لەگەڵ عەمردا ناکۆك و جیاواز مەبن، ئەگەر تۆ بە گوێم نەکەیت، ئەوا من بە گوێت دەکەم و ملکەچی بڕیارەکەت دەبم.. عەمر فەرمووی: دەی تۆ دەبێت بێیتە ناو سوپاکەمەوەو من دەبم بە سەرکردەت.. ئەبوعوبەیدە، بە بڕیارەکەی عەمر ڕازی بوو.. هەر بۆیە عەمرﷺ پێشکەوت و پێشنوێژی بۆ سوپای موسڵمانان کرد..

لە دوای جەنگەکە، یەکەم کەس کە گەیشتەوە شاری مەدینە، عەوف کوڕی مالیك بوو، کاتێك چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵی جەنگەکەی بە پێغەمبەری خوداﷺ ڕاگەیاند، پاشان باسی ڕووداوەکەی نێوان عەمری کوڕی عاص و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحی کرد..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك هەواڵی ئەو ڕووداوەی بیست، فەرمووی: پەروەردگار بەزەیی و سۆزی خۆی بە سەر ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحدا بڕێژێت..

> **بیرۆکە..**
> بۆ ئەوەی بە بەختەوەری و کامەرانی بژیت، پێش ئەوەی سەیری تاریکیەکانی ژیانت بکەیت، سەیری لایەنە درەوشاوەکانی ژیانت بکە..

# وەکو چیاکان خۆڕاگر بە..

لە سەرەتای قۆناغی بانگەوازکردنمدا، ڕۆژێك چووم بۆ یەکێك لە گوندەکان بۆ پێشکەش کردنی وتارێك.. بەرپرسی بانگەوازی ئەو ناوچەیە، پێشوازی لێکردمو سواری ئۆتۆمبیلێکی زۆر کۆن بووینو کەوتینە ڕێ..

کاتێك لەگەڵیدا کەوتمە گفتوگۆ، پێی ڕاگەیاندم ئەندازەی مارەیی هاوسەرداری، لە گوندەکەماندا بە ڕێژەیەکی زۆر بەرزبۆتەوە، هەتا وای لێهاتووە، کەسێك ناتوانێت ئۆتۆمبیلێکی تازە بکڕێت، ئەگەر بوارت هەبوو، بەڵکو باسێکی ئەو بابەتەش بکەیت.. پاشان چووینە گوندەکەوەو دەستم کرد بە پێشکەش کردنی وتارەکەم..

لە کۆتایی وتارەکەمدا، وەڵامی پرسیارە نوسراوەکانی ئامادەبووانم دەدایەوە.. دڵم خۆش بوو، کاتێك بینیم یەکێك لە پرسیارەکان، دەربارەی زۆری مارەییەو لە دڵی خۆمدا وتم: ئەمە ئەو بابەتە بوو، کە من دەمویست لە بارەیەوە بدوێم.. هەر بۆیە دەستم کرد، بە باس کردنی کاریگەرییە خراپەکانی زۆری مارەیی، لە سەر کچانو کوڕانی گەنجو لاو، پاشان وتم: هیچ کچێکی پێغەمبەری خوداﷺ مارەییەکەی لە پێنج سەد درهەم زیاتر نەبووە، دواتر دەنگم بەرزکردەوەو وتم: ئەی هۆزی فلان، ئایا کچەکانی ئێوە باشترو چاکترن لە کچەکانی پێغەمبەری خوداﷺ ؟!

لەپڕ کابرایەکی پیری بە ساڵاچوو، هاواری کردو وتی: بۆ کچەکانی ئێمە عەیبیان چیە؟! یەکێکی تر وروژاو وتی: قسە بە کچەکانی ئێمە دەڵێیت؟! یەکێکی تریان هەستایە سەر ئەژنۆو وتی: خۆ ئەمە لە بارەی کچەکانمانەوە دەدوێتو قسە دەکات!!

بە ڕاستی کەوتمە نێو ڕووداوێکی زۆر ناخۆشەوە، ڕزگاربوون لێی ئاسان نەبوو.. من لە سەرەتای قۆناغی بانگخوازیمدا بوومو تازە زانکۆم تەواو کرد بوو، نەمدەزانی چی بکەم، بە بێدەنگی مامەوەو هیچ قسەیەکم نەکرد، تەنها زەردەخەنەیەکم بە ڕووی هەرسێکیاندا کرد، سەیرێکی کۆتایی مزگەوتەکەشم کرد، بینیم هەندێك لە گەنجەکان پێدەکەنن، هەندێکیشیان هەستا بوونە سەر پێو سەیریان دەکردو چاوەڕێ بوون، بۆ ئەوەی بزانن چی ڕوودەداتو لە ڕوخساریاندا ئەوە دەخوێندرایەوە، کە بڵێن: تووشی گێرەو کێشەیەکی وابوویت، ڕزگاربوونت ئاسان نیە!!

کاتێك منیان بینی، زۆر ئارامو لەسەرخۆم، ئەوانیش کەمێك ئارام بوونەوە، پاشان یەکێك هەستاو وتی: خەڵکینە واز لە مامۆستا بهێنن، با مەبەستەکەی ڕوون بکاتەوە.. هەموو بێدەنگ بوون.. منیش سوپاسی ئەو کەسەم کرد، پاشان پۆزشم بۆ هێنانەوەو سوپاسی ئەوانیشو کچەکانیشیانم کردو دواتر مەبەستەکەمم بۆ ڕوون کردنەوەو بارودۆخەکەم ئاسایی کردەوە..

دڵنیابە، ڕەشەبا هەر چەندە بەهێز بێت، ناتوانێت درەختە ڕەگ داکوتاوەکان بجوڵێنێت.. سەرکەوتنیش لە ئارامگرتنو دان بە خۆگرتنی چەند ساتێکدایە.. هەر چەندێك ژیریو عەقڵت زیاد بکات، ئەوەندە نەزانیو نەفامیت کەم دەکات.. وەکو زەریاکان، کە هیچ شتێك ناتوانێت بیان جوڵێنێت.. هەروەها وەکو شاخەکان کە هیچ شتێك ناتوانێت بیان لەرزێنێت..

کاتێك کەسێك لە کۆڕو دانیشتنێکدا، یان لەماڵێکدا، یان لە وتارێکی گشتیدا، یان لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا، دەیەوێت توورەت بکاتو تۆش ئەگەر بە ئارامی بمێنێتەوەو بە سەر خۆتدا زاڵ بیتو توورە نەبیت، ئەوا هەموو خەڵکی دەبن بە دۆستو پشتیوانی تۆو سەنگەر لەو کەسە دەگرنو دژی دەوەستن.. ئەوەتا لە یەکێك لە جەنگەکاندا، کابرایەکی کوێری دووڕوو، چنگێك خۆڵ هەڵدەگرێتو دەڵێت: ئەی محمد سوێند بە خودا ئەگەر بمزانیایە ئەم خۆڵەی دەستم جگەلە تۆ بەر هیچ کەسێکی تر ناکەوێت، ئەوا تێم دەگرتیو دەمکرد بە ڕوخسارتدا.. هاوەڵان ویستیان بیکوژنو بەرەو ڕووی چوون، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرموون: مەیکوژن، ئەو پیاوە نابینایە.. دڵیشیو چاوەکانیشی کوێرن..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆیشتو هەر ئاوڕیشی لە کابرای دووڕوو نەدایەوە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوداﷺ خاوەنی داناییو ژیری بوو، چۆن دەبێت بە قسەی نەفامێك توورە بێت..

لو کل کلب عوی ألقمته حجراً    لأصبح الصخر مثقالاً بدینار..

بەڵێ.. ئەگەر هەر سەگێك وەڕیو ئێمە بەردی تێبگرین، ئەوا نرخی مسقاڵێك بەرد، دەبێت بە دینارێکی ئاڵتون.. پێشینانیش وتوویانە: سەگ دەوەڕێتو کاروانیش لە ڕۆیشتن هەر بەردەوامە..

**پەیقێک..**

ڕەشەبا، هەر چەندە بەهێز بێت، ناتوانێت شاخەکان بجوڵێنێت، بەڵام دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی یاری بە بەردو لمەکان بکاتو چۆنی بووێت ئاوایان لێبکات..

## نەفرینی لێمەکە.. با شەرابیشی خواردبێتەوە..!!

زۆرێك لەو كەسانەی كە تێكەڵییان دەكەین، هەر چەندە خراپو ناڵەبارین، خاوەنی خێرو چاكەشن، ئەگەر خێرو چاكەكەشیان كەم بێت.. خۆ ئەگەر بتوانین كلیلی سەرچاوەی خێرو چاكەكانیان بدۆزینەوە، ئەوە شتێكی زۆر چاكە.. هەندێك تاوانبار ناوبانگیان بە دزو جەردە دەركرد بوو، بە سەر دیواری خەڵكیدا سەردەكەوتنو دزییان دەكرد، بەڵام هەندێك لەو سەروەتو سامانەی كە دەستیان دەكەوت، لە ڕێگەی خێرو چاكەدا بەكاریان دەهێنا، یارمەتی هەژارو بێوەژنەكانیان پێدەداو جاری واش هەبوو مزگەوتیان پێ دروست دەكرد!! یان وەك ئەو ئافرەتەی، كاتێك بێباوكێكی ڕووتو برسی دەبینی، كاری بەدرەوشتیو داوێن پیسی ئەنجام دەدا، بۆ ئەوەی پارەو پولێكی دەست بكەوێتو ئەو بێباوكەی پێ تێر بكات..

تاوانباری وا هەیە، خەنجەرو چەقۆی بە دەستەوە گرتووەو دەیەوێت خوێنێك بڕێژێت، بەڵام كاتێك ئافرەتێك یان منداڵێك دەبینێت، سۆزی دەجوڵێتو خەنجەرو چەقۆكەی دەستی فڕێ دەداتو لەو تاوانە دوور دەكەوێتەوە..

كەواتە خەڵكی هەموو كەمو زۆر خێریان تێدایە، پێش ئەوەی گومانی خراپیان پێبەریت، گومانی چاكیان پێبەرە.. ئەوەتا پێغەمبەری خوداﷺ پۆزشو بیانووی گوناهبارانو ئەو كەسانەی وەردەگرت، كە لە جەنگەكاندا دوادەكەوتنو گومانی باشی پێدەبردن.. كاتێك كەسێك تاوانێكی ئەنجام دەدا، پێغەمبەری خوداﷺ لە پێشدا سەیری لایەنە ئیمانیەكانی ئەو كەسەی دەكرد، نەك لایەنی گوناهو تاوانو ئارەزووەكانی.. گومانی خراپی بە كەس نەدەبرد، خەڵكی بە كوڕو برای خۆی دەزانیو بە جوانترین شێوە هەڵسوكەوتی لەگەڵ دەكردن..

لە سەردەمی پێغەمبەری خواداﷺ پیاوێك گیرۆدەی خواردنەوەی عەرەق

ببوو، ڕۆژێك هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمانیدا دارکاری بکەن.. پاش چەند ڕۆژێك، دوبارە عەرەقی خواردەوەو دوبارە دارکارییان کردەوە.. پاشان چەند جارێکی تر عەرەقی دەخواردو دەیان هێنایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو دارکارییان دەکردەوە..

جارێك لەو جارانەو لە دوای دارکاری کردنەکەی، پیاوەکە دەڕوات‌و پاشان یەکێك لە هاوەڵان پێی دەڵێت: نەفرینی خودات لێبێت، چەند زوو زوو بۆ دارکاری کردن دەتهێنن!!

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ گوێ بیستی ئەم وتەیە دەبێت، ڕوخساری دەگۆڕێت‌و دەفەرموێت: بە نەفرینی مەکە، سوێند بە خودا ئەو پیاوە خوداو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت.. متفق علیه..

کاتێك هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت، دادپەروەربەو چاکەو جوانیەکانیان بخەرە ڕوو.. با هەست بەوە بکەن، بە هۆی خراپەکانیانەوە، چاکەکانیان لەبیر ناکەیت‌و هەر خۆشت دەوێن، ئەوسا دەتوانیت زیاتر لێیان نزیك بیتەوەو بچیتە دڵیانەوە..

**هونەرو لێزانین..**

پێش ئەوەی دەست بکەیت بە هەڵکێشانی ڕەگو شکاندنی درەختی شەڕو خراپەی خەڵکی، بگەڕێ بە دوای درەختی خێرو چاکەکانیانداو تێر ئاویان بکە..



# ئەگەر بەو شێوەیە نەبوون کە دەتەوێت، تۆ بەو شێوەیە بە کە دەیانەوێت..!!

هەمیشە ژیان بەو شێوەیە نابێت، کە ئێمە حەزی لێدەکەین.. هەمیشە کاروبارەکان بەو شێوەیە ناڕوات، کە ئارەزووی دەکەین.. ئۆتۆمبیلەکەت کۆنەو سارد کەرەوەکەشی کار ناکاتو ناشتوانیت بیگۆڕیت.. چارەسەر چیە؟! مادام چارت ناچارە، دەتوانیت خۆڕاگر بیتو سود لە ئۆتۆمبیلەکەشتو لە ژیانیشت وەربگریت..

فۆرمی وەرگرتن لە زانکۆت پڕ کردەوە، بەڵام لە کۆلێژێك وەرگیرایت، کە حەزت پێی نیە، هەوڵت زۆردا بۆ ئەوەی کۆلێژەکەت بگۆڕیت، بەڵام نەتتوانیو بەردەوام بووی لە زانکۆو دوو سێساڵیشت تێپەڕاند، دەی دەتوانیت سود لە خوێندنەکەت ببینیت، هەروەها چێژو خۆشیش لە ژیانت وەربگریت..

چوویت بۆ داخوازی ئافرەتێك، بەڵام پێیان نەدایتو تۆش ئافرەتێکی ترت مارە کرد.. ویستت لە شوێنێك دامەزرێیت، بەڵام لە شوێنو جێگەیەکی تر وەریان گرتیت، چارەسەر چیە؟! بە ئاسایی کارەکە وەربگرەو درێژە بە ژیانت بدەو بەختەوەر بژی..

زۆرێك لە خەڵکی کاتێك توشی یەکێك لە گرفتەکانی سەرەوە دەبن، دەیکەن بە کێشەیەکی زۆر گەورەو بەردەوام بیری لێدەکەنەوەو ئاخو ئۆف، بۆ ڕابردوو هەڵدەکێشنو لە لای دۆستو دوژمن سکاڵای حاڵی خۆیان دەکەن، هەموو ئەم نارەزاییانەش، ناتوانن کارێك بۆ سکاڵاکار بکەن، یان شتێکی لە دەستچووی بۆ بگێڕنەوە..ئەی چارەسەر چیە؟!

چارەسەر بریتیە لەوەی: ئەگەر کاروبارەکان بەو شێوەیە نەبوون، کە تۆ دەتەوێتو حەزی پێدەکەیت، ئەوا تۆ دەتوانیت خۆت بگونجێنیتو بەو شێوەیە بیت، کە ژیانت لێ تێك نەچێتو هەوڵ بدەیت بە بەختەوەری بژیت.. کەسی ژیرو دانا ئەو کەسەیە، کاتێك دەزانێت بارودۆخێکی بۆ ناگۆڕدرێت، لەگەڵیدا هەڵبکاتو خۆی بگونجێنێت..

هاوڕێیەکم سەرپەرشتی دروست کردنی مزگەوتێکی دەکرد، کاتێك پارەیان لێبڕا،

چوون بۆ لای یەکێك لە بازرگانەکان، بۆ ئەوەی لە تەواو کردنی مزگەوتەکەدا یارمەتیان بدات.. بازرگانەکە دەرگای لێکردنەوەو کەمێك لە لای دانیشتن و چەندێکی لە توانادا بوو یارمەتیدان، پاش کەمێك بازرگانەکە حەبێکی لە گیرفانی دەرهێناو خواردی.. یەکێك لە ئامادەبووان پێی دەڵێت: ئەوە خێربوو؟!

ئەویش دەڵێت: ئەوە حەبی خەو بوو، ماوەی بیست ساڵە بە هۆی ئەو حەبەوە نەبێت، خەوم لێناکەوێت.. ئامادەبووان دوعای خێرو شیفایان بۆ کردو ماڵئاواییان لێکرد، لە دوای هاتنە دەرەوەیان لە ماڵی بازرگانەکە، بە لای کۆمەڵێك چاڵ و ڕێگەوباندا دەڕۆن، کە کاریان تێدا دەبێت و بە هۆی دەنگی مۆلیدەو زۆرێك گڵۆپ و ڕوناکییەوە، ژاوەژاوێك دروست ببوو، ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو، پاسەوانی مۆلیدەکەن، کە پیاوێکی هەژار بوو، چەند لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەی ڕاخستبوو، زۆر بە ئارامی خەوی لێکەوتبوو!!

بەڵێ.. بە خۆشی و بەختەوەری بژی و کاتی غەم و خەفەت نیەو بە گوێرەی هەبوونی و نەبوونی خۆت درێژە بە ژیانت بدەو هەوڵبدە هەمیشە بە کامەرانی بژیت و ڕێگە مەدە هیچ کات، غەم و خەفەت لە دەرگای دڵ و دەروونت بدات..

پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، لە یەکێك لە جەنگەکاندا، خواردنیان زۆر کەم پێدەبێت و زۆریش هیلاك و ماندوو دەبن، پێغەمبەری خوداﷺ عابەکەی ڕادەخات و فەرمان دەکات بەوەی، کە هەموویان خواردنەکەیان تێکەڵ بکەن.. پیاوی وا هەبوو تەنها دەنکێك خورما، یان دوو دەنك خورمای دەهێنا، کەسی وا هەبوو لەتێك نانی هەبوو دەیهێناو تێکەڵی دەکرد.. هەموویان ئەوەی پێیان بوو، لە سەر عابەکەی پێغەمبەری خوداﷺ دایاننا، پاشان هەمووان دەستیان کرد بە خواردن و زۆریش چێژو خۆشییان لە خواردنەکەیان بینی، لەوانەشە تێریشیان نەخوارد بێت، بەڵام لانی کەم بۆ ساتێکیش بێت، برسێتیان بیرچۆوە..

**ترووسکەیەك..**

ئەو شتانەی خۆزگەی پێدەخوازیت، مەرج نیە هەموویان بەدی بێن.. شنەباش هەموو جارێك، بە ویستو ئارەزووی کەشتیەکان هەڵناکات..

## جیاوازیشمان هەبێت، هەر براین..

ئیمامی شافیعی (خودا لێی خۆش بێت) لە سەر بابەتێکی فیقهی لەگەڵ زانایەکدا دەکەوێتە گفتوگۆو ناگەنە هیچ ئەنجامێكو جیاوازی دەکەوێتە نێوانیان، هەتا وایان لێدێت دەنگیان بە سەر یەکدا بەرز دەکەنەوەو هیچیان ناتوانن، ئەوی تریان ڕازی بکەن.. کاتێك دانیشتنو گفتوگۆکەیان کۆتایی پێدێتو دەیانەوێت بڕۆن، ئیمامی شافیعی (خودا لێی خۆش بێت) بە زاناکەی هاوڕێی دەڵێت: ئایا نابێت لە ڕاو بۆچووندا جیاوازیمان هەبێتو براش بین؟!

هەندێك زانای بواری فەرموودە لە لای یەکێك لە خەلیفەکان دادەنیشن، یەکێك لە ئامادەبووان فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوداﷺ باس دەکات، یەکێك لە زاناکان سەرسام دەبێتو دەڵێت: ئەوە کەی فەرموودەی پێغەمبەری خودایەﷺ؟! لە کوێت هێناوە؟! درۆ بە دەم پێغەمبەری خوداوە دەکەیت؟!

پیاوەکەش دەڵێت: بە دڵنیاییەوە فەرموودەی پێغەمبەری خودایەﷺ..

زاناکەش دەڵێت: نەخێر.. من فەرموودەی وام نەبیستووەو لەبەریشم نیە!!

وەزیرێکی زۆر ژیر ئامادەی دانیشتنەکە دەبێت، ڕوو دەکاتە زاناکەو دەڵێت: ماموستا جەنابت هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوداتﷺ لەبەرە؟!

زاناکە دەڵێت: نەخێر..

وەزیرەکە دەڵێت: ئەی نیوەیانت لەبەرە؟!

زاناکە دەڵێت: لەوانەیە..

وەزیرەکەش دەڵێت: دەی وای دابنێ ئەو فەرموودەیە، لەو نیوەیەیە کە لەبەرت نیە..

کێشەکە کۆتایی هاتو بڕایەوە..

عبداللەی کوڕی موبارەكو فوزەیلی کوڕی عەیاز دوو هاوەڵی گیانی بە گیانی یەکبوونو هەرگیز لێك جیا نەدەبوونەوە، هەردووکیشیان دوو زانای زۆر

گەورەو خوداپەرست بوون.. ڕۆژەكان تێپەڕینو عبداللەی كوڕی موبارەك چوو بۆ جیهادو تێكشانو فوزەیلی كوڕی عەیازیش لە هەر دوو حەرەمی مەككەو مەدینە، هەر خەریكی نوێژو خوداپەرستی بوو..

ڕۆژێك فوزەیل لە یەكێك لە حەرەمەكان دادەنیشێتو، دڵی زۆر ناسك دەبێتو فرمێسك بە چاوەكانیدا دێتە خوارەوەو زۆر بیری عبداللەی كوڕی موبارەكی هاوەڵی دەكات، هەر بۆیە نامەیەكی بۆ دەنوسێتو داوای لێدەكاتو بانگی دەكات، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوەو لە حەرەم دەست بكاتەوە بە خوداپەرستیو نوێژو قورئان خوێندن..

كاتێك عبداللەی كوڕی موبارەك نامەكە دەخوێنێتەوە، ئەمیش بە نامەیەك وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت:

| | |
|---|---|
| يا عابد الحرمين لو أبصرتنـــا | لعلمت أنك في العبادة تلعب |
| من كان يخضب خده بدموعه | فنحورنا بدمائنا تتخضب |
| أو كان يتعب خيله في باطل | فخيولنا يوم الصبيحة تتعب |
| ريح العبير لكم ونحن عبيرنا | رهج السنابك والغبار أطيبُ |
| ولقد آتانا من مقال نبينا | قول صحيح صادق لايكذب |
| لايستوي غبار خيل الله في | أنف امرئ ودخان نار تلهبُ |
| هذا كتابُ الله ينطق بيننا | ليس الشهيد بميت لايكذب |

بەڵێ.. بە هۆنراوەیەك باسی فەزڵو گەورەیی جیهادو تێكۆشانی كردو پەیامێكی جوانیشی ئاڕاستەی هاوەڵەكەی كردو تیایدا نوسی بووی، كە ئەوەی تۆ دەیكەیت لە چاو تێكوشانی ئێمەوە، وەكو یاری وایەو ئەگەر تۆ بە فرمێسك گۆناكانت تەڕ دەكەیت، ئەوا ئێمە گەردنیشمان خوێنی لێدەچۆڕێ.. كاتێكیش ئەسپو ماینەكەت لە كاری ناساندا ماندوو دەكەیت، ئەوا ئێمە ئەسپو ماینەكانمان لە جیهادو تێكۆشاندا دەپێكرێنو ماندوو دەبن.. كاتێك خۆت بۆن خۆش دەكەیت، بە بۆنی خۆش، بۆنی خۆشی ئێمە تۆزو خۆڵی ڕێگەی تێكۆشانە.. پێغەمبەری خوداﷺ لە وتەیەكدا، كە هیچ گومانێكی تێدانیە، دەفەرموێت: تۆزو خۆڵی جیهادی هیچ كەسێك، لەگەڵ دوكەڵو بڵێسەی ئاگری

دۆزەخدا کۆنابنەوەو پەروەردگاریش لە قورئانەکەیدا، شەهیدی بە نەمر ناوبردووەو فەزڵو پلەو پایەی گەورەی پێبەخشیووە..

پاشان فەرمووی: هەندێك بەندە پەروەردگار توانای ڕۆژووگرتنێکی وای پێبەخشیووە، کە بە کەسێکی تری نەبەخشیووە.. هەروەها دەرگای قورئانی پیرۆزی لە هەندێك کەس کردۆتەوە، جیاواز لە خەڵکانی تر.. زانستو زانیاریشی بەخشیووە بە کەسانێكو توانای جیهادو تێکۆشانیش بە کەسانێکی تر.. کەسانێکیش پەروەردگار فەزڵی شەونوێژی پێبەخشیوون.. ئەوەی تۆی لە سەری، لەوە باشتر نیە کە من لە سەریم، هەر وەك چۆن ئەو کارەی کە من دەیکەم، لەو کارە باشتر نیە کە تۆ دەیکەیت.. هەردووکیشمان لە سەر خێرو چاکەین، بەم شێوەیە زۆر بە ئارامی جیاوازی لە نێوانیاندا نەما.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ... ﴿٦٨﴾﴾ القصص. واتە: (هەر پەروەردگاری تۆیە هەرچیەکی بوێت دروستی دەکاتو هەڵی دەبژێرێت)..

دوای ئەوەی پەروەردگار لە جەنگی خەندەقدا، بە هۆی ڕەشەبایەکی بەهێزەوە شکستی بە بێباوەڕان هێناو بە سەری شۆڕەوە گەڕانەوەو پشتیان هەڵکرد، موسڵمانانیش گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیانو شمشێرو کەرەسەکانی جەنگیان دانا، پێغەمبەری خوداش ﷺ گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو خۆی شۆری... کاتێك نزیك نیوەڕۆ بۆوە، جوبرائیل عليه السلام هاتو لە دەرەوەی ماڵەوە، بانگی پێغەمبەری خودای ﷺ کرد.. پێغەمبەری خودا ﷺ ترسی لێدەنیشێت..

جوبرائیل عليه السلام دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە چەکی جەنگتان داناوە؟! پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: بەڵێ..

جوبرائیل عليه السلام دەفەرموێت: دەی فریشتەکان هێشتا چەکەکانیان دانەناوەو تا ئێستاش بە دوای بێباوەڕانەوەنو ڕاویان دەنێنو خەریکن لە شاری مەدینە دووریان دەخەنەوە، پاشان فەرمووی: پەروەردگار فەرمانت پێدەکات، بەرەو لای جولەکەکانی بەنو قورەیزە بکەویتە ڕێ..

پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی خەڵکەکەی کردو پێی فەرموون: هەر کەسێك گوێڕایەڵو ملکەچە با نوێژی عەسر، لە بەنو قورەیزە ئەنجام بدات.. خەڵکەکە

هەموو چەکەکانیان هەڵگرتو کەوتنە ڕێ، هەتا کاتی نوێژی عەسر هاتو هێشتاش لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون.. هەندێکیان وتیان: تا نەگەینە بەنو قورەیزە نوێژی عەسر ناکەین، بەڵام هەندێکی تریان وتیان: نوێژەکەی عەسرمان دەکەین، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوداﷺ مەبەستی لەو قسەیەی ئەوە بوو: کە پەلە بکەینو زوو بکەوینە ڕێ، هەر بۆیە نوێژی عەسریان ئەنجامداو پاشان کەوتنەوە ڕێ، ئەوانی تریان نوێژەکەیان دواخستو کاتێك گەیشتنە بەنو قورەیزە نوێژەکەیان ئەنجامدا..

کاتێك ڕووداوەکەیان بۆ پێغەمبەری خوداﷺ گێڕایەوە، ڕەخنەی لە هیچ یەکێك لەو دوو کۆمەڵە نەگرت.. پاشان گەمارۆی جولەکەکانی بەنو قورەیزەیانداو پەروەردگار سەرکەوتنی بە موسڵمانان بەخشی..

سەیرکە ئەوانە کاتێك لە ڕاو بۆچووندا جیاواز دەبوون، بەڵام هەر برا بوون.. بە هۆی جیاوازی ڕاو بۆچوونیانەوە، کێشەو گیروگرفتیان نەدەسازاند.. بە ڕاستی ئەگەر بەم شێوەیە لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوت بکەیتو لەگەڵیاندا هێمنو لەسەرخۆ بیتو بەرامبەر ڕاو بۆچوونەکانیان سنگ فراوان بیت، بە دڵنیاییەوە لە لایان خۆشەویست دەبیتو زۆر بە ئاسانیو بە بێ لە دەرگادان، دەتوانیت بچیتە دڵیانەوە.. لە پێش خەڵکیشدا، لە لای پەروەردگار خۆشەویست دەبیتو بشزانە ناکۆکیو دووبەرەکی، جگەلە شەڕو خراپە، هیچ سودێکیان نیە..

**تێڕوانین..**

مەبەست ئەوە نیە هەموو کاتێك ڕێکو تەبا بین، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، ناکۆکو جیاواز نەبین..

# نەرمو نیانی مایەی جوانیە..

کاتێك بە یەکێك سەرسام دەبینو دەمانەوێت پیایدا هەڵبدەین، دەڵێین: فلانە کەس ڕێكوپێکە، یان قورسو گرانە، یان مەنگو بێدەنگە..

کاتێکیش دەمانەوێت، سەرزەنشتی کەسێك بکەین، دەڵێین: فلانە کەس زۆر سوكو ڕیسوایە، یان فلانە کەس زۆر چروکە، یان زۆر چەتوونە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: «ماکان الرفق في شيء إلا زانة، ومانزع من شيء إلا شانه». رواه مسلم.. واتە: (نەرمو نیانی لە هەر شتێکدا هەبێت، جوانی دەکاتو دەیرازێنێتەوە، هەر شتێکیش نەرمو نیانی تیادا نەمێنێت، ناشیرینو بێزراو دەبێت)..

ئایا دەتوانیت تەنێك ئاسن بە پەنجەیەك بجوڵێنیت؟!

بەڵێ.. ئەگەر بەرزکەرەوەیەکت لە لا بێت، دەتوانیت تەنە ئاسنەکە بە جوانی ببەستیتەوەو پاشان بە بچوکترین پەنجەت، دەتوانیت پەنجە بە دوگمەکانی بەرزکەرەوەکەدا بنێیتو زۆر بە ئاسانی بەرزی بکەیتەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: «إذا أراد الله بأهل بيت خيراً أدخل عليهم الرفق، وإذا أراد الله بأهل بيت شراً نزع منهم الرفق». رواه أحمد.. واتە: (پەروەردگار ویستی خێرو چاکەی بە هەر کۆمەڵو خانەوادەیەك هەبێت، ئەوا نەرمو نیانیان دەکات، ئەگەر پەروەردگار ویستی شەڕو نارەحەتیشی بە هەر کۆمەڵو خانەوادەیەك هەبێت، ئەوا نەرمو نیانییان لە ناودا ناهێڵێت)..

نەرمو نیانی ڕەوشتێکە، خەڵکی خۆشیان دەوێتو دڵیان پێی ئارامو ئاسودە دەبێتو هەر کەسێك خاوەنی ئەم ئاکارە جوانە بێت، دەبێتە جێگەی متمانەو باوەڕی خەڵکی..

ئەبو یوسفی قازی، بە ناوبانگترین قوتابی ئەبو حەنیفە دەبێت، ئەم ئەبویوسفە لە منداڵیدا کەسێکی زۆر هەژارو نەدار دەبێت، هەر بۆیە باوکی ڕێگری دەکات، ئامادەی وانەکانی ئەبو حەنیفە ببێتو فەرمانی پێدەکات، بچێت بۆ بازاڕ، کار بکاتو بژێوی خۆی بە دەست بهێنێت، ئەبوحەنیفەش سور دەبێت لە سەر ئەوەی دەبێت ئەبو یوسف ئامادەی وانەکانی بێتو ئەگەر دیار نەبووایە، سەرزەنشتی دەکرد..

ڕۆژێك ئەبو یوسف سکاڵای باوکی لە لای ئەبو حەنیفە دەکاتو حاڵی خۆی

تێدەگەیەنێت، ئەبوحەنیفەش (خودا لێی خۆش بێت) بانگی باوکی ئەبو یوسف دەکاتو پێی دەڵێت: ئەم کورەت ڕۆژانە چەندێك پەیدا دەکات؟ باوکیشی دەڵێت: دوو درهەم.. ئەبو حەنیفە پێی دەڵێت: من ڕۆژی دوو درهەمت دەدەمێو واز لە کورەکەت بهێنە، با خەریکی فێربوونی زانستو زانیاری بێت.. ئیتر لەو کاتەوە، تا چەندین ساڵ ئەبو یوسف، لە خزمەتی ئەبو حەنیفەدا خەریکی خوێندن دەبێتو زانستو زانیارییەکی باشی لێ وەردەگرێت..

بەڵێ.. ئەبو یوسف دەبێتە گەنجێکی لێهاتوو، زانستو زانیارییەکی باشیش بە دەست دەهێنێت، ڕۆژێك نەخۆش دەکەوێتو لەماڵەوە دەکەوێت، نەخۆشیەکەی تینی بۆ دەهێنێتو زۆر کاری تێدەکات، کاتێك ئەبو حەنیفە سەردانی دەکاتو دەیبینێت، زۆر بۆی دڵگران دەبێتو دەترسێت بمرێت، پاشان ئەبو حەنیفە دێتە دەرەوەو لەبەر خۆیەوە دەڵێت: ئاه ئەبو یوسف.. هیواخواز بووم لە دوای من، شوێنو جێگەم بگریتەوە!!

ئەبو حەنیفە، بە کۆمەڵێك غەمو خەفەتەوە، دەچێتەوە بۆ لای قوتابیەکانیو لە دوای دوو ڕۆژ، خودای گەورە شیفا بۆ ئەبو یوسف دەنێرێتو چاك دەبێتەوە.. ئەبو یوسف خۆی دەشواتو پاشان خۆی دەگۆڕێت، بۆ ئەوەی بچێت بۆ لای مامۆستاکەیو درێژە بە وانەکانی بدات، کاتێك هەڵدەستێت بڕوات، ئەو کەسانەی لە دەوروبەری دەبن، پێی دەڵێن: ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟! ئەویش دەڵێت: دەچم بۆ خوێندنی وانەکانم..

ئەوانیش دەڵێن: تا ئێستاش هەر دەچیت بۆ خوێندن؟! بەس نیە؟! ئەی نازانیت، ئەبو حەنیفە لە بارەی تۆوە چی وتووە؟! ئەبو یوسفیش دەڵێت: چی وتووە؟!

ئەوانیش دەڵێن: وتوویەتی: هیوادارم لە دوای خۆم لە ناو خەڵکیدا جێگەم بگرێتەوە.. دەی کەواتە مەبەستی ئەوەیە، هەموو زانستو زانیارییەکانی ئەبو حەنیفەت بە دەست هێناوەو ئەگەر مردیش، دەتوانیت بچیتە جێگەکەیو شوێنەکەی پڕ بکەیتەوە..

ئەبو یوسف کاتێك گوێی لەم قسانە دەبێت، سەرسام دەبێت بە خۆییو کاتێك دەچێت بۆ مزگەوت، دەبینێت ئەبو حەنیفە لەگەڵ قوتابیەکانیدا لە سوچێکی مزگەوتەکەدا خەریکی خوێندنن، بەڵام ئەم تێکەڵیان نابێتو لە سوچێکی تری مزگەوتەکەدا دادەنیشێتو دەست دەکات بە وانە وتنەوەو وەڵامی پرسیارەکانی خەڵکیش دەداتەوە..

ئەبو حەنیفە کاتێك کۆمەڵێکی تازە دەبینێت، لە مزگەوتەکەدا خەریکی خوێندن دەبن، پرسیار دەکاتو دەڵێت: ئەوە کێیە وانە دەڵێتەوە؟! قوتابیەکانیش دەڵێن: ئەوە ئەبو یوسفە..

ئەبو حەنیفە دەڵێت: چاك بۆتەوە؟! دەڵێن: بەڵێ..

ئەبو حەنیفەش دەڵێت: ئەی بۆ نایەت بۆ خوێندنی وانەکانی؟! ئەوانیش دەنگ‌وباس‌و رووداوەکەی بۆی دەگێرنەوەو دەڵێن: لەمەودوا بڕیاریداوە، خۆی وانە بە خەڵکی بڵێتەوەو پێویستی بە تۆ نەماوە..

ئەبوحەنیفە (خودا لێی خۆش بێت) بیر دەکاتەوە، چۆن بە نەرم‌و نیانی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم کارەی قوتابیەکەیدا بکات، ئاور بە لای یەکێك لە قوتابیەکانیدا دەداتەوەو پێی دەڵێت: برۆ بۆ لای ئەبو یوسف‌و پێی بڵێ: یا شێخ پرسیارێکم هەیە، پیاوێك جل‌وبەرگێك دەبات بۆ لای بەرگدروویەك، بۆ ئەوەی بۆی کورت بکاتەوە، دوای چەند رۆژێك کاتێك کابرا دەچێتەوە بۆ لای بەرگدرووەکە، بۆ ئەوەی جل‌وبەرگەی وەربگرێتەوە، بەرگدرووەکە نکۆڵی لەوە دەکات، کە هیچ جل‌وبەرگێکی لە لا بێت، پیاوەکەش پەنا دەباتە بەر پیاوانی پۆلیس‌و لە دوای گەران‌و بەدواداچوون، جل‌وبەرگەکە لە دوکانی بەرگدرووەکەدا دەدۆزنەوە.. پرسیارەکە لێرەدایە، ئایا بەرگدرووەکە مافی وەرگرتنی کرێی کورت کردنەوەی جل‌وبەرگەکەی هەیە، یان نا؟

ئەگەر وەڵامی دایەوەو وتی: بەڵێ، ئەوا پێی بڵێ: هەڵەت کرد.. ئەگەر وتیشی: نەخێر مافی وەرگرتنی کرێی کورت کردنەوەی جل‌وبەرگەکەی نیە، دوبارە پێی بڵێ: هەڵەت کرد..

قوتابیەکە بەم پرسیارە ئاڵۆزە دڵخۆش دەبێت‌و دەچێت بۆ لای ئەبو یوسف‌و پرسیارەکەی لێدەکات.. ئەبو یوسفیش بە خێرایی وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: بەڵێ.. مادام کارەکەی خۆی جێبەجێ کردووە، مافی خۆیەتی کرێی وەرگرتنی کاری کورت کردنەوەی جل‌وبەرگەکە وەربگرێت.. قوتابیەکەش دەڵێت: وەڵامەکەت هەڵەیە..

ئەبو یوسف سەرسام دەبێت‌و زیاتر لە پرسیارەکە ورد دەبێتەوەو پاشان دەڵێت: نەخێر مافی وەرگرتنی کرێکەی نیە.. دوبارە قوتابیەکە دەڵێت: وەڵامەکەت هەڵەیە..

ئەبو یوسف بیر لە پرسیارکەرەکە دەکاتەوەو دەڵێت: سوێندت دەدەم بە خودا، کێ تۆی ناردووە بۆ لای من؟! قوتابیەکەش ئاماژە بۆ ئەبو حەنیفە دەکات..

ئەبو یوسف هەڵدەستێت‌و بەرەو لای ئەبو حەنیفە دەکەوێتە رێ، کاتێك دەچێتە بەردەمی دەڵێت: پرسیارێکم هەیە، بەڵام ئەبو حەنیفە هیچ ئاوری لێناداتەوە.. ئەمجارەیان زیاتر لە ئەبو حەنیفە نزیك دەبێتەوەو زۆر بە شەرمەوە دەڵێت: مامۆستا پرسیارێکم هەیە.. ئەبو حەنیفە دەڵێت: پرسیارەکەت چیە؟

ئەبو یوسف دەڵێت: خۆت دەزانیت پرسیارەکەم چیە، پرسیاری جل‌وبەرگ‌و بەرگدرووەکە.. ئەبو حەنیفەش دەڵێت: بڕۆو بۆ خۆت وەڵامی بدەرەوە، ئەی تۆ مامۆستا نیت؟!

ئەبو یوسفیش دەڵێت: نەخێر تۆ مامۆستایت..

ئەبو حەنیفەش وەڵامی پرسیارەکەی دەداتەوەو دەڵێت: سەیری ئەندازەی کورت کردنەوەی جل‌وبەرگەکە دەکەین، ئەگەر جل‌وبەرگەکە بە ئەندازەی باڵای پیاوەکە کورت کرابۆوە، ئەوا مانای وایە بەرگدرووەکە کارەکەی بۆ پیاوەکە ئەنجامداوەو مافی خۆیەتی کرێکەی پێبدرێت، بەڵام ئەگەر ئەندازەی کورت کردنەوەی جل‌وبەرگەکە، بە ئەندازەی باڵای خۆی بوو، ئەوا مانای وایە کاری کورت کردنەوەکەی بۆ خۆی ئەنجامداوەو مافی وەرگرتنی کرێی کارەکەی لە دەست دەدات..

ئەبو یوسف کاتێك گوێی لەم وەڵامە جوانە دەبێت، سەری ئەبو حەنیفە ماچ دەکات‌و هەتا مامۆستا بەڕێزەکەی کۆچی دوایی دەکات لە خزمەتیدا دەبێت، دواتریش لە ناو خەڵکیدا جێگەی مامۆستا نازیزەکەی پڕ دەکاتەوەو درێژە بە ڕێبازەکەی دەدات..

بڕوانە ئەبو حەنیفە (خودا لێی خۆش بێت) چەند بە نەرم‌و نیانی‌و چەند بە جوانی چارەسەری ئەو کێشەیەی کرد!!

بە دڵنیاییە ئەگەر هاوسەرەکان، باوك‌و دایکەکان، مامۆستاو بەڕێوەبەرەکان، بە نەرم‌و نیانی هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتر بکەن، زۆرێك لە ناکۆکی‌و کێشەو گرفتەکان چارەسەر دەبن‌و کۆتاییان پێدێت..

ئێمەی مرۆڤ هەمیشە داوای نەرم‌و نیانی دەکەین، لە کڕین‌و فرۆشتندا، لە لێخوڕینی ئۆتۆمبیلدا، لە خوێندن‌و فێرکردندا، دەی با هەموومان هەوڵ بدەین بە نەرم‌و نیانی هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتردا بکەین‌و خۆمان لە توورە بوون بە دووربگرین.. پێغەمبەری خوداﷺ هەرگیز لەبەر خاتری خۆی لە کەس توورە نەبووە، کاتێك توورە دەبوو کە بێفەرمانیەکی پەروەردگار کرا بێت، یاخود سنورێك لە سنورەکانی ئیسلام شکێنرا بێت..

ڕۆژێك ئیمامی عومەرﷺ پەڕەیەك لە تەورات بە دەست جولەکەیەکەوە دەبینێت‌و پێی سەرسام دەبێت‌و دانەیەکی لەبەر دەنوسێتەوە، پاشان دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و بۆی دەخوێنێتەوە.. پێغەمبەری خوداﷺ تێبینی کرد، ئیمامی عومەرﷺ سەرسامە بەو نوسراوەی تەورات، دەشیزانی ئەگەر بوار بۆ ئەم کارانە بڕەخسێنێت،

لەوانەیە لەگەڵ قورئاندا تێکەڵ بکرێت‌و خەڵکی سەریان لێ تێک بچێت..

چۆن دەبێت، بە بێ پرسی پێغەمبەری خوداﷺ ئیمامی عومەرﷺ کاری وا بکات؟!

هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ تووڕە بوو، پاشان فەرمووی: ئایا سکاڵاو گلەییتان لە بەرنامەکەم هەیە؟! سوێند بە خودای پەروەردگار ئەگەر موساﷺ لە ژیاندا بمایە، شوێنی بەرنامەکەی من دەکەوت..

بەڵێ.. ئێمە هەمیشە دەڵێین: نەرم‌و نیانی.. نەرم‌و نیانی، بەڵام بە دڵنیاییەوە تووڕەیی‌و توندو تیژیش هەندێک جار پێویستن، وەك لەم نمونەیەی ژیانی پێغەمبەری ئازیزداﷺ بە دەردەکەوێت..

لە سەرەتای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا، پێغەمبەری خوداﷺ دێت بۆ کەعبەی پیرۆز، بۆ ئەوەی نوێژ بکات‌و بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا بسوڕێتەوە، بێباوەڕانی قورەیشیش لەو نزیکە دەبن‌و کۆڕو دانیشتنیان گەرم دەبێت.. بێباوەڕان بە چەندان شێوازی جیاواز ئازاری پێغەمبەری خودایانﷺ دەدا، کە چی پێغەمبەری خوداﷺ هەر ئارامی دەگرت..

بەڵێ.. پیاوە بە ناوبانگەکانیان لە نزیك کەعبە کۆبوونەوەو وتیان: بە ڕاستی ئەوەندەی لە سەر محمد ئارامگر بووین، لە سەر هیچ کەسێك ئەوەندە ئارامان نەگرتووە.. محمد جنێوی بە باوك‌و باپیرانماندا.. ڕەخنەو عەیب‌و عاری لە ئاینەکەمان گرت.. ناکۆکی خستە نێوانمان.. سوکایەتی بە خوداکانمان کرد..

لەم قسانەدا بوون، پێغەمبەری خوداﷺ هات بۆ کەعبەی پیرۆزو دەستی کرد بە سورانەوە بە دەوری کەعبەداو بێباوەڕانیش دەستیان کرد بە قسەی ناخۆش‌و کرچ‌و کاڵ.. پێغەمبەری خوداﷺ ڕوخساری تێکچوو، بەڵام نەرم‌و نیان بوو لەگەڵیان‌و بێدەنگی هەڵبژاردو لە سەر کارەکەی بەردەوام بوو.. کاتێك بۆ جاری دووەم بە دەوری کەعبەدا سورایەوە، دیسانەوە بێباوەڕان دەستیان بە قسەکانیان کردەوە، پێغەمبەری خوداشﷺ دوبارە بێدەنگ بوو..

جاری سێیەمیش بە هەمان شێوەی دووجارەکەی تر، بێباوەڕان قسەی خۆیان کردو پێغەمبەری خوداشﷺ بۆی دەرکەوت، بێدەنگی‌و نەرم‌و نیانی لەگەڵ ئەمانەدا هیچ سودێکی نیە، هەر بۆیە لە بەرامبەریان وەستاو فەرمووی: ئەی خەڵکانی قورەیش، ئایا گوێتان لێمە؟ سوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە، هەمووتان بە کوشتن‌و سەربڕین دەچن.. بێباوەڕان کاتێك گوێیان لەم هەڕەشەیە بوو، چ هەڕەشەیەك؟! سەربڕین!!

هەواڵەکەش کێ فەرموویێتی؟! کەسێك، کە لە ناویاندا بە ڕاستگۆ ناوبانگی دەرکردبوو!! هەموویان شڵەژانو حەپەسان، هەتا ماتو مەلولو سەرسام بوون، وەك ئەوەی باڵندە بە سەر سەریانەوە نیشتبێتەوە، پاشان لە ناو خۆیاندا وتیان: واز لە محمد بهێنن‌و پێغەمبەری خوداش ﷺ لێیان دوورکەوتەوە..

نەرمو نیانی‌و ئارامگریش، کاتو جێگەی خۆی هەیە، نەرمو نیانی‌و بێدەنگی‌و لە سەرخۆیی، ئەگەر لە غەیری کاتو شوێنی خۆیدا، بەکارهێنرا، ئەوا نیشانەی نەزانی‌و ترسنۆکیە.. ئەگەر سەیری ژیانی پێغەمبەری خودا ﷺ بکەین، لە هەموو حاڵەتە پێویستەکاندا، نەرمو نیانی بەکارهێناوە، نەك ترسنۆکی‌و لاوازی..

نمونەیەك لە نەرمو نیانی: دوای مانگێك لە ڕوودانی جەنگی بەدر، ئەبوعاصی هاوسەری زەینەبی کچی پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی زەینەبی خێزانی، بنێرێت بۆ مەدینە، بۆ لای باوکی.. پێغەمبەری خوداش ﷺ بۆ ئەم مەبەستە، زەیدی کوڕی حاریسەو هاوەڵێکی تری نارد بۆ ئەوەی لە نزیك مەککە چاوەڕێی بکەن‌و لەگەڵ خۆیان بیهێنن.. ئەبوعاص فەرمان بە زەینەب دەکات، بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات، کاتێك زەینەب (خودا لێی ڕازی بێت) خەریکی خۆئامادەکردن دەبێت، هندی کچی عوتبەی خێزانی ئەبوسوفیان دەبینێت‌و دەڵێت: کچەکەی محمد بیستوومە دەتەوێت بچیت بۆ لای باوکت..

زەینەبیش دەترسێت هند، کێشەیەکی بۆ دروست بکات، هەر بۆیە دەڵێت: بە تەمای شتی وانیم.. هندیش دەڵێت: کچی مامەم، ئەگەر بەتەمای ڕۆیشتن هەیت، هەر پێویستیەکت هەیە شەرم مەکە، من بۆت جێبەجێ دەکەم..

زەینەب (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: سوێند بە خودا بە ڕاستی بوو، بەڵام من ترسام بۆیە نکۆڵیم لە ڕۆیشتنەکەم کرد..

بەڵێ.. زەینەب (خودای لێ ڕازی بێت) خۆی ئامادە کرد، مێردەکەی ترسا خۆی لە شاری مەککە بیباتە دەرەوەو لە لای قورەیش ئاشکرا بن، هەر بۆیە فەرمانی بە کەنانەی برای کرد بەڕێی بکات.. کاتێك کەوتنە ڕێ، بێباوەڕانی قورەیش کەوتنە ورتە ورتو دەیان وت: چۆن ڕێگە بدەین کچەکەی محمد بچێت بۆ لای باوکی، لە کاتێکدا ئەوەی نەدەشیا لە جەنگی بەدردا پێی کردین.. بێباوەڕان بەرەو ڕوویان چوون‌و داوای گێڕانەوەی کچەکەی پێغەمبەری خودایان ﷺ دەکردو ئەمیش جگە لە شووبراکەی کەسی تری لەگەڵ نەبوو، کاتێك کەنانە گەلە کۆمەکی بێباوەڕانی بینی، خۆیدا بە زەویداو تیرو کەوانەکەی دەرکردو وتی: سوێند بە خودا هەر کەسێك لێم نزیك بێتەوە، تیربارانی دەکەم..

لەبەر ئەوەی کەنانە تیرهاوێژێکی بەتوانا دەبێت، خەڵکەکە ئەم هەڵوێستە دەبینن، بەرە بەرە پاشەکشە دەکەنو لە دوورەوە سەیر دەکەنو ناوێرن نزیك بکەونەوە، هەتا هەواڵەکە دەگات بە ئەبوسوفیانو پێی دەڵێن: زەینەب دەیەوێت بچێت بۆ لای باوکی..

ئەبوسوفیان دەکەوێتە ڕێو دەچێت بۆ لای کەنانەو هاوار دەکاتو دەڵێت: کابرا واز لە تیرو کەوانەکەت بهێنە، دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم.. کەنانە دەست لە تیرو کەوانەکەی هەڵدەگرێتو ئەبوسوفیانیش لێی نزیك دەبێتەوەو پێی دەڵێت: کارێکی باشت نەکرد، ئاوا بە ئاشکرا دەتەوێت ئەو ئافرەتە لە شار دەربکەیت، باش دەزانیت لە جەنگی بەدردا چیمان بە سەرهاتو محمد چۆن پیاوە ناودارەکانی کوشتینو ئافرەتەکانمانی بێوەژن خست.. کاتێك تۆ دەتەوێت بە ئاشکرا ئەم کارە بکەیت، خەڵکی گومانی ئەوە دەبەن، کە مەبەستت زەلیلی ئەوانە، سوێند بە خودا هیچ کارێکمان بە ڕێگری کردنی ئەو ئافرەتە بۆ لای باوکی نیە، بەڵام بگەڕێوە هەتا کەمێك دەنگوباسەکە کپ دەبێتەوەو خەڵکیش هەست دەکەن ئافرەتەکەیان گێڕاوەتەوە، ئەوسا ڕقو تووڕەییان دادەمرکێتەوەو تۆش بە نهێنی ڕەوانەی لای باوکی بکە..

کەنانە کاتێك گوێی لەم ئامۆژگارییە جوانانە بوو، ڕازی بوو، گەڕانەوەو چەند شەوێك لە مەککە مانەوەو پاشان شەوێك لە شەوەکان، زەینەبی گەیاندە لای زەیدی کوری حاریسەو هاوەڵەکەیو ئەوانیش بردیان بۆ شاری مەدینەو گەیاندیانە خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ..

سەیر بکەو وردبەرەوە، ئەبوسوفیان چەند بە جوانیو بە نەرمو نیانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەنانەدا ئەنجامداو توانی تیروکەوانەکەی لێ دووربخاتەوەو ڕێگری بکات، لەوەی جەنگو کوشتار ڕووبدات، ئەگەر جەنگو کوشتاریش ڕوویان بدایە، لەوانە بوو کچەکەی پێغەمبەری خودایﷺ تیادا بکوژرایە.. ئەوە هەڵسوکەوتی ئەبوسوفیان بوو لە کاتێکدا بێباوەڕ بوو، دەی دەبێت کاتێك کە موسڵمان بوو، هەڵسوکەوتی چۆن بوو بێت؟!

**نیگا..**

نەرمو نیانی لە هەر شتێکدا هەبێت، جوانو ڕازاوەی دەکات، لە هەر شتێکیشدا نەما، ناشیرینو ناحەز دەبێت..

# با زمانت شیرین‌و پاراو بێت..

ژیانی هەر یەکێکمان خاڵی نیە لەوەی، کە ئامۆژگاری‌و ڕێنمایی خەڵکانی تر بکەین.. ئامۆژگاری‌و ڕێنمایی بۆ منداڵەکانمان، بۆ هاوسەرەکانمان، بۆ دراوسێکانمان، هەروەها بۆ باوک‌و دایکمان.. ئەگەر سەرەتای دەست پێکردنی ئامۆژگاریەکانمان، نەرم‌و نیان‌و لەسەرخۆ بوو، ئەوا بەو شێوازەش کۆتایی پێدێت، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر سەرەتا بە وشکی‌و تووڕەیی دەستمان پێکرد، کۆتاییەکەشی بەو شێوازە دەبێت..

کاتێك ئامۆژگاری خەڵکی دەکەین، دەبێت بزانین هەڵسوکەوت لەگەڵ دڵ‌و دەروونیاندا دەکەین، نەك لەگەڵ جەستەو لاشەیان، هەر بۆیە دەبینین هەندێك لە کوڕو کچەکان ئامۆژگارییەکانی دایکیان وەردەگرن، بەڵام ئامۆژگارییەکانی باوکیان وەرناگرن‌و بە پێچەوانەشەوە..

بە هەمان شێوە قوتابی دەبینیت، ئامۆژگاری هەندێك لە مامۆستاکانی وەردەگرێت‌و خۆشی دەوێن، بەڵام ئامۆژگاری هەندێك لە مامۆستاکانی وەرناگرێت‌و بە گوێیان ناکات.. ئەگەر دەشتەوێت ئامۆژگارییەکانت کاریگەرییان هەبێت، زۆر درێژەی پێمەدەو زۆر مەچۆرە وردەکارییەوەو باسی هەموو شتە گەورەو بچوکەکان مەکە، بۆ ئەوەی کەسی بەرامبەر وا هەست نەکات، کە بە ووردی چاودێری دەکەیت‌و وەکو سێبەر بە شوێنێوەی..

ئەگەر ئامۆژگارییەکانیشت بە شێوەی پێشنیار پێشکەش بکەیت، ئەوا زۆر چاکترەو کاریگەری باشتریش جێدەهێڵێت.. بۆ نمونە: خێزانەکەت خواردنێکی بۆ ئامادە کردوویت، هەر چەندە زۆر خۆی بە دروست کردنیەوە ماندوو دەکات، بەڵام کەمێك سوێر دەردەچێت، کاتێك تامی دەکەیت، مەڵێ: ئاه.. ئەم خواردنە چیە؟! پەنا بە خودا!! کیسەیەك خوێت تێکردووە!! نەخێر.. بەڵکو دەتوانیت بڵێیت: ئەگەر خوێکەی کەمتر بووایە، خواردنەکە خۆشترو باشتر دەبوو..

بە هەمان شێوە کاتێك منداڵەکەت دەبینیت، جل‌وبەرگێکی چڵکنی لەبەردایە، دەتوانیت بە شێوازی پێشنیار ئامۆژگاری بکەیت، لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك پێی خۆش نیە فەرمانی بە سەردا بکرێت، هەر بۆیە دەتوانیت پێی بڵێیت: جل‌وبەرگی جوانتر لەبەر بکە..

یان کاتێك یەکێك لە قوتابیەکانت دوادەکەوێت، دەتوانیت پێی بڵێیت: هەوڵبدە جارێکی

تر دوا مەکەوە.. بە دڵنیاییەوە بەکارهێنانی ئەم شێوازانە، کاریگەری باش بەجێدەهێڵن‌و ئامۆژگارییەکانت زیاتر وەردەگیرێن‌و گوێیان لێدەگیرێت..

ئاگاداربەو نەکەی ئامۆژگارییەکانت بە وتەی نابەجێ‌و نەشیاو دەرببڕیت، وەك ئەوەی بڵێیت: بێ ڕەوشت.. چەند جار پێم وتیت وامەکە؟! تۆ بۆ تێناگەیت؟! تاکەی هەر فێری ڕەوشتت بکەم؟! هەر چەندە هەڵەکەی گەورە بوو، دەروونی بریندار مەکەو هەستی مەروشێنەو ئابرووی مەبە.. دەزانی بۆچی؟! لەبەر ئەوەی مەبەست چارەسەری هەڵەکانیەتی، نەك تۆڵە لێکردنەوەو سوکایەتی پێکردنی..

سەیری هەڵسوکەوتی پێغەمبەری ئازیزﷺ بکە، چۆن ئامۆژگارییەکانی دەخاتە ڕوو.. پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆژێك دەیەوێت ئامۆژگاری عبداللەی کوری ئیمامی عومەر بکات‌و هانی بدات بۆ ئەوەی شەونوێژ بکات، هاندان‌و ئامۆژگاریەکەشی بە شێوەی پێشنیار پێشکەش دەکات‌و دەفەرموێت: عبدالله ئەگەر شەونوێژی بکردایە پیاوێکی زۆر باش دەبوو.. لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: ئەی عبدالله وەکو فلانە کەس مەبە، بە شەو شەونوێژی دەکرد، پاشان وازی لێهێنا..

ئەگەر دەتوانیت سەرنجی کەسەکە بۆ لای هەڵەکان ڕابکێشە، بە بێ ئەوەی بە تەواوی هەست بکات مەبەستت پێی ئەوە.. پیاوێك لە لای عبداللەی کوری موبارەك پشمی‌و نەیووت: الحمدلله.. عبداللەی کوری موبارەك فەرمووی: کەسێك بپشمێت، دەبێت بڵێت چی؟ کابراکەش دەڵێت: دەبێت بڵێت: الحمدلله.. عبداللەی کوری موبارەکیش دەفەرموێت: یرحمك الله..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك لە نوێژی عەسر تەواو دەبوو، یەکە یەکە سەری لە هاوسەرەکانی دەداو قسەو گفت‌وگۆی لەگەڵ دەکردن، کاتێك چووە لای زەینەبی کچی جەحش (خودای لێ ڕازی بێت) هەنگوینی بینی، پێغەمبەری خوداشﷺ حەزی لە هەنگوین بووە، هەر بۆیە دەست دەکات بە هەنگوین خواردن‌و بەم هۆیەشەوە زیاتر لە لای زەینەب دەمێنێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی عائیشەو حەفصە (خودایان لێ ڕازی بێت) غیرەیان بۆ دروست ببێت‌و کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ دێتە لایان، هەردووکیان پێی دەڵێن: بۆنی مەغافیرت لێدێت، مەغافیر خواردنەوەیەکی شیرین‌و خۆشەو وەکو هەنگوین وایە، بەڵام بۆنی ناخۆشە.. پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر گرنگی بە خۆی دەدا، بۆ ئەوەی بۆنی ناخۆش لە دەم‌و لە جەستەی نەیات‌و هەمیشە هەوڵی دەدا بۆنی خۆش بێت، لەبەر ئەوەی جوبرائیل ﷺ و خەڵکیش بێزار نەکات..

کاتێك دەچێتە لای حەفصە (خودای لێ ڕازی بێت) لێی دەپرسێت‌و دەڵێت: چیت خواردووە؟ پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: لە لای زەینەب هەنگوینم خواردووە.. حەفصەش دەڵێت: بەڵام من بۆنی مەغافیرت لێدەکەم..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: نا.. هەنگوینم خواردووەو جارێکی تر هەنگوین ناخۆم.. پاشان هەڵدەستێت‌و دەچێت بۆ لای عائیشەو عائیشەش (خودای لێ ڕازی بێت) هەمان قسە دەکات، لەبەر ئەوەی پێشتر هەردووکیان لە سەر ئەوە ڕێك دەکەون، ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ بێت بۆ سەردانیان ئەو قسەیەی پێ بڵێن.. دوای چەند ڕۆژێك پەروەردگار نهێنی کارەکەیانی ئاشکرا کردو حەفصەش (خودای لێ ڕازی بێت) دانی پێدانا..

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ سەردانی حەفصە دەکات‌و دەبینێت شیفای کچی عبداللەی لە لایە، شیفا ئافرەتێك بوو شارەزایی لە کاری پزیشکی‌و چارەسەرکردنی خەڵکیدا هەبوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی بە ئاماژەیەك سەرنجی حەفصە ڕابکێشێت‌و تێی بگەیەنێت کە ئەو کارەی ئەو ڕۆژە لەگەڵ عائیشەدا لەسەری ڕێك کەوتبوون، کارێکی هەڵە بووە، بەڵام بە شێوازێك پێی ڕاگەیاند کە هەست‌و سۆزی بریندار نەکات..

پێغەمبەری خودا ﷺ چی فەرمووە؟! فەرمووی: ئەوە بۆ نزاو دۆعای مێروولە فێری حفصە ناکەیت، هەر وەك چۆن فێری نوسینت کرد؟! دۆعای مێروولەش چەند وتەو قسەیەك بوو، ژنانی عەرەب دەیانوت، ئەو وتانەش هەر چەندە هیچ زیان‌و سودێکیان نەبوو، بەڵام لە کۆتایی وتەکاندا باسی ئەوەی تێدا بوو، کە ئافرەت گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بکات، ئەمەش هەندێکە لەو وتانە: ئافرەتان ئاهەنگ دەگێڕن‌و بووك دەڕازێننەوە..

دەستیان لە خەنە دەگرن‌و چاویشیان دەڕێژن..

هەموو کارێکیش دەکەن، بەڵام لە هاوسەرەکانیان یاخی نابن‌و گوێڕایەڵیان دەکەن..

پێغەمبەری خودا ﷺ بەم شێوە جوانە لە ڕێگەی ئەو وتەیەوە کە دەڵێت: (بەڵام لە هاوسەرەکانیان یاخی نابن‌و گوێڕایەڵیان دەکەن) ویستی ئامۆژگاری حەفصەی خێزانی بکات.. بە ڕاستی شێوازێکی جوانی بەکارهێنا، بۆ ئەوەی وا لە بەرامبەرەکەی بکات هەست بە هەڵەکەی بکات‌و بە خۆیدا بچێتەوە!!

پیاوێك پەڕتووکێك لە پیاوێکی تر دەخوازێت، دوای چەند ڕۆژێك پەڕتووکەکە دەگێڕێتەوەو خاوەنی پەڕتووکەکەش شوێنەواری خواردن بە سەر پەڕتووکەکەیەوە دەبینێت، بەڵام بێدەنگ دەبێت‌و هیچ قسەیەك ناکات.. پاش چەند ڕۆژێك پیاوەکە دوبارە

دێتەوە بۆ ئەوەی پەرتووکێکی تر بخوازێت، خاوەن پەرتووکەکەش پەرتووکەکە دەخاتە سەر سینیەك‌و دەیداتێ.. پیاوەکە سەرسام دەبێت‌و دەڵێت: من داوای پەرتوکم کرد، نەك سینی؟! خاوەن پەرتووکەکەش دەڵێت: پەرتووکەکە بخوێنەرەوەو سینیەکەش نانی لە سەر بخۆ!! پیاوەکە پەرتووکەکە وەردەگرێت‌و لە پەیامی خاوەن پەرتووکەکەش تێدەگات..

پیاوێك هەبوو، کاتێك ئێواران دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لە دوای پشوودان جل‌وبەرگەکانی دادەناو هەڵیدەواسی‌و دەخەوت.. کاتێك پیاوەکە دەخەوت، خێزانەکەی دەچوو پارەکانی لە گیرفانی پیاوەکەیدا دەردەهێنا.. پیاوەکەش کاتێك بەیانی لە خەو هەڵدەستێت‌و دەچێت بۆ سەر کارەکەی‌و پاشان پێویستی بە پارە دەبێت بۆ کڕینی پێداویستیەکانی، دەبینێت هیچ پارەیەکی پێ نیەو سەرسام دەبێت!! دەبێت کێ پارەکەی برد بێت؟! هەر بۆیە چاودێری گیرفان‌و پارەکانی دەکات، هەتا تێدەگات‌و بۆی ڕوون دەبێتەوە..

ڕۆژێك کاتێك دەگەڕێتەوە، بۆقێك لەگەڵ خۆیدا دەباتەوەو دەیکاتە گیرفانیەوە.. کاتێك دەگاتە ماڵەوە، وەکو جاران جل‌وبەرگەکانی دادەنێت‌و وەکو کەسێکی خەوتوو ڕادەکشێت، کاتێك چاودێری خێزانەکەی دەکات، دەبینێت زۆر بە هێمنی بەرەو لای جل‌وبەرگەکان دەچێت‌و دەست دەکات بە گیرفانی جل‌وبەرگەکانیداو دەستی بەر بۆقەکە دەکەوێت‌و هاوار دەکات‌و دەڵێت: ئای دەستم!! پیاوەکەش چاوەکانی دەکاتەوەو دەڵێت: ئای گیرفانم..

خۆزگە هەموومان بەم شێوازە جوانە لەگەڵ هەموو کەسێکدا، هەڵسوکەوتمان ئەنجام بدایە، لەگەڵ منداڵەکانماندا، لەگەڵ قوتابیەکانماندا، هەروەها لەگەڵ هاوەڵ‌و دراوسێکانماندا..

نایف یەکێك بوو لە هاوەڵانم‌و دایکێکی زۆر چاکەکارو ئیمانداری هەبوو، هەرگیز نەیدەهێشت پەیکەرو وێنە لە ماڵەکەیدا هەبێت، لەبەر ئەوەی فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە، کە سەگ‌و وێنەو پەیکەری تێدا بێت.. لە ماڵەکەدا منداڵێکیان هەبوو، چەندان جۆر یاری منداڵانی هەبوو، تەنها بووکەڵەو پەیکەری نەبوو، لەبەر ئەوەی دایکی ڕێگەی نەدەدا بووکەڵەو پەیکەری منداڵان بکڕێت..

پورێکی منداڵەکە بووکەڵەیەکی بە دیاری بۆ دەهێنێت‌و پێی دەڵێت: بۆ خۆت لە ژوورەکەتدا یاری پێبکەو ئاگاداربە با دایکت نەیبینێت..

پاش یەك دوو ڕۆژێك، دایکی منداڵەکە بە کارەکەی زانی‌و ویستی ئامۆژگاریەکی گونجاو پێشکەش بە منداڵەکەی بکات، هەر بۆیە لە کاتی نان خواردندا وتی: منداڵەکان ئەوە چیە، یەك دوو ڕۆژە هەست دەکەم ماڵەکەمان فریشتەی تێدا نیە، نازانم چی فریشتەکانی

دەرکردووە!! کچە بچکۆلەکەش بە بێدەنگی گوێی گرتبوو، لە دوای نان خواردن دەچێت بۆ ژوورەکەی و بووکەڵەکە دەهێنێت بۆ لای دایکی و دەڵێت: دایە گیان ئەمە فریشتەکانی دەرکردووە، فەرموو چی لێدەکەیت لێی بکە..

بە ڕاستی بە شێوازێکی زۆر جوان ئامۆژگاری منداڵەکەی کردو بە هیچ شێوەیەك کارەکەی لە سەر قورس و گران نەکردو نەیشکاندو زیزی نەکردو دڵی نەڕەنجاند..

بەڵێ.. دەتوانیت هەنگوین بخۆیت و شانەکەشی نەشکێنیت.. بە شێوازێك ئامۆژگاری کەسی بەرامبەر مەکە، وەك ئەڕەی وابزانێت بە هۆی ئەو هەڵەیەوە بێباوەڕ بوو بێت، بەڵکو گومانی باشی پێبەرەو وای دابنێ بە مەبەست و بە ئەنقەست هەڵەکەی ئەنجام نەداوەو نەیزانیووە..

لە سەرەتای هاتنی ئاینی ئیسلامدا عەرەق قەدەغەو حەرام نەبوو، پاشان بە چەند قۆناغێك قەدەغە کرا، لە قۆناغی یەکەمدا پەروەردگار دەربارەی عەرەق فەرمووی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ لَكُمْ...... (٢١٩)﴾ البقرة. واتە: (پرسیارت لێدەکەن دەربارەی عەرەق و قومار، پێیان بڵێ: لەو دووانەدا تاوان و گوناهێکی گەورە هەیە، هەر چەندە چەند سوودێکیشان تێدایە بۆ خەڵکانێك)..

پاشان لە قۆناغی دووەمدا فەرمووی: ﴿لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ...... (٤٣)﴾ النساء. واتە: (نزیکی نوێژ مەکەون لە کاتێکدا ئێوە سەرخۆشن، هەتا ئاسەواری سەرخۆشی نامێنێت و دەزانن چی دەڵێن لە نوێژەکەدا)..

پاشان لە قۆناغی سێیەمدا پەروەردگار بە تەواوی عەرەقی حەرام و قەدەغە کردو فەرمووی: ﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٩٠)﴾ المائدة. واتە: (دڵنیابن کە عەرەق و قومارو گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خودا لەو شوێنانەی کە خەڵك بە پیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، پورچ و حەرام و حەڵاڵ زانین بە هۆی هەڵدانی زارەوە، ئەمانە هەر پیسن و لە کارو کردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بە دەست بهێنن لە هەر دوو جیهاندا)..

لە دوای دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە موسڵمانان بە تەواوی وازیان لە خواردنەوەی عەرەق هێنا، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە لە دەرەوەی شاری مەدینە ژیانیان بە سەردەبردو نەیاندەزانی عەرەق حەرام کراوە..

ڕۆژێك عامری کوڕی ڕەبیعە کە یەکێك بوو لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ

لە گەشتێك دەگەڕێتەوەو لەگەڵ خۆیدا کوپەیەك عەرەق بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوداﷺ دەهێنێت.. پێغەمبەری خوداشﷺ نە لە پێش ئیسلامو نە لە دوای ئیسلامیش هەرگیز عەرەقی نەخواردۆتەوە، بەڵام کاتێك خەڵکی شتێکیان بۆ بهێنایە، کە خۆی بە کاری نەهێنایە، وەك عەرەق، یان ئاڵتون، یان جلوبەرگی ئاوریشمو حەریر، دەیبەخشی بە موسڵمانان..

پێغەمبەری خوداﷺ بە سەرسامیەوە سەیری عەرەقەکەی کردو فەرمووی: ئایا نازانیو ئاگادار نیت بەوەی کە عەرەق حەرام کراوە؟! عامریش دەڵێت: حەرام کراوە؟! ئاگادارنیم ئەی پێغەمبەری خوداﷺ!! پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: دەی حەرام کراوە..

عامر عەرەقەکە هەڵدەگرێتو هەندێك کەس پێی دەڵێن: دەی بچۆ بیفرۆشە، پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، دەفەرموێت: نەخێر مەیفرۆشە، لەبەر ئەوەی پەروەردگار کاتێك شتێك حەرام دەکات، ئەوا پارەکەشی حەرام دەبێت.. پاشان عامر عەرەقەکە دەڕێژێتە سەر زەوی.. رواه الطبراني..

ئاگاداربە لە کاتی ئامۆژگاری کردنی خەڵکیدا بە خۆتدا هەڵمەدەو شانازی بە خۆتەوە مەکە، خۆت بەرزمەکەرەوەو بەرامبەریش بخەیتە چاڵێکی قوڵەوە، چونکە هیچ کەسێك بەو کارە ڕازی نابێت.. بۆ نمونە: هەندێك باوك کاتێك ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات، باسی شانازییەکانی خۆی بۆ دەکاتو زۆر بە شانو باڵی خۆیدا هەڵدەداتو دەڵێت: من وام کردو واچوومو وارۆیشتمو..و..

هەوڵبدە کاتێك ئامۆژگاری کەسێك دەکەیت، زۆر باسی خۆت مەکەو نمونە لە سەر خۆت مەهێنەرەوە، بەڵکو نمونە لە سەر کەسانی تر بهێنەرەوە، بۆ ئەوەی کەسی ئامۆژگاری کراو هەست بەوە نەکات، کە تۆ مەبەستت لە ئامۆژگاریەکانت ستایشو بەرز کردنەوەی خۆتو سوکایەتیو نزم کردنەوەی کەسی بەرامبەرە..

**بە کورتی..**
پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: وتەی جوانو شیرین، خێرو چاکەیە..

## نێوانی زیندوو، لەگەڵ مردوو..

لە لای خەڵکیو لە لای هاولاتیشی زۆر خوێنی تاڵ بوو، زۆریش ڕەزا گران بوو.. لە لای دراوسێکانیو براو خوشکەکانی تەنانەت لە لای منداڵەکانیشی خۆشەویست نەبوو..

بەڵێ.. خۆشەویست نەبوو.. زۆر جار پێی دەوترا: برا گیان تۆ هەستو سۆزت نیە؟! یەکێك لە منداڵەکانی بە دڵو دەروونێکی خۆشەوە، تیانووسی وانەکانی بۆ هێنا، لەبەر ئەوەی مامۆستاکەی نایابو زۆرباشەی بۆ نوسی بوو، بەڵام ئەم باوکە بێ هەستو نەستە هەر ئاوڕیشی بۆ نەدایەوەو بەڵکو وتی: ئەگەر بڕوانامەی دکتۆراشت بهێنایە شتێکی ئاسایی بوو!!

لەگەڵ قوتابیەکانیشیدا بە هەمان شێوە هەڵسوکەوتی دەکرد، کاتێك قوتابیەکی پەپولە ئاسای ڕۆح سوك، دەیویست قسەیەکی خۆش بکاتو هەستو سۆزی مامۆستاکەی کەمێك بجولێنێت، ئەم پیاوە زۆر بە ناخۆشی وەڵامی دەدایەوەو دەیوت: دەتەوێت بەم قسانە خوێنی خۆت شیرین بکەیتو خۆشەویست بیت؟!

بە هەمان شێوە ئەم کابرایە دەچێت بۆ لای فرۆشیارێكو فرۆشیارەکەش بە دڵێکی خۆشەوە دەڵێت: سوپاس بۆ خودا نامەیەکم لە کەسوکارمەوە بە دەست گەیشتووە، کەچی ئەو پیاوە هیچ بەشداریەکی لە خۆشی ئەو کرێکارە فرۆشیارەدا نەکرد، لە کاتێکدا فرۆشیارەکە ئەم هەواڵەی بۆ ئەوە پێڕاگەیاند، کە بەشداری خۆشیەکەی بکاتو هەواڵێکیان بپرسێت، بەڵام بە داخەوە..

جارێکی تر سەردانی هاوەڵێکی دەکاتو لە دوای چاو قاوە خواردن، هاوەڵەکەی تاکە منداڵە تازە لە دایك بووە پێچراوەکەیان دەکاتە باوەشیو دەیهێنێت بۆ لای میوانەکەو دەڵێت: ڕات چیە بەرامبەر ئەم پاڵەوانە؟! کابراش زۆر بە ساردیەوە دەڵێت: ماشاءالله.. خودا بۆتانی بهێڵێت.. باوکی منداڵەکە چاوەڕێ دەکات زیاتر باسی منداڵە تاقانەکەی بکاتو پیایدا هەڵبداتو لە دەستی وەربگرێتو لە باوەشی بگرێتو ماچی بکات، بەڵام بە داخەوە!!

کاتێك هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت، بە پێی ئەندازەی گرنگی کەسەکان،

گرنگی بە کاروبارەکانیان بدە، نەك بە ئەندازەی گرنگی دانی خۆت.. نایابو زۆر باشەی منداڵەکە، لە لای خۆی لە بڕوانامەی دکتۆرا گەورە تر بوو.. ئەو منداڵە تاقانە تازە لە دایك بووە، لە لای هاوەڵەکەت زۆر گرنگترو بە نرختره لە هەموو دونیاو حەز دەکات دڵی لەت بکاتو جگەرگۆشەکەی تیادا نیشتەجێ بکات!! دەی کەوایە نابێت کەمێك بەشداری لە خۆشیەکانیاندا بکەیتو بە خۆشی هاوەڵو منداڵەکەت خۆشحاڵ بیت؟!

جاری وا هەیە هەندێك کەس لە کارێکدا، یان لە شتێکی دیاریکراودا، گەرموگوڕیەکیان هەیە، دەی تۆش گرنگی بەو شتانە بدە، کە ئەو کەسانە پێی خۆشحاڵ دەبنو جێگەی گرنگیانە، هەروەها دڵیان ڕابگرەو لەگەڵیاندا وشك مەبەو بەشداری خۆشیو ناخۆشیەکانیان بکەو وەکو مردوو مەبە.. هەر بۆیە جاری وا هەیە هەندێك کەس سکاڵای ئەوە دەکەن، منداڵەکانیان خۆشیان ناوێن، ئێمەش پێیان دەڵێین: کاتێك منداڵەکانتان قسەیەکی خۆشتان بۆ دەگێڕنەوە، بە جوانی گوێیان لێناگرنو لەگەڵیاندا تێکەڵ بە بابەتەکە نابنو وا هەست دەکەن قسە بۆ دارو دیوار دەکەن، هەر بۆیە حەز بەوە ناکەن لەگەڵتاندا دابنیشنو قسەتان بۆ ناکەنو کێشەو گرفتەکانیان ناخەنە ڕوو..

کاتێك کەسێك ڕووداوێك یان چیرۆکێکت بۆ باس دەکات، ئەگەر پێشتر ئەو بابەتەشت بیستبوو، قسەی پێمەبڕەو گوێی لێبگرە..

عبداللەی کوڕی موبارەك دەفەرموێت: سوێند بە خودا کەسی وا هەبووە، قسەیەکی بۆ گێڕاومەتەوە، پێش ئەوەی ئەو کەسە لە دایك بێت، من ئەو بابەتەم بیستووە، بەڵام بە شێوەیەك گوێم بۆ گرتووە، وەك ئەوەی یەکەم جارم بوو بێت، گوێم لەو بابەتە بێت..

بە ڕاستی جوانە!!

پێش ڕوودانی جەنگی خەندەق، موسڵمانان خەریکی هەڵکەندنی چاڵەکەی دەوری شاری مەدینە بوونو هەموو پێکەوە کاریان دەکرد، کاتێك شەو دادەهات، ئاوو هەوا زۆر سارد دەبوو، بەڵام هاوەڵان لە هەڵکەندنی چاڵەکەدا هەر بەردەوام دەبوون.. شەوێك لە شەوەکان پێغەمبەری خودا ﷺ دێتە دەرەوەو دەبینێت وا هاوەڵان زۆر بە شادومانیەوە خەریکی هەڵکەندنی چاڵەکەن.. هاوەڵان کاتێك پێغەمبەری خودایان ﷺ بینی، هەموو بە یەك دەنگ وتیان:

نحن الذين بايعوا محمداً      على الجهاد مابقينا أبداً..

واتە: ئێمە هەموو پەیمانمان داوە بە محمدی پێغەمبەری خودا ﷺ، هەتا ماوین لە

سەر جیهادو تێکۆشان بەردەوام دەبین..

پێغەمبەری خوداﷺ تێکەڵ بە هەستو سۆزیان بوو، هەر بۆیە زۆر بە گەرمو گوڕیەوە وەڵامی دانەوەو فەرمووی:

اللهم إن العيش عيش الأخرة فاغفر للأنصار والمهاجرة..

واتە: پەروەردگار ژیان تەنها بریتیە لە ژیانی دوارۆژو خودایە لە پشتیوانانو کۆچکەران خۆشبە..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك لەگەڵ کەسێکدا گاڵتەو قسەی خۆشی بکردایە، بە تەواوی تێکەڵی دەبوو، هەروەها زەردەخەنەی بۆ دەکردو لەگەڵیدا پێدەکەنی..

ڕۆژێك ئیمامی عومەرﷺ دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و دەبینێت لە هاوسەرەکانی تورەیە، لەبەر ئەوەی داوای بژێوی زیاتریان لە پێغەمبەری خوداﷺ کرد بوو.. ئیمامی عومەریش لە دڵی خۆیدا دەڵێت: دەبێت پێغەمبەری خوداﷺ بخەمە پێکەنین، پاشان دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ خۆزگە ئێمەی قوڕەیشت دەبینی، چۆن زاڵو بە دەسەڵات بووین بەرامبەر ئافرەتانمان، خۆ ئەگەر ئافرەتەکانمان داوای بژێویان لێبکردینایە، ملیانمان لە لاشەیان جیادەکردەوە، بەڵام کاتێك هاتین بۆ شاری مەدینە، بینیمان ئافرەتانیان زاڵو بە دەسەڵاتن بە سەر پیاوانیاندا، هەر بۆیە ئافرەتانی ئێمەش لەوانەوە فێربوون، بە سەرماندا زاڵ بنو داوای بژێوی زیاترمان لێبکەن..

پێغەمبەری خوداﷺ زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی پیرۆزی.. ئیمامی عومەرﷺ لە سەر قسەکانی بەردەوام دەبێتو پێغەمبەری خوداشﷺ زەردەخەنەو پێکەنینەی زیاتر دەبێت، هەتا ددانە پیرۆزەکانی بە دیار دەکەون..

چ ڕەوشتێك لە ڕەوشتی پێغەمبەری خوداﷺ گەورە ترە، لە کاتێکدا پەروەردگار لە بارەیەوە فەرموویەتی:﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم. واتە: (بە ڕاستی تۆ لە سەر ڕەوشتو خوویەکی زۆر جوانو پەسەندو بێ وێنەو مەزنیت).. هەروەها بە ئیماندارانو موسڵمانان دەفەرموێت:﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ....﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب. واتە: (سوێند بە خودا بە ڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تەواوو ڕێكوپێك هەیە، تا چاوی لێ بکەنو شوێنی بکەون)..

پێغەمبەری خوداﷺ زۆر جاری وا هەبووە، لەگەڵ کەسانێکی نەشارەزاو نەزاندا هەڵسوکەوتی کردووەو لە سەر ئازارو ناڕەحەتیەکانیشیان ئارامی گرتووەو

نەیرەنجاندوون.. رۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ لە ناوچەیەكی نێوان مەككەو مەدینەدا لادەدات، بیلالیشی لەگەڵ دەبێت، پیاوێكی دەشتەكی دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و داوای پێویستیەكی لێدەكات، پێغەمبەری خوداشﷺ پەیمانی پێدەدات، پێداویستیەكەی بۆ جێبەجێ بكات، بەڵام ناتوانێت یەكسەر بۆی جێبەجێ بكات، كابرای دەشتەكیش زۆر پەلە دەكات‌و دەڵێت: ئەی محمد ئەو پەیمانەی پێتدام، بۆمی جێبەجێ ناكەیت؟!

پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر بە نەرم‌و نیانیەوە دەفەرموێت: موژدە بێت.. بۆتی جێبەجێ دەكەم.. موژدە بێت..

ئەم وشەیە چەند جوانە؟! ئایا لەم وشەیە ناسك‌و جوانتر هەیە؟! بەڵام كابرا دەشتەكیەكە زۆر بە ناشیرینی هاوار دەكات‌و دەڵێت: زۆر موژدەت پێدام!! پێغەمبەری خوداﷺ لەم قسەیەی كابرا تورە بوو، بەڵام بە سەر خۆی نەهێناو تورەییەكەی خواردەوە، پاشان بە لای بیلال‌و ئەبوموسای ئەشعەریدا لای كردەوەو فەرموی: كابرا موژدەكەی وەرنەگرت‌و گێرایەوە، ئێوە وەری بگرن.. ئەوانیش فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێمە موژدەكەت وەردەگرین..

پێغەمبەری خوداﷺ داوای هەندێك ئاوی كرد، روخسارو هەر دوو دەستی پیرۆزی تیادا شۆری‌و پاشان فەرمووی: لێی بخۆنەوەو بیپرژێنن بە روخسارو جەستەتانداو موژدەتان لێ بێت ئەم ئاوە ئاوێكی پیرۆزە.. ئەوانیش ئاوەكەیان وەرگرت‌و بەو شێوەیان كرد، كە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: زۆریش بە موژدەكەی دڵخۆش‌و شادومان بوون..

ئوم سەلەمەش (خودا لێی رازی بێت) لە پشت پەردەیەكەوەو لە نزیكیانەوە دانیشتبوو، كاتێك گوێی لە فەرمودە پیرۆزەكانی پێغەمبەری خوداﷺ بوو، ویستی لەو خێرو بەرەكەتە بێبەش نەبێت، هەر بۆیە بانگی كردن‌و فەرمووی: هەندێك لەو ئاوە بە منیش بدەن، ئەوانیش هەندێك لە ئاوەكەیان بۆ ناردو ئەویش بەو شێوەیەی كرد، كە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموو بووی.. متفق علیە..

رۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ خاتوو عائیشەدا (خودای لێ رازی بێت) دانیشتبوو، خاتوو عائیشەش (خودای لێ رازی بێت) دەستی كرد بە گفت‌وگۆی ئافرەتان، پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر بە وردی گوێی گرتبوو، لە كاتێكدا كە خاتوو عائیشە (خودای لێ رازی بێت) زۆر درێژەی بە وتەكانیداو پێغەمبەری خوداشﷺ بەو هەموو سەرقاڵیەوە، قسەكانی پێنەبری‌و تا كۆتای باسەكە گوێی بۆ گرت..

باسەکەش باسی چی بوو؟!

خاتوو عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) باسی ئەو یانزە ئافرەتەی کرد، کە لە پێش ئیسلامدا پەیمانیان بە یەکتردا، هەر کەسە بە ڕاستو دروستی باسی هاوسەرەکەی بکاتو هیچ شتێك نەشارێتەوە..

ئافرەتی یەکەمیان هاوسەرکەی بە شاخێکی سەخت چوواند، کە لە سەر شاخەکە گۆشتی وشترێکی پیری لێ بێت.. شاخەکە بەرزەو گۆشتەکەش گۆشتێکی باشو ناسك نیەو ئەوە ناهێنێت بۆ ئەو گۆشتە خراپە ماندوو بوونی سەرکەوتن بەسەر شاخەکەدا بچێژێت!! مەبەستی ئەوە بوو، هاوسەرەکەی خاوەن ڕەوشتێکی جوان نیەو خۆشی بە گەورە دەزانێت، لە کاتێکدا کەسێکی نەبووو نەداریشە..

ئافرەتی دووەمیش باسی هاوسەرەکەی دەکاتو دەڵێت: هاوسەرەکەم کەموکوری زۆرەو دەترسم ئەگەر باسی بکەم، پێی بگاتەوەو تەڵاقم بدات، چونکە منداڵم لێی هەیە، نامەوێت لێی جیا ببمەوە..

ئافرەتی سێیەمیان وتی: هاوسەرەکەم درێژێکی ناقۆڵایە.. خاوەن ڕەوشتی ناشیرینەو هیچ لێبوردنێکی نیەو وەکو شمشێر تیژە!! هەموو ساتو کاتێك بە تەڵاقدان دەمترسێنێتو ناتوانم قسەیەکی لەگەڵ بکەم، هەر سکاڵایەکی لە لا بکەم تەڵاقم دەداتو وەکو هاوسەر هەڵسوکەوتم لەگەڵ ناکاتو نە ئەومیە خاوەن هاوسەر بمو نە ئەوەشە ئافرەتێکی تەلاقدراوبم..

ئافرەتی چوارەمیشیان دەڵێت: هاوسەرەکەم وەکو شنەبای (توهامە) وایە.. نەگەرمەو نەسارد.. بە شێوەیەکی گشتی شنەبای توهامە تمپوتۆزاویو گەرمو سارد نیەو مایەی خۆشیەکی زۆرە بۆ دانیشتووانەکەی.. هەر بۆیە زۆر باسی باشی هاوسەرەکەی کردو دەریبڕی کە هاوسەرەکەی خاوەنی ڕەوشتی جوانەو مایەی هیچ ئازارو نارەحەتیەکیش نیە بۆی..

ئافرەتی پێنجەمیش دەڵێت: مێردەکەم لەماڵەوە وەکو پڵنگێك گورجوگۆڵو چالاکەو لە دەریشەوە وەکو شێر ئازاو بەهێزە، هەروەها کەسێکی زۆر لێبوردەو بەخشندەیە..

ئافرەتی شەشەمیش دەڵێت: هاوسەرەکەم زۆر زۆرخۆرەو هیچ شتێکی لەبەر نامێنێتەوە.. کاتێکیش دەخەوێت، هەموو پێخەفەکە بە خۆیەوە دەئاڵێنێتو هیچ بۆ من بەجێ ناهێڵێت.. کاتێکیش دڵتەنگ دەبم، ناملاوێنێتەوەو لە هۆکاری دڵتەنگیەکەم ناپرسێت..

ئافرەتی حەوتەمیش دەڵێت: هاوسەرەکەم زۆر گێلو نەفامەو هەرچی کەموکوڕی

هەیە، لە هاوسەرەکەمدا هەیە.. ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەیت، جنێوت پێدەدات.. ئەگەر گاڵتەوگەپی لەگەڵ بکەیت، بریندارت دەکات..

ئافرەتی هەشتەمیش دەڵێت: هاوسەرەکەم لە کەروێشك نەرمو نیانترە.. وەکو گوڵ بۆنخۆشە.. لەگەڵمدا ئارامو لەسەرخۆیە، بەڵام لەگەڵ کەسانی تردا، زۆر بەهێزو بە توانایە..

ئافرەتی نۆیەمیشیان دەڵێت: ماڵی هاوسەرەکەم فراوانەو هەمیشە بە ڕووی میواندا کراوەیەو بەردەوام بڵێسەی ئاگر دێت، بۆ ئامادەکردنی خواردنی میوانو ئەو شوێنەی کە لەگەڵ هاوەڵانیدا لێی دادەنیشێت، لە ماڵەکەیەوە نزیکە، ئەمەش وەکو گرنگیدانێك بە ماڵو خێزانو منداڵەکانی.. کاتێکیش هەست بە مەترسیەك بکات، ناخەوێتو دەبێت بە پاسەوانو چاودێری دەکات..

ئافرەتی دەیەمیان دەڵێت: هاوسەرەکەم ناوی مالیکەو هەر چەندێك ستایشی بکەمو پیایدا هەڵبدەم هەر کەمە، هەمیشە لە وشترەکانی نزیکە، بۆ ئەوەی هەمیشە بۆ دۆشینو سەربڕین ئامادەبن..

ئافرەتی یانزەیەمیشیان دەڵێت: هاوسەرەکەم ناوی باوکی زەرعە.. چ باوکی زەرعێك؟! زێڕو زیوی زۆری پێشکەش کردمو لە لای ئەو بە هۆی خواردنی چاکەوە قەڵەو بووم.. ئەوەندەی پیاهەڵدام، هەتا خۆم بە خۆم سەرسام بووم.. کەس‌وکارەکەشمی بە خۆمەوە دەوڵەمەند کردو کردنی بە خاوەنی ئاژەڵو مەڕومالاتو ئەسپو ماین.. هەر قسەیەکم بکردایە، ڕەخنەی لێنەدەگرتم.. ئەوەندەی کارگوزار هەبوو، بە تەواوی تێرخەو دەبوویت..

دایکی زەرعیش، چ دایکی زەرعێك؟! گۆشتنێکی شۆخو شەنگ.. خاوەن ماڵو حاڵێکی فراوان، هەروەها خاوەنی منداڵی بێدەنگو سەلارو جوانکیلە.. کارگوزارەکانیان، هەرگیز نهێنی ماڵیان نەدەبردە دەرەوەو بڵاوەیان پێنەدەکرد.. ماڵو جێگەو ڕێگەیان زۆر پاکو خاوێن بوو..

پاشان وتی: لە ڕۆژێکی بەهاردا باوکی زەرع دەچێتە دەرەوەو دەبینێت ئافرەتێك دانیشتووەو دوو منداڵی زۆر جوانی لە تەنیشتەوەیەو یاری بە سنگو مەمکی دایکیان دەکەن.. کاتێك باوکی زەرع ئەو ئافرەتە دەبینێت، پێی سەرسام دەبێتو من تەڵاق دەداتو ئەو مارە دەکات..

پاش ئەم ڕووداوە دایکی زەرعیش شوو بە پیاوێکی باشو ئازاو دەوڵەمەند دەکات، پیاوەکە زۆر دیاریو بۆنی خۆشی پێشکەش دەکات، پیاوەکە ئەوەندە بەخشندە دەبێت،

لە هەموو شتێك جووتێکی پێدەبەخشێت، جا بۆ خۆی بەکاری بهێنێت، یان بە ئارەزووی خۆی بیبەخشێت، هەروەها پیاوەکە بە دایکی زەرع دەڵێت: بەشی کەس‌وکاریشت لەم ماڵ‌و سامانە بدە.. پاشان دایکی زەرع زۆر بە تاسەوە دەڵێت: ئەگەر هەموو شتێکم بداتێ، ناگاتە بچووکترین شتی باوکی زەرع!! پاك‌و بێگەردی بۆ خودا، هێشتا دڵی ئەم ئافرەتە وابەستەی مێردی یەکەمیەتی‌و خۆشی دەوێت!!

وتەکانی خاتوو عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) تەواو بوو.. بە دڵنیاییەوە گێڕانەوەی چیرۆك‌و ڕووداوی پانزە ئافرەت، کاتێکی زۆری لە پێغەمبەری خوداﷺ گرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە بێدەنگی گوێی گرتبوو، هیچ بێزاریەکیش بە ڕوخساریەوە نە دەبینرا، کاتێکیش خاتوو عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) لە وتەکانی تەواو دەبێت، پێغەمبەری خوداﷺ دەریدەخات کە بە تەواوی گوێی لە وتەکانی گرتووەو تێی گەیشتووە، هەر بۆیە دەڵێت: من بۆ تۆ، وەکو باوکی زەرع وام بۆ دایکی زەرع، بەڵام من تۆ تەڵاق نادەم..

کەواتە: هەموومان هاوڕاین لە سەر دەرخستن‌و پیشاندانی نەرم‌و نیانی‌و گرنگیدان بە خەڵکی.. منداڵێك لە منداڵەکانت جل‌وبەرگێکی جوان لەبەردەکات‌و پێت دەڵێت: باوکە گیان جل‌وبەرگەکانم جوانە؟ دەی تۆش زۆر بە گەرم‌و گوڕی‌و بە ڕوویەکی خۆشەوە بڵێ: پاك‌و بێگەردی بۆ خودا، ئەو هەموو جوانیە چیە؟! بە هەمان شێوە لەگەڵ کچەکەتدا، لەگەڵ هاوسەرەکەتدا، لەگەڵ هاوڕێ‌و دراوسێکانتدا، بە هەمان شێوە هەڵسوکەوت بکەو لەگەڵیان تێکەڵ بەو زیندوو بە نەك مردوو..

ئەگەر شتێکت لەبیرچوو بوو، وەك ئەوەی کەسێك پێت بڵێت: مۆژدە بێت باوکم لە نەخۆشیەکەی چاك بۆتەوە، تۆ مەڵێ: بۆ نەخۆش بوو؟! بەڵکو بڵێ: سوپاس بۆ خودا، دڵخۆشت کردم، خودا دڵخۆشت بکات.. یان کەسێك پێت دەڵێت: براکەم لە بەندیخانە ئازاد کرا، مەڵێ: هەر نەشم بیستووە بەند کراوە، بەڵکو بڵێ: سوپاس بۆ خودا، بە ڕاستی هەواڵێکی خۆش بوو.. هەمیشە هەر لە شادی‌و خۆشیدا بن..

لە کۆتایی ئەم باسەدا، دەمەوێت پێتان بڵێم: هاندان‌و تێکەڵ بوون بەیەکتر‌و قسەی خۆش، کاریگەری لە سەر ئاژەڵانیش دروست دەکات، وەکو لەم ڕووداوەدا دەردەکەوێت..

ئەبوبەکری ڕەقی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە بیاباندا ڕێگەم کەوتە لای هۆزێکی عەرەب‌و پیاوێك میوانداری کردم‌و چووینە ڕەشماڵێکەوە، کاتێك چوومە ڕەشماڵەکەوە بەندەیەکی ڕەش پێستی تیادا کۆت‌و بەندکرابوو.. هەندێك وشتری مردارەوەبووشم

بینی، لە بەرامبەر ڕەشماڵەکەدا.. تەنها وشترێك مابوو، ئەویش گیانی دەداو خەریك بوو مردارەوە دەبوو.. بەندەکە پێی وتم: تۆ میوانی‌و مافت لە سەر خاوەن ماڵ هەیەو ڕێزی میوان دەگرێت..

ئەبوبەکر دەڵێت: منیش بێدەنگ بووم‌و نەشمدەزانی تاوانی ئەم بەندەیە چیە!! کاتێك خواردن ئامادە بوو، وتم: نان ناخۆم، هەتا ئەو بەندەیە ئازاد نەکەیت.. خاوەن ماڵەکەش وتی: ئەو بەندەیەی دەیبینی، ماڵی وێران کردووم‌و هەژاری خستووم.. منیش وتم: چی کردووە؟!

خاوەن ماڵەکەش دەڵێت: ئەو بەندەیە دەنگێکی زۆر کاریگەرو خۆشی هەیە، چی کەل‌وپەل‌و شمەکم هەبوون، لە سەر پشتی وشترەکانم بوون، کاتێك ئەم بەندەیە بە دەنگە خۆشەکەی گۆرانی دەڵێت، وشترەکان دەکەونە هەڵبەزو دابەزو هەڵپەڕین‌و بە هۆی قورسی کۆڵەکەی پشتیانەوە، جگە لەم وشترەیان کەوا گیان دەدات، هەموویان دەمرن‌و ماڵم وێران دەبێت، بەڵام قسەی میوانێکی وەکو تۆم پێناشکێت‌و ئەوا دەست‌و قاچی دەکەمەوە..

میوانەکە دەڵێت: زۆر تامەزرۆی بیستنی دەنگی بەندە ڕەش پێستەکە بووم.. کاتێك ڕۆژ بۆوە، داوام لێکرد بە وشترەکەم ئاو لە بیر هەڵبکێشێت، بەندەکە دەستی کرد بە گۆرانی وتن، کاتێك وشترەکە گوێی لەو دەنگە خۆشە دەبێت، دەست بە هەڵپەڕین‌و هەڵبەزو دابەز دەکات، هەتا گوریسەکەی دەستم دەپستێنێت‌و بە سەردەمدا کەوتم، بە ڕاستی دەنگی ئەوەندە خۆش‌و بە سۆز بوو، وا گومان دەبەم، هێشتا گوێم لە دەنگی وا خۆش نەبوو بێت..

ئەگەر دەنگی خۆش کار بکاتە سەر ئاژەڵان، دەی دەبێت وتەو قسەو ئامۆژگاری جوان، چ کاریگەرییەك لە سەر مرۆڤەکان دروست بکەن؟!

**بە ڕاهێنان‌و پرۆڤە، پەرە بە خۆت بدە..**

زیندوو بە نەك مردوو.. بە هۆی ڕوخسارو دەربڕینە جوانەکانتەوە، کاریگەری لە سەر خەڵکی دروست بکە، تاوایان لێدێت هۆگرت دەبن..



## ئامۆژگارییەکانت باکورت‌و پوخت بن..

وتراوە: ئەو کەسەی ئامۆژگاری خەڵکی دەکات، وەك ئەو کەسە وایە کە بە قامچی لە خەڵکی دەدات، لێدانەکانی کەسی قامچی بە دەستیش، بە ئەندازەی شارەزایی‌و لێهاتوویی خۆی ئازار جێدەهێڵێت..

تێبینی ئەوە بکە ئێمە دەڵێین شارەزایی‌و لێهاتوویی کابرای قامچی بە دەست، نەك هێزو تواناکەی!! لەبەر ئەوەی جاری وا هەیە قامچی بە دەستێکی بەهێز زۆر بە توندی لە کەسێك دەدات‌و ئازارێکی زۆری پێدەگەیەنێت، بەڵام پاش کەمێك ئازارەکە نامێنێت‌و هیچ شوێنەوارێکیش جێناهێڵێت، بەڵام قامچی بە دەستی شارەزاو لێهاتوو، زۆر بە توندیش قامچییەکەی بەکارناهێنێت، بەڵام دەزانێت چۆن بەکاری دەهێنێت‌و لە کوێی بدات.. بە هەمان شێوە کەسی ئامۆژگاریکاریش مەرج نیە زۆر قسە بکات‌و درێژە بە ئامۆژگارییەکانی بدات، بەڵکو دەتوانێت زۆر بەکورتی ئامۆژگاری پێویست بە کەسی ئامۆژگاریکراو بگەیەنێت‌و ئامانجەکەی بپێکێت..

هەتا دەتوانیت بەکورتی ئامۆژگاری خەڵکی بکە.. کاتێك دەتەوێت ئامۆژگارییەك پێشکەش بکەیت، بە ئەندازەی وتارێك درێژەی پێمەدە، بە تایبەت ئەگەر ئامۆژگارییەکە لە بابەتێکدا بوو، کە هەردووکتان هاوڕا بوون، وەك ئامۆژگاری کردنی خەڵکی دەربارەی زیانەکانی تورەیی، یان حەرامی عەرەق، یان ترسناکی وازهێنان لە نوێژ، یان ئازاردانی دڵی دایك‌و باوك..

ئەگەر سەیری پێغەمبەری خودا ﷺ بکەین دەبینین، بە دێڕێك یان دوو دێڕ ئامۆژگارییەکانی پێشکەش کردووە، وەك ئەم نمونانە:

پێغەمبەری خودا ﷺ بە ئیمامی عەلی رضي الله عنه دەفەرموێت: ئەی عەلی کاتێك لە جاری یەکەمدا ئافرەتێکت دەکەوێتە پێش چاو، جاری دووەم سەیری مەکەرەوە، لەبەر ئەوەی لە یەکەم جاردا گوناهبار نابیت، بەڵام بۆ دووەم جار نا..

ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بەکورتی کۆتایی هات..
هەروەها بە عبداللەی کوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە ژیانی دونیادا وەك نامۆیەك، یان وەکو ڕێبوارێك وابە..
هەروەها بە مەعازی کوڕی جەبەلﷺ دەفەرموێت: ئەی مەعاز سوێند بە خودا خۆشم دەوێیت.. لە دوای هەموو نوێژێك واز لەم فەرموودەیە مەهێنەو بڵێ: (اللهم اعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك).. واتە: (ئەی پەروەردگار یارمەتیم بدە لە سەر یادکرنو سوپاس کردنت، هەروەها بۆ ئەوەی بە چاکیو بە جوانی بتپەرستم)..
هەروەها بە ئیمامی عومەرﷺ دەفەرموێت: ئەی عومەر تۆ پیاوێکی بەهێزیت، لە لای بەردە ڕەشەکەی کەعبە، قەرەباڵغیو پاڵەپەستۆ دروست مەکە..
کاتێك ئیمامی عومەرﷺ لە سەرەمەرگدا دەبێت، خەڵکی پۆل پۆلو دەستە دەستە دێنە سەردانیو ماڵئاوایی لێدەکەن، گەنجێك دێتە ژوورەوەو دەڵێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران موژدە بێت، پەروەردگار هاوەڵی پێغەمبەری خودایﷺ پێبەخشیت.. ئەوەی زانیتو لە تواناتدا بوو، پێشکەشی ئیسلامو موسڵمانانت کرد.. پاشان کە بوویت بە کاربەدەست، دادپەروەر بوویت، پاشان پەروەردگار وا پلەی بەرزی شەهیدیت پێدەبەخشێت.. ئیمامی عومەریشﷺ دەفەرموێت: خۆزگە سەر بە سەر دەرچوومایە..
پاشان گەنجەکە ڕۆیشتو ئیمامی عومەرﷺ بینی، جلوبەرگەکەی لە زەویەکە دەخشاو دەکەوتە ژێر قاچەکانیەوە، ئیمامی عومەرﷺ لەو کاتەدا ویستی ئامۆژگارییەکی ئەو گەنجە بکاتو فەرمووی: بانگی ئەو گەنجەم بۆ بکەن.. کاتێك گەنجەکە گەڕایەوەو لە بەردەستی ئیمامی عومەرداﷺ وەستا، ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: ئەی برازای شیرینم، جلوبەرگەکەت بەرزبکەرەوە، لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی پاكو خاوێنی بۆ جلوبەرگەکانت، هەروەها مایەی ڕەزامەندی پەروەردگارتو دەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر لێی بترسیت..
بەڵێ.. زۆر بەکورتی پەیامی ئامۆژگاری گەیاند بە گەنجەکەو درێژەی پێنەداو چەندو چوونی لەگەڵ نەکرد.. چەندو چوونو درێژەدان بە بابەتو کێشەکان

کارێکی خراپو ناپەسەندە.. پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: (من گرەنتی خانوویەك لە بەهەشتدا بۆ ئەو کەسە دەکەم، کە واز لە چەندو چوونو دەمەقاڵێ بهێنێت، ئەگەر لە سەر حەقیش بێت)..

جاری وا هەیە کەسێك باوەڕ بە ڕاستی بۆچوونێك، یان کارێك دەکات، بەڵام بە هۆی خۆ بە گەورەزانینەوە دەری نابڕێتو دانی پێدانانێت، هەر وەکو پەروەردگار لە بارەی فیرعەونو داروودەستەکەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ ...... ﴿١٤﴾ ﴾ النمل. واتە: (جا ئەوانە هەر ڕق ئەستوورییان کردو باوەڕیان پێی نەبوو، بە زۆرداریو خۆبەزلزانی، لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتەو ڕاستە)..

بەڵێ.. فیرعەونو داروودەستەکەی ڕاستیەکانیان ناسیو لە دڵو دەروونیاندا دانیان پێدانا، بەڵام بە هۆی خۆ بە گەورەزانینەوە شوێنی موسا ﷺ نەکەوتن..

بەڵێ.. گرنگ ئەوەیە کەسی ئامۆژگاریکراو ، واز لە هەڵەکەی بهێنێتو نەگەڕێتەوە سەری، نەك ئەوەی کە بە سەریدا سەرکەویتو بیبەزێنیت، چونکە خۆ ئێوە لە گۆڕەپانی زۆرانبازیدا نین!!

جاری وا هەیە کەسی ئامۆژگاریکراو بە چەند وشەو وتەیەکی کرچو کاڵ، پۆزش دەهێنێتەوە، کە جێگەی سەلماندنو ڕەزامەندی نین، بەڵام تۆ لێبووردەبەو پۆزشو بیانووەکانی وەرگرەو لەگەڵیدا توندو تیژ مەبەو دەرگاکانی پەشیمانی بە ڕوودا دامەخەو دەرگاکانی ئامۆژگاری بە ڕوودا ئاوەڵا بکەو لە ئامۆژگاری کردنی بەردەوام بەو کۆڵ مەدە..

**تێڕوانین..**

زۆر بەکورتی لە هەڵەکانیان ئاگاداریان بکەو درێژەی پێمەدەو وتاریان بۆ مەخوێنەرەوە..

# گوێ بە قسەی خەڵکی مەدە..

کەسانی ئامۆژگاریکاری وا هەن، شارەزاییەکی تەواویان لە هونەری ئامۆژگاری کردندا نیە، جاری وا هەیە بە ئامۆژگارییەکانیان لە جیاتی ئەوەی ئاسودەو دڵخۆشت بکەن، زیاتر دڵتەنگ‌و غەمبارت دەکەن‌و کێشەکانت لە سەر گران دەکەن.. کەسانی وا هەن زۆر ئیرەییت پێدەبەن‌و مەبەستیانە غەمبارت بکەن.. هەیانە ئەوەندە بێ ئەزموونە، ئەگەر بێدەنگ بێت زۆر باشترە لەوەی کە ئامۆژگاری خەڵکی بکات.. کەسانێك هەن هەمیشە بە چاویلکەی ڕەشەوە، سەیری ژیان دەکەن..

دەگێڕنەوە پیاوێك بە سواری گوێدرێژەکەی دەکەوێتە ڕێ‌و کوڕەکەشی لە تەنیشتیەوە ڕێدەکات، لە ڕێگە بە هەندێك لە خەڵکی دەگەن‌و دەڵێن: سەیری ئەو پیاوە دڵڕەقە بکەن، خۆی سواری پشتی گوێدرێژەکەی بووەو کوڕەکەشی بە پێ دەڕوات!! پیاوەکە کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، خۆی دادەبەزێت‌و کوڕەکەی سوار دەکات..

پاش کەمێکی تر بە کۆمەڵە کەسێکی تر دەگەن‌و ئەمانیش دەڵێن: سەیری ئەو کوڕە بکەن چەندە بێڕێزە، خۆی سواری گوێدرێژ بووەو باوکیشی بە پێ دەڕوات.. پیاوەکە کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، خۆشی لەگەڵ کوڕەکەیدا سواری گوێدرێژەکە دەبێت..

لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبن‌و دەگەن بە کەسانێکی تر و ئەمانیش دەڵێن: سەیری ئەو دوو مرۆڤە دڵڕەقە بکەن، هیچ بەزەییەکیان بەو ئاژەڵەدا نایاتەوە..

پیاوەکە کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، دادەبەزێت‌و بە کوڕەکەشی دەڵێت: تۆش دابەزە.. کوڕەکەشی دادەبەزێت‌و دوو بە دوو دەڕۆن‌و گوێ درێژەکەش هیچ شتێکی لە سەر پشت نابێت..

پاشان بە کۆمەڵە کەسێك دەگەن‌و پێیان دەڵێن: سەیری ئەو دوو کەسە

گێل‌و نەفامە بکەن، گوێدرێژێکیان پێیەو کەچی خۆیان بە پێ دەڕۆن، باشە گوێدرێژ بۆ سواربوون دروست نەکراوە؟!

پیاوەکە ئیتر خۆی بۆ نەگیراو هاواری کردو کوڕەکەی ڕاکێشاو بە جووتە چوونە ژێر سکی گوێدرێژەکەوەو ئەمجارەیان ئەمان گوێدرێژەکە هەڵدەگرن!!

ئەگەر لەو کاتەدا من لەوێ بوومایە، بەو پیاوەم دەوت: چیت پێخۆشە وابکەو گوێ لە قسەو قسەڵۆکی خەڵکی مەگرە، چونکە ڕازی کردنی هەموو خەڵکی، کارێکی بەدی نەهاتووەو مرۆڤ ناتوانێت پێی بکات..

کەسی وا هەیە کاتێك پێشنیارێك دەردەبڕێت، لەخۆوە دەست بە قسەکردن دەکات‌و بیری لێناکاتەوە، وەکو ئەوەی کەسێك بێت بۆ لات‌و پێت بڵێت: ئەوە بۆچی داخوازی فلانە ئافرەتت کرد؟! ئەی بۆچی مارەت کرد؟!

کاکی برا کارەکە تەواو بووەو تازە مارەی کردو کۆتایی پێهات!!

یان برادەرێك دێت بۆ لات‌و دەڵێت: ئەوە ئۆتۆمبیلەکەت فرۆشت؟! ئەی بۆ ئاگادارت نەکردم؟! فلانە کەس پارەی زیاتری پێدەدا..

براکەم بیبڕەوەو بەسە.. کابرا ئۆتۆمبیلەکەی فرۆشت‌و کۆتایی پێهات.. کەواتە: ئازاری دەروونت مەدەو گوێ لە هەموو قسەیەکی خەڵکی مەگرە..

ئەزموون..

ڕازی کردنی هەموو خەڵکی، کارێکی بەدی نەهاتووەو مرۆڤ ناتوانێت پێی بکات..

## با هەمیشە زەردەخەنەت لە سەر لێو بێت..

ماوەی چەندین ساڵە دەیناسمو هاوڕێی کارمە، بە هەر حاڵ ئەوەی دەمەوێت باوەڕ بکەم یان نا ئەوەیە، تا ئێستا نازانم ئەو هاوڕێیەم دانی لێرواوە یان نا، چونکە زەردەخەنەم پێوە نەبینیوە، هەتا دانەکانی ببینم!! هەمیشە گرژو مۆنە، وا دەزانێت ئەگەر کەمێك ڕووخۆشو لێو بە خەندە بێت، تەمەنی کەم دەکات، یان ماڵو سەروەتو سامانەکەی لە دەست دەچێت!!

حەریری کوری عبداللەﷺ دەفەرمویت: هەر کاتێك پێغەمبەری خودامﷺ بینی بێت، زەردەخەنەی لە سەر لێو بووە..

کەسانێك هەن هەمیشە ڕووخۆشو لێو بە خەندەن..

کاتێك مامۆستایتو دەچیتە ژوورەوە بۆ لای قوتابییەکانت، با ڕووت خۆش بێت..

کاتێك سواری فرۆکە دەبیتو خەڵکی سەیرت دەکەن، بە ڕوویاندا پێبکەنەو با زەردەخەنەت لە سەر لێوت بێت..

کاتێك دەچیتە دوکانێکەوە یان دەچیت بۆ بەنزینخانەیەك، یان فەرمانگەیەك، لێو بە خەندەبە..

کاتێك چاكو چۆنی لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت، با زەردەخەنەت لە سەر لێو بێتو بە ڕوویاندا پێبکەنە..

بە شێوەیەکی گشتی زەردەخەنەو ڕووخۆشی، کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە بۆ نەهێشتنی تورەیی و گومانو ڕاڕایی.. پاڵەوان ئەو کەسەیە بە سەر هەستو سۆزیدا زاڵ بێتو زەردەخەنەی لە سەر لێو بێت..

ئەنەسی کوری مالیكﷺ ڕۆژێك لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ بە ڕێگەیەکدا دەڕۆنو پێغەمبەری خوداشﷺ پارچە پەڕۆیەکی زبری بە سەر شانەوە دەبێت.. کابرایەکی دەشتەکییان پێدەگاتو پارچە پەڕۆکە لە قورگی پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ توند دەکات!! ئەنەسﷺ دەفەرمویت: شوێنەوازی زبری پەڕۆکە لە سەر جەستەی پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ دەرکەوت..

دەبێت ئەو پیاوە چی ویستبێت؟! کێ دەڵێت ماڵەکەی نەسووتاوەو بۆ یارمەتی نەهاتووە؟!

گوێ بگرە بزانە چی دەوێت‌و داوای چی دەکات.. دەڵێت: ئەی محمد.. تێبینی ئەوە بکە نەیوت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ.. ئەی محمد: لەو ماڵ‌و سامانەی خودا، کە لە لاتە بەشم بدە..

پێغەمبەری خوداﷺ ئاوڕ دەداتەوەو پاشان پێدەکەنێت‌و فەرمان دەکات‌و دەفەرموێت: بەشی بدەن..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ ئەوەندە ئارامگر بوو، ئەو شێوە هەڵسوکەوتانە، نەیاندەتوانی تورەی بکەن.. پێغەمبەری خوداﷺ زۆر لەوە سنگ فراوانترو گەورەتر بوو، لە سەر شتانێکی بێ نرخ لە خەڵکی تورە بێت‌و سزایان بدات.. پێش ئەوەی بیر لە تورەبوون‌و سزادان بکاتەوە، بیری لە ئەنجامەکەی دەکردەوە..

چ سوودێکی دەبوو، ئەگەر بە سەر کابرا دەشتەکیەکەدا هاواری بکردایەو دەری بکردایە؟! ئایا برینەکانی گەردنی سارێژ دەبوو؟! ئەی کابرا ڕەوشتی جوان دەبوو؟!

نەخێر.. دەی کەواتە باشترین چارەسەر ئارامگرتنە..

بەڵێ.. هەندێك هەڵسوکەوت تورەمان دەکەن، بەڵام چارەسەریان بریتی نیە لە تورەیی‌و هەڵەشەیی، بەڵکو چارەسەریان بریتیە لە نەرم‌و نیانی.. زەردەخەنە.. گومانی باش.. خواردنەوەو شاردنەوەی تورەیی.. ئارامگرتن‌و پەلە نەکردن..

بەراستی پێغەمبەری خوداﷺ جوانی فەرمووە کە دەفەرموێت: (ليس الشديد بالصرعة، إنما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب).. واتە: (ئازاو پاڵەوان بریتی نیە لەو کەسەی کە زۆرانبازو بەهێزە، بەڵکو ئازا بریتیە لەو کەسەی لە کاتی تورەییدا بە سەر خۆیدا زاڵ دەبێت)..

لە کۆتاییدا پێت دەڵێم: ڕووخۆشی‌و دەربڕینی زەردەخەنە بە ڕووی براکەتدا مایەی خێرو پاداشت‌و چاکەیە..

پێشەنگ..

هەر کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بینرا بێت، ڕووخۆش‌و لێو بە خەندە بووە..

## هێڵە سورەکان..

قوتابیم بوو لە زانکۆ.. خاوەن ڕۆشنبیرییەکی فراوان بوو.. سوور بوو لە سەر دروست کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ خەڵکیدا، بەڵام زۆر خوێن تاڵو ڕەزاگران بوو، ڕۆژێك هات بۆ لامو وتی: مامۆستا.. هەمیشە هاوڕێکانم لێم تورە دەبنو لە سەر گاڵتەو قسە خۆشەکانم ئارام ناگرن!!

لە دڵی خۆمدا وتم: من لە بێدەنگیت بێزارم، چ جای ئەوەی قسەو گاڵتە بکەیت؟! بە تایبەت کاتێك کە دەتەوێت خۆت ڕووخۆشو گاڵتەئامێز نیشان بدەیت!! لێم پرسیو وتم: بۆچی لە گاڵتەو قسە خۆشەکانت بێزارن؟! نمونەیەکم لە قسە خۆشەکانت پێ بڵێ..

وتی: یەکێك پشمیو منیش وتم: نەفرینی خودات لێ بێت.. کاتێك تورە بوو، قسەکانم تەواو کردو پێم وت: ئەی شەیتان، خودا ڕەحمت لێ بکات!!

ئاه.. بە ڕاستی قسەیەکی زۆر ناخۆشی کرد!! داماوە وایدەزانی بەو قسە بێزراوانە خۆشەویست دەبێت!!

خەڵکی هەر چەندە ڕازی بن گاڵتەوگەپت لەگەڵ بکەنو گوێ لە قسە خۆشەکانت بگرن، بەڵام ڕازی نابن هەندێك قسەو گاڵتەیان لەگەڵ بکەیتو هێڵە سورەکانی ژیانیان ببەزێنێت، بە تایبەت لەبەر چاوی خەڵکیو بە ئاشکرا..

هەندێك لە خەڵکی، بە بیانووی لێ ڕابینینەوە، گوێ نادەنێو هەندێك هەڵسوکەوت دەکەن، یان هەندێك داواکاری نەشیاو دەکەن، وەك ئەوەی مۆبایلەکەت هەڵدەگرنو بە ئارەزووی خۆیان تەلەفۆنی پێدەکەن، یان بە مۆبایلەکەت کورتەنامە بۆ کەسانێك دەنێرن، کە حەز ناکەیت ئەو کەسانە ژمارەی مۆبایلەکەت بزانن، یان بە بێ پرس ئۆتۆمبیلەکەت دەبەن، یاخود ئەوەندە داوا دەکەن، هەتا لە ڕوو دادەمێنێو ناچار دەبیت بیان دەیتێ..

یان جاری وا هەیە چەند قوتابیەك لە بەشی ناوخۆیی بەیەکەوە نیشتەجێ دەبن، کاتێك یەکێکیان بەیانی بەخەبەر دێتو دەیەوێت بچێت بۆ زانکۆ، دەبینێت یەکێك لە قوتابیە هاوڕێکانی چاکەتەکەی بردووە، یەکێکی تریان پێڵاوەکانی لە پێ کردووەو ڕۆیشتووە..

جاری وا هەیە کەسانێك بە بیانووی قسەی خۆشەوە، لە کۆڕو دانیشتنە گشتیەکاندا،

هاوڕێکانیان بێزارو نارەحەت دەکەن.. پێویستە بزانرێت کەسانێك هەر چەندە خۆشیان بوویێت، مرۆڤن‌و شایەنی بێزاربوون‌و توڕەبوونن‌و پێویستە ئاگاداری هەست‌و سۆزیان بیت‌و دڵیان نەڕەنجێنیت..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە جەنگی تەبوك گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، عورووەی کوڕی مەسعودی سەقەفی هات بۆ خزمەتی، عورووە گەورەی هۆزەکەی دەبێت‌و زۆر ڕێزی دەگرن.. عورووە موسڵمان دەبێت‌و دەیەوێت بچێت بانگی هۆزەکەی بکات، بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنن‌و موسڵمان بن، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ دەترسێت هۆزەکەی ئازاری بدەن‌و بەو ئاسانیە دەستبەرداری ئاینەکەی خۆیان نەبن، هەر بۆیە فەرمووی: ئەوانە دەتکوژن!!

پێغەمبەری خودا دەیزانی هۆزی سەقیف لە هەڵسوکەوتدا توندوتیژ‌و ڕەقن، ئەگەر لەگەڵ گەورەکەشیاندا بێت..

عورووەش دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هێندەی چاویان خۆشیان دەوێم‌و ڕێزم دەگرن..

بەڵێ.. عورووە دەکەوێتە ڕێ بۆ لای هۆزەکەی، بۆ ئەوەی بە دەم بانگەوازەکەیەوە بێن‌و باوەڕ بهێنن، کاتێك گەیشتە لای هۆزەکەی، سەرکەوتە سەر بەرزیەك‌و بە دەنگی بەرز بانگی کردن‌و هەموو کۆبوونەوە، پاشان بانگی کردن بۆ ئەوەی موسڵمان بن‌و پێشی ڕاگەیاندن کە خۆی موسڵمان بووەو دوبارە لە بەرامبەریان باوەڕەکەی ئاشکرا کردو وتی: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله..

کاتێك گوێیان لەم وتانە بوو، دەستیان کرد بە هاوار هاوارو توڕەبوون‌و ڕازی نەبوون، واز لە خوداکانیان بهێنن، هەر بۆیە لە هەموو لایەکەوە بە ڕم هێرشیان کردە سەری، هەتا بورایەوەو لە هۆش چوو.. کاتێك خەریك بوو گیان بسپێرێت، ئامۆزاکانی هاتن بۆ لای‌و وتیان: ئەی عورووە لە باتی کوشتنی تۆ، کوشتار نەکەین؟! عورووەش دەڵێت: نەخێر لە باتی من کەس مەکوژنەوەو تۆڵە لە کەس مەسەننەوە، پەروەردگار بە شەهیدی ڕێزی لێنام..

کاتێك هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: نمونەی عورووە، وەکو نمونەی ئەو پیاوە وایە کە پەروەردگار لە سورەتی یاسیندا باسی دەکات، کاتێك بە هۆزەکەی وت: شوێنی پێغەمبەران بکەون‌و باوەڕ بهێنن، بەڵام ئەوان شەهیدیان کرد..

دەی ئاگاداربە: خەڵکی هەر چەندە لێت نزیك بن، هەروەها هەر چەندە هاوڕێی‌و خۆشەویستت بن، هەست‌و سۆزیان هەیەو نابێت لە کاتی هەڵسوکەوتتدا، یان لە کاتی

ئەنجامدانی گاڵتەو قسەی خۆشدا، دەروونو هەستیان بریندار بکەیت.. وریابە هێڵە سورەکانی ژیانیان نەبەزێنیتو سنوری خۆت بزانە.. هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ داوامان لێدەکات موسڵمانان نەترسێنین..

ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ چەند هاوەڵێکیدا لە گەشتێکدا دەبنو هەر کەسەو کەلوپەلەکانی بە خۆی دەبێت، یەکێك لە هاوەڵان خەوی لێدەکەوێتو یەکێك لە هاورێکانی شتێکی لێ دەشارێتەوە، کاتێك پیاوەکە خەبەری دەبێتەوەو دەبینێت شتێك لە کەلوپەلەکانی دیار نیە، ترسی لێدەنیشێتو دەست دەکات بە گەڕان بە دوای شتەکەیدا، پێغەمبەری خوداشﷺ لە کاتی ئەم ڕووداوەدا، دەفەرموێت: (لايحل المسلم أن يروع مسلماً). رواه أحمد وأبوداود. واتە: (بۆ هیچ موسڵمانێك دروست نیە، موسڵمانێکی تر بترسێنێت)..

جاری وا هەیە کەسێك بەو هەڵسوکەوتەی کە دەیکات، بە گومانی خۆی دڵخۆشت دەکات، بەڵام بە داخەوە زۆر جار زیانت پێدەگەیەنێتو دڵتەنگو غەمبارت دەکات، بەڵکو توشی دڵەڕاوکێشت دەکاتو لەوانەیە تا ماوەیەکیش توشی شۆك ببیت..

بۆ نمونە: بە بێ ئەوەی ئۆتۆمبیلەکەت بکوژێنیتەوە، لەبەردەم دوکانێك دەوەستیتو دادەبەزیت، بۆ ئەوەی پێداویستیەك بکڕیت، لەپڕ یەکێك لە هاورێکانت دێتو سواری ئۆتۆمبیلەکەت دەبێتو دوور دەکەوێتەوە، تۆش وا دەزانیت ئۆتۆمبیلەکەیان فڕاندوویت، یان دزیوویانە.. ئەمەش بۆ گاڵتەو پێکەنین!! هاورێکەت بۆیە ئەم کارەی کرد، بۆ ئەوەی کەمێك پێبکەنێت، یان گاڵتەیەکی ترس ئامێز دروست بکات، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە ناخۆشو بە ئازارن..

**تێڕوانین..**

**هەر شتێك لە سنوری خۆی دەرچوو، پێچەوانە دەبێتەوەو دەگۆڕێت بۆ دژەکەی.. زۆر گاڵتەوگەپیش هەبووە، بە شەڕو ناخۆشی کۆتاییان پێهاتووە!!**

## پاراستنی نهێنی..

لە کۆنەوە وتراوە: هەر نهێنیەك لە دوو تێپەڕی، ئەوا بڵاو دەبێتەوە.. پرسیاریش کراوە مەبەست لە دوو چیە؟! وتراوە مەبەست لە دوو، هەر دوو لێوە!!

لە ماوەی سی‌و پێنج ساڵ تەمەنی ڕابوردوومدا، بیرم نایات نهێنیەکم بە گوێچکەی کەسێکدا چرپاند بێت‌و لێی دڵنیا بووبێتم، مەگەر سوێندی بۆ خواردبێتم، کە نهێنییەکەم دەشارێتەوەو دەیخاتە بیرێکی قوڵی بێبنەوە.. بیریشم نایات، کەسێك لە دوای بیستنی نهێنییەکەم، ڕاشکاوانە وتبێتی: فلانە کەس ناتوانم نهێنیەکەت بشارمەوە، بەڵکو هەموو کەسێك لە سەرەتاوە دەستی دەکێشێ بە سەر سنگیداو دەڵێت: سوێند بە خودا، ئەگەر خۆر بخەنە سەر شانی ڕاستم‌و مانگیش لە سەر شانی چەپم، یان ئەگەر چەقۆ بخەنە سەر گەردنم، نهێنیەکەت ئاشکرا ناکەم!! بەڵام پاشان ئەگەر زۆر خۆی بۆ بگرێت، دوو یان سێ مانگ، دەتوانێت خۆی بگرێت‌و نهێنیەکەت بڵاو دەکاتەوەو دەم بە دەم دەگاتەوە بە خۆت..

لەم کاتەدا، پێت دەڵێم: هەر لە سەرەتاوە هەڵە بوویت، چونکە پێویستە نهێنییەکانت، سنوری هەر دوو لێوت نەبەزێنن، هەروەها پێویستە داوای کارێك لە خەڵکی نەکەیت، کە لە توانایاندا نەبێت، هەر وەك وتراویشە:

إذا ضاق صدر المرء عن نفسه فصدر الذي يستودع السر أضيق..

بەڵێ.. ئەگەر سنگی کەسێك تەسك‌و بچوك بێت بۆ پاراستنی نهێنیەکانی خۆی، ئەوا بە دڵنیاییەوە سنگی ئەو کەسەی کە نهێنیەکەتی لا دادەنێی، تەسك‌و بچوکترە..

کێشەکە لەوە دایە جاری وا هەیە باسەکە لە لای کەسێك باس دەکەیت، بۆ ئەوەی ڕاوێژی پێبکەیت‌و ڕێگەو چارەسەرێکت نیشان بدات، کەچی دواتر نهێنییەکەت بڵاو دەکاتەوە، تۆش لەبەر چاوت دەکەوێت‌و زۆریش ڕقت لێدەبێتەوە..

نمونەیەکی سەیر لە مێژوودا بەم شێوەیە ڕوویداوە: پێش ڕوودانی جەنگی بەدر، کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵی کاروانێکی بازرگانی قورەیشی بیست، خۆی‌و هاوەڵانی بەرەو کاروانەکە کەوتنە ڕێ.. سەردەستەی کاروانەکە، ئەبوسوفیان بوو،

کاتێك هەستی بە مەترسی کرد، پیاوێکی بە کرێ گرت، بۆ ئەوەی هەواڵی مەترسی کاروانەکە بگەیەنێتە قورەیش.. کابرا کەوتە ڕێ بەرەو مەککە، ڕێگەی مەککەش چەند ڕۆژێکی دەویست، خەڵکی مەککەش هیچ هەواڵێکیان لەو بارەیەوە نەدەزانی..

شەوێك عاتیکەی کچی عبدالمطلبی پوری پێغەمبەری خوداﷺ خەوێکی ترسناك دەبینێت.. کاتێك ڕۆژ بۆوە ناردی بە شوێن عەباسی برایداو پێی وت: برام، سوێند بە خودا ئەمشەو خەوێکم بینی ترساندمیو دەترسم بەڵاو نارەحەتیەك بە سەر هۆزەکەتدا بێت، ئەوەی بۆت باس دەکەم، بیشارەوەو لە لای کەس مەیدرکێنە.. عەباسیش﷜ دەڵێت: باشە.. چیت بینی؟!

عاتیکە دەڵێت: سوارێکم بینی بە سەر وشترەکەیەوە، هاتە پێشەوە، هەتا گەیشتە دۆڵی (ابطح)و پاشان وەستاو بە دەنگی بەرز هاواری کردو وتی: ئەی ستەمکاران بڕۆن بۆ ئەو شوێنەی کە لە ماوەی سێ ڕۆژدا تیایدا دەمرن!! پاشان وتی: خەڵکەکەم بینی لە دەوری کۆبوونەوە، پاشان ڕۆیشتو چووە مزگەوتەکەوەو خەڵکەکەش بە شوێنیەوە بوون، پاشان بە وشترەکەیەوە سەرکەوتە سەر کەعبەو بە هەمان شێوەی پێشوو هاواری کردو وتی: ئەی ستەمکاران بڕۆن بۆ ئەو شوێنەی کە لە ماوەی سێ ڕۆژدا تیایدا دەمرن!!

پاشان کەوتە سەر شاخی ئەبی قەیسو هەمان هاواری پێشووی دووبارە کردەوە، پاشان لە سەر لوتکەی شاخەکەوە، تاشە بەردێکی فڕێدا، تا گەیشتە خوارەوە، پارچە پارچە بوو.. هیچ ماڵێکی مەککە نەما پارچەیەك لەو بەردانەی تێنەچێت..

عەباس﷜ کاتێك گوێی لەم قسانە بوو، شڵەژاو وتی: سوێند بە خودا ئەمە خەوێکی ڕاستو ڕوونە!! پاشان وتی: دەی تۆش ئەم خەوە باس مەکەو بۆ کەسی مەگێڕەوە..

عەباس﷜ ڕۆیشتو هەر خەیاڵی لە لای خەوەکەی خوشکەکەی بوو، لە ڕێگە وەلیدی کوڕی عوتبە دەبینێت، کە یەکێك بوو لە هاوەڵەکانیو خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوەو پێی دەڵێت: بۆ کەسی مەگێڕەوە.. پاشان وەلید دەڕواتو عوتبەی کوڕی دەبینێتو خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، عوتبەش بۆ هەندێك لە هاوەڵەکانی دەگێڕێتەوە، هەتا وای لێدێت زۆربەی خەڵکەکە دەیبیستنو خەوەکە دەبێتە باسو خواسی خەڵکی شاری مەککەو کۆڕو دانیشتنەکانیان..

دەمەو نیوەڕۆ، عەباس﷜ دەچێت بۆ ئەوەی بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا بسوڕێتەوە،

ئەبوجەهلیش لەگەڵ هەندێك كەسدا لە سێبەری كەعبەدا دانیشتبوون‌و باسی خەوەكەی عاتیكەیان دەكرد.. كاتێك ئەبوجەهل عەباسﷺ دەبینێت، دەڵێت: كە تەواو بوویت، وەرە بۆ لامان..

عەباسﷺ سەری سورماو لە دڵی خۆیدا دەڵێت: دەبێت ئەبوجەهل چ كارێكی بە من هەبێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەك بیری بۆ خەوەكەی عاتیكەی خوشكی ناچێت.. كاتێك عەباسﷺ تەواو بوو، چوو بۆ لای ئەبوجەهل‌و هاوەڵەكانی.. كاتێك عەباسﷺ دادەنیشێت، ئەبوجەهل دەڵێت: ئەی نەوەی عبدالمطلب لە كەیەوە فێری ئەوەبوون قسە لە نادیارەكان بكەن؟!

عەباسیشﷺ دەڵێت: وەكو چی؟! ئەبوجەهل دەڵێت: وەك ئەو خەوەی عاتیكە بینیوویەتی..

عەباسﷺ ترسی لێدەنیشێت‌و دەڵێت: چی بینیووە؟!

ئەبوجەهل دەڵێت: ئەی نەوەی عبدالمطلب، ئایا ڕازی بوون پیاوانتان ببێت بە پێغەمبەر، هەتا ڕازی بن ئافرەتانتان ببێت بە پێغەمبەرو هەواڵ هێنەر؟! ئێمە لە سەر قسەی عاتیكە سێ ڕۆژ چاوەڕێ دەكەین، ئەگەر وتەكانی بە ڕاست دەرچوون باشە، ئەگەر نا نوسراوێك دەنوسین، كە ئێوە درۆزنترین كەسی عەرەبن..

عەباسﷺ دەشلەژێ‌و نكۆڵی لە خەوەكەی خوشكەكەی دەكات‌و هیچ قسەیەكیشی پێ نابێت، هەتا وەڵامی ئەبوجەهلی پێبداتەوە.. كاتێك عەباس دەگەڕێتەوە ماڵەوە، هەموو ئافرەتانی نەوەی عبدالمطلب لێی تورە دەبن‌و پێی دەڵێن: ئێوە ڕازی بوون، ئەو پیس‌و چەپەڵە قسەی ناشیرین بە پیاوانتان بڵێت، ئەی چۆن ڕازی دەبن، قسەی ناشیرین بە ئافرەتانتان بڵێت‌و ئێوەش گوێ بیستی بن، ئایا غیرەتتان نیە؟!

عەباسﷺ كاتێك گوێی لەم قسانە دەبێت، ڕق‌و تورەیی بەرز دەبێتەوەو دەڵێت: سوێند بە خودا ئەگەر ئەمجارە ئەبوجەهل قسەی وا بكات، ئاواو ئاوای لێدەكەم..

سێ ڕۆژ دوای خەوەكەی عاتیكە، عەباس دەچێت بۆ كەعبەو زۆریش تورە دەبێت.. كاتێك دەچێت بۆ كەعبە، ئەبوجەهل دەبینێت‌و بەرەو ڕووی دەچێت، بەڵام ئەبوجەهل زۆر بە پەلە پشت هەڵدەكات‌و دەڕوات.. عەباس لە پەلە ڕۆیشتنی ئەبوجەهل سەرسام دەبێت‌و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: ئەفرینی خودات لێ بێت، هەموو ئەو پەلە پەلەت لە ترسی ئەوە بوو، قسەیەكت پێ بڵێم؟!

بەڵام لە ڕاستیدا ئەبوجەهل کاتێك گوێی لە نێردراوەکەی ئەبوسوفیان دەبێت، وا هاوار دەکات‌و داوای کۆمەکی دەکات، بۆ ڕزگارکردنی کاروانە بازرگانیەکەی قوڕەیش، بە پەلە دەڕوات بەرەو لای دەنگەکە.. کاتێك دەگاتە لای نێردراوەکەی ئەبوسوفیان، دەبینێت لوتی وشترەکەی براوەو خوێن بە ڕوخساری وشترەکەیدا دێتە خوارەوەو نوێنەرەکەش، کراسەکەی بەری دادڕیووەو هاواری بە دەمەوەچوونی کاروانەکەی قوڕەیش دەکات..

قورەیشیش زۆر بە پەلە سوپا ئامادە دەکەن‌و دەکەونە ڕێ بەرەو بەدرو ئەوە ڕوویدا، کە ڕوویداو بێباوەڕانی قوڕەیش توشی بەلاو سەرشۆڕییەکی زۆر گەورە بوون‌و ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەو گەورەکانیان کوژران، لەوانەش ئەبوجەهل..

بزانە لە چاوتروکانێکدا، ئەو خەوە چۆن بلاوبۆوە؟!

ئیمامی عومەرﷺ کاتێك باوەڕی هێناو موسڵمان بوو، ویستی هەواڵی موسڵمان بوونەکەی بلاوبێتەوەو بێباوەڕان بیبیستن، هەر بۆیە هەواڵەکەی بە کەسێکی زۆر دەم شڕو قسەگێڕەوە ڕاگەیاندو پێی وت: فلانە کەس قسەیەکت بۆ دەکەم، بەڵام با نهێنی بێت لە لات!! کابراکەش دەڵێت: نهێنیەکەت چیە؟!

ئیمامی عومەرﷺ دەفەرموێت: من موسڵمان بووم، بەڵام ئاگاداربە لە لای کەس ئەم نهێنیە نەدرکێنی!!

هەر ئەوەندەی ئیمامی عومەرﷺ دیار نەماو ڕۆیشت، کابرا دەگەڕاو هەر کەسێکی بەر چاو بکەوتایە پێی دەوت: دەزانی عومەر موسڵمان بووە؟! ئەوە نەتزانیووە عومەر باوەڕی هێناوە؟!

بە ڕاستی سەیرە!! دەڵێی بریکاری بلاوکردنەوەی هەواڵ‌و دەنگوباسە!!

ڕۆژێك لە ڕۆژان، پێغەمبەری خوداﷺ، ئەنەسﷺ دەنێرێت بۆ کارێك، کاتێك دەڕوات توشی دایکی دەبێت، دایکی پرسیاری لێدەکات‌و دەڵێت: پێغەمبەری خوداﷺ بۆ چ کارێکی ناردووی؟ ئەنەسیشﷺ لە وەلامدا دەڵێت: سوێند بە خودا نهێنی پێغەمبەری خوداﷺ نادرکێنم..

پێغەمبەری خوداﷺ هاوەلانی لە سەر پاراستن‌و نەدرکاندی نهێنیەکان پەروەردە دەکرد، ئەوەتا ئەنەسﷺ لە کاتێکدا منداڵ بووە، بەڵام ئامادە نەبوو نهێنی پێغەمبەری خوداﷺ لە لای دایکیشی بدرکێنێت..

عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: فاطمەی کچی پێغەمبەری

خوداﷺ هات بۆ لامان، ڕۆیشتنی فاطمەش زۆر لە ڕۆیشتنی باوکی دەچوو.. کاتێك هات بۆ لامان، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: بەخێربێی کچە شیرینەکەم، پاشان لە لای ڕاستی، یان لە لای چەپی دایبنیشاند، پاشان چپەیەکی چرپاند بە گوێیداو فاطمە دەستی کرد بە گریان، پاشان چپەیەکی تری چەپاند بە گوێیدا، دەستی کرد بە پێکەنین..

منیش وتم: تا ئەمڕۆ ئەم بینیووە خۆشیو غەمباری ئەوەندە لە یەك نزیك بن!! پرسیارم لە فاطمە کرد دەرباری قسەکانی پێغەمبەری خوداﷺ، لە وەڵامدا وتی: نهێنی پێغەمبەری خوداﷺ نادرکێنم..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی دوایی کرد، دوبارە دەربارەی قسەکانی ئەو ڕۆژە پرسیارم لە فاطمە کردەوە.. ئەویش وەڵامی دامەوەو وتی: جوبرائیلﷺ هەموو ساڵێك جارێك قورئانی پێ دەوردەکردمەوە، بەڵام ئەمساڵ دووجار پێی دەورکردمەوە، وا دەبینم مردنم نزیك بووبێتەوە، تۆش یەکەم کەسی لە کەسە نزیکەکانم، کە پێم دەگەیت.. کاتێك گوێم لەم قسانە بوو، دەستم کرد بە گریان، پاشان فەرمووی: ئایا ڕازی نابیت گەورەی ئافرەتانی بەهەشت، یان گەورەی ئافرەتانی ئیماندار بیت؟! ئەمجارەیان لە خۆشیدا دەستم کرد بە پێکەنین..

دەی دڵنیابە، بە ئەندازەی پاراستنی نهێنییەکانیان، خەڵکی متمانەت پێدەکەنو دەرگاکانی دڵیان بە ڕووتدا والا دەکەنو نهێنییەکانیان، بە خەزێنەی تۆ دەسپێرن، بۆ ئەوەی بە متمانەوە بۆیان بپارێزیتو بۆیان هەڵبگریت..

دەی هەوڵ بدە نهێنییەکانی خۆت مەدرکێنەو نهێنی خەڵکیش بپارێزەو باسیان مەکە..

**وتراوە..**

دەبیت بە دیلو بەندکراوی ئەو کەسانەی

کە نهێنییەکانت لە لا درکاندووە..

# جێبەجێ کردنی پێداویستیەکان..

کاتێك خەریکی خوێندنی ماجستێر بووم، زۆرێك لە پەڕتوکی ڕێچکەو ڕێبازەکانم خوێندەوە، لە ناو ئەو ڕێچکەو ڕێبازانەشدا، ڕێچکەی (البرامجاتي) هەبوو، واتە: ڕێچکەی بەرژەوەندی، یا سودمەندبوون.. کاتێك ئەم ڕێچکەیەم خوێندەوە، ئەوسا زانیم بۆچی لە ئەوروپاو ئەمریکا گوێمان لە هەندێك باس و خواسی وەك ئەوە دەبێت، کە کاتێك کوڕێك لە باوکی جیادەبێتەوەو جێی دەهێڵێت، ئەگەر لە دوای ئەوە لە چێشتخانەیەکدا یەکتر ببینن، هەر کەسەیان پارەی خواردنی خۆی دەدات!!

لەبەر ئەوەی ئەوان بۆچوونیان وایەو دەڵێن: ئەگەر لێت سودمەند نەبین، ئیتر بۆچی خزمەتیشت بکەین؟!

بۆچی سەروەت و سامانی خۆمان لە خزمەتی تۆدا خەرج بکەین؟!

بۆچی کاتی خۆم لە خزمەتی تۆدا بەفیڕۆ بدەم؟! بە بێ ئەوەی هیچ سودێکی مادديت بۆم هەبێت!!

بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم کێشانەو پێوانەیەی هەڵگێڕایەوە، ئەوەتا پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥﴾ البقرة. واتە: (هەمیشە خێرو چاکە ئەنجام بدەن و چاکەخواز بن و (ماڵ و سامانتان لە پێناوی خوادا ببەخشن) چونکە بە ڕاستی خودا ئەو چاکەکارانەی خۆشدەوێت)..

هەروەها پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (ئەگەر بۆ پێداویستیەك لەگەڵ برایەکمدا بڕۆم، هەتا بۆی جێبەجێ دەکەم، لە لام خۆشترو چاکترە لەوەی مانگێك لە مزگەوتەکەمدا خەریکی خوداپەرستی بم).. هەر کەسێك بە دەم پێداویستی برایەکیەوە بچێت، ئەوا خودای پەروەردگار دێت بە دەم پێداویستیەکانیەوەو بۆی جێبەجێ دەکات..

پێغەمبەری خوداﷺ هەمیشە بە دەم پێداویستی موسڵمانانەوە چووە، جاری وا هەبووە پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك بە ڕێگەدا ڕۆیشتووە، ئافرەتێك یان پیرێژنێك

پێی وتووە کارێکم پێت هەیە، پێغەمبەری خوداش ﷺ وەستاوەو گوێی لێگرتووە، جاری واش هەبووە لەگەڵیدا ڕۆیشتووە، بۆ ئەوەی کارەکەی بۆ ئەنجام بدات..

پێغەمبەری خودا ﷺ تێکەڵی خەڵکی دەکردو لە سەر ئازارو نارەحەتیەکانیشیان ئارامی دەگرت.. بە دەروونێکی بەسۆزو بە چاوێکی فرمێسکاویو بە دڵێکی میهرەبانەوە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد.. لەگەڵیاندا خۆی بە جەستەیەك دەزانی.. هەستی بە هەژاری هەژارەکانو غەمی غەمبارەکانو نەخۆشی نەخۆشەکان دەکرد..

ئەوەتا پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆژێك لە مزگەوتەکەیدا دادەنیشێتو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا خەریکی گفتوگۆ دەبێت، لەپڕ دەبینێت وا کۆمەڵە کەسێکی زۆر ڕووتو ڕەجاڵو هەژار لە هۆزی نەجد بەرەو لایان دێن.. ئەو کەسانەش ئەوەندە هەژار بوون، توانای دوورینی جلوبەرگەکانیان نەبوو، بەڵکو لە ناوەڕاستەوە قوماشو پەڕۆکانیان دڕاند بوو، پاشان سەریان پێداکرد بوو، ئینجا ئەملاولای پەڕۆکانیان بە خۆیاندا دابوو، بە بێ ئەوەی هیچیشیان شەرواڵیان لە پێدا بێت، یان جامانەیان لە سەردا بێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك هەژاریو برسێتی بە ڕوخساریانەوە بینی، ڕەنگو ڕووی گۆڕا، پاشان هەستاو چوو بۆ یەکێك لەماڵەکانی، هیچ شتێکی شك نەبرد بە کەڵکی بەخشین بێت، پاشان ماڵ بە ماڵ، هەموو ماڵەکانی گەڕا، بەڵام هیچ شتێکی دەست نەکەوت.. پاشان هاتەوە بۆ مزگەوتو نوێژی نیوەڕۆی ئەنجامداو سەرکەوتە سەر دوانگە، سوپاسو ستایشی خودای کردو چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی خوێندو پاشان فەرمووی: ببەخشن، پێش ئەوەی توانای بەخشینتان نەمێنێت.. هەر کەسێك لە ئێوە با لە دینارەکەی، لە درهەمەکەی، لە گەنمو جۆیەکەی ببەخشێتو هیچ شتێکیش لە بەخشیندا بە کەم مەزانن..

پێغەمبەری خودا ﷺ باسی زۆرێك لە بەخشینەکانی کرد، هەتا فەرمووی: ئەگەر بە لەتێك خورماش بێت..

پیاوێك لە پشتیوانان لە چنگیدا هەندێك شتی هێنا، پێغەمبەری خودا ﷺ بە ڕوویەکی خۆشەوە لێی وەرگرت، لە کاتێکدا، لە سەر دوانگەکەش بوو.. پاشان فەرمووی: هەر کەسێك کارێکی باش بکات، یان کارێکی باش پیشانی خەڵکی بدات، خێرو پاداشتی ئەو کەسەی هەیە کە کارەکە ئەنجام دەداتو پاداشتی ئەنجامدەرەکەش هیچ کەم

ناکات.. هەر کەسیش کارێکی خراپ نیشانی خەڵکی بدات، بە ئەندازەی خراپەکارەکە گوناهی دەگات، بە بێ ئەوەی لە گوناهی ئەنجامدەرەکەش کەم بکات..

خەڵکەکە هەموو بەرەو ماڵەکانیان ڕۆیشتن‌و بە دینارو درهەم‌و خورماو گەنم‌و جۆو جل‌وبەرگەوە گەڕانەوەو دوو کۆمەڵ‌و گردۆڵکەیان کۆکردەوە، گردۆڵکەیەك لە خواردن‌و ئەوی تریان لە جل‌وبەرگ.. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ ئەم هەموو بەخشینەی بینی، ڕوخساری وەکو بەشێك لە مانگ درەوشایەوە، پاشان بە سەریاندا دابەشی کرد.. رواه مسلم..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ بە جێبەجێ کردنی پێداویستیەکانیان، دەچووە دڵی موسڵمانانەوەو لە پێناویاندا چاوپۆشی لە کات‌و سەروەت‌و سامانی خۆی دەکرد..

کەسێك پێویستی بە نەخۆشخانەیە، هەوڵ بدە بیگەیەنە.. کەسێك کێشەیەکی هەیە، لە چارەسەری کێشەکەیدا یارمەتی بدە.. لە کەم کردنەوەی ئازارو نارەحەتیەکانی خەڵکیدا بەشداری بکە، کاتێك دەزانن مەبەستی تۆ لەم کارانە، سوپاس‌و پیاهەڵدان نیە، ئەوا خۆشیان دەوێیت‌و لە پەروەردگار بۆت دەپاڕێنەوەو نزای خێرت بۆ دەکەن‌و ئەوانیش هەمیشە لە ئامادەباشیدا دەبن، بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستیدا، بە دەم کێشەکانتەوە بێن..

أحسن إلى الناس تستعبد قلوبهم فطالما إستعبد الأنسان إحسان..

بەڵێ.. بە چاکەکردن لەگەڵ خەڵیکدا، دڵیان بە دەست دەهێنیت، زۆرجاریش مرۆڤ وەکو بەندەی لێدێت بەرامبەر بەو کەسانەی کە چاکەیان لەگەڵ کردووە..

**تێڕوانین..**

هەر کەسێك بۆ غەیری خۆی بژێت، هیلاكو ماندوو دەبێت، بەڵام بە گەورەیی دەژی‌و بە گەورەییش دەمرێت..



## پەیمانێك، مەدە، كە بۆت جێبەجێ نەكرێت..!!

هاوەڵێکم کەسێکی زۆرباش بوو.. خاوەن ژیری و ڕەوشتێکی جوان بوو.. کەسێکی دیندار بوو.. لە تەنیشت ماڵی خۆیان، پێشنوێژی مزگەوتێك بوو، بەڵام زۆرێك لە خەڵکی باسیان دەکردو سەرزەنشت و گلەییان لێدەکرد.. کاتێك گوێم لەم قسانەی خەڵکی دەبوو، سەرسام دەبووم و هیچ وەڵامێکیشم پێنەبوو بۆیان..

ڕۆژێك دراوسێیەکیان هات بۆ لام و وتی: یا شێخ هاورێکەت، نە پێشنوێژیمان بۆ دەکات و نە لەگەڵیشماندا نوێژ دەکات!! هەندێك پۆزشم بۆ هێنایەوەو وتم: لەوانەیە سەرقاڵی کارێکی گرنگ بێت، یان لە ماڵ نەبێت.. دراوسێکەیان وتی: یاشێخ ئۆتۆمبیلەکەی لەبەر دەرگا ڕاگرتووەو دڵنیام لە ماڵەوەیە، کەچی ئامادەی نوێژی جەماعەت نابێت، لە کاتێکدا پێشنوێژی مزگەوتەکەشمانە!!

بە هەر حاڵ هۆکاری دواکەوتنی هاورێکەم لە مزگەوت دۆزیەوە.. ئەو هاوەڵەم بە هۆی ئەوەی پێشنوێژی مزگەوت بوو، خەڵکی بۆ کێشەو پێداویستیەکانیان ڕوویان لێدەنا..

یەکێك بە هۆی قەرزاریەوە ڕووی تێدەکرد، بەڵکو کەسێك بناسێت، بۆ ئەوەی لە دانەوەی قەرزەکەیدا یارمەتی بدات..

کەسێکی تر ئامادەیی تەواو کردووەو دەیەوێت مامۆستا تکایەکی بۆ بکات، بۆ ئەوەی لە زانکۆ وەربگیرێت..

کەسێك نەخۆشەو دەیەوێت مامۆستا یارمەتی بدات، بۆ ئەوەی سەردانی نەخۆشخانە بکات..

کەسێکی تر چەند کچێکی قەیرەی هەیەو دەیەوێت مامۆستا بە شوویان بدات..

کەسێك کرێچیەو توانای دانی کرێکەی نیە..

ئەمانەو چەندان کەسی تر سەردانیان دەکرد، لە کاتێکدا مامۆستا کەسێکی ئاسایی بوو، خاوەن توانایەکی گەورەش نەبوو.. پەیوەندیەکی پتەویشی لەگەڵ کاربەدەست و دەسەڵاتدارانیشدا نەبوو، بەڵام شەرمی دەکردو دڵی کەسی پێنەدەشکاو هەر کەس دەهات، پەیمانی جێبەجێ کردنی کارەکەی پێدەدا.. بەمیانی دەوت لە دانەوەی قەرزەکەتدا یارمەتیت دەدەم.. ژمارەی تەلەفۆنی ئەوی تریانی وەردەگرت و پەیمانی وەرگرتنی لە

زانكۆ پێدەداو بۆ ئەوانی تریش هەروەها..

خەڵكەكەش لە كاتی خۆیدا دەهاتنەوەو مامۆستاش پۆزش‌و بیانووی دەهێنایەوەو دووبارە پەیمانی پێدەدانەوە، هەتا وای لێهاتبوو، لە دەست خەڵكەكە ڕای دەكردو خۆی لێ دەشاردەوەو وەڵامی تەلەفۆنی نەدەدانەوە، جاری واش هەبوو لە ماڵەوە خۆی دەشاردەوەو نەدەهاتە دەرەوە..

هەندێك جار ئەگەر یەكێك لەو كەسانەی كە پەیمانی پێدابوون، بیبینیایە جنێوی پێدەداو بە سەریدا هاواری دەكردو پێی دەوت: باشە ئەی بۆچی پەیمانت پێدام؟! بۆچی دەستخەڕۆت كردم؟! بۆچی بەتەمات كردم؟!

كەسێكی تر پێی دەوت: وازم لە هەموو كەس هێناو ئەم كارەم تەنها بە تۆ سپارد، بۆچی پەیمانت پێدام؟! كاتێك ئاگاداری حاڵی بووم، زانیم چاڵێكی قوڵی بۆ خۆی هەڵكەندووە.

جارێكیان گوێم لێبوو پۆزشی بۆ یەكێك دەهێنایەوەو دەیوت: بە داخەوە نەمتوانی كارێكت بۆ بكەم.. ئەویش زۆر بە توندی وتی: باشە كە هیچت بۆ ناكرێت، پێشتر ئاگادارت بكردمایەتەوە..

زانایەك دەڵێت: لە سەرەتادا داوای لێبوردن كردن‌و پۆزش هێنانەوە، زۆر باشترو چاكترە لە داوای لێبوردن‌و پۆزش هێنانەوەی كۆتایی.. پێویستە مرۆڤ ئەندازەی تواناكانی خۆی بزانێت، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ...... ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة. واتە: (خودای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ كەسێك مەگەر بە قەدەر توانای خۆی نەبێت)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا...... ﴿٧﴾ ﴾ الطلاق. واتە: (خودا بە گوێرەی دارایی هەر كەسێك داوای بەخشین دەكات).. پێغەمبەری خوداش ﷺ داوامان لێدەكات، خۆمان نەخەینە ژێر كارێكەوە، كە لە توانامان‌دا نەبێت..

لە بیرم دێت ڕۆژێك لە كۆمەڵگەیەكی سەربازی لە ڕیاز وتارێكم پێشكەش كرد، دوای وتارەكەم كەسێك هات بۆ لام‌و وتی: یاشێخ كارێكی گرنگم پێتە..

وتم: فەرموو.. كارەكەت چیە؟! وتی: ئێستا بە گونجاوی نازانم پێتی بڵێم، پێویستە لە كاتێكی تردا بتبینم.. زۆر بە نەرمی گوێم بۆ كابرا گرتبوو، بەڵام ئەو پیاوە بابەتەكەی زۆر گەورە كرد بوو.. منیش ژیان فێری كردبووم، كە زۆرێك لە خەڵكی كێشەو كاروبارەكان لە قەبارەی خۆیان گەورەتر دەكەن..

پاشان پێی وتم: وابزانم سبەینێ لە فڵانە شار وتارت هەیە.. ئەو شارەش ٢٠٠كم لە ڕیازەوە دوور بوو..

وتم: بەڵێ..

وتی: دەی دێم بۆ ئەوێو دوای تەواوبوونی وتارەکە دەتبینم.. سەرسام بووم، لەبەر ئەوەی زۆر سور بوو لە سەر ئەوەی بە تایبەتی بمبینێت!!

بەڵێ.. بۆ ڕۆژی دوایی ڕاستەوخۆ لە دوای پێشکەش کردنی وتارەکەم، پیاوێك بە پەلەو بە پێی پەتی بەرەو ڕووم هات، کاغەزێکی بچوکیشی بە دەستەوە بوو، لە تەنیشتمەوەو شان بە شانم وەستاو منیش وتم: فەرموو.. پێویستیەکەت چیە؟!

وتی: یاشێخ برایەکم هەیە، بڕوانامەی سەرەتایی هەیە، داوات لێدەکەم دایبمەزرێنیت..

وتم: هەر ئەوەندە؟!

وتی: هەر ئەوەندە..

پیاوەکە زۆر سور بوو لە سەر داواکارییەکەیو سۆزو بەزەیی بۆ براکەی، بە ڕوخساریەوە دیار بوو، وا دەردەکەوت براکەی بارودۆخێکی دژواری هەبێت.. دڵنیابووم ئەگەر پەیمانی پێبدەم، لەوانەیە نەتوانم پەیمانەکەم بەرمە سەر، لەبەر ئەوەی ئێستا هەڵگری بڕوانامەی زانکۆش بە ئاسانی دانامەزرێت، نەك خاوەن بڕوانامەی سەرەتایی، منیش شارەزای تواناکانی خۆم بوومو نەمدەتوانی پەیمانێکی پێبدەم، کە نەتوانم بۆی جێبەجێ بکەم..

بە ڕاستی بۆ من ساتێکی زۆر ناخۆش بوو، خۆزگەم دەخواست کارێکم بۆ بکرایەو بمتوانیایە یارمەتیەکی بدەم، بەڵام دەسەڵاتم نەبوو.. ویستم بە شێوازێکی جوان داوای لێبوردنی لێبکەمو پۆزشی بۆ بهێنمەوە، هەر بۆیە پێم وت: براکەم سوێند بە خودا، ئاواتەخوازبووم بمتوانیایە یارمەتیت بدەم.. برای تۆیە، برای منیشە.. منیش وەکو تۆ دڵم بۆی بە ئازارە، بەڵام ناتوانمو کارێکم پێناکرێتو هیوادارم بمبەخشیت..

وتی: یاشێخ هەوڵ بدە.. وتم: ناتوانم..

وتی: باشە، بەڵام ئەم کاغەزەم لێوەرگرە، ژمارەی تەلەفۆنی ئێمەی تێدایە، هەر کاتێك وەزیفەیەکت دۆزیەوە، پەیوەندیمان پێوە بکە.. هەستم کرد دەیەوێت هیوابڕاو نەبێتو بە پەتی پەیمانێکەوە پابەندم بکاتو هەمیشە چاوەڕێی تەلەفۆنی من بێت..

وتم: با کاغەزەکە بە خۆت بێت، تۆ ژمارە تەلەفۆنی من وەربگرەو ئەگەر وەزیفەیەکت دۆزیەوە، پەیوەندیم پێوە بکە، بەڵکو پەیامێکت بۆ بنوسم، بۆ ئەو بەرپرسەی وەزیفەکەی بە دەستە، بەڵکو ڕازی بێتو دایبمەزرێنێت..

پیاوەکە کەمێك بێدەنگ بوو، چاوەڕێ بووم ماڵئاوایيم لێ بکات، بەڵام لەپڕ وتی:

خودا ڕووت سپی بکات!! یاشێخ سوێند بە خودا ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ فلانە بەرپرسدا لەم بارەیەوە قسەم کرد، ناونیشانو ژمارە تەلەفۆنی لێوەرگرتم، بەلام نەگرنگی پێدامو نەپەیوەندیشی پێوەکردم.. جارێکی تر لەم بارەیەوە لەگەڵ فلانە لێپرسراودا قسەم کرد، بەلام تا ئێستاش وەلامی نەداوەمەتەوە.. ئەو کەسانە گرنگی بە هەژاران نادەن.. خودا تۆڵەیان لێ بکاتەوەو دەستی کرد بە دۆعا کردن لەو جۆرە کەسانە..

لە دڵی خۆمدا وتم: سوپاس بۆ خودا، خۆ ئەگەر پەیمانم پێبدایە، یان کاغەزەکەم لێ وەربگرتایە، ئێستا من دەبووم بە سێیەم کەس، لەو کەسانەی کە پەیمانەکەیان بۆ نەبردۆتە سەر..

بەڵێ.. لە سەرەتاوە داوای لێبوردن بکەیت، زۆر باشترە لەوەی متمانەت لە دەست بدەیتو پەیمانەکانت نەبەیتە سەر.. چەند جوانە لەگەڵ یەکدا ڕاستگۆ بینو بە ڕاشکاوی لەگەڵ یەکدا بدوێینو تواناکانی خۆمان بناسینو بزانین چیمان بۆ دەکرێتو چیمان بۆ ناکرێت.. نەك تەنها لەگەڵ خەڵکیدا، بەڵکو لەگەڵ پێویستیە بچوکەکانی هاوسەرو منداڵەکانیشماندا، ئەگەر زانیمان ناتوانین بۆیان جێبەجێ بکەین، پەیمانیان پێنەدەین..

جاری وا هەیە کاتێك لە ماڵ دەردەچیت، هاوسەرەکەت پێت دەڵێت: شیرو شەکرو سەوزەو میوەو.. و.. لەگەڵ خۆتدا بهێنەرەوە..

ئاگاداربە نەڵێی: باشە.. باشە.. کاتێك دەزانی کاتت نیە، یان ناتوانی هەموو ئەو شتانە بکڕیت، بڵێ: ناتوانم..

سەرەتا بڵێی ناتوانم باشترە، لەوەی لە کاتی گەڕانەوەدا بڵێی: کاتم نەبوو.. یان دوکانەکان داخرابوون.. یان بیرم چوو..

هەروەها لەگەڵ هاوڕێو خوشكو براکانیشتدا، بەم شێوەیە هەڵسوکەوت بکەو ئەگەر توانای ئەنجامدانی کارێکت نەبوو، زۆر بە ڕاشکاوی بڵێ: ناتوانم..

**ئەزموون..**

داوای لێبوردن کردنو پۆزش هێنانەوە لە سەرەتادا، چاکترو باشترە لە داوای لێبوردن کردنو پۆزش هێنانەوەی کۆتایی..

## خۆ بە کەم زانین..

جارێکیان لە شوێنێك دانیشتبووم، کە چەند کەسێکی لێبوو.. یەکێك لەو کەسانە، کەسێکی دەوڵەمەند بوو، لە کاتی قسەکردنیدا وتی: کاتێك بە لای کرێکارێکدا ڕۆیشتم، دەستی درێژ کرد بۆ ئەوەی تەوقەم لەگەڵ بکات، دوودڵ بووم لە سەر ئەوەی تەوقەی لەگەڵ بکەم یان نا، پاشان دەستم درێژ کردو تەوقەم لەگەڵ کرد.. پاشان بە لە خۆبایی بوونێکەوە وتی: لەگەڵ ئەوەشدا کە من دەستم بۆ هیچ کەسێك درێژ ناکەم، بۆ ئەوەی تەوقەی لەگەڵ بکەم!!

بڕوانە دەڵێت: دەستم بۆ هیچ کەسێك درێژ ناکەم، بۆ ئەوەی تەوقەی لەگەڵ بکەم!! بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ ئافرەتێکی بەندەی لاواز، لە ناوەڕاستی ڕێگەدا دەیوەستێنێتو سکاڵای ئەوەی لەلا دەکات، کە زۆر کاری پێدەکەنو ماندووی دەکەن، پێغەمبەری خوداشﷺ لەگەڵیدا دەکەوێتە ڕێو تکای بۆ دەکات، بۆ ئەوەی ئازاری نەدەنو کاری زۆری پێنەکەن..

پێغەمبەری خوداﷺ دەربارەی کەسانی خۆبەگەورەزان دەفەرموێت: هەر کەسێك لە دڵیدا ئەندازەیەکی زۆر کەمیش خۆبەگەورەزانین هەبێت، ناچێتە بەهەشت..

چەندین جار گوێمان لێدەبێت خەڵکی دەڵێن: فلانە کەس زۆر لوتی بەرزە.. فلانە کەس تەنها خۆی دەبینێت.. خۆی زۆر بە گەورە دەزانێت.. بە هۆی ئەم ڕەوشتانەشەوە، خەڵکی ڕقیان لێی دەبێتو خۆشیان ناوێت..

جاری وا هەیە بە کەسێك دەڵێیت: بۆچی بە هانای فلانە دراوسێتەوە ناچیتو یارمەتی نادەیت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: فلانەکەس زۆر خۆی بە گەورە دەزانێتو بە هیچ شێوەیەك ڕووی لێمان نیەو خۆی بە هاوشانی ئێمە نازانێت!!

ئاە.. ئەو کەسانە چەندە قێزەونو ناشیرینن، ئەو کەسانەی زۆر بە کەشخەو فیزەوە بە سەر زەویدا دەڕۆن.. ئەو کەسانەی ڕوو لە خەڵکی وەردەگێڕن.. چەندە بێزراون، ئەو کەسانەی بەرامبەر کرێکارو کارگوزارو هەژاران، خۆیان بە گەورە دەزانن..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بە سەربەرزی چووە شاری مەککەوەو پەروەردگار ئازادکردنی شارەکەی پێبەخشی، بە ڕێگەو کوچەو کۆڵانەکانی شارەکەدا دەڕۆی، ئەو ڕێگەو کوچەو کۆڵانانەی کە پڕبوون لە یادگاری تاڵو پڕ ئێشو ئازار، چەندین جار کاتێك لەو ڕێگەو کۆڵانانەوە تێدەپەڕی، پێیان دەوت: شێت.. درۆزن.. جادوگەر، بەڵام ئەمڕۆ وا بە سەربەرزیەوە دەچێتە ئەو شارەوە.. ئەمڕۆ پەروەردگار دەسەڵاتو هێزی بە پێغەمبەرەکەیﷺ بەخشیووەو ئەو کەسانەشی زەلیل کردووە، کە تا دوێنێ ئازاری پێغەمبەرﷺ و هاوەڵەکانیان دەدا..

دەی دەبێت بە چ شێوەیەك بچێتە ناو شاری مەککەوە؟! دەبێ تۆڵەیان لێبکاتەوەو سزایان بدات؟!

نەخێر.. کاری وا لە پێغەمبەری خوداﷺ ناوەشێتەوە، بەڵکو بە شێوەیەك چووە شاری مەککەوە، ئەوەندە سەری پیرۆزی داخستبوو، خەریك بوو ڕیشی بەر پشتی وڵاخەکەی دەکەوت، ئەمەش وەکو دەربڕینی سوپاسگوزاری بۆ خودای پەروەردگار..

عبداللەی کوڕی مەسعودﷺ دەفەرموێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و لە بارەی شتێکەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ کرد، پیاوەکە کاتێك قسەی دەکرد، دەلەرزی، پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرموو: ئارامو لەسەرخۆبە، من کوڕی ژنێکی قورەیشیم، کە گۆشتی وشکەوەکراوەی دەخوارد..

بەڵێ.. خۆ بە کەم زانینو خاکی بوون، وەکو تیشكو ڕووناکی ئەستێرە وایە لە سەر ئاو، بەڵام ئەستێرەکە خۆی هەر بەرزو بڵندە.. خۆ بە گەورە زانینیش وەکو دووکەڵ وایە، ئەگەر بە هۆی هەواشەوە بەرز بێتەوە، بەڵام خۆی هەر لە سەر زەویەو نزمە..

**بە کورتی..**

هەر کەسێك لەبەر خاتری خودا خۆی بە کەم بزانێت، خودای پەروەردگار بەرزی دەکاتەوەو بەڕێزی دەکات..

## خودا پەرستی نهێنیو شاراوە..

دە ساڵێك لەمەوبەرو لە ڕۆژێکی بەهارو شەوێکی سارددا، لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانمدا، لە گەشتێکدا بووین.. یەکێك لە ئۆتۆمبیلەکانمان لەکارکەوتو ناچاربووین لەو شوێنەدا بمێنینەوە.. ئاگرمان کردەوەو بە دەوریدا دانیشتین..

چەند جوانو خۆشە، لە شەوێکی سارددا، لە دەوری ئاگر گوێ بیستی قسەی خۆش بین!! دانیشتنەکەمان درێژەی کێشا.. تێبینی ئەوەم کرد یەکێك لە هاوەڵانمان، کە کەسێکی زۆر چاكو بۆ خودا گونجاو بوو، لە نێوانماندا هەستاو دووركەوتەوە!! ئەو هاوەڵەمان زۆر جار خوداپەرستی بە نهێنی ئەنجام دەدا.. ڕۆژانی هەینی دەمبینی زۆر بە زوویی، دەچوو بۆ مزگەوت، بەڵکو جاری وا هەبوو هێشتا دەرگای مزگەوت نەکرابووەوە، دەچوو بۆ مزگەوت..

بەڵێ.. لە ناوماندا هەستاو هەندێك ئاوی لەگەڵ خۆی برد، گومانم وا بوو دەچێت بۆ ئەوەی دەست بە ئاو بگەیەنێت.. کاتێکی زۆری پێچوو، منیش کەوتمە چاودێری کردنی.. کاتێك بینیم، لێمان دووركەوتبۆوەو لەتاو سەرما پەشتەماڵێکی لە خۆی پێچابوو، سەری خستبووە سەر زەویو لەو تاریکیەداو بە تەنها خەریکی نوێژکردن بوو.. بە ئاشکرا پێوەی دیار بوو، کە پەروەردگاری خۆشدەوێت، وا گومانم دەبرد، پەروەردگاریش ئەوی خۆش بووێت..

دڵنیا بووم، ئەو جۆرە چاکەو خوداپەرستیە نهێنیانە، مایەی سەربەرزی دونیاو دوارۆژە.. چەندین ساڵ تێپەڕی.. ئەمڕۆ ئەو پیاوە بووە بە کەسێکی بانگخوازو خۆشەویستی خەڵکیو هۆکار بووە بۆ ڕێنمایی کردنی چەندین کەس.. کاتێك لە مزگەوت یان لە بازاڕ دەبینرێت، منداڵو بچوکەکان پێش گەورەکان پێشبڕکێ دەکەن، بۆ ئەوەی چاكو چۆنی لەگەڵ بکەن.. زۆرێك لە بازرگانو پیاوە ناودارو دەسەڵاتدارەکان، خۆزگە دەخوازن، وەکو ئەو هاوەڵەمان لە دڵی خەڵکیدا خۆشەویست بن، بەڵام ئەوە زۆر دوورە!!

کەسێك شەونخونی بکاتو کەسێکیش شەوان دەست لە ملانی خەو بێت، ئایا کەسی دووەم دەتوانێت بە کەسی یەکەم بگات؟!

بێگومان نەخێر.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾﴾ مريم. واتە: (بە ڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، لە ئایندەدا خودای میهرەبان سۆزو خۆشەویستیو ڕێزی تایبەتییان بۆ ئامادە دەکات، (هەروەها لە لایەن فریشتەکانو ئیمانداران و نیشتەجێکانی بەهەشتەوە) خۆشەویستو ڕێزدارن)..

بەڵێ.. کاتێك پەروەردگار خۆشی بووێت، خەڵکی سەرزەویش خۆشیان دەوێت.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: پەروەردگار کاتێك کەسێکی خۆش بووێت، بانگی جوبرائیل دەکاتو دەفەرموێت: پەروەردگار بە دڵنیاییەوە من فلانە کەسم خۆش دەوێت، تۆش خۆشت بووێت.. جوبرائیلیش ئەو کەسەی خۆش دەوێتو پاشان بانگی فریشتەکانی ئاسمان دەکاتو دەفەرموێت: پەروەدگار فلانە کەسی خۆش دەوێتو ئێوەش خۆشتان بووێت، فریشتەکانیش هەموویان ئەو کەسەیان خۆشدەوێت، پاشان دانیشتوانی سەر زەویش خۆشیان دەوێت..

بە هەمان شێوە ئەگەر پەروەردگار ڕقی لە کەسێك بێت، بانگی جوبرائیل دەکاتو پێی دەفەرموێت: ڕقم لە فلانە کەسەو تۆش ڕقت لێی بێت، جوبرائیلیش ڕقی لەو کەسە دەبێتو پاشان بانگی فریشتەکانی ئاسمان دەکاتو دەفەرموێت: پەروەردگار ڕقی لە فلانە کەسەو ئێوەش ڕقتان لێی بێت.. فریشتەکانیش هەموو ڕقیان لێی دەبێت، پاشان دانیشتووانی زەویش ڕقیان لێی دەبێت.. رواه البخاري ومسلم..

ئای چەندە خۆشە، کەسێك لە سەر زەوی ژیان بە سەربەرێتو بخەوێتو بخواتو بخواتەوە، پەروەردگاریش لە ئاسمانەوە بە ناوەکەی خۆیەوە بانگی بکاتو بفەرموێت: من فلانە کەسم خۆش دەوێت، ئێوەش خۆشتان بووێت!!

زوبێری کوڕی عەوامﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێك دەتوانێت بە نهێنی کرداری چاك ئەنجام بدات، با بیکات..

کرداری چاکەو پەرستشە نادیارەکانیش جۆراو جۆرن، لەوانە:

★ ئەنجامدانی شەونوێژ، ئەگەر تەنها ڕکاتێکی وەتریش بێت، جا ڕاستەوخۆ لە دوای نوێژی خەوتنان بێت، یان پێش خەوتن، یان پێش نوێژی بەیانی، بۆ ئەوەی لە لای خودای پەروەردگار لە ڕیزی ئەو کەسانەدا ناوت تۆمار بکرێت، کە شەونوێژ ئەنجام دەدەن.. پێغەمبەری خوداشﷺ دەفەرموێت: (إن الله وتر يحب الوتر، فأوتروا ياأهل

القرآن).. واتە: (پەروەردگار تاکەو تاکی خۆش دەوێت، ئەی دۆستانی قورئان نوێژی وەتر ئەنجام بدەن)..

★ هەروەها هەوڵدان بۆ یەکخستنو ئاشت کردنەوەی نێوان خەڵکی.. نەهێشتنی ناکۆکی لە نێوان دراوسێکاندا، هەروەها لە نێوان هاوسەرو خوشكو براکاندا.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (الا اخبركم بأفضل من درجة الصلاة والصيام والصدقة؟ قالوا: بلى.. قال: إصلاح ذات البين). رواه احمد. واتە: (ئایا لە کارێك ئاگادارتان بکەم، کە پلەی لە نوێژو ڕۆژوو خێرو خێرات چاکتر بێت؟ هاوەڵان فەرموویان: بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: یەکخستنو ڕێکخستنی نێوان خەڵکی)..

★ هەروەها زۆر یادی خودا کردن، لەبەر ئەوەی هەموو کەسێك کێی زۆر خۆش بووێت، زۆر باسی دەکات.. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئایا ئاگادارتان بکەم بە باشترینو پاکترینو چاکترینو بەرزترین کردارەکانتان لە لای پەروەردگارو باشتر بێت بۆتان لە بەخشینی زێرو پارە، لەوەش چاکتر بێت، کە بە دوژمنەکانتان بگەنو لە گەردنیان بدەنو ئەوانیش لە گەردنتان بدەن؟ هاوەڵان فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: زیکرو یادی پەروەردگار.. رواه احمد والترمذي..

زۆر یادکردنی پەروەردگار هۆکارێکە بۆ گیرابوونی نزاو پاڕانەوەکان، وەك لەم ڕووداوە ڕاستەقینەیەدا دەردەکەوێت:

ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) جارێك لە جاران ڕێی دەکەوێتە ناوچەیەك، دوای نوێژی خەوتنان، ئیمامی ئەحمەد دەیەوێت لە مزگەوتەکەدا بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی خانەخوێیەکی ناسیاوی نابێتو حەزیش ناکات خۆی بە خەڵکەکە بناسێنێت، لەبەر ئەوەی خەڵکەکەش بە کارگوزاری مزگەوتەکەشەوە نایناسن، هەر بۆیە کارگوزارەکە مزگەوتەکە دادەخاتو ئیمامی ئەحمەد دەکاتە دەرەوە..

ئیمای ئەحمەدیش هەر چۆنێك بێت تا نزیك بەرەبەیان لە کوچەو کۆڵانەکاندا دەیگوزەرێنێت، نزێك بەرەبەیان کابرایەکی نانەواچی دێتو نانەواخانەکەی دەکاتەوە، کاتێك ڕێبوارێك دەبینێت، بە تەنها لە کۆڵاندایە، بانگی دەکاتو پێی دەڵێت: وەرە ژوورەوە کەمێك خۆت گەرم بکەرەوە..

ئیمامی ئەحمەد دەچێتە ژوورەوەو دادەنیشێت، ماوەیەك دەمێنێتەوەو دەبینێت ئەم پیاوە بەردەوام یادی پەروەردگار دەکاتو هەمیشە زمانی دەجوڵێتو خەریکی

وتنی: سبحان اللهو أستغفراللهو الحمدللهو اللهاكبره..

ئیمامی ئەحمەد سەرسام دەبێت، چونکە کەسێکی نەبینیووە ئاوا بەم شێوەیە بەردەوام یادی پەروەردگاری بکات، هەر بۆیە پرسیاری لێدەکاتو پێی دەڵێت: لە کەیەوە بەم شێوەیە ئاوا بەردەوام یادی پەروەردگارت دەکەیت؟!

پیاوەکەش دەڵێت: ماوەیەکی زۆرە ئەوەندەی پێم کرا بێت، زمانی خۆم بە یادی پەروەردگارەوە خەریك کردوە..

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: لە ئەنجامی ئەم کارەتدا چیت بە دەست هێناوەو چ سوودێکت لە ژیانی دونیادا لەم کارەت بینیووە؟!

پیاوەکەش دەڵێت: هەرچیم لە خودای پەروەردگار داوا کردبێت، پێی بەخشیووم، تەنها یەك شت نەبێت!!

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: ئەو شتە چیە؟!

پیاوەکە دەڵێت: داوام لە پەروەردگار کردووە، بە چاوی خۆم ئیمامی ئەحمەد ببینمو بە خزمەتی بگەم.. ئیمامی ئەحمەدیش دەفەرموێت: دەی موژدە بێت من ئیمامی ئەحمەدمو بە قاچەکانی خۆم هاتووم بۆ لات.. سبحان الله!!

* یەکێکی تر لە کارە نهێنییەکان بریتیە لە: چاکەکردنو بەخشین بە نهێنی، چونکە بەخشین بە نهێنی، دەبێتە هۆی کوژاندنەوەی ڕقو تووڕەیی پەروەردگار..

ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه لە دوای ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، دەچوو بۆ دەرەوەی شاری مەدینەو کەمێك دەمایەوەو پاشان دەگەڕایەوە..

ئیمامی عومەر رضي الله عنه لەم کارەی ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه سەری سوڕما بوو، هەر بۆیە ڕۆژێك لە دوای نوێژی بەیانی دەکەوێتە شوێنی، هەتا ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنهی بینی، خۆی بە ڕەشماڵێکی کۆنو ڕزیودا کرد..

ئیمامی عومەر رضي الله عنه لە پەنای گاشە بەردێکدا خۆی حەشاردو پاش کەمێك ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه لە ڕەشماڵەکە هاتە دەرەوەو ڕۆی.. ڕاستەوخۆ ئیمامی عومەر رضي الله عنه خۆی کرد بە ڕەشماڵەکەداو بینی تەنها ئافرەتێکی لاوازی نابینای تێدایە، لەگەڵ چەند کچۆڵەیەکی بچووك.. ئیمامی عومەر رضي الله عنه پرسی: ئەوە کێ بوو هات بۆ لاتان؟! ئافرەتەکەش دەڵێت: نایناسم، بەڵام دەزانم پیاوێکە لە موسڵمانانو ماوەیەکی زۆرە هەموو بەیانیەك سەرمان لێدەدات..

ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی: کە دێت چی دەکات؟! ئافرەتەکە دەڵێت: ماڵەکەمان بۆ گسك دەدات و هەویرمان بۆ دەشێلێت و شیرمان بۆ دەدۆشێت و هەر پێویستیەکی ترمان هەبێت، بۆمان ئەنجام دەدات و پاشان دەڕوات..

ئیمامی عومەر دێتە دەرەوەو ئاهێك هەڵدەکێشێت و لەبەر خۆیەوە دەڵێت: بە ڕاستی ئەی ئەبوبەکر بەم کارانەت جێنیشینەکانی دوای خۆت هیلاك و ماندوو کرد!!

ئیمامی عومەریش ﷺ لەم کارانەدا زۆر دوور نەبوو، لە ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ، ئەوەتا تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: جارێکیان لە تاریکی شەودا ئیمامی عومەرم بینی خۆی کرد بە ماڵێکدا، پاشان هاتە دەرەوەو خۆی کرد بە ماڵێکی تردا.. منیش سەرم سوڕماو لە دەروونی خۆمدا وتم: دەبێت ئیمامی عومەر لەو ماڵەدا چی بکات؟! کاتێك ڕۆژ بووەوە، چووم بۆ ماڵی یەکەمیان.. کاتێك چوومە ژوورەوە، پیرێژنێکی نابینا دانیشتبوو.. وتم: ئەو پیاوەی شەو بۆچی هات بۆ لاتان؟!

پیرەژنەکەش لە وەڵامدا وتی: ماوەیەکی زۆر زۆرە، پەیمانی پێداوم دێت و پێداویستیەکانم بۆ جێبەجێ بکات و پاشان دەڕوات..

تەڵحە کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، بە خۆی دەڵێت: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی تەڵحە، چاودێری عومەر دەکەیت و بە دوای عەیب وعاریدا دەگەڕێیت؟!

شەوێکی تریان ئیمامی عومەر ﷺ دەچێت بۆ دەرەوەی شاری مەدینەو پیاوێکی ڕێبوار دەبینێت، لە نزیك ڕێگەکە ڕەشماڵێکی هەڵداوەو زۆر بە شپرزەیی لە بەردەم دەرگای ڕەشماڵەکە دانیشتووە.. ئیمامی عومەر ﷺ کاتێك ئەم پیاوە بەم شێوە دەبینێت، لێی دەپرسێت و دەڵێت: تۆ کێیت؟! پیاوەکەش دەڵێت: ڕێبوارێکم و هاتووم بۆ لای ئەمیری ئیمانداران بۆ ئەوەی یارمەتیەکم بدات..

ئیمامی عومەر ﷺ لەم کاتەدا، لە ناو ڕەشماڵەکەدا گوێی لە ناڵە ناڵی ئافرەتێك دەبێت، پرسیار دەکات و دەڵێت: ئەوە چیە؟!

پیاوەکە دەڵێت: ڕەحمەتی خودات لێ بێت، بڕۆ بە دەم کارو پێداویستیەوەو وازمان لێ بهێنە..

ئیمامی عومەریش ﷺ دەفەرموێت: ئەمە کاری منەو پێم بڵێ..

پیاوەکە دەڵێت: ئەوە خێزانەکەمەو خەریکە منداڵی دەبێت، کەسێکی لا نیەو هیچ خواردن و خواردنەوەیەکیشمان پێ نیە..

ئیمامی عومەرﷺ زۆر بە پەلە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو خێزانەکەی، کە کچی ئیمامی عەلیەﷺ، لە ڕووداوەکە ئاگادار دەکات.. هەر شتێك پێویست بێت، ئامادەی دەکەن‌و هەردووکیان بەرەو دەرەوەی شاری مەدینەو بەرەو ڕەشماڵی ژن‌و پیاوەکە دەکەونە ڕێ.. کاتێك دەگەنە ڕەشماڵەکە، خێزانەکەی ئیمامی عومەرﷺ دەچێتە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتەکەو ئیمامی عومەریشﷺ لە دەرەوە لەگەڵ پیاوەکەدا خەریکی ئاگرکردنەوەو خواردن دروست کردن دەبێت..

ئیمامی عومەرﷺ کاتێك فووی لە ئاگرەکە دەکرد، دووکەڵ‌و تەپ‌وتۆزی دارو ئاگرەکە تێکەڵ بە ڕیشی پیرۆزی ببوون، پیاوەکەش دانیشتبوو سەیری دەکرد، لەم کاتەدا خێزانەکەی ئیمامی عومەرﷺ هاواری دەکات‌و بە دەنگی بەرز دەڵێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران موژدەی ئەوە بدە بە هاوەڵەکەت، کە کوڕێکیان بوو.. کاتێك پیاوەکە گوێی لە وشەی ئەمیری ئیمانداران دەبێت، دەترسێت‌و دەڵێت: تۆ عومەری کوڕی خەتتابیت؟!

ئەویش فەرمووی: بەڵێ.. پیاوەکە ترساو ویستی دووربکەوێتەوە، بەڵام ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: لە شوێنی خۆت بمێنەوەو دوور مەکەوەرەوە.. پاشان ئیمامی عومەرﷺ مەنجەڵە خواردنەکەی هەڵگرت‌و لە ڕەشماڵەی نزیك کردەوەو بە خێزانەکەی وت: خواردن بدە بەو ئافرەتە.. ئافرەتەکەش لە خواردنەکەی خوارد، پاشان ئیمامی عومەرﷺ خواردنی برد بۆ پیاوەکەو فەرمووی: بخۆ تۆ ماندوویت‌و ئەمشەو نەخەوتوویت..

پاشان ئیمامی عومەرﷺ بانگی خێزانەکەی کرد، بۆ ئەوەی بڕۆن‌و بە پیاوەکەشی فەرموو: سبەینێ وەرە، بۆ لام بۆ ئەوەی شتێکت بۆ بکەین..

ڕەحمەت‌و سۆزو بەزەیی پەروەردگار لە ئیمامی عومەرﷺ بێت.. چەندە خۆ بە کەم زان بوو؟! چۆن بە نهێنی خودای لە خۆی ڕازی دەکرد؟! هەموو ئەم کارانەشی بە مەبەستی ئەوە بوو، خۆشەویستی خودا بە دەست بهێنێت..

عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلیﷺ بە شەوان توورەکە ئاردی بە پشتی هەڵدەگرت‌و دەیبرد بۆ ماڵە هەژارەکان، کاتێك کۆچی دوایی کرد، بینیان پشتی ڕەش بووەتەوەو شین هەڵگەڕاوە.. وتیان: ئەم پشتە، بە پشتی بارهەڵگرو کۆڵ کێش دەچێت، واش نازانین ڕۆژێك کاری بارهەڵگری‌و کۆڵ کێشی کرد بێت!! بەڵام کاتێك نانی سەد ماڵە بێوەژن‌و هەتیوی شاری مەدینە بڕا، ئەوسا زانییان کە ئەمە عەلی کوڕی حوسەین

بووە، شەوانە ئاردی بۆ بردوون و ماڵە هەژارەکانی بە سەر کردۆتەوە!!

پیاو چاکێك بیست ساڵ بە نهێنی ڕۆژ نا ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبوو، بە بێ ئەوەی ماڵی خۆشیان بەم کارەی بزانن.. ئەم پیاوە کاری دوکانداری دەکرد، بەیانیان کاتێك دەڕۆی بۆ سەر کارەکەی خواردنی بەیانی و نیوەڕۆی لەگەڵ خۆی دەبرد، ئەو ڕۆژەی بە ڕۆژوو بووایە، خواردنەکەی دەبەخشی، ئەو ڕۆژەی بە ڕۆژووش نەبوایە خۆی دەیخوارد، ئێوارانیش کاتێك دەگەڕایەوە، لەگەڵ خێزان و منداڵەکانیدا خواردنی ئێوارەی دەخوارد..

بەڵێ.. بە ڕاستی ئەو جۆرە کەسانە هەست بە خۆشەویستی پەروەردگاریان دەکەن و مەبەستیانە ڕەزامەندی خودا بە دەست بهێنن.. ئەو کەسانە، کەسانی ئیماندارو پارێزکارن، ئەو کەسانەن کە پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرموێت:﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا ﴿٣٥﴾ جَزَاءً مِن رَبِّكَ عَطَاءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾﴾ النبأ. واتە: ( بە ڕاستی بۆ خوداناس و پارێزکاران سەرفرازی و خۆشی و شادی و کامەرانی فراوان ئامادەیە* چەندەها باخچەی جوان و جۆری ترێ* (لەو جێگەو ڕێگە خۆشانەدا هاوسەرو هاودەمی) نافرەتانی سینە جوان و (دیمەن جوان) هاوتەمەن ئامادەیە* لەگەڵ کاسەی پڕ لە شەرابی تایبەتیدا* لەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەکی پڕوپووچ و درۆو دەلەسەیەك نابیستن* ئەمەش هەمووی پاداشتێکە (ئەی ئیماندار)، بەخششێکە بە حسابێکی ورد دەبەخشرێت بە بەختەوەران)..

دەی داوای خۆشەویستی پەروەردگارت بکە، یارمەتی ئەم داوایەشت بەوە دەبێت، کە خۆشەویستی خۆت، لە دڵی دروست کراوەکانی پەروەردگارتدا بچێنێت..

**ڕۆشنایی..**

مەبەست ئەوە نیە کە خەڵکی تەنها بە ڕووکەش خۆشیان بووێت، بەڵکو مەبەستی سەرەکی ئەومیە، کە لە ناخیشەوە خۆشیان بووێت..

# کێ لە پشیلەکەیدا..؟!

پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکە بدەیتەوە، گوێ لەم چیرۆکە بگرە..

کەسێك سکرتێری بەڕێوەبەرێکی ڕەوشت خراپو تووڕە دەبێت، بەڕێوەبەرەکە خاوەنی هیچ جۆرە شارەزاییەکی جوان نابێت، بۆ ئەوەی هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا پێبکاتو لە کارەکەشیدا لێهاتووی شارەزاییەکی ئەوتۆی نابێت، هەر بۆیە زۆرێك لە ئەرك‌و کارەکانی لە سەر کەڵەکە ببوو.. ڕۆژێك بە سەر سکرتێرەکەیدا هاوار دەکاتو بانگی دەکات.. سکرتێرەکە ئامادە دەبێتو دەڵێت: فەرموو..

بەڕێوەبەرەکە هاواردەکاتو دەڵێت: پەیوەندیم بە نوسینگەکەتەوە کرد، وەڵامت نەدایەوە.. سکرتێرەکەش دەڵێت: ببورە، لە نوسینگەکەی تەنیشتم بووم..

بەڕێوەبەرەکە بە تووڕەییەوە، هاواری کرد بە سەریداو وتی: هەموو جارێك ببورە.. ببورە.. برۆ ئەم کاغەزانە بەرە بۆ سەرۆکی بەشی چاککردن‌و بە پەلە بیان هێنەرەوە.. سکرتێرەکە ڕۆیشتو کاغەزەکانی برد بۆ سەرۆکی بەشی چاککردن‌و بە تووڕەییەوە وتی: بە پەلە تەواویان بکەو دوایان مەخە..

سەرۆکی بەشی چاککردن هەڵسوکەوتی سکرتێرەکەی بە دڵ نابێت، هەر بۆیە دەڵێت: باشە.. بەڵام بە شێوەیەکی جوان‌و گونجاو کاغەزەکان دابنێ!!

سکرتێرەکەش لە وەڵامدا دەڵێت: گونجاو یان نەگونجاو، گرنگ ئەوەیە زوو تەواویان بکەیت..

بەم شێوەیە قسەیەك لەمو قسەیەك لەو، دەبێت بە دەنگە دەنگیان، پاشان سکرتێرەکە دەگەڕێتەوە بۆ نوسینگەکەی.. دوای دوو کاتژمێر یەکێك لە فەرمانبەرە ئاساییەکانی بەشی چاککردنەوە، دەچێت بۆ لای سەرۆکی بەشەکەیو دەڵێت: مۆڵەتم بدە، بۆ ئەوەی بچم منداڵەکانم لە قوتابخانە بهێنمەوەو پاشان دەگەڕێمەوە.. سەرۆکی بەشی چاککردنەوەش، بە هۆی ئەوەی لەگەڵ سکرتێرەکەدا، تووشی دەمەقاڵێ ببوو، بە سەر فەرمانبەرەکەدا هاوار دەکاتو دەڵێت: تۆ هەموو ڕۆژێك هەر دەڕۆیت!!

فەرمانبەرەکەش دەڵێت: ماوەی دە ساڵە من هەموو ڕۆژێك ئەمە ئیشمەو هەر

ڕۆیشتووم، یەکەمجارو لە سەرەتاوە ڕازی نەبوویتایە..

سەرۆکی بەشەکەش دەڵێت: هیچ شتێك لەگەڵ تۆدا سوودی نیە، چاوسوورکردنەوە نەبێت.. دەی بگەڕێرەوە بۆ نوسینگەکەت..

فەرمانبەرە هەژارەکە دەگەڕێتەوە بۆ نوسینگەکەی‌و لە هەڵسوکەوتی سەرۆکی بەشەکەشی سەرسام دەبێت‌و بەردەوامیش لە پەیوەندی کردندا دەبێت، بۆ ئەوەی کەسێك بدۆزێتەوە، تا منداڵەکانی لە قوتابخانەوە بەرێتەوە بۆماڵەوە.. منداڵەکانیشی کاتێکی زۆر لە بەر گەرماو تیشکی خۆر لە چاوەڕوانی باوکیاندا دەبن، هەتا یەکێك لە مامۆستاکان دەیان گەیەنێتەوە ماڵەوە..

بە هەر حاڵ فەرمانبەرەکە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو زۆریش تووڕە دەبێت.. یەکێك لە منداڵە بچووکەکانی، یارییەکی بە دەستەوە دەبێت‌و بەرەو ڕووی باوکی دێت‌و دەڵێت: باوکە.. مامۆستا ئەم شتەی داپێم لەبەر ئەوەی...

باوکەکە نایەڵێت منداڵەکەی قسەکەی تەواو بکات‌و هاوار دەکات‌و دەڵێت: برۆ بۆ لای دایکت‌و دوورکەوەرەوە، پاڵێکیشی پێوە دەنێت.. منداڵەکە دەست دەکات بە گریان‌و دەڕوات..

کاتێك منداڵەکە دوور دەکەوێتەوە، پشیلە جوانەکەی بەرەو ڕووی دێت‌و خۆی لە قاچی منداڵەکە دەخشێنێ‌و بە دەوریدا دێت‌و دەچێت، منداڵەکەش لە داخا شەقێکی تێهەڵدەدات‌و دەیکێشێت بە دیوارەکەدا..

پرسیارەکە ئەوەیە: کێ شەقی لە پشیلەکەدا؟!

وا گومان دەبەم، بە زەردەخەنەوە بڵێیت: بەڕێوەبەرەکە..

وەڵامەکەت ڕاستە، لەبەر ئەوەی بەڕێوەبەرەکە بوو بە هۆی ئەوەی سکرتێرەکە، پاشان سەرۆکی بەشی چاککردن‌و پاشان فەرمانبەرەکەو پاشان منداڵەکە تووڕە ببن..

بەڕێوەبەرەکە کۆمەڵێك کاری لە سەر خۆی کۆکردبووەوە، هەتا وای لێهات، پیانەدەگەیشت‌و فشاری دەروونی بۆ دروست بوو، پاشان خۆی بۆ کۆنترۆڵ نەکراو بە ڕووی سکرتێرەکەیدا تەقیەوە..

سەیرە!! بۆ فێری ئەوە نەبین کارەکانمان دابەش بکەین؟! بۆ فێری ئەوە نەبین، کاتێك کارێکمان پێناکرێت، زۆر بە ڕاشکاوی بڵێین: ئەوە لە دەستی ئێمەدا نیەو ناتوانین، لەبەر ئەوەی زۆر جار کاریگەری خراپ هەڵسوکەوت کردنمان، زەرەرو زیان بە

خەڵکانێك دەگەیەنن، کە لایەنێك نین لە کێشەکەدا.. ئاگاداریش بەو لە ڕوودا مەمێنەو ناچار مەبە کە پەیمانێك بدەیت و بۆت جێبەجێ نەکرێت..

لەگەڵمدا وەرە بۆ ئەوەی بچین بۆ شاری مەدینەو سەیری پێغەمبەری خودا ﷺ بکەین.. ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ قسەی بۆ موسڵمانان دەکردو باسی ڕۆژی دوایی بۆ دەکردن، پاشان لە ناو وتارەکەیدا دەنگی بەرز کردەوەو فەرمووی: ئەی فاتمەی کچی محمد، داوای هەر شتێکم لێدەکەیت، لە سەروەت و سامانم داوا بکە، بەڵام لە لای پەروەردگار هیچ کارێکم لە دەست نایات، بۆتی بکەم..

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا، دەمەوێت ئەوەت پێ بڵێم: کاتێك توانای جێبەجێ کردنی کارێکت نیەو پەیمانی جێبەجێکردنیش نادەیت بۆ ئەوەی داوای لێبوردن لە کەسی بەرامبەر بکەیت، شێوازێکی نەرم ونیان و جوان بەکاربهێنەو بڵێ: توانای ئەنجامدانی ئەو کارەم نیە کە داوام لێدەکەیت..

بۆ نمونە: کەسێك دێت بۆ لات، بۆ ئەوەی لە دامەزراندنی براکەیدا یارمەتی بدەیت، لەبەر ئەوەی باوکت یان برایەکت، یان خۆت بەرپرسێکی گەورەن، دەشزانی توانای دامەزراندنی براکەیت نیە، هەر بۆیە بە شێوازێکی جوان دەتوانیت پێی بڵێیت: فلانە کەس.. من هەست بە نارەحەتی تۆ دەکەم.. برای تۆیە برای منیشە.. ئەگەر پێنج برام هەبێت، براکەی تۆ شەشەمیانە، بەڵام بڕوا بکە هیچم لە دەست نایەت بۆتی ئەنجام بدەم، زۆر داوای لێبوردن دەکەم و داوای سەرفرازیش بۆ براکەت لە پەروەردگار دەخوازم..

ئاگاداربە ئەم قسانەشی بە ڕوویەکی خۆشەوە پێ بڵێ.. وەڵام دانەوەت بەم شێوازە جوانە، وەکو ئەوە وایە کارەکەت بۆ ئەنجامدا بێت، ئایا وانیە؟!

**تێڕوانین..**

لەگەڵ خۆتو خەڵکیشدا ڕاشکاوو بوێربە.. تواناکانی خۆت بزانەو پەیمانی کارێك مەدە، کە لە تواناتدا نەبێت..

# لە چاڵەکە دەریان بهێنەو ڕزگاریان بکە..!!

ئایا جارێك لە جاران کەسێك لە شوێنێکی گشتیدا، یان لە بەر چاوی خەڵکی، بە وشەو قسەی بریندارکەر سەرەزەنشتیان نەکردوویت؟! یان گاڵتەیان پێنەکردوویت؟! گاڵتە بە جل‌وبەرگت، یان بە شێوازی قسەکردنت، یان بە هەر شتێکی ترت؟!

بە دڵنیاییەوە، لەو کاتەدا ڕەنگی ڕوخسارت گۆڕاوەو نارەحەت بوویت.. کاتێکیش یەکێك لە ئامادەبووان بەرگری لێکردوویت‌و وەڵامی قسەی ئەو کەسانەی داوەتەوە، هەستت بە پشتیوانی‌و پشتگیری کردوە، لەبەر ئەوەی وەکو ئەوە وابووە، کەسانێك پاڵت پێوە بنێن بۆ ئەوەی بتخەنە چاڵێکەوە، بەڵام ئەو کەسە جل‌وبەرگەکانت بگرێت‌و ڕایکێشێت، بۆ ئەوەی نەیەڵێت بکەویتە چاڵەکەوە..

دەی تۆش ئەو شێوازی بەرگری کردنە لەگەڵ کەسانی تردا بەکاربهێنەو تاقی بکەرەوە، بزانە چ شوێنەوارێکی کاریگەر بەجێدەهێڵێت..

کاتێك دەچیت بۆ ماڵێك‌و منداڵێکی ماڵەکە بە سینیەك خواردنەوە بەرەو ڕووت دێت، بەڵام لەبەر پەلەپەل، زۆری نامێنێت سینیە خواردنەکە بخات.. باوکی منداڵەکەش کاتێك پەلە پەلی کوڕەکەی دەبینێت، بە تووڕەییەوە بەرەو ڕووی دەچێت‌و هاواری بە سەردا دەکات‌و دەڵێت: بۆ ئەوەندە پەلە پەل دەکەیت؟! چەند جار فێرم کردیت، وا نەکەیت؟!

منداڵەکە ڕەنگی سور هەڵدەگەڕێت.. تۆش بەرگری لە منداڵەکە دەکەیت‌و دەڵێیت: نا.. نا.. ئەم کوڕە جوانە پاڵەوانە.. پیاوە.. ماشاءالله بە تەنها ئەو هەموو شتەی هەڵگرتووە، بۆیە پەلە پەل دەکات، لەبەر ئەوەی شتانی تریش ماوە بیان هێنێت..

دەزانی لەم کاتەدا منداڵەکە هەست بە چ پشتگیری‌و خۆشیەك دەکات؟! دەزانی چەندێك لە لای بە نرخ دەبیت؟! ئەمە لەگەڵ منداڵێکدا، ئەی ئەگەر بەرگری لە کەسە گەورەو بەتەمەنەکان بکەیت، دەبێت چ هەستێکیان بەرامبەرت بۆ دروست بێت؟!

کاتێك گەنجێك لە ناو کۆمەڵە خەڵکێکدا بە پرسیارێکی نەشیاو شەرمەزار دەکرێت‌و پێی دەوترێت: مژدەمان پێبدە فلانە کەس، لە زانکۆ پلەکەت چی بوو؟

ئایا کەسانی ژیر لە ناو خەڵکیدا ئەم پرسیارە دەکەن؟! گەنجەکەش سور هەڵدەگەڕێت.. تۆش فریای دەکەویت‌و زۆر بە نەرمی دەڵێیت: فلانە کەس بۆچی پرسیاری نمرەکانی

زانکۆ لەو گەنجە دەکەیت؟! ئایا ژنی بۆ دێنیت؟! یان بە تەمای دایبمەزرێنی؟!

بەم قسانە ئامادەبووان هەموو دەخەیتە پێکەنین‌و پرسیارەکەی سەرەتایان بیر دەچێتەوە.. یان کاتێك سەرکۆنەو سەرزەنشتی کەسێك دەکرێت، لە سەر ئەوەی تێکرای نمرەی ساڵانەی نزمە، تۆش دەڵێیت: برام سەرزەنشتی مەکە.. پسپۆڕی بواری خوێندنەکەی قورس‌و گرانەو انشاءالله ساڵی داهاتوو باشتر دەبێت..

بە دەست هێنان‌و ڕاکێشانی دڵی خەڵکی بە لای خۆتدا، هەلێکەو کەسانی زیرەك‌و وریا لە دەستی نادەن‌و ژمارەی دۆست‌و خۆشەویستانی خۆیانی پێ زیاد دەکەن..

عبداللەی کوری مەسعود ﷺ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێدا، سەربکەوێتە سەر دار سیواکێك بۆ ئەوەی پارچە سیواکێکی بۆ لێ بکاتەوە.. عبدالله ﷺ کەسێکی لاوازو سوکەڵە بوو، کاتێك سەرکەوتە سەر دارەکە، شنەبایەك هەڵیکردو جل‌وبەرگەکانی جوڵاندو لاقەکانی دەرکەوتن.. کەسانێکی ئامادەبوو، کە لەوێ بوون، کاتێك لاقی لاوازی عبدالله ﷺ دەبینن، دەست دەکەن بە پێکەنین..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ئەوە بۆچی پێدەکەنن؟! وتیان: بە قاچو لاقە لاوازەکانی عبدالله پێدەکەنین؟!

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: سوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە، قاچەکانی عبدالله لە تەرازوودا لە شاخی ئوحود قورس‌و گرانترن.. رواه أحمد..

کاتێك خەڵکەکە پێکەنین، دەبێت هەستی عبدالله ﷺ چۆن بوو بێت؟! ئەی کاتێك کە پێغەمبەری خودا ﷺ بەرگری کردو هاتە وەڵام، دەبێت هەستی چۆن بوو بێت‌و چەندێك خۆشحاڵ بوو بێت؟!

**تێڕوانین..**

بە دەست هێنانی خۆشەویستی خەڵکی، هەلێکەو کەسانی زیرەکو وریا دەیقۆزنەوەو لە دەستی نادەن..

## گرنگیدان بە ڕووکەش..

ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) ڕۆژێك لە ناو قوتابیەکانیداو لە مزگەوت دانیشتبوو، وانەی پێدەوتن، لەبەر ئەوەی قاچەکانی ئازاری هەبوو، درێژی کردبوون و پاڵی بە دیوارێکیشەوە دابوو.. لەم کاتەدا پیاوێك بە جل‌وبەرگێکی جوانەوە دێتە ژوورەوە..

پیاوەکە جامانەیەکی گەورەو جوانی لە سەردا بوو، جل‌وبەرگەکەی شێوازێکی بە ویقاری پێبەخشی بوو.. قوتابیەکان جێگەیان بۆ کردەوەو لە تەنیشت ئەبوحەنیفەوە دانیشت.. کاتێك ئەبوحەنیفە بەو شێوازە ناوازەیە پیاوەکەی بینی، شەرمی لێکردو سەرەڕای ئازارەکانی، قاچەکانی هێنایەوەیەك و خۆی کۆکردەوەو جوان دانیشت..

ئەبوحەنیفە لە وانە وتنەوەکەی بەردەوام بوو، پیاوەکەش گوێی دەگرت.. کاتێك وانەکە تەواو بوو، قوتابیەکان دەستیان کرد بە پرسیارکردن، پیاوەکەش دەستی بەرزکردەوە، بۆ ئەوەی پرسیارێك بکات، ئەبوحەنیفە فەرمووی: فەرموو پرسیارەکەت چیە؟! پیاوەکەش وتی: یاشێخ کەی کاتی نوێژی ئێوارە دێت؟

ئەبوحەنیفەش فەرمووی: کاتێك خۆرئاوا دەبێت..!!

پیاوەکە دەڵێت: ئەی ئەگەر شەو هات‌و خۆر هەر ئاوا نەبوو، چی بکەین؟!

ئەبوحەنیفە کاتێك گوێی لەم ئەگەرو پرسیارە نەشیاوە دەبێت، دەفەرموێت: ئێستا کاتی ئەوەیە ئەبوحەنیفە قاچەکانی درێژ بکات.. هەر بۆیە وەکو پێش هاتنی پیاوەکە، قاچەکانی درێژ کردەوەو بۆ وەڵامی پرسیارە نەشیاوەکەی کابراش، بێدەنگی هەڵبژارد.. چۆن دەبێت شەو دابێت‌و خۆریش ئاوا نەبێت؟!

وتراوە: بینینی جاری یەکەم لە٧٠٪ی کەسایەتی تۆ لە هزری بەرامبەردا وێنا دەکات.. ئەگەر پێش ئەوەی قسەو هەڵسوکەوتیش بکەیت، لێت ورد ببنەوەو لێت ڕابمێنن، ئەوا لە ٩٥٪ی کەسایەتی تۆ لە هزرو خەیاڵیاندا وێنا دەبێت، پاشان لە دوای قسەکردن‌و تێکەڵ بوون، ئەو ڕێژەیە، یان زیاتر دەبێت، یان کەمتر..

کاتێك بە ڕێڕەوی نەخۆشخانەیەك، یان کۆمپانیایەکدا، شان بە شانی کەسێك دەڕۆیت، کە جلوبەرگێکی جوانی لەبەردا بێتو بە ڕێكوپێکی هەنگاو بنێتو بە ڕێگەدا بڕوات، کاتێك دەگەنە دەرگای چوونە دەرەوەی ڕێڕەوەکە، لەوانەیە بە دەست خۆت نەبێتو وەکو ڕێزێك لەو شکڵو شێوەیەی کە هەیەتی، فەرمووی لێبکەیتو پێش خۆتی بخەیت..

یان کاتێك سواری ئۆتۆمبیلی هاوڕێیەکت دەبیتو دەبینیت ناوەوەی ئۆتۆمبیلەکەی زۆر شپرزو ناڕێكوپێکەو کاسێتەکانی هەموو پرژو بڵاوبوونەتەوە، ڕاستەوخۆ بیرو هزرت بۆ ئەوە دەچێت، کە ئەم هاوڕێیەت کەسێکی شپرزەیەو گرنگی بە ڕێكوپێکیو جوانی ڕێکخستنی کەلوپەلەکانی نادات..

دەمەوێت ئەوە بڵێم: مەبەستمان لە گرنگیدان بە شێوازو ڕوخسارو جلوبەرگ، ئەوە نیە کە زیادەڕەویان تێدا بکەینو لە ئەندازەی خۆیان زیاتر گرنگیان پێبدەین..

پێغەمبەری خوداﷺ زۆر گرنگی بە ڕوخسارو شێوازو جلوبەرگی دەدا.. جلوبەرگی هەبوو، لە ڕۆژانی هەینیو جەژنەکاندا لەبەری دەکرد.. جلوبەرگی هەبوو، لە کاتی هاتنی نوێنەری هۆزەکاندا لەبەری دەکرد.. هەروەها پێغەمبەری خوداﷺ زۆر حەزی بە بۆنی خۆش بووەو هەمیشە گرنگی بە بۆنو شێوازو ڕوخساری خۆی داوە..

ئەنەسرضي الله عنه دەفەرموێت: عەرەقی پێغەمبەری خوداﷺ وەکو گەوهەرو مرواری وابوو.. دەستە پیرۆزەکانیشی لە ئاوریشم نەرمو شل تر بوونو ئەوەندەش بۆنیان خۆش بوو، وەك ئەوە وا بوو، تازە لە ناو توورەکەیەك بۆنی خۆش دەری هێنابن.. کاتێك دەهات بۆ لامانو دەردەکەوت، بە بۆنە خۆشەکەیدا دەمان ناسیەوە..

هەروەها ئەنەسرضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ هەرگیز بۆنی خۆشی ڕەد نەدەکردەوە.. ڕوخساری پیرۆزی پێغەمبەری خوداﷺ وەکو خۆر درەوشاوە بوو.. کاتێك دڵخۆش بووایە، ڕوخساری وەکو مانگی لێدەهات..

جابیری کوری سەمورەرضي الله عنه دەفەرموێت: لە شەوێکی مانگە شەودا، پێغەمبەری خوداﷺ بینی، سەیری پێغەمبەری خوداﷺ و مانگەکەم کرد، پێغەمبەری

خوداﷺ لەبەر چاوم لە مانگەکە جوانترو درەوشاوە تر بوو..

پێغەمبەری خوداﷺ پیاوێك دەبینێت، جلوبەرگێکی شڕو خراپی لەبەردا دەبێتو پێی دەفەرموێت: ماڵو سەروەتو سامانت هەیە؟ پیاوەکە دەڵێت: بەڵێ.. وشترو مانگاو مەڕو ئەسپو بەندەم هەیە..

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: کاتێك پەروەردگار سەروەتو سامانێکت پێدەبەخشێت، با شوێنەواری ئەو نازو نیعمەتو سەروەتو سامانەت پێوە دیار بێت.. هەروەها دەفەرموێت: هە کەسێك خودا نازو نیعمەتێکی پێبەخشی، ئەوا خودای گەورە پێی خۆشە شوێنەواری ئەو نازو نیعمەتە بە بەندەکەیەوە ببینێت..

جابری کوڕی عبداللهﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ سەردانی کردین بۆ ماڵەوە، پیاوێکی سەرو قژ نارێكو ئاڵۆزکاوی بینی، فەرمووی: ئایا شتێکی دەست ناکەوێت سەرو قژی پێ ڕێك بخات؟! هەروەها پیاوێکی تری بینی جلوبەرگەکەی پیسو پۆخڵ بوو، فەرمووی: ئایا ئاوی دەست ناکەوێت، بۆ ئەوەی جلوبەرگەکانی پێ بشوات؟! هەر کەسێك قژی هەیە، با خزمەتی بکات..

پێغەمبەری خوداﷺ سوور بوو لە سەر گرنگیدان بە شێوەو ڕوخساری، هەروەها بە جلوبەرگو بۆنی خۆش، زۆریش ئەم فەرموودەیەی دوبارە دەکردەوەو دەیفەرموو: (إن الله جميل يحب الجمال). رواه مسلم. واتە: (خودای پەروەردگار جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت)..

ئەزموون..

یەکەمین تێڕوانین، لە ٧٠٪ی کەسایەتی تۆ لە هزرو خەیاڵی بەرامبەردا دروست دەکات..

# ڕاستگۆیی..

بیرم دێت ڕۆژێك لە هۆڵی تاقیکردنەوەدا، چاودێری قوتابیەکانم دەکرد، تاقیکردنەوەکەش لە ڕۆژی پێنج شەممەدا بوو، هەر چەندە ڕۆژی پێنج شەممە مۆڵەتو پشوو بوو، بەڵام لە بەر زۆری وانەکان ناچار بووین تاقیکردنەوەی تێدا ئەنجام بدەین.. لە دوای دەست پێکردنی تاقیکردنەوەکە بە چەند خولەکێك، قوتابیەك هات، کە دواکەوتبوو، ئەو هەژارە زۆر شڵەژا بوو، پێم وت: ببورە درەنگ هاتیت، ڕێگەت نادەم تاقیکردنەوە ئەنجام بدەیت.. داوای کرد ڕێگەی بدەم..

وتم: چی دوای خستی؟!

وتی: بڕوا بکە خەوم لێکەوتبوو..

بە ڕاستگۆییەکەی سەرسام بووم، هەر بۆیە وتم: فەرموو..

دوای چەند خولەکێکی تر، قوتابیەکی تر هات.. وتم: چی بووە هۆی ئەوەی دوا بکەویت؟!

وتی: سوێند بە خودا ڕێگە زۆر قەرەباڵغ بوو، خۆت دەزانی بەیانیان خەڵکی دەچن بۆ سەر کارەکانیان، یەکێك بۆ زانکۆ.. یەکێك بۆ کۆمپانیا.. یەکێك بۆ شوێنێکی تر.. زۆرێك قسەی کرد، بۆ ئەوەی پێم بسەلمێنێت کە ڕێگە قەرەباڵغ بووە.. ئەو داماوە بیری چوو بوو، ئەمڕۆ پشووی فەرمیە.. لەوانەیە شەقامەکان تەنها قوتابیەکانی ئێمەی لێبووبن!!

وتم: شەقامەکان قەرەباڵغ بوون ها؟! ئۆتۆمبیلەکانیش زۆر بوون؟!

وتی: بەڵێ.. سوێند بە خودا هەر دەڵێی لەگەڵمدا بووی!!

وتم: ئەگەر درۆ دەکەیت، بزانە چۆن دەیکەیت.. برای خۆم، ئەمڕۆ پێنج شەممەیەو پشووە!! کام شەقام قەرەباڵغ بوو؟!

وتی: ئاه!! بە ڕاستی بیرم چوو پێت بڵێم: یەکێك لە تایەکانی ئۆتۆمبیلەکەم پەنچەر بوو، وەستام بۆ ئەوەی چاکی بکەمەوە!!

داماوە زۆر تێکچوو بوو، پێکەنیمو پاشان ڕێگەمداو چووە ژوورەوە بۆ ئەوەی

تاقیکردنەوەکەی ئەنجام بدات..

ئای چەندە ناشیرینە، کاتێك بۆ خەڵکی ڕوون دەبێتەوە، کە درۆت لەگەڵ کردوون!! درۆ خەڵکیت لێ دەرەوێنێتەوەو باوەڕیان پێت نامێنێتو متمانەت پێناکەن.. وات لێدێت، کە دۆستەکانت کێشەیەکیان بۆ دروست دەبێت، داوای یارمەتیت لێناکەن، هەروەها کاتێك قسە دەکەیت، گوێت لێناگرن.. ئای درۆ چەندە ناشیرینو بێزراوە؟!

پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوداﷺ و وتیان: موسڵمان ترسنۆك دەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ.. وتیان: ئەی چروكو ڕەزیل دەبێت فەرمووی: بەڵێ.. وتیان: ئەی موسڵمان درۆزن دەبێت: فەرمووی: نەخێر.. رواه مالك..

عبداللەی کوڕی عامرؓ دەفەرموێت: ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ لە ماڵمان دانیشتبوو، دایکم بانگی کردمو وتی: وەرە شتێکت بدەمێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: دەتەوێت چی بدەیتێ؟ دایکیشم وتی: خورمای دەدەمێ.. پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەگەر پێت نەدایە، ئەوا درۆیەکت لە سەر دەنوسرا.. رواه أبوداود..

کەسانی درۆزن، زۆر پەیمان دەدەنو ناشی بەنە سەرو پۆزشو بیانووی جۆراو جۆریش دەهێننەوە، بۆ ئەوەی ڕازیت بکەن، زۆر زووش درۆکەیان دەردەکەوێتو ئاشکرا دەبن..

ئیمامی زوهری لە لای کاربەدەستێك شایەدیەك دەدات.. کاربەدەستو دەسەڵاتدارەکەش دەڵێت: درۆ دەکەیت..

ئیمامی زوهری هاوار دەکاتو دەڵێت: پەنا بە خودا.. من درۆ دەکەم؟! سوێند بە خودا ئەگەر بانگدەرێك لە ئاسمانەوە بانگ بکاتو بڵێت: خودا درۆی حەڵاڵ کردووەو ڕێگەیداوە درۆ بکەن، ئینجا درۆ ناکەم، ئەی چۆن درۆ دەکەم لە کاتێکدا کە حەرامو قەدەغەکراو بێت؟!

**ڕاستی..**

هەڵیان خەڵەتاندوویت، کاتێك پێت دەڵێن: درۆی سپی، لەبەر ئەوەی درۆ ڕەنگی ڕەشە..

## ئازایەتی..

کاتێك لە دانیشتن‌و میوانداریەکە، هاتینە دەرەوە، پێی وتم: ناوی ئەو هاوەڵەی پێغەمبەری خودام ﷺ دەزانی، کە لە چیرۆکەکەدا باست کردو ناوەکەیت بیر نەدەکەوتەوە..

وتم: سەیرە!! ئەی بۆ بیرت نەهێنامەوەو پێت نەوتم؟! خۆ تۆ ئاگادار بووی هەمووومان دامابووین‌و بیرمان لە ناوەکەی دەکردەوە؟!

سەری داخست‌و وتی: شەرمم دەکرد قسە بکەم.. لە دڵی خۆمدا وتم: لەناوچوون بۆ ترسنۆکی‌و شەرم..

کەسێکی تر پێی وتم: دوو ڕۆژ پێش ئێستا چوومە پۆلەکەمان‌و بینیم قوتابیەکان‌و مامۆستاکەش بە بێدەنگی دانیشتوون‌و وانەش ناخوێنن، دانیشتم‌و بە قوتابیەکی تەنیشتم وت: ئەوە چی بووە؟! وتی: عەساف هاوەڵمان مردووە.. خودا ڕەحمی پێ بکات..

لە پۆلەکەمان چەند هاوەڵێکی عەساف هەبوون، نوێژیان نەدەکردو تێکەڵ بە چەندان گوناهو حەرامیش ببوون.. کاریگەری مردنی هاوەڵەکەیان، بە تەواوی بە ڕوخساریانەوە دیار بوو.. لە دڵی خۆمدا وتم: ئێستا کاتی خۆیەتی بۆ ئەوەی هەندێك ئامۆژگارییان بکەم‌و هانیان بدەم بۆ ئەوەی نوێژەکانیان ئەنجام بدەن‌و چاکسازی لە خۆیاندا دروست بکەن‌و لەگەڵ باوك‌و دایکیاندا چاك بن..

وتم: زۆر چاکە دەی ئەو کارەت کرد؟! وتی: نەخێر.. شەرمم کرد.. بێدەنگ بووم‌و ڕق‌و تووڕەییم خواردەوەو لە دڵی خۆمدا وتم: لە ناوچوون بۆ ترسنۆکی‌و شەرم..

گەنجێك ناتوانێت کێشەکانی لە لای باوکی باس بکات، لەبەر ئەوەی شەرم دەکات.. لەوانەیە کەسانێك هەبن، بڵێن: شەرم دەکەم، یان ناتوانم بە کەسێکدا هەڵبدەم‌و باسی چاکەکانی بکەم، لەبەر ئەوەی دەترسم پێم بڵێن: ئەو قسانە

بۆ ڕووپامایی دەکات.. زۆرێك لەم قسانەم بیستووەو حەز دەکەم بە سەر هەموو ئەو کەسە ترسنۆكو شەرمنانەدا هاوار بکەمو پێیان بڵێم: ئەی شەرمنو ترسنۆکەکان، هەتا کەی؟!

کەسانی ترسنۆكو شەرمن ناتوانن گۆڕانکاری بکەن، لەبەر ئەوەی وەکو سفری دەستە چەپ وان.. کاتێك لە کۆڕو دانیشتنێکدا دەبن، خۆیان دەشارنەوەو هیچ ڕاو بۆچوونێك دەرنابڕن..

خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی ڕقیان لە کەسانی ترنۆكو شەرمنە، جا ئەو کەسانە برا، یان باوك، یان دایك، یان بەڕێوەبەریان بن..

دەی بە خۆتدا بچۆرەوەو ئازابەو مەترسەو شەرم مەکەو ئامۆژگاریو ڕێنمایی خەڵکی بکە..

**تێڕوانین..**

به خۆتدا بچۆرەوەو پرۆڤە بکە..

سەرکەوتنیش بریتیە لە: ئارام گرتنی تەنها ساتێك..

# خۆڕاگری لە سەر بیرو باوەڕەکان..

هەر چەندێك کەسایەتی کەسێك بەهێز بێتو زیاتر لە سەر بیروباوەڕەکانی جێگیر بێت، ئەوا گرنگی بوونی لە سەر ژیان زیاتر دەبێت.. کاتێك بیرو باوەڕی تۆ بە شێوەیەکە، کە ڕەشوە وەرناگریت، جا بە هەر ناوێك بێت، وەك: بەخشین.. دیاری.. بەردەوام لە سەر ئەو بیرو بۆچوونەت، جێگیر بەو هەرگیز وەری مەگرە..

ئافرەتێك باوەڕی وایە، بە هەر بیانوویەك بێت، درۆ لەگەڵ هاوسەرەکەیدا نەکات، دەی با بەردەوام بێت لە سەر ئەو ڕەوشتە جوانەی.. کەسێك لە پەیوەندی خراپ، خۆی بە دوور دەگرێتو شەرابیش ناخوات، جگەرەش ناکێشێت، کاتێك لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دادەنیشێت، لە سەر نەکردنی ئەو کارانە با سور بێتو بەردەوام بێت.. با هاوەڵەکانیشی ڕەخنەی لێبگرنو بە کەسێکی وشكو دوورە پەرێز ناوی بەرن، بەڵام بە دڵنیاییەوە، لە ناخو دەروونیاندا هەست بەوە دەکەن، بەرامبەر پاڵەوانێك وەستاون.. زۆربەیان لە کاتی نارەحەتیدا، پەنای بۆ دەبەنو لە کێشەکانیاندا، ڕاوێژی پێدەکەنو لە کەسانی تر زیاتر گرنگی پێدەدەن..

ئەم بابەتەش تایبەت نیە تەنها بە پیاوان، یان ئافرەتان، بەڵکو پەیوەندی هەیە بە هەردوو لایانەوەو هەردوولایان پێویستە لە سەر بیرو بۆچوونو هەڵسوکەوتو ڕەوشتە جوانەکانیان جێگیرو دامەزراوبنو هەرگیز سازشی لە سەر نەکەن..

کاتێك ئاینی ئیسلام بڵاوبووەوە، هۆزەکان نوێنەری خۆیان دەناردە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ، یەکێك لەو هۆزانەش، هۆزی سەقیف بوو.. نوێنەرانی هۆزی سەقیف هاتنو چوونە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوداوەﷺو پرسیاریان لە بارەی ڕیباو زیناو عەرەقەوە لە پێغەمبەری خوداﷺ کرد، پێغەمبەری خوداشﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەو شتانە هەموویان حەرامو قەدەغەکراون..

ئەم هۆزی سەقیفە بتێکیان هەبوو، لە دێر زەمانەوەو لە باوو باپیرانیانەوە، بەندایەتیان بۆ دەکردو دەیانپەرست، پاشان پرسیاریان دەربارەی بتەکەیان لە پێغەمبەری خوداﷺ کرد.. پێغەمبەری خوداشﷺ بە بێ دوودڵیو یەکسەر فەرمووی:

بیروخێنن‌و تێکی بشکێنن..

نوێنەرەکانی هۆزی سەقیف ترسیان لێنیشت‌و وتیان: ئەی هاوار!! خۆ ئەگەر بتەکەمان بزانێت، نیازی ڕووخاندنیت هەیە، ئەوا هەموو هۆزەکەت لەناودەبات‌و دەیان کوژێت!!

ئیمامی عومەر‌ئامادەی ئەم وتووێژە دەبێت‌و سەرسام دەبێت لەوەی کە ئەمانە لە بتەکەیان دەترسن، هەر بۆیە فەرمووی: ئەی هۆزی سەقیف: ئێوە چەندە نەزان‌و نەفامن!! ئەو بتە بریتیە لە بەردو دارو هیچ سودو زیانێکیشی نیە!! نوێنەرەکانی هۆزی سقیف تورە دەبن‌و دەڵێن: ئەی عومەر ئێمە بۆ لای تۆ نەهاتووین.. ئیتر ئیمامی عومەر بێدەنگ دەبێت..

پاشان وتیان: بە مەرجێك بۆ ماوەی سێ ساڵ واز لە بتەکەمان بهێنیت، پاشان بیروخێنە.. پێغەمبەری خودا‌ﷺ بینی ئەم کەسانە دەیانەوێت لە بیرو باوەڕەکەیدا، سازشکاری لەگەڵ بکەن، لە کاتێکدا بیرو باوەڕو یەکتاپەرستی گرنگترین بنەمای باوەڕی موسڵمانەو یەکتاپەرستیش سەرەتاو بناغەی بنەڕەتی ئاینی ئیسلامە، دەی ئەوان مادام دەیانەوێت موسڵمان بن‌و باوەڕ بهێنن، ئیتر چ پێویستیەکیان بەو بتە بێ گیان‌و بێ دەسەلاتە هەیە؟!

هەر بۆیە فەرمووی: نەخێر.. وتیان: دەی دوو ساڵ وازی لێ بهێنەو پاشان بیروخێنە..

پێغەمبەری خودا‌ﷺ فەرمووی: نەخێر.. وتیان: دەی بۆ ساڵێك، پاشان وتیان بۆ تەنها مانگێك وازی لێ بهێنەو پاشان بیروخێنە..

پێغەمبەری خودا‌ﷺ فەرمووی: نەخێر.. ئیتر نوێنەرەکانی سەقیف تێگەیشتن، ئەم بابەتە، بابەتی باوەڕهێنانەو شایەنی سازشکاری تێداکردن نیە، هەر بۆیە وتیان: دەی خۆتان بیروخێنن، ئێمە هەرگیز کاری وا ناکەین..

پێغەمبەری خودا‌ﷺ فەرمووی: دەی باشە چەند کەسێکتان لەگەڵ دەنێرم، تا بیروخێنن..

پاشان وتیان: نامانەوێت نوێژ بکەین، لەبەر ئەوەی خۆیان بە گەورە دەزانی، حەزیان نەدەکرد، سەریان بخەنە سەر زەوی‌و دوایانەوە بەرزتر بێت لە سەریان..

پێغەمبەری خودا‌ﷺ فەرمووی: لێتان دەبوورم، کە بە دەستی خۆتان بتەکانتان

نەشکێنن، بەڵام خێرو چاکە لە ئاینێکدا نیە، کە نوێژی تێدا نەبێت.. ئەوانیش وتیان: باشە.. نوێژ دەکەین، هەر چەندە مایەی نەنگیشە بۆمان..

نوێنەرەکان ڕۆیشتنەوەو بانگی خەڵکەکەیان کرد، بۆ ئەوەی موسڵمان بن.. پاشان پێغەمبەری خوداﷺ چەند هاوەڵێکی نارد، بۆ ئەوەی بتەکەیان بشکێنن، خالیدی کوڕی وەلیدﷺو موغیرەی کوڕی شوعبەشﷺ، لە ناو ئەو هاوەڵانەدا بوون.. هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوداﷺ بەرەو بتەکە چوون، هۆزی سەقیفیش ترسیان لێ نیشتوو، گومانیشیان وابوو، ناتوانن بتەکەیان بڕوخێنن‌و پارێزگاری‌و بەرگری لە خۆی دەکات..

موغیرەی کوڕی شوعبەﷺ، تەورێکی بە دەستەوە گرت‌و ڕووی کردە هاوەڵانی‌و فەرمووی: سوێند بە خودا دەبێت بتانخەمە پێکەنین، پاشان بەرەو بتەکە چوو، تەورێکی لە بتەکەداو پاشان خۆی خست بە سەر زەویەکەداو قاچەکانی خستە لەرزە لەرزو جوڵە جوڵ.. هۆزی سەقیف کاتێك ئەمەیان بینی، کەوتنە هاوار هاوارو دەیان وت: بتەکە موغیرەی کوشت.. پاشان ڕوویان کردە هاوەڵەکانی ترو وتیان: دەی کێ لە ئێوە دەیەوێت با نزیکی بتەکەمان بکەوێت..

ئا لەم کاتەدا موغیرەﷺ بە پێکەنینەوە هەستایەوەو وتی: ئەی هۆزی سەقیف، ئەم کارەم بۆ گاڵتەو پێکەنین کرد، ئەم بتە بەردو دارە، دەی ڕوو بکەنە خودای پەروەردگارو تەنها ئەو بپەرستن‌و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن.. پاشان کەوتە ڕووخاندنی بتەکەو خەڵکەکەش لەگەڵیدا، هەتا پارچە پارچەیان کردو تەختی زەویەکە بوو..

**نیگا..**

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێك بیەوێت بە تووڕە بوونی خودای گەورە، ڕەزامەندی خەڵکی بە دەست بهێنێت، ئەوا خودای گەورەو خەڵکیش لێی تووڕە دەبن.. هەر کەسێکیش داوای ڕەزامەندی پەروەردگار بکاتو بیەوێت بە تووڕە بوونی خەڵکی ڕەزامەندی پەروەردگار بە دەست بهێنێت، ئەوا خودای گەورەو خەڵکیش لێی ڕازی دەبن..



## فریودەرەکان..

بابەتێکم خوێندەوە کە تیایدا نوسرابوو: گەنجێکی موسڵمان لە بەریتانیا، بانگەوازی کۆمپانیایەك دەبینێت، سەبارەت بەوەی پێویستیان بە چەند کارمەندێك هەیە بۆ ئیشکگرتن..

گەنجە موسڵمانەکە دەچێت بۆ چاوپێکەوتن‌و کۆمەڵێکی زۆر گەنج‌و لاو دەبینێت، کە بۆ هەمان مەبەست هاتبوون.. کەسەکان یەکە یەکەو بە شوێن یەکدا، دەچوونە ژوورەوە بە مەبەستی چاوپێکەوتن.. هەر کەسێك لە چاوپێکەوتنەکە تەواو دەبوو، پاشان دەهاتە دەرەوەو لێیان دەپرسی: چیان لێ پرسیت؟! ئەی چیت وەڵامدانەوە؟!

گرنگترین پرسیار کە لیژنەی چاوپێکەوتن‌و تاقیکردنەوە دەیکرد، بریتی بوو لەم پرسیارە: ڕۆژانە چەند پەرداخ عەرەق دەخۆیتەوە؟

سەرە هاتە سەر گەنجە موسڵمانەکەو چووە ژوورەوەو پرسیار لە دوای پرسیار وەڵامی دانەوە، هەتا گەیشتە ئەو پرسیارەی: ڕۆژانە چەند پەرداخ عەرەق دەخۆیتەوە؟

گەنجەکە دوودڵ دەبێت‌و نازانێت درۆ بکات‌و وەکو ئەوانەی تر بڵێت: ڕۆژی ئەوەندە پەرداخ عەرەق دەخۆم، بۆ ئەوەی پێی نەڵێن: تۆ موسڵمانێکی توندڕەویت، یان بە ڕاستی وەڵام بداتەوەو بڵێت: من موسڵمانم‌و لە لای ئێمە عەرەق حەرام‌و قەدەغەکراوەو بە هیچ شێوەیەك عەرەق ناخۆمەوە!!

دوای بیرکردنەوەیەکی خێرا، بڕیار دەدات بە ڕاستی وەڵام بداتەوە، هەر بۆیە دەڵێت: من عەرەق ناخۆمەوە..

ئەوانیش دەڵێن: بۆچی، نەخۆشیت؟! گەنجەکە دەڵێت: نەخێر.. بەڵکو من موسڵمانم‌و عەرەق لە لای ئێمە حەرامە.. ئەوانیش دەڵێن: تەنانەت لە پشووی کۆتای هەفتەشدا هەر ناخۆیتەوە؟! گەنجەکەش دەڵێت: نەخێر.. بە هیچ شێوەیەك ناخۆمەوە..

بە سەرسامیەوە سەیری یەکتر دەکەن‌و زۆر لە لایان سەیر دەبێت!! کاتێك ئەنجامی چاوپێکەوتنەکە دەردەچێت، ناوی گەنجەکە لە ناوەکانی پێشەوەی وەرگیراوەکان دەبێت.. گەنجەکە دادەمەزرێت‌و دوای چەند مانگێك یەکێك لە بەرپرسەکانی کۆمپانیاکە دەبینێت‌و پێی دەڵێت: بۆچی پرسیاری عەرەقتان لە هەمووان کردو زۆر دوبارەتان دەکردەوە؟!

بەرپرسەکەش دەڵێت: لەبەر ئەوەی کارەکەی ئێمە سەبارەت بە ئێشکگرتن بوو، هەر گەنجێکمان دادەمەزراند، عەرەق خۆر بوو، دوای ئەوەی سەرخۆش دەبوو، شوێنەکەی جێدەهێشت و دزیمان لێدەکراو زەرەرمان لێدەکەوت.. کاتێك تۆمان بینیو زانیمان کە عەرەق ناخۆیت، دامانمەزراندیو ئەو کەسەمان دەستکەوت کە بە دوایدا دەگەڕاین..

ئای چەند جوانە مرۆڤ خاوەنی بیرو باوەڕێکی دامەزراو بێت و لە پێناو خۆشیەکانی دونیادا، دەستی لێ هەڵنەگرێت و جێگیرو خۆڕاگر بێت.. کێشەی ئێمە ئەوەیە، لە کۆمەڵگەیەکدا دەژین، کەسانێکی کەم پابەندن بە بیرو بۆچوونەکانیانەوە.. کەمن ئەو کەسانەی لە پێناوی بنەماو بیرو باوەڕیاندا، دەژینو دەمرن..

کاتێك بە بیرو باوەڕتەوە پابەند دەبیت و بە ڕێگەی ڕاست و دروستدا هەنگاو هەڵدەنێی، خاوەن بیرو بۆچوونە پڕوپووچەکان وازت لێناهێنن و دەبێت چاوەڕێی فڕوفێڵ و پیلانەکانیان بیت!! کاتێك بەرتیل وەرناگریت، هاوکارە بەرتیل خۆرەکانت لێت تورە دەبن.. کاتێك داوێن پیسیو زینا ئەنجام نادەیت، خراپەکارانو بێرەوشتان تورە دەبن..

دەگێڕنەوە ئیمامی عومەر‌ رضي الله عنه شەوێك لە شەوان بە شاردا دەگەڕاو چاودێری ژیان و ئاسایشی خەڵکی دەکرد، لە تاریکی شەودا بە لای ماڵێکدا دەڕوات، گوێی لە دەنگی پێکەنین و گاڵتەوگەپێکی زۆر دەبێت، وەك ئەوەی دەنگی چەند کەسێکی سەرخۆشی تێدا بێت.. دەیەوێت لە دەرگاکەیان بدات، بەڵام دەترسێت گومانەکەی هەڵە بێت، هەربۆیە لە دەرگا نادات، بەڵکو پارچەیەك خەڵوز هەڵدەگرێت و بە نیشانەیەك دەرگای ماڵەکە نیشان دەکات و دەڕوات..

خاوەن ماڵەکە گوێی لە دەنگی دەرگاکەیان دەبێت، دێتە دەرەوەو نیشانەیەك لە سەر دەرگاکەیان دەبینێت، کاتێك لە دوورەوە پشتی ئیمامی عومەریش رضي الله عنه دەبینێت، لە ڕووداوەکە تێدەگات و دەزانێت ئەو نیشانەیەی سەر دەرگاکەیان، کاری ئیمامی عومەرە..

پیاوەکە پێویست بوو، نیشانەی سەر دەرگاکەیان بسڕێتەوە، بەڵام وای نەکرد، بەڵکو پارچە خەڵوزێك هەڵدەگرێت و هەمان نیشانە لە دەرگای دراوسێکانی دەدات و ماڵەکەی خۆی لە ناویاندا ون دەکات!! وەکو ئەوەی بیەوێت هەموو دەروودراوسێکانی بهێنێتە ئاستی خۆیو وەکو خۆی ناشرینیان بکات و سەرخۆش بن!!

بەڵێ.. نەیویست ئاستی خۆی بەرز بکاتەوە بۆ ئاستی دراوسێکانی، بەڵکو ویستی ئەوان بهێنێتە ئاستی خۆی..

بە دڵنیاییەوە کەسی زیناکەر، حەز دەکات هەموو کەس زینا کارو داوێن پیس

بن.. کاتێك ئافرەتێك دەبینێت بەردەوام درۆ لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەکات، کەسێکیش ئامۆژگاری دەکات، بۆ ئەوەی واز لەو کارە ناشیرینە بهێنێت، کەچی لە باتی ئەوەی بە گوێی بکات، حەز دەکاتو هەوڵیش دەدات بۆ ئەوەی ئەویش وەك خۆی ماڵ وێران بکاتو دەڵێت: پیاوان هەر ئاوا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەیت باشە.. ئیش و کارەکان بە درۆکردن نەبێت ناڕوات..

بەڕێوەبەری فەرمانگەیەك کاتێك ڕاستگۆیە لەگەڵ فەرمانبەرەکانیداو خاوەن هەڵسوکەوتێکی جوانەو دڵی ئاسودەیەو بەختەوەرە لە ژیانیدا، کاتێك بەڕێوەبەرێکی خراپ دەبینێت، لە باتی ئەمیش وەك و ئەو خۆی چاك بکات، کەچی پێی دەڵێت: وامەکەو وابکە.. ڕووی خۆش مەدە بە کارمەندەکانت.. دەم بە خەندە مەبە..

دوکاندارێکی جگەرەفرۆش کاتێك دوکاندارێکی هاورێی دەبینێت، جگەرە نافرۆشێت، حەز دەکات ئەویش وەك ئەم بێتو پێی دەڵێت: بۆ ئەوەی قازانج زیاتر بکەیت، بۆچی جگەرەش نافرۆشیت؟!

دەی پاڵەوان بەو لە سەر بیرو باوەڕە جوانەکانت دامەزراوو خۆڕاگربەو بە هەموو هێزێکەوە بڵێ: نەخێر.. هەرگیز ناتوانن هەڵمخەڵەتێنن.. هەر لە کۆنیشەوە بێباوەڕان زۆر هەوڵیان دەدا، پێغەمبەری خوداﷺ لە بیرو باوەڕەکەیدا سازشکاری بکات.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ ﴾ القلم. واتە: (تۆ هەرگیز بە قسەی ئەوانە مەکە، کە باوەڕیان بە تۆ نیەو بەرنامەکەت بە درۆ دەزانن* ئەوانە ئاواتە خوازن کە تۆ نەرمی بنوێنیت، ئینجا ئەوانیش نەرمی بنوێنن)..

دەی ئاگادارو وریابەو هەرگیز واز لە بیرو باوەڕە جوانەکانت نەهێنیتو وریابە هەڵتنەخەڵەتێنن..

**پرۆگرام..**

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ ﴾ القلم.

# لێبوردن و لێخۆشبوون لە خەڵکی..

ژیان خاڵی نیە، لە هەندێك ناخۆشی و نارەحەتی، کە لە لایەن خەڵکیەوە تووشمان دەبێت.. کەسانێك هەن گاڵتەوگەپی زۆر بێزارکەر دەکەن.. کەسانێك هەن قسەو گوفتاریان زۆر رەق و زبرە.. کەسانێك هەن، بەردەوام بوون لەگەڵیاندا، کارێکی ئاسان نیە.. کەسانێك هەن رووداوەکان گەورە دەکەن و بە هیچ شێوەیەك لێبوردن و لێخۆشبوون لە بەرنامەیاندا نیە، بەمەش دەروونی خۆیان ئازار دەدەن و بۆ ماوەیەکی زۆر سنگیان بە هۆی رق و کینەوە تەسك و غەمبار دەکەن..

ولله در الحسد ما أعدله بدأ بصاحبه فقتله..

بەڵێ.. رق و کینەو ئیرەیی بردن، سەرەتا لە کەسەکە خۆیەوە دەست پێدەکات و خۆی لەناودەبات.. دەی لە ئێستاوە هەوڵبدە ئازاری دەروونی خۆتی مەدە، لەبەر ئەوەی هەندێك کێشە هەن، پێویست ناکات کەسیان لە سەر سزا بدەین، گەورەو دڵ فراوان بە.. رابوردوو لە بیربەرەوەو بە خۆشی و بەختەوەری بژی..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ مەککەی پیرۆزی رزگار کرد، بانگی عوسمانی کوری تەڵحەی کردو داوای کلیلی کەعبەی لێکرد.. پێغەمبەری خودا ﷺ چووە ژوورەوە بۆ ناو کەعبەو بینی بێباوەڕانی قورەیش بە نەزانی خۆیان وێنەی فریشتەکانیان لە سەر دیوارەکانی کەعبە کێشا بوو، هەروەها وێنەی ئیبراهیم ﷺ یان کێشا بوو، زاری پێبوو، قوماری دەکرد!!

پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك ئەمەی بینی، فەرمووی: خودا بیان کوژێت، باوکە ئیبراهیم لە کوێ و ئەم کارە لە کوێ؟! ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ آل عمران. واتە: (ئاشکرایە کە ئیبراهیم نە جولەکە بووەو نە گاور، بەڵکو ملکەچ و فەرمانبەردارو موسڵمان بووەو لە دەستەی موشریك و هاوەڵگەران نەبووە)..

پاشان بڕیاریدا بە سڕینەوەی هەموو ئەو وێنانە، پاشان پەیکەری کۆترێکی بینی لە نێوان دوو چڵە داردا، بە دەستی خۆی شکاندی و فڕێیدا.. پاشان لەبەر دەرگای کەعبە وەستاو خەڵکەکەش هەموو بە بێباوەڕو باوەڕدارەوە، سەیریان دەکردو چاوەڕێی پێغەمبەری خودا ﷺ بوون.. پاشان دوو ڕکات نوێژی ئەنجامدا، پاشان چوو بۆ لای ئاوی زەمزەم و لێی خواردەوەو دەستنوێژی لێگرت، موسڵمانانیش بۆ دەستکەوتنی پاشماوەی ئاوی دەستنوێژەکەی

پێشبڕکێیان دەکرد، بێباوەڕان کاتێك ئەمەیان لە موسڵمانان بینی، سەرسام بوونو دەیان وت: هەرگیز هیچ پادشاو دەسەڵاتدارێکمان نەبینیوە، بەم شێوەیەی بۆ بکرێت!!

پاشان چوو بۆ لای مەقامی ئیبراهیم ﷺ و کەمێك هێنایە دواوە، لەبەر ئەوەی بە کەعبەوە نوسا بوو، پاشان لە دەرگای کەعبە وەستاو سەیری خەڵکەکەی دەکردو وتاری بۆدان، خۆزگە ئێمەش لە ناویاندا بووینایە..

پێغەمبەری خوداﷺ لە وتارەکەیدا فەرمووی: لا إله إلا الله وحده لاشريك له.. صدق وعده.. وهزم الأحزاب وحده..

بەڵێ.. پەروەردگار پەیمانەکەی بردە سەرو بەندەکەی خۆی سەرخستو هەموو تاقمو کۆمەڵی بێباوەڕانی تێك شکاند..

پاشان سەیری گەورەکانی قورەیشی کردو فەرمووی: خەڵکی هەموو لە ئادەمن، ئادەمیش لە خۆڵ دروست بووە، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات. واتە: (ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێرو مێیەك دروست کردووە (کە باوکە ئادەمو دایکە حەوایە)و کردوومانن بە چەندەها گەلو تیرەو هۆزی جۆر بە جۆر، تا یەکتر بناسنو پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە.. بە ڕاستی بەڕێزترینتان لای خودا ئەو کەسانەتانە کەزۆرتر لە خودا ترسەو فەرمانبەری خودایە، بێگومان خودا زاناو ئاگایە بە هەمووان)..

پاشان لە ڕوخساری بێباوەڕان ورد بووەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوداﷺ لەوپەڕی هێزو دەسەڵاتدا بوو، ئەوانیش لەو پەڕی بێهێزیو لاوازیدا بوون..

ئەو کەسانەی ڕۆژانێك بە درۆزن ناویان برد بوو.. ئازاریان دابوو.. لە کاتێکدا پێغەمبەری خوداﷺ خەریکی نوێژکردن بوو، ناوسکی ئاژەڵیان کرد بوو بە سەریدا!! ئەوەتا ئێستا بە زەلیلی لە بەردەمیدا وەستاونو نازانن چارەنووسیان بە چی دەگات..

پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکانی قورەیش، گومان دەبەن چیتان لەگەڵ بکەم؟

هەموو ڕاپەڕینو وتیان: خێرو چاکەمان لەگەڵ دەکەیت.. تۆ براو برازایەکی بەڕێزی ئێمەی، هەروەها کوڕێکی بەڕێزیشمانی..

سەیرە!! ئایا بیریان چوو، چیان بەو برا بەڕێزەی خۆیان کرد.. ئەی هەر ئەوان نەبوون، بەو برا بەڕێزەی خۆیان دەوت: شێت.. جادوگەر.. درۆزن.. ئەی ئەگەر برای بەڕێزو کوڕی برای بەڕێزتانە، بۆچی دژایەتیان دەکرد؟! بۆ موسڵمانە لاوازو بێهێزەکانتان ئازار دەدا؟! ئەوە بیلالە وەستاوەو تا ئێستاش شوێنەواری سزادانی ئێوە بە سەر پشتیەوە دیارە..

ئەوە عەممارە وەستاوەو لە ژێر ئەو دارخورمایەدا، زۆر دڕندانە باوك و دایكیتان شەهید كرد، كەچی ئێستا دەڵێن: تۆ برای بەڕێزی ئێمەی!!

ئەی هەر ئێوە نەبوون پێغەمبەری خوداﷺ و موسڵمانانتان بۆ ماوەی سێ ساڵ لە شیوی بەنی عامردا، گەمارۆو بەند كرد، هەتا وایان لێهات لە برساندا گەڵای داریان دەخوارد!! بەزەییتان بە گریانی منداڵەكانیاندا نەهاتەوە!! ناڵە ناڵی پیرو بە تەمەنەكان سۆزیان نەجوڵاندن!! بەزەییتان بە ئافرەتانی نەخۆش و دووگیاندا نەهاتەوە!!

ئەی شەری بەدرو ئوحودو خەندەقتان بیرچۆتەوە؟! هەر ئێوە نەبوون ڕێگەتان لە پێغەمبەری خوداﷺ گرت و نەتان هێشت بێتە شاری مەككە، بۆ ئەوەی عومرە ئەنجام بدات؟! ئێوە نەبوون لە سەرەمەرگدا، ڕێگەتان لە موسڵمان بوونی مامەی پێغەمبەری خوداﷺ گرت و هانتان دەدا، بۆ ئەوەی لە سەر بتپەرستی بەردەوام بێت و باوەڕ نەهێنێت؟! ئەی ئێوە نەبوون..؟! ئێوە نەبوون..؟!

چەندان یادەوەری ترش و تاڵ، بە بیرەوەری پێغەمبەری خواداﷺ هاتن و چوون.. تەنها پێغەمبەری خوداﷺ نا، بەڵكو ئەو یادەوەریانە بە یادی ئیمامی ئەبوبەكرو ئیمامی عومەرو بیلال و عەممارو زۆرێك لە هاوەڵاندا دەهات و دەچوو.. هەر یەكێك لە هاوەڵان چیرۆك و ڕووداوی دڵتەزێنی لەگەڵ قورەیشدا هەبوو..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ دەیتوانی قورسترین سزای بێباوەڕانی قورەیش بدات، لەبەر ئەوەی ئەوانە بێباوەڕانی جەنگ بوون، هەروەها دەست درێژیكەر بوون، خیانەتكاریش بوون، لەبەر ئەوەی خیانەتیان لە ڕێكەوتنی حودەیبیە كرد.. لەبەر ئەوەی زۆر تاوانكارو خراپ بوون، نەیاندەزانی پێغەمبەری خوداﷺ چیان لێدەكات.. پێغەمبەری خوداﷺ بە ورەیەكی بەرزو سەرێكی بڵندەوە، وتەیەكی دا بە گوێیاندا، كە هەتا هەتایە مێژوو شانازی پێوە دەكات..

بەڵێ.. فەرمووی: بڕۆن ئێوە هەموو ئازادن..

بێباوەڕان لە خۆشیدا خەریك بوو باڵ بگرن و باوەڕیان نەدەكرد، ئاوا بە ئاسانی لێیان خۆش بێت!! ئایا بە ڕاستی لێمان خۆش بوو؟!

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ سەیری كەعبەی پیرۆزی كرد، سێ سەدو شەست بتی تێدا بوو، هەر بۆیە بە دەستی پیرۆزی خۆی، كەوتە شكاندنی بتەكان و دەیفەرموو: حەق و ڕاستی هاتن و ئاینی پڕوپووچ، پشتی هەڵكردو هەڵهات..

هەندێك لەو بێباوەڕانەی كە مێژوویەكی ڕەشیان لەگەڵ موسڵماناندا هەبوو، پێش

ئەوەی موسڵمانان بێنە شاری مەککە، هەڵهاتن‌و ڕایان کرد، سەفوانی کوڕی ئومەییەش یەکێك بوو لە ڕاکردووان‌و نەیدەزانی بۆ کوێ بچێت؟! سەفوان بەرەو جەددە کەوتە ڕێ، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی دەریاوە، بەرەو یەمەن بچێت..

کاتێك خەڵکەکە لێبوردنی پێغەمبەری خودایانﷺ بە چاوی خۆیان بینی، حەزیان دەکرد ڕاکردووەکانیش بگەڕێنەوە، هەر بۆیە عومەیری کوڕی وەهب، دێت‌و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سەفوانی کوڕی ئومەییە، گەورەی هۆزەکەیەتی‌و لە دەستی تۆ ڕایکردووە، هاتووم مۆڵەتی لێخۆشبوونی بۆ وەربگرم، بۆ ئەوەی پەنای بدەی..

پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر بە سادەیی فەرمووی: ئەوا لێی خۆشبووم‌و پەنامدا.. عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ نیشانەیەك، یان شتێکم بدەرێ، بۆ ئەوەی باوەڕم پێبکات..

پێغەمبەری خوداشﷺ ئەو مێزەرەی سەر پێدا، کە لە کاتی هاتنە ناو شاری مەککەدا لە سەری کرد بوو..

عومەیر کەوتە ڕێ‌و گەیشت بە سەفوان، لە کاتێکدا خەریك بوو سواری کەشتی دەبوو، عومەیر پێی دەڵێت: باوك‌و دایکم بە قوربانت بن، بۆ خاتری خودا خۆت بە هیلاك مەبەو خۆت مەفەوتێنە، ئەو نیشانەیەم بۆ هێناوی کە باوەڕم پێبکەیت، پێغەمبەری خوداﷺ پەنای داویت‌و لێت خۆشبووە..

سەفوانیش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: قسەم لەگەڵ مەکە، چونکە تۆ درۆزنی.. عومەیریش هاوار دەکات‌و دەڵێت: سەفوان، پێغەمبەری خوداﷺ باشترین‌و نەرم‌و نیان ترین کەسە.. خۆ ئەو خزمی خۆتە.. سەرکەوتنی ئەو، سەرکەوتنی تۆیە، ڕێزو دەسەڵاتی ئەو، ڕێزو دەسەڵاتی تۆیە..

سەفوان دەڵێت: لە خۆم دەترسم.. عومەیریش دەڵێت: ئەو پێغەمبەرەﷺ زۆر لەوە نەرم‌و نیان‌و بە بەزەیی ترە، کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە.. سەفوان ڕازی دەبێت‌و بەیەکەوە دەگەڕێنەوە، هەتا دەگەنە مەککەو عومەیر، سەفوان دەبات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ.. کاتێك دەگەنە ئەوێ، سەفوان دەڵێت: عومەیر وای پیشان دەدات، کە پەنات داوم‌و لێم خۆش بوویت؟

پێغەمبەری خوداشﷺ دەفەرموێت: ڕاست دەکات.. سەفوان دەڵێت: بەڵام بۆ موسڵمان بوونم، دوو مانگ مۆڵەتم پێبدە، لە سەر بت پەرستیەکەی خۆم بمێنمەوەو بیر بکەمەوە، موسڵمان بم، یان نا..

پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: چوار مانگ بۆ تۆ.. پاشان سەفوان موسڵمان

دەبێت و باوەڕ دەهێنێت..

ئای لێخۆش بوون و لێبوردن لە خەڵکی و لە بیربردنەوەی ڕابوردوو چەندە بەرز و جوانە.. ئەم ڕەوشتەش ڕەوشتی مرۆڤە گەورەکانە.. بە هەر حاڵ ژیانی دونیا زۆر کورتە.. زۆر لەوە کورتترە، کە جوانیەکانی بە ڕق و کینە، ناشیرین بکەین..

پێغەمبەری خوداﷺ لە ئیش و کارە تایبەتیەکانیشدا، هەمیشە نەرم و نیان بووە.. میقدادی کوڕی ئەسوەدﷺ دەفەرموێت: من و دوو هاوەڵم چووین بۆ شاری مەدینە، جگەلە پێغەمبەری خوداﷺ کەس میوانداری نەکردین.. پێغەمبەری خوداﷺ بردمانی بۆ ماڵێك لە ماڵەکانی، کە چوار بزنی لێبوو، پاشان فەرمووی: میقداد بزنەکان بدۆشە و بیکە بە چوار بەشەوە و هەر بەشەی بۆ کەسێکتان..

میقدادﷺ دەفەرموێت: هەموو ئێوارەیەك بزنەکانم دەدۆشی و سێ بەشیمان دەخوارد و بەشێکیشمان بۆ پێغەمبەری خوداﷺ هەڵدەگرت، لە کاتی گەڕانەوەیدا دەیخوارد..

شەوێکیان میقدادﷺ وەکو شەوانی تر، بزنەکان دەدۆشێت و دەیکات بە چوار بەشەوە، خۆیی و دوو هاوەڵەکەی سێ بەشەکەی خۆیان دەخۆن و بەشێکیشی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ هەڵدەگرێت.. پێغەمبەری خوداﷺ لە گەڕانەوەیدا دوا دەکەوێت.. میقدادیشﷺ لە سەر جێگەکەی پاڵ دەکەوێت و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: لەوانەیە پێغەمبەری خوداﷺ لە میوانی بێت، بەشە شیرەکەی بخۆم باشە.. هەڵدەستێت شیرەکە دەخوات و هیچ بۆ پێغەمبەری خوداﷺ ناهێڵێتەوە..

میقدادﷺ دەفەرموێت: کاتێك شیرەکەم خواردەوە، سکم کەوتە جوڵە جوڵ و قۆڕە قۆڕ و لەو کارەی کردم، پەشیمان بوومەوە و لە دڵی خۆمدا وتم: ئێستا پێغەمبەری خوداﷺ بە برسێتی دێتەوە و هیچ نابێت بیخوات و دۆعام لێدەکات، هەر بۆیە لە خەفەتدا سەرم داپۆشی..

کاتێك بەشێك لە شەو تێپەڕی، پێغەمبەری خوداﷺ هاتەوە و سڵاوی کرد، سڵاوێك کە کەسێکی بەخەبەر گوێی لێبێت و خەوتوو بەخەبەر نەهێنێت.. میقداد لە سەر جێگەکەیەوە و لە ژێرەوە سەیری پێغەمبەری خودایﷺ دەکرد، کاتێك بەرەو قاپی شیرەکە ڕۆیشت و بینی هیچی تێدا نیە، سەری پیرۆزی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە.. میقدادﷺ ترساو وتی: ئا ئێستا دۆعام لێدەکات، هەر بۆیە بە وردی گوێی ڕاگرت، بۆ ئەوەی بزانێت پێغەمبەری خوداﷺ چی دەڵێت: پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: خودایە خواردن و خواردنەوە بدەیت بە کەسێك، کە خواردن و خواردنەوەم دەداتێ..

کاتێك میقدادﷺ گوێی لەم دۆعایە دەبێت، حەز دەکات پیرۆزی دۆعاکە بە دەست

بهێنێت، هەر بۆیە چەقۆیەك هەڵدەگرێت، بۆ ئەوەی بزنێکیان سەرببڕێت‌و خواردنی پێغەمبەری خودای ﷺ لێ دروست بکات.. کاتێك دەستی لە بزنەکان دەدا، بۆ ئەوەی بزانێت کامیان قەڵەوە، دەستی بەر گوانی یەکێکیان دەکەوێت‌و دەبینێت پڕە لە شیر، دەست لە گوانی یەکێکی تریان دەدات، ئەویش پڕ دەبێت لە شیر، هەر چواریان تاقی دەکاتەوە، گوانی هەموویان پڕ دەبێت لە شیر..

هەر چواریانی دۆشی، هەتا قاپەکەی پڕ کردو کەف کرد، پاشان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بخۆرەوە..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو هەموو شیرەی بینی، فەرمووی: میقداد ئەی ئەمشەو ئێوە شیرەکەتان نەخواردەوە؟! میقدادیش فەرمووی: بخۆرەوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: میقداد هەواڵ چیەو چی ڕوویداوە؟ میقدادیش فەرمووی: بخۆرەوە دوایی بۆت باس دەکەم.. کاتێك میقداد ﷺ زانی پێغەمبەری خودا ﷺ تێری شیر خواردەوەو پیرۆزی دۆعاکەشی بەرکەوت، لە خۆشیدا دەستی کرد بە پێکەنین‌و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك شەو درەنگ هاتیتەوە، منیش برسیم بوو، لە دڵی خۆمدا وتم: لەوانەیە پێغەمبەری خودا ﷺ نانی خوارد بێت‌و میوان بوو بێت، هەر بۆیە بەشەکەی تۆشم خواردو پاشان هەموو ڕووداوەکەی گێڕایەوە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ سەرسام بوو بەوەی، چۆن ئاوا زوو گوانی بزنەکان پڕ لە شیر بوونەوە!! چۆن لە شەوێکدا بزنەکان دووجار دەدۆشرێن؟! پاشان فەرمووی: ئەمە تەنها لە سۆزو بەزەیی پەروەردگارەوەیە، ئەی بۆچی ئاگادارت نەکردم‌و پێشتر پێت نەوتم، بۆ ئەوەی دوو هاوەڵەکەشت لێیان بخواردایەو توشی ئەو دۆعاو پاڕانەوە خێرەش ببوونایە..

میقدادیش ﷺ فەرمووی: سوێند بەو خودایەی تۆی بە ڕاستی ڕەوانە کردووە، مادام من‌و تۆ توشی ئەو دۆعا خێرە بووین، ئیتر کێ توشی ئەو خێرە دەبێت، یان نا، بە لامەوە گرنگ نیە..

**تێڕوانین..**

ژیان بریتیە: لە وەرگرتن‌و بەخشین.. دەی هەوڵبدە بەخشینت زیاتر بێت لە وەرگرتن..



## بەخشندەیی..

چ دەردێك وەكو ڕژدیو چروكی، ناشیرینو خراپە؟! ئای چەندە ناشیرینە؟!

كەسانی ڕژدو چروك، دەستیان تێناچێت، میوانداری هەندێك لە هاوڵاتیان بكەن، بۆ ئەوەی خۆشەویستییان بە دەست بهێنن.. دیارییەك پێشكەش بە كەسێك ناكەن.. زۆر جار گرنگی بە شێوەو ڕوخساری خۆشیان نادەن.. خۆیان بۆنخۆش ناكەنو ماڵو سامانەكەیان لە خزمەتی خۆیاندا بەكارناهێنن..

بەڵام كەسی بەخشندە، هەمیشە لە خۆشەویستانی نزیكەو ئەگەر كەموكوڕییەكیان هەبێت، حەز دەكات زوو بچێت بە دەمیانەوەو بە بەخشینەكانی دڵی دۆستو خۆشەویستانی خۆش دەكات..

بەكورتی: ئەوەندە چاكەو بەخشینی زۆرە، خەڵكی وەكو بەندە لێكردووەو دڵو دەروونی هەموویانی بۆ لای خۆی ڕاكێشاوە..

ئەوەی زۆر گرنگە لە كاتی بەخشیندا هەبێت، بریتیە لە: بوونی نیەتی پاكو چاك، بۆ ئەوەی بە كارە چاكەكانت، هەروەها بە بەخشینەكانت، ڕەزامەندی پەروەردگار بە دەست بهێنیتو مەبەستت بە دەست هێنانی ناوبانگو پلەوپایە نەبێت..

سوفیان دەفەرموێت: چووم بۆ شاری مەدینەو پیاوێكم بینی، خەڵكی لە دەوری كۆبببوونەوە.. وتم: ئەوە كێیە؟!

وتیان: ئەبوهورەیرەیە رضي الله عنه.. ئەوەندە لێی نزیك بوومەوە، هەتا چوومە بەردەمیو قسەی بۆ خەڵكی دەكرد، كاتێك قسەكانی تەواو كردو خەڵكەكە بڵاوەیان كرد، وتم: سوێندت دەدەم بە پەروەردگار، فەرموودەیەكم بۆ بگێڕەوە، ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەری خوداتﷺ بیستبێت..

ئەبوهورەیرەش رضي الله عنه فەرمووی: فەرموودەیەكت بۆ دەگێڕمەوە كە لە پێغەمبەری خودامﷺ بیستووە.. پاشان بورایەوەو پاش كەمێك هۆشی هاتەوەو فەرمووی: فەرمودەیەكت بۆ دەگێڕمەوە، كە لە پێغەمبەری خودامﷺ بیستووەو بە تەنها لەو

ماڵەدا بووم، لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ و کەسمان لەگەڵ نەبوو..

پاشان دووبارە بورایەوەو پاش کەمێك هۆشی هاتەوەو دەستێکی بە ڕوخساریدا هێنا.. جارێکی تریش ویستی فەرموودەکە بگێڕێتەوە، بورایەوە، ئەمجارەشیان هۆشی هاتەوەو فەرمووی: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: خودای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا، دادەبەزێت بۆ لای بەندەکانی، بۆ ئەوەی دادبینییان لە نێواندا بکات، لە کاتێکدا هەموو کۆمەڵو خەڵکانێك دەبینێ، بە چۆکدا کەوتوون..

یەکەم کەسێك بانگ دەکرێت، بۆ ئەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت، پیاوێکی خاوەن شارەزایی زانستو زانیارییە لە قورئاندا، پەروەردگار دەفەرموێت: ئایا فێری ئەو پەڕاوەم نەکردی، کە بۆ پێغەمبەرەکەم دابەزاند؟

پیاوەکەش دەڵێت: بەڵێ.. ئەی پەروەردگارم..

پەروەردگاریش دەفەرموێت: دەی بەوەی فێرم کردی، چیت کردو چیت پێ ئەنجامدا؟

پیاوەکە دەڵێت: شەوو ڕۆژ دەمخوێندەوەو کارم پێدەکرد..

پەروەردگار پێی دەفەرموێت: درۆت کرد.. فریشتەکانیش هەموو دەڵێن: درۆت کرد.. پەروەردگار دەفەرموێت: ویستت پێت بڵێن: فلانە کەس قورئان خوێنی چاکە.. لە دونیادا پاداشتی خۆت وەرگرتو خەڵکی پیایاندا هەڵدایتو وتیان: فلانە کەس قورئانخوێنی چاکە..

پاشان کەسێك بانگ دەکەن، کە خاوەن سەروەتو سامانێکی زۆر بووەو پەروەردگار پێی دەفەرموێت: ئایا ئەوەندەم سەروەتو سامان نەدایتێ، کە پێویستت بە کەس نەبێت؟

پیاوەکەش دەڵێت: بەڵێ.. ئەی پەروەردگار..

پەروەردگاریش دەفەرموێت: دەی بەوەی پێم بەخشیت، چیت کردو چیت ئەنجامدا؟ پیاوەکە دەڵێت: پەیوەندەی خزمایەتیم پێ جێبەجێ کردو دەمبەخشی..

پەروەردگار دەفەرموێت: درۆت کرد.. فریشتەکانیش هەموو دەڵێن: درۆت کرد.. پەروەردگار پێی دەفەرموێت: بەڵکو ویستت پێت بڵێن: فلانە کەس بەخشندەیە..

لە دونیاشدا ئەوەت پێوترا کە دەتویست..

پاشان پیاوێك دەهێنن کە لە پێناوی خوادا کوژراوەو پەروەردگار پێی دەفەرموێت: لە پێناوی چیدا کوژرایت؟ پیاوەکەش دەڵێت: فەرمانت بە غەزاو تێکۆشانداو منیش کوشتارم کرد، هەتا کوژرام..

پەروەردگاریش دەفەرموێت: درۆت کرد.. فریشتەکانیش هەموو دەفەرموون: درۆت کرد.. پەروەردگار دەفەرموێت: بەڵکو ویستت پێت بڵێن: فلانە کەس ئازایە، لە دونیادا ئەوەشت پێ وترا کە دەتویست..

ئەبوهورەیرە ﷺ فەرموی: پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ بە ئەژنۆی داکێشامو فەرمووی: ئەی ئەبوهورەیرە، ئەو سێ کەسە، یەکەمین کەسانێکن کە لە ڕۆژی دواییدا ئاگری دۆزەخیان پێدەکرێتەوە.. رواه الترمذي..

ئەگەر لە کاتی بەخشیندا، نیەتت چاكو پاك بوو، ئەوا إنشاءالله کارەکانت مایەی ڕەزامەندی پەروەردگارت دەبن.. ئەو کەسانەش کە پێویستە لە پێش خەڵکانی ترەوە، چاکەیان لەگەڵ بکەیت، بریتین لە: کەسوکارەکانت.. دایکت.. باوکت.. هاوسەرەکەت.. مێردەکەت.. پاشان کەسە نزیکەکانی ترت.. هەروەها ئەو کەسانەی کە حەقی بژێویان لە سەر تۆیە، چونکە ئەوەندە بەسە کە مرۆڤ بە خراپ بناسرێت، ئەو کەسانە لە دەست بداتو پێویستیەکانیان بۆ جێبەجێ نەکات، کە مافی بژێویان لە سەریەتی..

پێویستە جیاوازی لە نێوان بەخشندەیی‌و دەست بڵاویدا بکەین: پیاوێك بە کۆڵانو شەقامێکی کۆندا دەڕواتو خانوویەکی خراپو دارزاو دەبینێت، کچۆڵەیەکی بچوکی جل‌وبەرگی شڕو دڕاویش، لە لا شانی دەرگای خانووەکەدا دانیشتبوو.. پیاوەکە پرسیاری لێدەکاتو دەڵێت: تۆ کێیت؟

کچۆڵەکەش دەڵێت: من کچی حاتەمی طائیم.. پیاوەکە دەڵێت: سەیرە!! کچی ئەو پیاوە بەخشندەیەو بەم شێوەیە؟!

کچۆڵەکەش دەڵێت: ئاخر بەخشندەیی باوکم بوو، حاڵی بەم حاڵە گەیاندین!! پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الإسراء. واتە: (نەکەیت ئەوەندە دەست نوقاو بیت وەك

ئەوەی کە دەستی بە کۆتو زنجیر بە گەردنیدا هەڵواسرا بێت، هەروەها ئەوەندەش دەست بڵاو مەبە لەوەو دوا بکەویتە بەردەم لۆمەو سەرزەنشتی ئەمو ئەوو هیچت بە دەستەوە نەمێنێتو بە هەناسە ساردیو نائومێدی بۆی دانیشیت)..

کەسی بەخشندە سوپاسکراوە، بەڵام کەسی ڕژدو چروك بێزراوە، هەر بۆیە پەروەردگار داوامان لێدەکات بە تەواوی دەست بڵاوو دەستکراوە نەبینو بە تەواویش دەست نوقاو نەبین، بەڵکو لەو نێوەندەدا بین.. دەی هەوڵبدە دەست بە ناوەڕاستی دارەکەوە بگرە، نەك ئەمسەرو ئەوسەری..

پێغەمبەری خوداشﷺ وەك لەم نمونەیەدا دەردەکەوێت بەخشندەترین مرۆڤ بووە، ئەوەتا ئەبوهوریرەﷺ دەفەرموێت: ئەبوهورەیرەﷺ دەفەرموێت: سوێند بە خودای پەروەردگار، ئەوەندەم برسی بوو خەریك بوو بکەومە سەر زەویو لە برساندا بەردم بە سکمەوە بەستبوو..

ڕۆژێك لە سەر ڕێگەیەك دانیشتم، کە خەڵکی لێوەی تێدەپەڕین، وەك ڕێگەی بەر دەرگای مزگەوت.. ئەبوبەکرﷺ بە لامدا تێپەڕیو پرسیاری ئایەتێکی قورئانم لێکرد، تەنها لە برسا پرسیارم لێکرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بمباتەوە بۆماڵی خۆیان، بەڵام لەگەڵ خۆی نەیبردم..

پاشان عومەرﷺ بە لامدا تێپەڕیو پرسیارێکم لەویش کرد، ئەویش لێم تێنەگەیشتو وەڵامی پرسیارەکەی دامەوەو لەگەڵ خۆی نەیبردم..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ بە لامدا تێپەڕیو کاتێك بینیمی زەردەخەنەیەکی بۆ کردمو زانی چی لە ڕوخسارو دەروونمدا هەیەو پێی فەرمووم: ئەبوهورەیرە لەگەڵم وەرە.. شوێنی کەوتمو مۆڵەتی وەرگرتو چووینە ژوورەوە.. پەرداخێك شیری لێبوو.. فەرمووی: ئەم شیرە لە کوێوە هاتووە؟!

وتیان: فلانە کەس بە دیاری بۆی ناردووی..

فەرمووی: ئەبوهورەیرە بچۆ بانگی (أهل الصفة) بکە ، کە کۆمەڵێك ئیماندار هەژار بوون.. چونکە ئەو موسڵمانە هەژارانە میوانی موسڵمانانن‌و کەس‌وکارو ماڵیان نیە.. هەر کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ خێرێکی بۆ بهاتایە، ئەوا دەینارد بۆ ئەو موسڵمانە هەژارانە، هەروەها ئەگەر دیاریەکیشی بۆ بهاتایە، دەینارد بە

شوێنیانداو بەشی دەدان..

ئەبوهورەیرەش رضي الله عنه لەبەر ئەوەی زۆری برسی بوو، بانگ کردنی ئەو هەموو موسڵمانەی زۆر پێخۆش نەبوو، چونکە خۆی بە خاوەن مافو برسی تر دەزانی لەوان، بەڵام فەرمانی پێغەمبەری ئازیزە ﷺ و دەبێت جێبەجێی بکات..

بە هەر حاڵ دەفەرموێت: چووم‌و بانگم کردن، هاتن‌و چوونە ژوورەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و پێغەمبەری خوداش ﷺ پێی فەرمووم: ئەبوهورەیرە شیرەکە بگرەو بەشیان بدە.. پەرداخە شیرەکەم لە دەستی پیرۆزی وەرگرت‌و یەك یەك دەمدا بەو موسڵمانانە، هەتا تێریان خوارد.. بەم شێوەیە هەموویان تێریان خواردو پەرداخەکەم گەڕاندەوە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ .. پێغەمبەری خودا ﷺ بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کردم‌و فەرمووی: ئەبوهورەیرە تەنها من‌و تۆ ماوین..

وتم: بەڵێ.. ئەی پێغەمبەری خودا..

فەرمووی: دانیشەو بخۆرەوە..

ئەبوهورەیرە رضي الله عنه دەفەرموێت: منیش دانیشتم‌و دەستم کرد بە خواردنەوەی شیرەکە..

پێغەمبەری خودا ﷺ بەردەوام دەیفەرموو: بخۆ.. هەتا وتم: سوێند بەو خودایەی تۆی بە ڕاست ناردووە، هیچی ترم بۆ ناخورێ‌و شوێنم نەماوە تێی بکەم!! پاشان فەرمووی: بیدە بە من.. پەرداخەکەم دایە دەستی‌و سوپاسی خودای کردو پاشان ناوی خودای هێناو پاشماوەی شیرەکەی خوارد.. رواه البخاري..

بەخشین نهێنی زۆر گەورەی تێدایە، جاری وا هەیە، مەرج نیە ڕاستەوخۆ بە کەسێك ببەخشیت‌و ڕێزی لێبگریت، بەڵکو دەتوانیت بەو کەسانە ببەخشیت، کە ئەو کەسە خۆشی دەوێن، ئەوسا تۆش لە لای ئەو خۆشەویست‌و بەڕێز دەبیت..

ڕۆژێك یەکێك لە هاوەڵانم کیسەیەکی هێنا، هەندێك شیرینی‌و یاری منداڵانی تێدابوو، گومانم وابوو، هەمووی بایی چەند ڕیاڵێك بێت.. هاوەڵەکەم کیسەیەکەی پێدام‌و وتی: ئەمە بۆ منداڵەکانت.. منداڵەکانم زۆر پێی دڵخۆش بوون، هەروەها منیش دڵخۆش بووم، لەبەر ئەوەی هەستم کرد، ئەو هاوەڵەم پێی خۆشە منداڵەکانم دڵخۆش بن..

یەکێك لە پیاوچاکانی پێشوو، کەسێکی زانا بوو، بەڵام هەژار بوو.. قوتابیەکانی جار جار دیاریو خواردنیان بۆ دەبرد.. کاتێك قوتابیەك دیارییەکی بۆ مامۆستاکە دەبرد، مامۆستاکەش هەتا دیارییەکە تەواو دەبوو، زۆر ڕێزی ئەو قوتابیەی دەگرت، بەڵام کاتێك دیارییەکە تەواو دەبوو، دەگەڕایەوە بۆ حاڵەتی ئاسایی خۆی..

یەکێك لە قوتابیەکان بیر لەوە دەکاتەوە، دیارییەك بۆ مامۆستا بەرێت، کە نرخەکەی گونجاو بێتو ماوەیەکی زۆریش بمێنێتەوەو تەواو نەبێت، بۆ ئەو مەبەستەش کیسەیەك خوێی بە دیاری بۆ دەبات، چونکە خوێ نرخەکەی هەرزانەو زۆریش لە ماڵدا دەمێنێتەوە، لەوانەیە کیسەیەك بەشی ساڵێك بکات..

ئەگەر ڕاوێژ بە من بکەیت، بۆ ئەوەی کاتژمێرێك، یان شوشەیەك بۆنی خۆش، کامیان بە دیاری ببەخشیت بە هاوڕێیەکەت، ئەوا پێت دەڵێم: کاتژمێرەکەی بە دیاری بدەرێ، لەبەر ئەوەی زیاتر دەمێنێتەوەو ئەو ماوەیە لەبەر چاوی دەبێت، لەوانەشە نرخەکەی لە شوشە بۆنەکە هەرزانتریش بێت..

بیرم دێت کاتژمێرێکی دیوارم بە دیاری بەخشی بە یەکێك لە قوتابیەکانمو ناوی خۆشم لەسەر نوسی.. قوتابیەکە زانکۆی تەواو کردو پاش چەند ساڵێك بۆ پێشکەش کردنی وتارێك سەردانی یەکێك لە شارەکانم کرد، یەکێك لە ئامادەبووان بانگهێشتی کردم بۆ ئەوەی ببم بە میوانیو لەگەڵیدا بچمەوە بۆ ماڵەوە، کاتێك چوومە ژوورەوە، ئاماژەی بە کاتژمێرێکی سەر ژوورەکەیان کردو وتی: ئەوە بەنرخترین دیارییە لە لای من، هەر چەندە حەوت ساڵ بە سەر پێشکەش کردنی دیارییەکەشدا تێپەڕی بوو، ئەو کاتژمێرە شتێکی ئاسایی بوو، بەڵام لە دڵو دەروونی ئەو کەسەدا نرخو بایەخێکی گەورەی هەبوو..

**تێڕوانین..**

به دەست هێنانی دڵو دەروونی خەڵکی،
هەلێکەو لەوانەیە دوبارە نەبێتەوە..

# ئازار نەدانی خەڵکی..

خەڵکی هەموو ڕقیان لێبوو.. کەم کەس لە دەست ئازارو نارەحەتییەکانی ڕزگاریان دەبوو.. خۆ ئەگەر لە شەڕی دەستی ڕزگاریان بووایە، ئەوا لە شەڕی زمانی ڕزگاریان نەدەبوو!! هەروەها ئەگەر لە دەستی بچووایە لە کاتی ئامادەبوونتدا بە قامچی زمانی پێتدا بکێشێت، ئەوا لە پاشملە غەیبەتی دەکردی‌و نەیدەهێشت بە بێوەیی لە دەستی ڕزگارت بێت!!

بەڵێ.. بە ڕاستی کەسێکی سەیر بوو!! هێندەی قورسایی شاخەکان، لە سەر دڵی خەڵکی ڕەزاگران‌و بێزراو بوو.. ئەو کەسانەی کە ئازاری خەڵکی دەدەن، سەرەڕای ڕق‌و کینەی خەڵکی، سەرەڕایی بە ئاوات خواستنی خەڵکی بۆ ئەوەی سەرشۆڕبن، بۆ ئەوەی توشی نەهامەتی‌و نارەحەتی بن، ڕەجاڵ‌و مایە پووچیشن..

سەیری پێغەمبەری خوداﷺ بکە، کاتێك لە ناو هاوەڵانیدا دانیشتووەو پێیان دەفەرموێت: ئایا دەزانن مایەپووچ کێیە؟ هاوەڵانیش دەفەرموون: مایەپووچ لە لای ئێمە، ئەو کە هیچ پارەو پوڵ‌و شمەکێکی نەبێت..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: مایەپووچی ئوممەتەکەی من، کەسێکە کاتێك لە ڕۆژی دواییدا دەیهێنن، خاوەنی نوێژو ڕۆژووو زەکات بووە، بەڵام جنێوی بەو داوەو بوهتانی بۆ ئەو کردووەو ماڵی ئەوی خواردووەو خوێنی ئەوی ڕشتووەو لەویداوە.. چاکەکانی دەدرێت بەو کەسانە، کاتێك چاکەکانی تەواو دەبێت، خراپەی ئەو کەسانە دەخرێتە سەر خراپەکانی‌و پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە.. رواه مسلم..

پێغەمبەری خوداﷺ خۆی بە دوور گرتووە، لە هەموو شێوازەکانی ئازاردانی خەڵکی.. عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ هەرگیز بە دەستی نە لە هیچ ئافرەتێك‌و نە لە هیچ خزمەتگوزارێکی نەداوە، تەنها لە پێناوی خوادا نەبێت.. هەرگیز تۆڵەی لە هیچ کەسێکیش نەکردۆتەوە، مەگەر سوکایەتیەکی بە سنورێك لە سنورەکانی پەروەردگار کرد بێت، تەنهاش لەبەر خاتری خودا تۆڵەی لێدەکردەوە..

کاتێك پەروەردگار نیعمەتێکی خۆی بە بەندەیەکی دەبەخشێت، دروست نیە ئەو

نیعمەتە لە ئازاردانی خەڵکیدا بەکاربهێنێت، لەبەر ئەوەی لەوانەیە پەروەردگار هەر لە دونیادا تۆڵەی لێبکاتەوەو دڵی ئەو کەسانە خۆش بکات، کە ئازاری داون..

لە بیرم دێت، یەکێك لە هاوەڵانم قورئانی پیرۆزی لەبەر بوو، کەسێکی چاکیش بوو، هەندێك لە خەڵکی جار جار دەهاتن، بۆ ئەوەی قورئانیان بە سەردا بخوێنێت‌و دۆعایان بۆ بکات، زۆر جاریش پەروەردگار لە سەر دەستی شیفای بۆ دەناردن.. هەندێك جاریش دوعای بە سەر ئەو کەسانەشدا دەخوێنت، کە توشی چاوو جادو ببوون ..

ئەو هاورێیەم پێی وتم: رۆژێك یەکێك لە گەورە بازرگانەکان هات بۆ لام‌و سکاڵای ئازارێکی بەهێزی دەکرد لە دەستی چەپیدا.. شوێنەواری ئەو ئازارە بەهێزەش بە روونی بە روخسارەوە دیار بوو.. روخساری چرچ‌ولۆچ ببوو.. چاوەکانی لار ببوون.. لە بەردەستمدا دانیشت‌و پاشان وتی: یاشێخ دۆعام بە سەردا بخوێنە..

وتم: هاوارو سکاڵای چی دەکەیت؟!

وتی: ئازارێکی بەهێز.. هۆکارەکەشی نازانم.. سەردانی چەندان پزیشکیشم کردووەو شیکاریی زۆریشم ئەنجامداوەو هەموویان پاك‌و بێ کەم‌وکورین.. نازانم توشی چی بووم.. بەڵکو چاو بێت.. دوعام بە سەردا خوێندو بۆی پارامەوە.. رۆژی دووەمیش هاتەوەو دۆعام بە سەردا خوێند.. بۆ رۆژی سێیەم‌و چوارەمیش بە هەمان شێوە، درێژەی کێشاو ئازارەکەشی هەر زیادی دەکرد..

رۆژێك بە سەریدا هاوارم کردو وتم: ئەی فلانەکەس لەوانەیە ئەو ئازارەی توشت بووە، هۆکارەکەی دوعای ستەم لێکراوێك بێت، کە ئازارت دابێت، یان ستەمت لێکردبێت.. لە ماڵیدا، یان لە دەرونیدا، یان لە هەر شتێکی تردا.. رەنگی گۆڕاو هاواری کرد: ستەم!! بۆچی ستەم؟! خۆ من پیاوێکی چاکم.. من.. من..

لە توڕەییەکەی ئارامم کردەوەو داوای لێبوردنم لێکردو پاشان رۆی..

لەدوای دە رۆژ هاتەوە بۆ لام.. تەندروستی زۆر باش بوو.. زۆر سور بوو لە سەر ئەوەی، کە سەرم ماچ بکات.. دەیویست دەستم ماچ بکات‌و پاشان وتی: سوێند بە خودا لەدوای بەزەیی خودا، تۆ هۆکاری شیفای من بووی..

وتم: چۆن؟! خۆ دوعاکانم ئازارەکانی کەم نەکردی!!

وتی: لەدوای ئەوەی لە لای تۆ رۆیشتم.. ئازارەکەم زیادی کردو وشەکانی تۆ لە گوێمدا دەزرنگایەوە..

بەڵێ.. لەوانەیە ستەمم لە کەسێك کرد بێت.. یان ئازاری کەسێکم دابێت.. بیرم لەو

کاتە کردەوە، کە ویستم کۆشکەکەم دروست بکەم.. زەویەك بە تەنیشت زەویەکەمەوە بوو.. ویستم بیکڕم، بۆئەوەی بیکەم بە باخچە بۆ کۆشکەکەم.. ئەو زەویەش هی چەند بێباوکێك‌و دایکیان بوو..

داوام لە دایکیان کرد پێم بفرۆشێت.. بەڵام ڕازی نەبوو.. وتی: ئەگەر بیفرۆشم پارەکەی چی لێبکەم؟ واز لە زەویەکە بێنە با وەك خۆی بێت, هەتا منداڵەکانم گەورە دەبن‌و خۆیان شتێکی لێدەکەن.. ویستم ڕازی بکەم.. پارەی زۆرم خستە بەردەست، ڕازی نەبوو، بەڵام زەویەکە بۆ من زۆر گرنگ‌و بە بایەخ بوو..

وتم: ئەی چیت کرد؟!

وتی: بە هەندێك ڕێگەی تایبەتی خۆم، زەویەکەم لێسەند.. مۆڵەتی دروست کردنی بیناشم بۆ دەرکرد, ئەمەشیان هەر بە ڕێگەی تایبەتی‌و بینام تیایدا دروست کرد..

وتم: ئەی منداڵەکان؟ ئەی دایکیان؟

وتی: هەواڵم پێگەیشت، دایکیان دەهات‌و سەیری کرێکارەکانی دەکرد، کە کاریان دەکرد لە زەویەکەیداو قسەی پێدەوتن‌و دەگریا.. کرێکارەکانیش وایان دەزانی شێتە.. لە بیرمە کە دەستەکانی بەرز کردەوەو دەپاڕایەوەو دەگریا، ئا لەو کاتەدا ئازارەکە، لە دەستمدا دەستی پێکرد.. بە شەو خەوم لێنەدەکەوت.. بە ڕۆژ ئاسودە نەدەبووم..

وتم: باشە.. چیت کرد؟!

وتی: چووم بۆ لای‌و گریام‌و داوای لێبوردنم لێکرد.. لە شوێنێکی تردا زەویەکی باشتر لە زەویەکەی خۆیم بۆ کڕی .. ئەویش ڕازی بوو، دوعای بۆ کردم‌و داوای لێخۆشبونی لە خودا بۆ کردم.. سوێند بە خودا کاتێك دەستەکانی بەرز دەکردەوەو دۆعای بۆ کردم، دەستەکانی دانەگرتبوو، پەروەردگار شیفای بۆ ناردم، لە کاتێکدا شارەزایی‌و زانیاری پزیشکەکان لە ئاستی ئازاری دەستەکانمدا، بێ توانابوون‌و هیچیان پێنەکرا..

**وتراوە..**

چاوەکانی تۆ دەخەون، بەڵام ستەم لێکراو بەخەبەرەو لە لای پەروەردگار دوعات لێدەکات، لە کاتێکدا کە چاوی پەروەردگار هەرگیز ناخەوێت..



# نا بۆ دوژمنایەتی..

خەڵکی لە هەڵسوکەوتیاندا جیاوازن.. هەیانە زوو تووڕە دەبن‌و هەشیانە زۆر نەرم‌و نیانە.. هەیانە زۆر زیرەك‌و بلیمەتەو هەیانە زۆر گێل‌و نەفامە.. هەیانە نەزانەو هەیانە زانا.. هەیانە گومانی باش بە خەڵکی دەبات‌و هەیانە گومانی خراپ‌و هەروەها..

کەسی ستەمکار بێئاگایە لە ستەمەکانی‌و وا دەزانێت دادپەروەرترین کەسە.. گێل‌و نەفامی وا هەیە، خۆی بە زیرەکترین کەس دەزانێت..

بیرم دێت، کاتێك لاو بووم‌و لە سەرەتای خوێندنی دواناوەندیدا بووم، میوانێکی خوێن تاڵمان هات، نازانم خوێندنی سەرەتایی تەواو کرد بوو، یان نا، بەڵام دەمزانی دەتوانێت بنوسێت‌و بخوێنێتەوە.. کاتێك هاتە ژوورەوە، سەرقاڵی پرسیارێکی شەرعی بووم‌و بە دوای وەڵامەکەیدا دەگەڕام.. ئەوەی بۆ میوان پێویست بوو، ئامادەم کردو بۆم هێناو پاشان دەستم برد بۆ تەلەفۆن‌و چەند جارێك ویستم پەیوەندی بە شێخ عبدالعزیز بن بازەوە بکەم (خودا لێی خۆش بێت) بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەم دەست بکەوێت، بەڵام شێخ عبدالعزیزم بۆ وەرنەگیرا..

کاتێك میوانەکەمان هەستی بە سەرقاڵیم کرد، وتی: ئەوە تەلەفۆن بۆ کێ دەکەیت؟!

وتم: بۆ شێخ عبدالعزیز بن باز، پرسیارێکم هەیەو بە دوای وەڵامەکەیدا دەگەڕێم..

میوانەکەمان زۆر بە متمانەوە وتی: سبحان الله!! من ئامادەم‌و پرسیار لە عبدالعزیز بن باز دەکەیت؟!

خەڵکانی وا زۆرن، بەڵام هەوڵبدە بە جوانی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەو دان بە خۆتدا بگرەو مەیانڕەنجێنەو مەیانکە بە دوژمنی خۆت.. یارمەتیان بدەو ڕزگاریان بکەو ئیتر ئازاری دەروونی خۆت مەدە..

**ڕازو نیاز..**

ژیان زۆر لەوە کورتترە، لە دووبەرەکی‌و دوژمنایەتیدا بەکاری بهێنیت..

# زمان..!!

ناكۆكیو دووبەرەكی نێوان خەڵكی، بەهۆی زمانەوەیە.. هەر زمانە دەبێتە هۆی ئەوەی كەسانێك رقیان لە كەسانێكی تر بێتو حەز بە بینیان نەكەن.. چەندین ئاژاوە لە نێوان خێزانەكاندا، لە نێوان براكاندا، لە نێوان هاورێكاندا، كە روویانداوە، بەهۆی زمانەوە بووە.. هەموو ئەمانە بەهۆی جنێوێكی زمان، یان بەهۆی غەیبەتێك، یان بەهۆی قسەگێرانەوەیەكی زمانەوە، روویانداوە..

بە دڵنیاییەوە ئێمە دەتوانین بەهۆی زمانەوە، بە شێوازێكی جوان بۆچوونەكانمان بە كەسانی تر بگەیەنین، ئیتر بۆچی پەنا بۆ هەڵسوكەوتو كردارو گوفتاری ناشیرین بەرین؟!

دەگێرنەوە پادشایەكی دەسەڵاتدار لە خەویدا هەموو ددانەكانی هەڵدەوەرێنو دەكەون.. بانگی خەوگێرەرەوەیەك دەكات، بۆ ئەوەی خەوەكەی بۆ لێك بداتەوە، خەوگێرەرەوەكەش كاتێك گوێی لە خەونەكەی پادشا دەبێت، چەند جارێك دەڵێت: پەنا بە خودا..!! پاشان دەڵێت: پادشا.. ماڵو منداڵو كەسوكارت هەموو دەمرن، تەنها خۆت دەمێنیتەوە..

پادشا كاتێك گوێی لەم قسانە دەبێت، زۆر تووڕە دەبێتو هاوار دەكاتو دەڵێت: بیبەن داركاری بكەن.. پاشان بانگی خەوگێرەرەوەیەكی تر دەكاتو خەوەكەی بۆ دەگێرێتەوە، خەوگێرەرەوەكەش بە روویەكی خۆشەوە بە پادشا دەڵێت: مژدە بێت پادشا، شوكر خێرە، تەمەنت ئەوەندە درێژ دەبێت، لە دوای هەموو كەسو كارو ماڵو منداڵەكانت دەمریتو هەر بە پادشاییش دەمێنیتەوە.. پادشا دەگەشێتەوەو فەرمان دەكات بۆ ئەوەی دیاری پێ ببەخشن..

بەڵێ.. لە یەكەمیان نارازی بوو، فەرمانیدا داركاری بكەن، بەڵام لە دووەمیان رازی بوو، فەرمانیدا دیاری پێ ببەخشن، خۆ ئەگەر لە قسەی هەر دوو خەوگێرەرەوەكە ورد بینەوە، دەبینین قسەی هەردووكیان، هەر یەك قسە بوو، بەڵام شێوازی دەربرینەكەیان جیاواز بوو..

بەڵێ.. زمان گەورەی گەورەكانە، لە واتای فەرموودەیەكی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە، كە فەرموویەتی: كاتێك مرۆڤ بەیانی دەكاتەوە، هەموو ئەندامەكانی لاشەی



قسە بە زمان دەڵێن‌و هاوار هاواریانە لە دەستی‌و پێی دەڵێن: ئەی زمان لە خودا بترسە، ئەگەر تۆ ڕێك‌و باش بیت، ئەوا ئێمەش باش دەبین، خۆ ئەگەر تۆ لارو لەوێر بیت، ئەوا ئێمەش وا دەبین.. رواه أحمد والترمذي..

بەڵێ.. بە ڕاستی زمان وەك برا گەورە وایەو گەورەی مرۆڤە.. لە وتاری هەینیدا گەورەو بەرێزەو ئامۆژگاری خەڵکی پێدەکرێت.. لە یەکخستن‌و ڕێکخستنی نێوان خەڵکیدا هەر گەورەیە.. لە کڕین‌و فرۆشتنندا هەر گەورەیە، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نیە، ئەگەر کەسێك زمانی لە دەستدا، یان زمانی نەبوو، ئیتر کۆتایی بە ژیانی دێت..

نەخێر.. بەڵکو کەسانی بە تواناو خاوەن هیممەت، ئەگەر بەشێکی جەستەشیان لە دەست بدەن، هەر بە پاڵەوانی دەمێننەوە، ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیەش نمونەیەکی ئەو کەسە هیممەت بەرزانەیە:

ئەبو عبدالله زۆر جیاواز نەبوو لە هاوەڵەکانی ترم، بەڵام خودا شایەدە لە هەموویان زیاتر سور بوو لە سەر ئەنجامدانی کاری خێرو چاکە.. چەندین چالاکی بانگخوازی هەبوو.. لە دیارترینیان ئەوە بوو، لە کاتی کارەکەیدا پێی هەڵدەستا، کە لە پەیمانگای کەڕو لاڵەکان وەرگێڕ بوو..

ڕۆژێك پەیوەندی پێوە کردم‌و وتی: پێت خۆشە دوو کەس لە کەڕو لاڵەکانی پەیمانگە ئامادە بکەم، بۆئەوەی لە مزگەوتەکەتدا ئامۆژگاری نوێژ خوێنەکان بکەن..

سەرم سوڕما!! وتم: کەڕو لاڵ ئامۆژگاری‌و قسە بۆ کەسانێك بکەن، کە دەبیستن‌و قسە دەکەن؟!

وتی: بەڵێ.. ڕۆژی یەکشەممە دەیان هێنم..

چاوەڕێی ڕۆژی یەکشەممەم دەکرد.. ئارامم لێبڕا بوو.. ڕۆژی یەکشەممە هات‌و لە دەرگای مزگەوت وەستام‌و چاوەڕێم دەکردن.. ئەبو عبدالله بە خۆی‌و سەیارەکەیەوە هات.. لە نزیك دەرگای مزگەوت وەستا.. پاشان دابەزی‌و دوو پیاویشی لەگەڵ بوو.. سەیری یەکەمیانم کرد کەڕیش‌و لاڵیش بوو.. نەدەبیبیست‌و نەقسەی دەکرد.. بەڵام چاوی ساغ بوو.. دووەمیان کەڕیش‌و لاڵیش‌و کوێریش بوو.. نەدەیبیست‌و نەقسەی دەکردو نەدەیبینی!!

دەستم درێژ کردو تەوقەم لەگەڵ ئەبو عبدالله کرد.. زانیم ئەوەی تەنیشتی ناوی ئەحمەدە.. بە زەردەخەنەو ڕوویەکی خۆشەوە سەیری کردم‌و تەوقەم لەگەڵ ئەویشدا کرد.. ئەبو عبدالله ئاماژەی بۆ نابیناکە کردو وتی: سڵاو لە فایزیش بکە..

وتم: السلام علیکم .. ئەبو عبدالله وتی: دەستی بگرە، چونکە ئەو نە گوێی لێتەو

نەدەتبینیّ.. دەستم خستە ناودەستیو دەستمی گوشی..

خەڵکی چوونە ژوورەوە بۆ ناو مزگەوتو لەدوای نوێژی عیشا، ئەبو عبداللە لە سەر کورسییەك دانیشتو ئەحمەد لە لای ڕاستیو فایزیش لە لای چەپیەوە دانیشتن.. خەڵکەکە بە سەرسورمانەوە سەیریان دەکردو نەیان بینیبوو، کەڕو لاڵ لە سەر کورسی ئامۆژگاریکار دابنیشێت.. ئەبو عبداللە لای کردەوە بە لای ئەحمەدداو ئاماژەی بۆ کرد.. ئەحمەد دەستی پێکردو دەستەکانی بەکاردەهێناو دەیجوڵاندن.. خەڵکیش هەر سەیریان دەکردو هیچ تێنەدەگەیشتن..

ئەبو عبداللە لە مایکرۆفۆنەکە نزیك بۆوەو وتی: ئەحمەد چیرۆکی گەڕانەوەو هیدایەتدانی خۆیتان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: بە کەڕی لە دایك بووم.. لە شاری جەددە گەورە بووم.. کەس‌وکارم پشت گوێیان خستبوومو بە هیچ شێوەیەك ئاوڕیان لێنەدەدامەوە..

خەڵکیم دەبینی دەچوون بۆ مزگەوت، بەڵام نەمدەزانی بۆچی دەچوون!! هەندێك جار باوکمم دەبینی بەرماڵەکەی ڕادەخستو کڕنوشی دەبرد، بەڵام من نەمدەزانی چی دەکاتو چی دەڵێت.. کاتێکیش پرسیارم لە کەس‌وکارم دەکرد لێم توڕە دەبوونو وەڵامیان نەدەدامەوە..

پاشان ئەبو عبداللە بێدەنگ بوو، ئاوڕی بۆ لای ئەحمەد دایەوەو ئاماژەی بۆ کرد.. ئەحمەد بەردەوام بوو لە گێڕانەوەی ژیانی خۆی.. بە دەستەکانی ئاماژەی دەکرد.. پاشان ڕوخساری گۆڕا، وەك ئەوەی کاریگەری شتێکی لە سەر بێت.. ئەبو عبداللە سەری داخستو پاشان ئەحمەد دەستی کرد بە گریان.. بە کوڵ گریا.. گریانەکەی کاریگەرییەکی زۆری لە سەر خەڵکەکە هەبوو، بەڵام نەیاندەزانی بۆ دەگریەت..

ئەبو عبداللە وتی: ئەحمەد باسی ئەو کاتەتان بۆ دەکات، کە چۆن خودای ناسی.. چۆن نوێژی کرد.. بەهۆی کەسێکەوە کە لە سەر شەقام بینیویەتیو سۆزی بۆ لای جوڵاوەو فێری دینداری کردووە.. کاتێك کە سەرەتا دەستی کردووە بە نوێژ کردن، هەستی بە نزیك بوونەوەی لە خودای پەروەردگار کردووە .. هەستی کردووە لە سەر ئەم تاقیکردنەوەیە، خودای پەروەردگار پاداشتی دەداتەوە.. باسی ئەوەی کرد کە چۆن هەستی بە تامو شیرینی باوەڕ کردووە..

ئەبو عبداللە پاشماوەی چیرۆکی ئەحمەدی بۆ دەگێڕاینەوەو زۆربەی خەڵکیش کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەحمەدەوە.. بەڵام من سەرقاڵ بووم.. جارێك سەیری ئەحمەدم دەکردو جارێك سەیری فایز.. لە دڵی خۆمدا دەموت: ئەوە ئەحمەد دەبینیّو

زمانی ئاماژەش دەزانێت و ئەبو عبداللە تێیدەگات.. ئەی چۆن لە فایز تێبگات؟! چونکە فایز نەدەبینێ و نەدەبیستێ و نەقسە دەکات!!

ئەحمەد تەواو بوو.. فرمێسکەکانی دەسڕی.. ئەبو عبداللە لای کردەوە بە لای فایزدا.. لە دڵی خۆمدا وتم: ها.. دەبێت چی بکات؟!

ئەبو عبداللە بە پەنجەکانی دەستی کێشای بە ئەژنۆی فایزدا.. فایزیش وەکو تیر لە کەوان دەرچێت، باسێکی زۆر کاریگەری پێشکەش کردین..

دەزانن چۆن؟! بە قسە؟! نەخێر.. چونکە لاڵ بوو، قسەی نەدەکرد..

ئەی بە ئاماژە؟! نەخێر؟! چونکە نابینا بوو.. زمانی ئاماژەی نەدەزانی، بەڵکو بەهۆی هەستی دەست لێدانەوە..

ئەبو عبداللە دەستی لەبەردەم دەستەکانی فایزدا دادەناو بەهۆی چەند دەست لێدانێکی تایبەتەوە تێیدەگەیاندو پاشان ئەبو عبداللە بۆ ئێمەی باس دەکردو تێیدەگەیاندین.. نزیکەی چارەکێکی پێچوو.. فایز کەسێکی ئارام و لەسەرخۆ بوو.. نەیدەزانی کە ئەبو عبداللە لە قسەکانی تەواو بووە، یان نا.. لەبەرئەوەی نەدەیبیست و نەدەیبینی.. لەبەرئەوە کاتێك ئەبو عبداللە لە وەرگێڕانەکەی تەواو دەبوو، بە پەنجەکانی دەستی دەیکێشا بە ئەژنۆی فایزداو پاشان دەستەکانی لە نێوان دەستی فایزدا دادەناو فایزیش بە چەند دەست لێدانێك تێیدەگەیاند..

خەڵکەکە چاویان لە نێوان فایزو وەرگێڕەکەیدا دەگێڕا.. سەریان سوڕما بوو.. فایز خەڵکەکەی هان دەدا بۆئەوەی تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە.. جارێك گوێچکەی دەگرت.. جارێك زمانی.. جارێك دەستەکانی لە سەر چاوەکانی دادەنا.. فرمانی بە خەڵکەکە دەکرد، کە گوێ و چاوو زمانیان لە حەرام بپارێزن.. سەیری خەڵکەکەم دەکرد.. هەندێکیانم دەبینی لەبەرخۆیانەوە دەیان وت: سبحان اللە.. هەندێکی تریان بە چرپە لەگەڵ یەکدا قسەیان دەکرد.. هەندێکیشیان زۆر بە تامەزرۆوە هەستیان ڕاگرتبوو.. هەندێکیان دەگریان..

بەڵام هەست و دەروونی من زۆر دوور ڕۆیشت.. بەراوردی توانای فایزم کرد لەگەڵ توانای ئەو هەموو خەڵکەدا.. پاشان بەراوردی خزمەتکردنی فایزم کرد بۆ ئاینەکەی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا.. ئەو خەمەی کە کەسێکی نابینای کەڕو لاڵی وەك فایز داویەتی بە سەر شانیدا، لەوانەیە زۆر زیاتر بێت لە خەمی هەموو ئەو خەڵکانەی کە بۆ ئاینەکەیان هەیانە.. هەزار کەس لە خەڵکی وەك فایز نابن و فایزیش وەك هەزار کەس وایە لە خەڵکی..

کەسێك کە تواناکانی دیاریکراون، بەڵام لە پێناو ئاینەکەیدا وەکو مۆم دەسوتێت.. هەست دەکات کە سەربازێکە لە سەربازەکانی ئیسلام.. خۆی بە بەرپرس دەزانێت لە بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەدا کە یاخیو سەرپێچیکەرن.. زۆر بە گەرمی دەستەکانی دەجولاند.. وەك ئەوەی بڵێت: ئەی ئەو کەسەی نوێژەکانت ناکەیت، تاکەی؟!

ئەی ئەو کەسەی بە چاوەکانت، سەیری حەرام دەکەیت، تاکەی؟!

ئەی ئەو کەسەی کەوتویتەتە زەلکاوی سەرپێچیەوە، تاکەی ناگەڕێیتەوە؟!

ئەی ئەو کەسەی حەرام دەخۆیت.. ئەی ئەو کەسەی کەوتویتەتە ناو هاوەڵ پەیداکرنەوە بۆ خودای گەورەو تاك و تەنها.. هەموو ئەو کەسانە.. تاکەی؟! ئایا دوژمنایەتی دوژمنەکانمان بۆ ئاینەکەمان بەس نیە؟! ئێوەش دوژمنایەتی ئاینەکەتان دەکەن؟!

فایز دەیویست ئەوەی لە دڵیدا هەیە بیخاتە ڕوو.. خەڵکەکە زۆر پێی کاریگەر بوون.. گوێم لە گریانو دەنگی سبحان اللەی خەڵکی بوو..

فایزیش تەواو بوو، هەستاو ئەبو عبداللە بە دەستەکانی گرتی.. خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوەو سڵاویان لێدەکرد.. ئەویش سڵاوی لە خەڵکەکە دەکرد.. هەستم دەکرد خەڵکی لە لای فایز هەموو یەکسانن.. سڵاوی لە هەمووان دەکرد.. جیاوازی لە نێوان کەسدا نەدەکرد.. گەورەو بچوك.. بەهێزو لاواز.. دەوڵەمەندو هەژار.. هەمووان لە لای یەکسان بوون.. ئەبو عبداللە دەستی فایزی گرتو بەرەو دەرەوەی مزگەوت ڕۆیشتن..

بەڵێ.. فایزو وەرگێڕەکەی لە کامەرانیەکی گەورەدا بوون.. ئای لەم دونیایە!! چەندان کەس هەن بە قەد چوار یەکی فایز لە نارەحەتیو ئازاردا نین، بەڵام ناتوانن بە سەر خەمو نارەحەتیەکانیاندا سەرکەونو زاڵ بن.. کوان ئەو کەسانەی نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە.. ئازارو سستی گورچیلە.. شەلەل.. جەڵتە.. بۆچی خۆشی لە ژیانیان وەرناگرن؟! بۆچی خۆیان لەگەڵ ژیاندا ناگونجێنن؟!

چی لەوە جوانترە کاتێك خودای گەورە بەندەیەکی توشی نارەحەتیو نەخۆشی دەکاتو پاشان سەیری دڵی بەندەکەی دەکات، دەبینێت ڕەزامەندو ئارامگرە؟!

ڕۆژەکان تێپەڕینو بەردەوام وێنەی فایز لە پێش چاوم بوو..

دوای ئەوە ڕۆژێك بە ئەبو عبداللە گەیشتمو پرسیاری فایزم لێکرد.. وتی: ئەو پیاوە نابینایە شتی زۆر سەیر لە ژیانیدا هەیە.. وتم: چۆن؟!

وتی: لە ژیانمدا کەسم نەبینیوە بە وێنەی فایز لە سەر نوێژەکانی سور بێت.. فایز لە ناوچەیەکی دەرەوەی شاری ڕیاز، ژوورێکمان لە پەیمانگاکەدا بۆ نیشتەجێ بوونی

ئامادەكردووە.. كارگوزاریكیشمان بۆ داناوە بۆ ئەوەی ئاگای لێبێتو خواردنی بۆ ئامادە بكاتو بۆ نوێژەكانی خەبەری بكاتەوەو بە پێویستیەكانی هەڵبستێت.. كارگوزارەكە لە كاتی نوێژەكاندا دێت بۆ لایو دەرگاكەی بۆ دەكاتەوە، فایزیش دەست نوێژ دەگرێتو چاوەڕێی كارگوزارەكە دەكات، دەستی بگرێتو بیبات بۆ نوێژی جەماعەت بۆ مزگەوت..

هەندێك جار كارگوزارەكە دوادەكەوت، فایز بە پەلە لە دەرگاكەی دەدا لە ترسی ئەوەی نوێژەكەی بە جەماعەت لە دەست نەچێت.. لە نێوان فایزو مزگەوتەكەشدا، دوو شەقامی ڕوو بەڕووی یەك هەبوون.. فایز دەڕۆیشتو دەستەكانی دەجوڵاند، بۆئەوەی ئەگەر ئۆتۆمبیلی لێبێت شۆفێرەكان ببینن.. چەندان ئۆتۆمبیلیش بەهۆی فایزەوە لێكیان دابوو..

فایز شتی سەیری هەیە!! جارێك لەدوای عەسر چووم بۆ پەیمانگە.. كۆمەڵێك لە كەڕو لاڵەكان لەبەردەم دەرگای پەیمانگە چاوەڕێیان دەكردو ئاماژەیان دەكرد، كە فایز گرفتێكی هەیە.. كاتێك چووم بۆ لای بینیم، زۆر تووڕەیەو دەستەكانی دەجوڵێنێتو ئەوانەی دەوروبەریشی لێی تێناگەن.. كاتێك دەستم خستە ناو دەستیەوە، ئاسیمیو بە توندی دەستی گرتم.. چەند دەست لێدانێكی دیاریكراوی لێدامو منیش بە هەمان شێوە دەستم لێدایەوەو ئارام بۆوە..

دەزانی چی تووڕەی كرد بوو؟! نوێژی بەیانی ئەو ڕۆژەی بە جەماعەت لەدەست چوو بوو.. دەیوت: ئەو كارگوزارە دەركەنو بیگۆڕن بە یەكێكی تر.. منیش تووڕەییەكەیم ڕەواندەوە..

سۆزو بەزەیی خودات لێبێت ئەی فایز.. خودا بەزەیی بە ئێمەشدا بێتەوە..

ئەوەتا فایز لە ژیانیدا سەركەوتنی بە دەست هێناو خەڵكی خۆشیان دەویست، لە كاتێكدا كوێریشو كەڕیشو لاڵیش بوو.. دەی خۆ تۆ سوپاس بۆ خودا، پەروەردگار زمانی پێداوی، هەروەها دەبیستیو دووچاوی جوانیشی پێبەخشیووی!! دەی مادام زمانت لە بە دەست هێنانی سۆزو خۆشەویستی خەڵكیدا بەكاربهێنە..

**ڕاستیەك..**

مرۆڤ نە گۆشتی دەخورێتو نە پێستەكەشی لەبەر دەكرێتو سودی لێ دەبینرێت، دەی هیچ نەبێت با زمانی شیرین بێت!!

# سنوورێك بۆ زمانت دابنێ..

جاری وا هەیە مرۆڤ بەهۆی تەنها قسەیەکەوە، پەروەردگار هەتا ڕۆژی دوایی خەشم و قینی لێدەگرێت، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ ئاگاداری کردووین، کە بە شێوەیەکی ڕەها قسە نەکەین و بیر لە ئەنجامی قسەکانمان بکەینەوە.. کۆنترۆڵ نەکردنی زمانیش، خاوەنەکەی بەرەو لەناوچوون دەبات..

احفظ لسانك أيها الأنسان　　　لايلدغنك إنه ثعبان

كم في المقابر من قتيل لسانه　　　كانت تهاب لقاءه الشجعان..

بەڵێ.. پێویستە ئاگاداری زمانت بیت، نەوەکو پێتەوە بدات و بتگەزێت، چونکە زمان وەکو ماری ژەهراوی وایە و زۆر کەسیش بەهۆی زمانیەوە کوژراوە و ئێستا لە گۆڕدایە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە ئازا بوون، کەسانی ئازاو بەجەرگ لە ڕووبەڕوو بوونەوەیان ترساون و خۆیان لێیان لاداوە..

چەندین ئافرەت بە هۆی زمانیانەوە، خۆیان بە تەڵاقدان داوە.. کاتێك ئافرەتێك لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەبێتە دەنگە دەنگیان و خێرا خێرا دوبارەی دەکاتەوە و دەڵێت: تەڵاقم بدە.. دەی ئەگەر دەتوانیت تەڵاقم بدە.. دەی ئەگەر پیاوی تەڵاقم بدە!! هاوسەرەکەشی داوای لێدەکات و پێی دەڵێت: بێدەنگ بە.. ئافرەتەکەش بێدەنگ نابێت و کێشەکەیان گەورەتر دەبێت و ئەو پەیوەندیەی چەندین ساڵە خەریکی دروست کردنین، لە ماوەی چەند چرکەیەکدا دەیروخێنن و ئافرەتەکە خۆی بە تەڵاقدان دەدات.. ئەمەش بە هۆی زمانەوە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ داوامان لێدەکات، لە کاتی تووڕەییدا بێدەنگ بین و قسە نەکەین..

بەڵێ.. بێدەنگ بین، لەبەر ئەوەی لە کاتی تووڕەییدا، ناتوانین کۆنترۆڵی زمانمان بکەین و لەوانەیە قسەی هەڵە بکەین..

بەڵێ.. گەنجی زۆر بەهێزو توانا هەیە، کاتێك قاچی دەخزێت و دەکەوێت، هیچی لێنایات، بەڵام هەڵەیەکی بچوکی زمانی لەوانەیە ببێتە هۆی کوژران و لەناوچوونی..

ماوەیەك لەمەو پێش بەشداری ڕێککەوتنی کێشەی نێوان دوو بنەماڵەم کرد، کێشەکەش بەم شێوەیە بوو: پیاوێکی ژیری بەتەمەنی گەورە، گومان دەبەم تەمەنی لە سەرووی

شەست ساڵیەوە بوو بێت، لەگەڵ چەند هاورێیەکی هاوتەمەنیدا دەچن بۆ ڕاو..

لە ڕێگە قسەو باسی ڕابوردوو بۆ یەك دەگێڕنەوەو یادگاری سەردەمی لاوی بە بیری یەکتر دێننەوە، پاشان لەبارەی زەوی‌وزاری باپیرەیانەوە قسە دەکەن‌و ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ئەم پیاوەو یەکێکی تریانەوەو هەر یەکەیان دەڵێن: ئەو زەویە زەوی‌وزاری باپیرەی منە.. ناکۆکیەکەیان زیاد دەکات‌و یەکێکیان بەوی تریان دەڵێت: سوێند بە خودا ئەگەر ببینم لەو زەویانە نزیك دەبیتەوە، فیشەکی ئەم چەکە لە مێشکتدا خاڵی دەکەمەوە، پاشان بە چەکەکەی دەستی فیشەکێك بە سەر هاورێکەیدا دەتەقێنێت‌و دواتریش بە یەکدا هەڵدەپڕژێن‌و خەریك دەبێت یەکتر بکوژن، بەڵام هاورێکانیان لێکیان دەکەنەوەو هەر یەکەیان بۆ ماڵی خۆیان دەگەڕێنەوە..

ئەومیان کە فیشەکەکەی بە سەردا تەقێنرا بوو، لە ڕق‌و کینەدا خەو نەدەچووە چاوی، هەر کە خۆر هەڵهات خۆی کۆکردەوەو چەکەکەی هەڵگرت‌و کەوتە چاودێری هاورێکەی.. هاورێکەی پیاوێکی خانەنشین بوو، کاری شۆفێری دەکردو ڕۆژانە چەند مامۆستایەکی ئافرەتی دەگەیاندە قوتابخانەکەیان.. هەندێك ئۆتۆمبیلی هاوشێوەی ئۆتۆمبیلی ئەم پیاوەش، هەمان کاریان دەکردو مامۆستایان‌و قوتابیانیان دەگەیاند..

پیاوە چەك بە دەستەکەش لە دوای درەختێکەوەو لە دوورەوە خۆی شاردبۆوە، بۆ ئەوەی پێی نەزانن‌و ئاشکرا نەبێت.. لە دوورەوە شۆفێری یەکێك لە ئۆتۆمبیلەکان دەبینێت، لەبەر ئەوەی چاوی کز دەبێت، وا دەزانێت ئەو کەسەیە کە فیشەکەکەی بە سەردا تەقاندووە، هەر بۆیە سێ فیشەك دەنێت بە سەریەوە..

خەڵکەکە دەشڵەژێن‌و قوتابیەکان هەموو دەترسن‌و هاوار هاوار بەرز دەبێتەوەو پۆلیس دەگاتە شوێنی ڕووداوەکە.. لەبەر ئەوەی فیشەکەکان چوو بوونە سەری شۆفێرەکەوە، یەکسەر دەمرێت.. پیاوکوژەکەش، زۆر بە هێمنی‌و لەسەرخۆییەوە، دەچێت بۆ بنکەی پۆلیس‌و ڕووداوەکەیان بۆ دەگێڕێتەوەو پاشان دەڵێت: من فلانە کەسم کوشت، ئێستا دڵم ئاوی خواردەوە، ئیتر دەمکوژنەوە.. دەمسوتێنن.. دەمخەنە بەندیخانە.. چی دەکەن بیکەن..

بە شێوەیەکی کاتی بەندی دەکەن، ئەفسەری لێکۆڵینەوەش، کاتێك سەیری ناسنامەی کوژراوەکە دەکات، دەبینێت ئەو کەسە نیە، کە بکوژەکە مەبەستی کوشتنی بووە، بەڵکو کەسێکە کە هیچ پەیوەندی‌و ناسیاویەکی بە بکوژەکەوە نیە!! ئەفسەری لێکۆڵینەوەکە، ئەو پیاوە لەگەڵ خۆی دەبات کە بکوژەکە وا دەزانێت کوشتوویەتی‌و تۆڵەی خۆی لێکردۆتەوە.. کاتێك دەگەنە لای بکوژەکە، ئەفسەرەکە پێی دەڵێت: ئەی تۆ نەتوت

فلانە کەسم کوشتووە؟! فیشەکەکانت کەسێکی تری پێکاوەو کوشتوویەتی!!

بکوژەکە هاوار دەکاتو چەند ڕۆژێك بێهۆش دەکەوێت، پاشان دێتەوە هۆش خۆیی.. دواتر دادوەر بڕیاری کوشتنەوەی بۆ دەردەکات..

بە ڕاستی ئیمامی ئەبوبەکرﷺ ڕاستی فەرمووە، کاتێك دەفەرموێت: هیچ شتێك ئەوەندەی زمان پێویستی بە بەندکرن نیە.. کاربەدەستێك ڕۆژێك لەگەڵ یەکێك لە بەردەستەکانیدا دادەنیشێتو قسەی خۆشو گاڵتەوگەپ دەکەن، شەیتان یاریان پێدەکاتو هانیان دەدات، بۆ ئەوەی عەرەق بخۆنەوە، کاتێك عەرەق دەخۆنەوە، ژیریان لە دەست دەدەن، لەبەر ئەوەی عەرەق دایکی هەموو خراپەو تاوانەکانەو مرۆڤەکان دادەبەزێنێت، بۆ ئاستی ئاژەڵ، بەڵکو خوار ئاژەڵیش.. کاربەدەستەکە ئاگای لە خۆی نامێنێتو فەرمان دەکات بەوەی ئەو کەسەی کە لەگەڵیدا قسەی خۆشی دەکردو عەرەقیان دەخواردەوە، بکوژن..

فەرمانی ئەو کاربەدەستەش ڕەد کردنەوەی نەبوو.. پیاوەکە زۆر دەپاڕێتەوەو هاوار دەکاتو داوا لە کاربەدەستەکە دەکات لێی خۆش بێت، بەڵام کاربەدەستەکە پێدەکەنێتو دەڵێت: بیکوژن.. بیکوژن.. دەیکوژنو دەیخەنە بیرێکی دوورە دەستەوە..

بۆ ڕۆژی دوایی، کاتێك کاربەدەستەکە تەنها دەبێت، حەز دەکات ئەو پیاوەی شەو بەیەکەوە قسەی خۆشیان دەکرد، بێت بۆ لایو بە یەکەوە دانیشن، هەر بۆیە دەڵێت: فلانە کەسم بۆ بانگ بکەن.. ئەوانیش دەڵێن: قوربان کوشتمان!!

کاربەدەستەکەش دەڵێت: کێ کوشتیو بۆچی کوشتی؟! ئەی کێ وتی: بیکوژن؟!

ئەوانیش دەڵێن: قوربان خۆت وتت بیکوژن.. پاشان ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕنەوە، کاربەدەستەکەش بێدەنگ دەبێتو سەری دادەخاتو لە کارەکەی پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام لە پاش چی؟!

إبن الجوزی دەفەرموێت: سەرسامم لە هەندێك کەس، کاتێك دەتوانن خۆیان لە خواردنی حەرام بە دوور بگرن، هەروەها دەتوانن خۆیان لە دزیو داوێن پیسی بپارێزن، بەڵام ناتوانن دەست بە سەر جوڵەی زمانیاندا بگرنو باسی ئەمو ئەو نەکەنو زمانی خۆیان بۆ ناگیرێت..

**سەیرە!!**

ئاژەڵ زمانی درێژەو قسە ناکات.. بەڵام مرۆڤ زمانیشی کورتە، کەچی بێدەنگ نابێت..

# کلیلی دەروازەکان..

کلیلی کردنەوەی دەروازەی دڵەکان، بریتیەلە: سوپاس و ستایش و پیاهەڵدان..

بەڵێ.. جوانترین وتەو گفتوگۆ، بریتیە لە: دان پێدانان و دەرخستنی جوانییەکانی خەڵکی، هەروەها پێش ئەوەی لە سەر هەڵەکانیان سەرزەنشتیان بکەیت، پێویستە لە سەر چاکەکانیان سوپاسیان بکەیت..

زۆرێك لەو کەسانەی ئامۆژگاری دەکرێن، ئامادە نین گوێ بۆ ئامۆژگاری ئامۆژگاریکارەکە ڕابگرن، لەبەر خۆ بە گەورە زانین نا، هەروەها لەبەر ئەوەش نا، کە دان بە هەڵەکەیدا نانێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی کەسی ئامۆژگاریکار نازانێت بە شێوەیەکی جوان ئامۆژگارییەکانی پێشکەش بە کەسی بەرامبەر بکات..

بۆ نمونە: کاتێك دەچیت بۆ یەکێك لە نەخۆشخانەکان، دەبینێت ئەو فەرمانبەرەی کە بەرپرسە لە ڕەوانە کردنی نەخۆش بۆ لای پزیشك، لەو دیو شوشەکەوە دانیشتووەو بە دەستێکی پەڕەی ڕۆژنامەکان هەڵدەداتەوەو بە دەستەکەی تریشی جگەرە دەکێشێت و هیچ گرنگی بە نەخۆشەکانی دەوروبەری نادات.. پیاوێکی بە ساڵاچووش دەبینیت، منداڵێکی بە دەستەوەیە، دەگری و تایەکی بەرزی هەیەو چاوەڕێ دەکات فەرمانبەرەکە لە ڕۆژنامە خوێندنەوە ببێتەوەو ڕەوانەی پزیشکی منداڵانیان بکات..

کاتێك ئەم دیمەنانە دەبینیت، گڕ دەگریت و تووڕە دەبیت، منیش سەرزەنشتت ناکەم، لەبەر ئەوەی جێگەی ئەوەیە تووڕە بیت، هەر بۆیە بە سەر فەرمانبەرەکەدا هاوار دەکەیت و دەڵێیت: ها.. تۆ لە نەخۆشخانە دانیشتووی، یان لە قاوەخانە؟! ئەوە لە خودا ناترسیت؟! سەیرکە جگەرەش دەکێشێت!! نمونەی وەك تۆ پێویستە لە لای بەڕێوەبەر شکاتی لێ بکرێت، یان لە فەرمانگە دەربکرێت..

ئەمانەو چەندان قسەی توندوتیژی تریش.. ئایا ئەگەر وەڵامی تووڕەبوونەکەت، بە تووڕەبوون نەداوەتەوەو ڕۆژنامەکە لاببات و نەخۆشەکان ڕەوانەی لای پزیشك بکات، هەست دەکەیت بە سەر ئەو کێشەیەدا سەرکەوتنت بە دەست هێنابێت؟!

نەخێر.. ڕاستە بە شێوەیەکی کاتی چارەسەری کێشەکەت کرد، بەڵام لەوانەیە بەیانی، یان دوو بەیانی بە هەمان شێوە بگەڕێتەوە سەر هەڵسوکەوتەکەی پێشووی.. دەی کەواتە چی بکەین باشە؟!

کۆنترۆڵی ڕق‌و کینەت بکەو لەگەڵ کێشەکەدا بە ژیری هەڵسوکەوت بکە، نەك بە سۆز.. زەردەخەنە بخەرە سەر لێوت، با تووڕەش بێت.. بە زەردەخەنەوە لێی بچۆرە پێشەوەو بڵێ: سلاوت لێ بێت.. لەوانەیە لە ژێر لێوەوەو بە بێ ئەوەی سەیرت بکات، وەڵامت بداتەوەو چاوەکانیشی لە سەر وێنەی یاریزانێکی ناو ڕۆژنامەکەی بێت‌و بڵێت: سلاو لە تۆش..

کەمێك چاوەڕێ بکەو پاشان بە وتەیەك بیدوێنە، کە سەرنجی ڕابکێشێت، وەك ئەوەی پێی بڵێی: حاڵت چۆنە؟ خودا خێرت بە سەردا بڕێژێ.. بە دڵنیاییەوە سەری بەرز دەکاتەوەو دەڵێت: سوپاس بۆ خودا باشم..

تا ئێرە نیوەی ڕێگەکەت بڕیووە.. پاشان بە وتەیەکی خۆش بیدوێنەو بڵێ: بە ڕاستی کەسانی وەك جەنابت پێویست ناکات لە پێشوازی نەخۆشخانەدا کار بکات!! ڕەنگی دەگۆڕێت‌و دەڵێت: بۆچی؟! زۆر بە هێمنی پێی بڵێ: لەبەر ئەوەی ڕوخسارت ئەوەندە گەشاوەو جوانە، کاتێك نەخۆشەکان دەتبینن، ڕاستەوخۆ چاك دەبنەوەو پێویستیان بە پزیشك نامێنێت!!

زەردەخەنە دەکەوێتە سەر لێوی‌و ڕوخساری دەگەشێتەوەو بە دڵنیاییەوە، ئێستا گوێ لە ئامۆژگارییەکانت دەگرێت.. ئەوسا دەتوانیت پێی بڵێیت: برای شیرینم ئەو پیاوە بە ساڵاچووە دەبینیت؟! ئەی ئەو پیرێژنە هەژارە!! خۆزگە ڕەوانەی لای پزیشکت دەکرد..

یەکسەر کارەکانیان جێبەجێ دەکات‌و پاشان کارەکەی تۆش تەواو دەکات.. پێش ئەوەی بەجێی بهێڵی، پێی بڵێ: سبحان الله!! یەکەم جارە بە دیدارت شاد دەبم، نازانم چۆن ئاوا زوو چوویتە دڵمەوە؟! سوێند بە خودا لە هەزاران کەس، لە لام خۆشەویست تری.. (ڕاستە.. چونکە بە دڵنیاییەوە موسڵمانێکت لە ملیۆنەها بێباوەڕ خۆشتر دەوێت).. ئەوسا زیاتر دڵخۆش دەبێت‌و سوپاست دەکات..

پاشان پێی بڵێ: هەندێك قسەم هەبوو، خۆزگە گوێت لێدەگرتم، بەڵام دەترسم

تووڕەت بکەم.. ئەویش دەڵێت: نا.. نا.. فەرموو.. ئەوسا دەتوانیت ئامۆژگاری بکەیتو پێی بڵێیت: خودای گەورە بە فەزڵی خۆی ئەم وەزیفەیەی پێ بەخشیوویت، هەروەها لەبەر ئەوەی کارەکەت لە شوێنی پێشوازی کردنو ڕەوانە کردنی نەخۆش دایە بۆ لای پزیشك، پێویستە زۆر نەرمو نیان بیتو نمونەیەکی باش بیت لەگەڵ خەڵکیداو گرنگییان پێ بدەیت، چونکە لەوانەیە پیرەمێردێك یان پیرێژنێك لە تاریکی شەودا دەستەکانی بەرز بکاتەوەو دۆعایەکی خێرت بۆ بکات..

بە دڵنیاییەوە سوپاست دەکاتو داوای پاداشتی خودات بۆ دەکات.. بە هەمان شێوە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکانی تریشدا بکە، وەك کەسێك گرنگی بە نوێژەکانی نادات، یان باوکێك گرنگی بە کچەکانی نادات و لە سەر بالآپۆشییان لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکات، یان گەنجێك دەبینیت لەگەڵ باوكو دایکیدا باش نیە، پێویستە هەموو ئەمانە بە شێوازێکی جوان ئامۆژگاری بکەیت..

بەڵێ.. وتەو وشەی جوان بەکاربهێنەو ڕێزیان بگرەو گوێ لە بیرو بۆچوونەکانیان ڕابگرە.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗ ... ﴿١٢﴾﴾ المجادلة. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك ویستتان چپەیەك، یان قسەیەکی نهێنی لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بکەن، پێش ئەو کارە، خێرێك بکەن)..

پێغەمبەری خوداشﷺ بە شێوازێکی ئەوەندە جوان ئامۆژگاری خەڵکی کردووە، کە یەکسەر پێی ڕازی بوونو لێیان وەرگرتووە.. ئەوەتا کاتێك دەیەوێت مەعازی کوڕی جەبەلؓ فێری زیکرێك بکات، پێی دەفەرموێت: ئەی مەعاز.. سوێند بە خودا خۆشم دەوێیت، دوای هەموو نوێژێك، بڵێ: اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك.. بۆیە لەم کاتەدا باسی ئەوەی کردو فەرمووی: سوێند بە خودا خۆشم دەوێی، بۆ ئەوەی ئامادەی بکات، بۆ وەرگرتنی ئەو ئامۆژگاریو زانیارییە.. کاتێك مەعازؓ گوێ بیستی ئەو موژدە خۆشە دەبێتو دڵی ئارام دەبێت، ئەوسا پێغەمبەری خوداﷺ ئامۆژگارییەکەی پێشکەش دەکات..

جارێکی تریان پێغەمبەری خوداﷺ دەستی عبداللەی کوڕی مەسعودؓ وەکو سۆزو خۆشەویستیەك دەگرێتو پێی دەفەرموێت: ئەی عبداللە ئەگەر دانیشتی بۆ

تەحیات، بڵێ: التحيات لله والصلوات والطيبات، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته.. عبداللهﷺ وتەكانی پێغەمبەری خوداﷺ لەبەر دەكاتو لە دوای تێپەڕ بوونی چەندین ساڵو دوای كۆچی دوایی پێغەمبەری خوداﷺ، عبداللهﷺ شانازی بەو هەڵوێستەی پێغەمبەری خوداوەﷺ دەكاتو دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺ خۆی فێری تەحیاتی كردم، لە كاتێكدا دەستەكانی لە سەر دەستم بوو..

ڕۆژێكی تریان پێغەمبەری خوداﷺ تێبینی ئەوەی كرد، ئیمامی عومەرﷺ كاتێك دەیەوێت بە دەوری كەعبەدا تەواف بكاتو بەردە ڕەشەكە ماچ بكات، لەوانەیە بەهۆی بەهێزی جەستەیەوە، خەڵكی ئازار بداتو لاوازو پیرەكان نارەحەت بكات.. پێغەمبەری خوداﷺ ویستی پێش ئەوەی ئامۆژگاری بكات، قسەیەكی پێ بڵێت، كە دڵی خۆش بكات، هەر بۆیە سەرەتا پێی فەرموو: ئەی عومەر، تۆ پیاوێكی بەهێزیت.. ئیمامی عومەرﷺ بە بیستنی ئەم قسەیە، زۆر خۆشحاڵ بوو، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: لە لای بەردە ڕەشەكە پاڵەپەستۆ مەكە..

جارێكی تریان دەیەوێت ئامۆژگاری عبداللەی كوڕی عومەر بكات، پێی دەفەرمووێت: عبدالله پیاوێكی زۆر چاك دەبوو، ئەگەر شەو نوێژی بكردایە.. یان پێی دەفەرمووێت: ئەی عبدالله وەك فلانە كەس مەبە، شەو نوێژی دەكرد، بەڵام دوایی وازی لێ هێنا..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ هەموو كەسێكدا هەڵسوكەوتو شێوازو گوفتاری جوانی بەكار دەهێنا..

لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا، پیاوێك هەبوو لە شاری مەدینە، بە ناوی سوەیدی كوڕی صامت، ئەم پیاوە دەم سپیو گەورەی هۆزەكەی بوو، پیاوێكی ژیر بوو، هەروەها شاعیریش بوو، زۆرێك لە وتەی دانایانی لەبەر بوو، هەتا وا بە ناوبانگ بوو، هەر چی پەندو وتەی لوقمانی حەكیم هەیە، هەمووی لەبەر بووە..

ڕۆژێك ئەم پیاوە بۆ حەج یان بۆ عومرە، دەچێت بۆ مەككە.. خەڵكی كاتێك هەواڵی هاتنی بۆ مەككە دەبیستن، دەچن بۆ بینینی، پێغەمبەری خوداشﷺ كاتێك دەبیستێت، پیاوێكی وا هاتووە بۆ مەككە، ئەمیش دەچێت بۆ لایو بانگی دەكات بۆ ئەوەی موسڵمان بێتو باوەڕ بە تەنهایی پەروەردگار بهێنێت، هەروەها بۆی ڕوون دەكاتەوە، كە كۆتا پێغەمبەرەو ئەم قورئانەش وتەی پەروەردگارەو پڕە لە پەندو

ئامۆژگاری‌و بنەمای بەڕێوەبردن..

سوەید دەڵێت: لەوانەیە ئەوەی بە تۆیە، وەك ئەوە وا بێت کە بە منە..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: تۆ چیت پێیە؟! سوەید دەڵێت: پەندو ئامۆژگارییەکانی لوقمانی حەکیمم پێیە.. سوەید وتەو پەندەکانی خۆیی‌و لوقمانی حەکیمی خستە بەرامبەر وتەکانی قورئانی پیرۆز، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ بە هیچ شێوەیەك تووڕە نەبوو، بەڵکو داوای لە سوەید کرد، هەندێکی بۆ بڵێ..

سوەید هەندێك لە پەندەکانی لوقمانی حەکیمی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ خوێندەوەو پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر بە ئارامی گوێی گرتبوو، کاتێك سوەید تەواو بوو، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەم وتانە چاك‌و جوانن، پاشان فەرمووی: بەڵام ئەوەی بە منە، لەمە باشترە، لەبەر ئەوەی ئەوەی من، قورئانەو لە لایەن پەروەردگارەوە بۆم دابەزیووەو بریتیە لە ڕوناکی‌و ڕێنمایی، پاشان هەندێك قورئانی بۆ خوێندو بانگی کرد، بۆ ئەوەی موسڵمان بێت..

سوەید زۆر بە هێمنی گوێی گرتبوو، پاشان سوەید ڕۆیشت، بەڵام کاریگەری پێغەمبەری خودایﷺ لە سەر دروست ببوو، کاتێك ڕۆیشتەوە بۆ مەدینە، زۆری پێنەچوو، لە نێوان هەر دوو هۆزی ئەوس‌و خەزرەجەوە، جەنگ‌و کوشتار دروست بوو، سوەید لە هۆزی ئەوس بوو، لە لایەن هۆزی خەزرەجەوە دەکوژرێت، ئەمەش پێش کۆچ کردنی پێغەمبەری خوداﷺ بوو بۆ شاری مەدینە، ناشزانرێ موسڵمان بوو، یان نا؟ هەر چەندە هەندێك لە پیاوانی هۆزەکەی دەڵێن: کاتێك کوژرا، موسڵمان ببوو..

لە هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوداﷺ ورد بەرەوە، چۆن توانی بە ڕەوشتی جوان، دڵی کەمەندکێش بکات..

**بە کورتی..**

لە ستایش‌و پێزانین‌و هانداندا، زیادەڕەوی بکەو هەمیشە ڕەخنەگر مەبە..

# پاشەکەوتو سەرمایەی سۆزداری..

کاتێك لە بازار کەسێك بە رِوویەکی گرژەوە دەبینیت، پاشان جارێکی تریش لە دوکانێك بە هەمان رِوخسارەوە دەیبینیت، پاشان لە ئاهەنگێکی هاوسەرداریدا، دوبارە بە رِوویەکی گرژو مۆنەوە دەیبینیت، ئیتر بۆ هەمیشە وێنەی ئەو کەسە بە رِوخسارێکی گرژو ترش‌و تاڵەوە، لە خەیاڵتدا جێگیر دەبێت.. کاتێك وێنەکەی دەبینیت، یان گوێت لە ناوی دەبێت، راستەوخۆ تووڕەییەکەی دێتەوە پێش چاوت.. ئایا وانیە؟!

خۆ ئەگەر کەسێکی رِووخۆش‌و لێو بە خەندە ببینیت، پاشان بۆ جاری دووەم‌و سێیەمیش لە شوێنێکی تردا بە زەردەخەنەوە بیبینیتەوە، ئەوا وێنەی ئەو کەسە لە خەیاڵتدا بە رِوخسارێکی گەشاوەو دەم بە خەندەوە تۆمار دەبێت..

ئەمە سەبارەت بە کەسانێك، کە زۆر نایانبینین‌و زۆر هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ناکەین، بەڵام ئەمە بۆ ئەو کەسانە نیە، کە زۆر دەیان بینین‌و بەردەوام هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەین، وەك هاوسەرو منداڵەکانمان.. دراوسێکانمان.. هاورێکانی فەرمانگەو سەر کارەکانمان.. چونکە ئەم کەسانە مەرج نیە بەردەوام دەم بە خەندە، یان تووڕە بن..

نەخێر.. لەبەر ئەوەی زۆر هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەین، بە رِوو گرژی‌و بە رِووخۆشیش دەیان بینین، لەبەر ئەوەی ئەوانیش مرۆڤن‌و هەست‌و سۆزیان هەیە.. بە خۆشەویستی ئەو کەسانەش بۆ ئێمە، بە ئەندازەی چاکەو خراپەی ئێمەیە بۆیان.. بە مانایەکی تر خۆشەویستی ئەوان بۆ ئێمە، لە سەر بنەمای ئەو چاکەو خراپانەیە، کە بەرامبەریان ئەنجاممان داوەو بۆیان پاشەوکەت کردووین..

چۆن؟! کاتێك بەرامبەر بە کەسێك هەڵوێستی جوان دەنوێنیت، ئەوا ئەو کەسە، ئەو هەڵوێستە جوانەت، لە تیانوسی خەیاڵیدا تۆمار دەکات‌و هەڵی دەگرێت.. واتە لە دڵ‌و دەروونیدا جێگەیەك دیاری دەکات، بۆ هەڵگرتنی چاکەو جوانیەکانی تۆو پاشان ئیتر یان ئەوەتا چاکەکانت لەو شوێنە دیاریکراوەدا زیاد دەبێت، یان بە هۆی خراپەو هەڵسوکەوتی نەشیاوەوە، ئەو پاشەکەوت‌و چاکانەت، کەم دەکات‌و لێیان رادەکێشێت..

هەر زەردەخەنەیەك‌و هەر رِوویەکی خۆش، سەرمایەو پاشەکەوتی چاکەکانی تۆ زیاد دەکەن‌و پاشان دەبێتە هۆی پاشەکەوتی سۆزداریت‌و لە لای کەسانی بەرامبەر، خۆشەویست دەبیت.. بە هەمان شێوە دیارییەکانت، گوفتارو کردارە جوانەکانت، پاشەکەوتی سۆزداریت زیاد دەکەن.. جنێوو هەڵسوکەوتە ناشیرینەکانت، دەبنە هۆی کەم

بوونەوەی پاشەکەوتی سۆزداریت، چونکە کارە خراپەکانت، دەبنە هۆی کەم کردنەوەی کارە چاکەکانت.. ئەگەر پاشەکەوتی سۆزداریت، یان پاشەکەوتی چاکەکانت زۆر بوون، ئەوا ئەگەر رۆژێك هەڵەیەکیش بکەیت، کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەرت نابێت..

وإذا الحبيب أتى بذنب واحد جاءت محاسنه بألف شفيع..

بەڵێ.. کاتێك کەسێکی خۆشەویست، تەنها هەڵەیەك دەکات، هەزاران لە چاکەکانی دێنو دەبن بە تکاکار بۆی.. بەڵام ئەگەر پاشەکەوتی چاکەکانت خاڵی بن، ئەوا ناتوانی هیچی لێ رابکێشیتو خەڵکی بە ئاسانی لە هەڵەکانت نابوورن، یان دەبیت بە کەسێکی بێزراوو رقیان لێت دەبێت..

کاتێك پرسیار لە ئافرەتێکی تەڵاقدراو دەکەیتو پێی دەڵێیت: بۆچی تەڵاق درایت؟! لە وەڵامدا دەڵێت: لەبەر هۆیەکی زۆر هیچ، هاوسەرەکەم داوای لێکردم بە یەکەوە سەردانی خوشکەکەی بکەین، منیش رازی نەبووم، ئەویش توورە بوو، دەستی بە جنێودان کردو پاشان تەڵاقیدام!!

ئەگەر بە وردی لە هۆکاری تەڵاقدانەکە وردبینەوە، ئەو هۆکارە تاکە هۆکاری تەڵاقدانەکە نیە، بەڵکو بابەتەکە وەکو بابەتی پشت شکانی وشترەکە وایە!!

دەگێرنەوە پیاوێك وشترێکی زۆر بەهێزی دەبێت، دەیەوێت گەشتێك بکات، هەر بۆیە خۆی کۆ دەکاتەوەو شمەکەکانی دەخاتە سەر پشتی وشترەکەیو بە توندی دەیان بەستێتەوە.. پیاوەکە بە ئەندازەی چوار وشتر، شمەك لە سەر پشتی وشترەکەی بار دەکات.. وشترەکە لەبەر گرانی بارەکەی، دەکەوێتە لەرزە لەرز..

خەڵکیش بە سەر پیاوەکەدا هاوار دەکەنو دەڵێن: بەسی لێ بار بکە..

لە کۆتاییدا تەنها شتێکی سوكو بچوك دەمێنێتەوە، وەك پارچە قایشێك، یان پشتێنێك، پیاوەکە دەڵێت: تەنها ئەمە ماوەو کۆتا شتە، کاتێك هەڵی دەداتە سەر پشتی وشترەکە، وشترەکە دەکەوێتە سەر زەویو توانای لێدەبرێتو پشتی دەشکێت!!

ئەگەر وردبینەوە، دەبینین ئەو شتە سوکەی کۆتایی، پشتی وشترەکەی نەشکاند، بەڵکو ئەو کۆڵو بارە گرانەی کابرا لە وشترەکەی بار کرد بوو، بوو بە هۆی شکانی پشتی وشترەکە.. وشترەکە هەر ئارامی گرتو هەر ئارامی گرت، هەتا توانای نەماو بەو شتە سوكو بچوکە، چۆکی داداو پشتی شکا..

هۆکاری تەڵاقدانی ئەو ئافرەتەش، نەچوونی بۆ سەردانی خوشکی پیاوەکەی نیە، بەڵکو کۆمەڵە هۆکارێك کۆبوونەتەوەو لە کۆتاییدا بەو هۆکارەوە تەڵاقدرا.. پێشتر بە دەم داخوازییەکانی هاوسەرەکەیەوە نەچووە.. ئارەزووەکانی بەجێ نەهێناوەو خۆشەویستی بۆ دەرنەبڕیووەو لە بەرامبەریدا خۆی بە گەورە زانیووەو رێزی لە بۆچوونەکانی

نەگرتووەو بەردەوام لە پاشەکەوتی سۆزداریو خۆشەویستی ڕاکێشاوەو هیچ شتێکی باشیشی پاشەکەوت نەکردۆتەوەو بەردەوام مێردەکەی بریندار کردووەو ڕۆژێك هەولی نەداوە برینەکانی هاوسەرەکەی سارێژ بکات..

هاوسەرەکەشی هەر ئارامی گرت، هەتا چۆن ئەو شتە بچوكو سوکە پشتی وشترەکەی شکاند، ئاوا کێشەیەکی بچوك بوو بە هۆی ئەوەی ئیتر نەتوانێت ئارام بگرێتو ئەوە ڕوویدا کە ڕوویداو خێزانەکەی تەلاقدا..

خۆ ئەگەر ئافرەتەکە هەوڵی بدایە پاشەکەوتی سۆزداری خۆی زیاد بکردایەو بیلاواندایەتەوەو خۆشەویستی بۆ دەربېڕیایەو گرنگی بە خواردنو پۆشوودانی هاوسەرەکەی بدایەو ڕێزی لە بۆچوونەکانی بگرتایە، ئەو کاتە پاشەکەوتی چاکەکانی زۆر دەبوو، ئەوسا ئەگەر کارێکی نەشیاویشی بکردایە، دەیتوانی لە پاشەکەوتەکانی ڕابکێشێتو خراپەکانی لە زەریای چاکەکانیدا ون دەبوونو دیار نەدەمان..

قوتابیەکی هاروهاجو پشێو، کاتێك هەڵەیەکی بچوك دەکاتو مامۆستاکەشی لێی تورە دەبێتو لێی دەداتو لەپۆلیش دەیکاتە دەرەوە، قوتابیەکە سکاڵای خۆی دەردەبڕێتو دەڵێت: فلانە هاورێم هەڵەیەکی لە هەڵەکەی من گەورەتریشی ئەنجامدا، کەچی مامۆستا وەکو من سزای نەداو هەر گوێشی پێنەدا، هەڵەی من تەنها ئەوەندە بوو، بە بێ پرس نوکتەیەکی خۆشم گێڕایەوە، کەچی ئاوای لێکردم..

ئەم قوتابیە ئاگاداری ئەوە نیە، نوکتەکەی وەکو کۆتا شتی سەر پشتی وشترەکە وابوو، کە پشتی وشترەکەی شکاند..

کەواتە: ئێمە هەموومان هەمیشەو بەردەوام پێویستمان بەوە هەیە، لە هەموو شوێنو دۆڵو ناوچەیەکدا پاشەکەوتی سۆزداریو خۆشەویستی خەڵکیمان هەبێت.. ئافرەتان پێویستە هەلی بە دەست هێنانی دڵی هاوسەرانیان بە دەست بهێننو بەردەوامیش زیاتری لێ پاشەکەوت بکەن.. هەروەها پیاوانیش بە هەمان شێوە.. منداڵانیش پێویستە دڵی باوكو دایکیان داگیر بکەنو خۆیان خۆشەویست بکەن.. هەروەها مامۆستا لەگەڵ قوتابیو قوتابی لەگەڵ مامۆستاو برا لەگەڵ براو بەڕێوەبەر لەگەڵ فەرمانبەرانداو بە پێچەوانەشەوە..

**بە کورتی..**

**کاتێك کەسێکی خۆشەویست تەنها هەڵەیەك دەکات، چاکەکانی هەزاران تکای بۆ دەکەن..**



## وتەی کاریگەر..

خۆ قسە پارەی تێناچێت!! دەبا گوێمان لە قسەیەکی خۆشیش بێت!! ئەمە قسەی ئافرەتێکی هەژار بوو، کاتێك سکاڵای لە مێردەکەی دەکردو گلەیی لێدەکرد.. ڕاستە هاوسەرەکەی خواردنو جلوبەرگو هەموو پێداویستیەکانی، بۆ دابین کرد بوو، بەڵام لەگەڵ خێزانەکەیدا قسە شیرین نەبوو.. شارەزایی لە هونەری وتەی خۆشدا نەبوو..

کەسانی ژیرو بلیمەت، کۆکن لە سەر ئەوەی گرنگترین خاڵی بەهێزی فرۆشیاری زیرەك بریتیە لە: زمان شیرینیو قسە خۆشی.. کاتێك کریارێك دێت بۆ لای، خێرا خێرا دوبارەی دەکاتەوەو دەڵێت: چاوەکەم.. فەرموو.. وازی لێ بهێنە با لە سەر خۆمان بێت.. ماندوو بوون بۆ بەڕێزت، مایەی کامەرانیە.. هەروەها گرنگترین خاڵە بەهێزەکانی سکرتێریش بریتیە لە زمان شیرینیو قسە خۆشی.. جاری وا هەیە ئافرەتێك لە ڕادەبەدەر هاوسەرەکەی خۆش دەوێت، لەبەر ئەوەی قسە شیرینەو زمان شیرینە، هەر چەندە هاوسەرەکەی کەسێکی چروكو جوانیش نەبێت..

بیرم دێت گەنجێکی تازە پێگەیشتوو هەبوو، توانایەکی سەیری لە ڕازی کردنی کچاندا هەبوو.. زۆرێك لە کچانی بە خۆشەویستی فریودا بوو، ئەوەی جێگەی سەرسامی بوو، ئەوە بوو خاوەنی ئۆتۆمبیلێکی مۆدێل بەرزو گیرفانێکی پڕیش نەبوو، بە ئارەزووی خۆیان دیارییان بۆ بکرێت..

گومانیش نەبەی کەسێکی ڕۆح سوكو جوانیش بوو بێت، داواکارم خودای پەروەردگار بە بینینی دیمەنی ناشیرینی ئەو گەنجە تاقیت نەکاتەوە!! تەنها خاوەنی زمانێکی هەنگوینی بوو، بەردی دەکرد بە ئاو، بە زمانی ئەو کچانەی ڕازی دەکردو هەڵی دەخەڵەتاندن!!

دەی هەوڵبدە بە جوانترین وشە بەرامبەرەکەت بدوێنە، کاتێك کەسێك پێت دەڵێت: فلانە کەس داوای کارێکت لێدەکەم.. بڵێ: فەرموو.. خزمەتی کەسانێکم کردووەو کارم بۆ کردوون، هاوتای پێڵاوەکەی بەڕێزت نابن.. ئەم شێوازە جوانو وتە شیرینو خۆشانە، لەگەڵ دایكو باوكو هاوسەرو منداڵو هاوڕێکانتدا بەکار بهێنە، لەبەر ئەوەی هەرگیز زیانت پێناگاتو وەکو جادوگەر، دەتوانیت بە بەکارهێنانی شێوازو گوفتارو ڕەفتاری

جوان، جادو لە خەڵکی بکەیت..

سەیری ئەم دیمەنەی جەنگی حونەینی ئیماندارانی پشتیوانانی مەدینە بکە.. پشتیوانان، ئەو ئیماندارانە بوون لە جەنگی بەدردا شان بە شانی پێغەمبەری خوداﷺ دژی بێباوەڕان جەنگان و کوشتاریان کرد.. لە جەنگی ئوحودیشدا بە هەمان شێوە.. لە جەنگی خەندەقیشدا بە توندترین گەمارۆ، گەمارۆدران.. لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ بەردەوام بوون، هەتا شاری مەککە ڕزگار کرا، پاشان بەرەو جەنگی حونەین کەوتنە ڕێ..

لە سەرەتای دەست پێکردنی جەنگی حونەیندا، موسڵمانان نارەحەت بوون و زۆربەیان بڵاوەیان لێکردو تارادەیەك شکان.. پێغەمبەری خوداﷺ سەیری هاوەڵانی کرد، بە بەرچاویەوە هەڵدەهاتن و ڕایان دەکرد!! هەر بۆیە هاواری لە پشتیوانان کردو بانگی کردن.. ئەوانیش بە دەم بانگەکەی پێغەمبەری خوداوەﷺ هاتن و گەڕانەوەو ڕیزەکانیان ڕێکخستەوەو کەوتنەوە جەنگ و کوشتار.. گەردنیان کرد بوو بە قەڵغان بۆ پاراستنی پێغەمبەری خوداﷺ، هەتا بێباوەڕان شکان و سەرکەوتن بۆ موسڵمانان گەڕایەوە..

جەنگ کۆتایی هات و دەستکەوتەکان کۆکرانەوەو هەموو چاوەڕێ بوون، پێغەمبەری خوداﷺ بەشیان بدات، لەبەر ئەوەی هەر کەسەو بیری لە برسێتی و نەبوونی ماڵ و منداڵ و کەس وکاری دەکردەوەو هیوای دەخواست، لە دەستکەوتەکە شتێکی وای بەربکەوێت، بۆ ئەوەی کەمێك حاڵی ماڵ و منداڵی پێ باش بکات..

پێغەمبەری خوداﷺ بانگی ئەقرەعی کوڕی حابسی کرد، کە تازە موسڵمان ببوو، سەد وشتری پێدا.. پاشان بانگی ئەبوسوفیانی کردو سەد وشتری دا بەویش.. پێغەمبەری خوداﷺ بەردەوام سەروەت و سامانی بە سەر خەڵکانی شاری مەککەدا دەبەخشیەوە، لە کاتێکدا بە هاوتای خەڵکانی مەدینە، قوربانییان نەدابوو، وەکو ئەوانیش لە پێناوی ئیسلامدا تێنەکۆشا بوون..

کاتێك پشتیوانانی مەدینە ئەم حاڵەیان بە چاوی خۆیان بینی، هەندێکیان لە ناوخۆیاندا بە یەکتریان دەوت: خودا لە پێغەمبەری خوداﷺ خۆش بێت، بەشی قوڕەیش دەدات، بەڵام بەشی ئێمە نادات، خۆ هێشتا شمشێرەکانمان خوێنی قوڕەیشی لێدەتکێ!!

کاتێك سەعدی کوڕی عوبادەی گەورەیان، هەست بەمە دەکات، دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و پێی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هاوەڵانت لە پشتیوانان ئاواو ئاوا دەڵێن..

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئەی سەعد تۆ چی دەڵێیت؟ سەعدرضي الله عنه دەڵێت:

منیش کەسێکم لە هۆزەکەم..

پێغەمبەری خوداﷺ هەستی کرد، پێویستە چارەسەری ئەم بابەتە بکاتو زیاتر بچێتە دڵیانەوە، هەر بۆیە فەرمووی: دەی پشتیوانانم بۆ کۆ بکەرەوە، کاتێك کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوداﷺ سوپاسی پەروەردگاری کردو پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکانی پشتیوانان، پێم گەیشتووە چیتان وتووە..

ئەوانیش دەڵێن: گەورەو سەرکردەکانمان هیچیان نەوتووە، ئەگەر قسەیەکیش کرا بێت، هەندێك لە خەڵکە ئاساییەکانمان ئەو قسانەیان کردووە!! پاشان پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئەی کۆمەڵانی پشتیوانان، ئەی ئێوە گومراو سەرلێشێواو نەبوون؟! ئەی خودا بە هۆی منەوە ڕێگەی نیشان نەدانو ڕێنمایی نەکردن؟! هەموو وتیان: بەڵێ.. وابوو..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەی هەژار نەبوون، پەروەردگار دەوڵەمەندی کردن؟! ئەی دوژمنی یەکتر نەبوون، خودای پەروەردگار دڵەکانی یەك نەخستنو نەیکردن بە برا؟! وتیان: بەڵێ.. وابوو..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵانیش بێدەنگ دەبنو چاوەڕێ دەکەن، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: ئەوە بۆ وەڵامم نادەنەوەو بێدەنگن؟! ئەوانیش دەڵێن: بڵێین چیو وەڵامی چیت بدەینەوە، هەموو فەزڵو پلەو پایەیەك هەر بۆ خودای گەورەو پێغەمبەرەکەیەتیﷺ..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەگەر بتان ویستایە، دەتان توانی بڵێن: کاتێك هاتی بۆ لامان، خەڵکی بە درۆیان خستیتەوەو ئێمە بە ڕاستمان زانیت.. لاواز بوویتو ئێمە سەرمان خستیت.. دەریان کردیتو ئێمە داڵدەو پەنامان دایت.. بەم وتە جوانانە، هەستو سۆزی بزواندنو پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکانی پشتیوانان، ئایا ڕازی نابن خەڵکی بە وشترو مەڕو بزنەوە بڕۆنەوەو ئێوەیش پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ خۆتاندا بەرنەوە بۆ ماڵەکانتان؟!

ئەگەر خەڵکی هەموو بە شیوو دۆڵێکدا بڕۆنو پشتیوانانیش بە شیوو دۆڵێکدا بڕۆن، ئەوا من ئەو شیوو دۆڵە دەگرمە بەر، کە پشتیوانان گرتویانەتە بەر.. سوێند بەو خودایەی گیانی محمدی بە دەستە، ئەگەر کۆچ کردن نەبووایە، ئەوا پیاوێك دەبووم لە پشتیوانان.. خودایە لەگەڵ پشتیوانانو نەوەی پشتیوانانو نەوەی نەوەی پشتیوانان‌دا بەسۆزو میهرەبان بە..

پشتیوانان کاتێك گوێیان لەم وتە پیرۆزانەی پێغەمبەری خوداﷺ بوو، دەستیان کرد بە گریان، هەتا فرمێسك ڕیشی تەڕ کردن‌و وتیان: هەمووومان ڕازین پێغەمبەری خوداﷺ بەش‌و پشکی ئێمە بێت.. پاشان هەموو بڵاوەیان لێکرد..

ئای پێغەمبەری خوداﷺ چەندە ڕەوشت بەرزو جوانیت!!

دەگێڕنەوە لە میسر پیاوێکی ستەمکار هەبوو بە ناوی پاشا.. ئەم پیاوە چەند کێڵگەیەکی کشتوکاڵی هەبوو.. کارگوزارو ڕەنجبەرو خزمەتگوزارەکانی بەر دەستی، زۆر ئازار دەداو زۆری کار پێدەکردن.. ڕۆژ هات‌و ڕۆژ ڕۆیی، پاشا زەوی‌وزارو کشتوکاڵەکەی لە دەست چوو.. لە دوای دەوڵەمەندی هەژار کەوت‌و ماڵ‌و منداڵەکەی ڕووت‌و ڕەجاڵ‌و برسی بوون‌و هیچ سەرچاوەیەکی بژێویشی نەبوو، جگە لە کاری کشتوکاڵیش، هیچ کارێکی تری نەدەزانی..

پاشا هەستاو کەوتە گەڕان بە دوای دۆزینەوەی کارێکدا، بەڵام چ کارێك؟! ڕووی کردە کێڵگەی یەکێك لەو کەسانەی سەردەمانێك لە لای کاریان کرد بوو، زۆریش ئازاری دابوو.. زۆر بە داماویەوە، چووە بەردەم خاوەن کێڵگەکەو داوای کرد کاری لە لا بکات، جا میوە ڕنین بێت، داربڕین بێت، بژارکردن بێت، یان هەر کارێکی تر..

کابرای خاوەن کێڵگە کاتێك پاشای بینی، بە ڕوویدا هەڵشاخاو وتی: تۆ لە لای من کار بکەیت؟! تۆی خۆ بە گەورەزان‌و ستەمکاری دڵ ڕەق!! سوپاس بۆ خودا کە دوعاکانی وەرگرتین‌و ئەوا سەرشۆڕی کردوویت، پاشان لە کێڵگەکەی دەری دەکات..

پاشا بە دڵتەنگیەوە دەڕوات‌و قاچەکانی بە دوای خۆیدا پەل کێش دەکات، هەتا دەگاتە کێڵگەی یەکێکی تر لەوانەی کە پێشتر زۆری ئازاردا بوون، ئەویش بە هەمان شێوەی خاوەن کێڵگەی یەکەم دەری دەکات..

پاشا بۆ لای کەسی سێیەم دەڕوات‌و دەیەوێت ئەمیشیان تاقی بکاتەوە.. کاتێك خاوەن کێڵگەی سێیەم پاشا دەبینێت، سەرسام دەبێت، ئەمیش بە دەست پاشاوە ستەم‌و ئازارێکی زۆری چەشتبوو.. بە هەر حاڵ پاشا هاتە قسەو وتی: منداڵەکانم زۆریان برسیەو بە دوای کارێکدا دەگەڕێم..

خاوەن کێڵگەکە ویستی زۆر زیرەکانە تۆڵەی خۆی لە پاشا بسەنێتەوە، هەر بۆیە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردو پێی وت: یاخوا بەخێربێیت پاشا، بە ڕاستی کێڵگەکەت ڕوناك کردەوە.. پاشای گەورە هاتووە بۆ کێڵگەکەی من؟! زۆری بە پاشادا هەڵدا، هەتا فریویداو بەم قسە بریقەدارانە، سڕی کرد، پاشان وتی: تەنها یەك کارم هەیە، بەڵام

نازانم لەگەڵ تۆدا دەگونجێت یان نا؟!

ئەمڕۆ کێڵگەکەم دەکێڵم، دووگا گاسنەکانیان ڕا دەکێشا، گایەکی ڕەش و یەکێکی سپی، بە داخەوە ئەمڕۆ گا ڕەشەکەیان نەخۆشەو ناتوانێت کار بکات، گاسپیەکەش ناتوانێت بە تەنها گاسنەکان ڕابکێشێت، دەمەوێت ئەمڕۆ لە جێگەی گا ڕەشەکەیان کار بکەیت!! تۆ زۆر بەهێزیت پاشا.. تۆ سەرکردەی.. تۆ هەمیشە پێشرەومانی..

پاشا کاتێك گوێی لەم پیاهەڵدانانە دەبێت، زۆر بە شانازییەوە، دەچێت بۆ لای گا سپیەکەو بە یەکەوە دەست بە کێڵانی کێڵگەکە دەکەن.. خاوەن کێڵگەکەش لەگەڵ گا سپیەکەدا پاشا دەبەستێتەوەو زوو زوو دوبارەی دەکاتەوەو دەڵێت: ئەی باشترین پاشای جیهان.. ئەی بەهێزو پاڵەوان.. پاشان خاوەن کێڵگەکە سواری گاسنەکان دەبێت و بە قامچیەکەی دەستی بە گا سپیەکەدا دەکێشێ، گا سپیەکەش کاتێك دەجوڵێ و هێز دەداتە خۆی، پاشاش لەگەڵ خۆیدا ڕادەکێشێ..

بەڵێ.. پاشا هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە وەکو کەسێك ژیری لە دەست دابێت، لە جێگەی گا ڕەشەکە جوت دەکات، کاتێك ئێوارە دادێت، خاوەن کێڵگەکە حەبلەکان لە مل و شانی پاشا دەکاتەوەو دەڵێت: بە ڕاستی کارێکی زۆر باشت کرد..

ئەی پاشا.. ئەمڕۆ خۆشترین ڕۆژی تەمەنمە.. پاشان پاشا کرێکەی وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.. شان و ملی بریندار ببوون و خوێن لە قاچەکانی دەچۆڕاو عەرەق هەموو گیانی داگرتبوو، بەڵام هێشتا بەنجەکە بەری نەدابوو..

کاتێك دەگەڕێتەوە، منداڵەکانی پرسیاری لێدەکەن و دەڵێن: کارت دۆزیەوە؟! پاشاش زۆر بە شانازییەوە دەڵێت: بەڵێ.. من پاشام پاشا، چۆن کار نادۆزمەوە؟!

منداڵەکانی دەڵێن: دەی چ کارێکت کرد ئەمڕۆ؟! پاشاش لە وەڵامدا دەڵێت: ها.. چ کارێکم کرد؟! ئیتر بەرە بەرە خەریك بوو بەنجەکە بەری دەداو بیری کەوتەوە، ئەمڕۆ چیان بە سەر هێناوە، کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان وتی: ئەمڕۆ لە جێگەی گا ڕەش کارم کرد!!

**بڕیار..**

کاتێك دەدوێیت، جوانترین وشە هەڵبژێرە، هەر وەك چۆن جوانترین میوە هەڵدەبژێریت..



## نزاو پاڕانەوە..

لێرەدا نامەوێت باسی فەزڵو گەورەیی نزاو پاڕانەوەو شێوازو مەرجەکانی گیرابوونی بکەم، لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەمانەوە نیە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە، چۆن بتوانین لە ڕێگەی نزاو پاڕانەوەوە، خۆشەویستی خەڵکی بە دەست بهێنینو دڵیان کەمەند کێش بکەین؟!

پێغەمبەری ئازیزیشﷺ لە پەروەردگار پاڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی بۆ سەر جوانترینو ڕەوشتو ئاکارەکان، ڕێنمایی بکات..

دەگەڕێینەوە بۆ بابەتەکەی خۆمان، چۆن بتوانین نزاو پاڕانەوەکان، بۆ بە دەست هێنانی خۆشەویستی خەڵکی بەکار بهێنین؟! بە شێوەیەکی گشتی خەڵکی پێیان خۆشە لە پەروەردگار بۆیان بپاڕێیتەوە، هەتا لە کاتی سڵاو کردنیشدا، پێیان خۆشە لەگەڵ هەواڵ پرسیندا، دوعایان بۆ بکەیتو بۆیان بپاڕێیتەوەو بڵێیت: خودا بت پارێزێتو دامەزراوت بکات..

کاتێك کەسێك دەبینیت، منداڵەکانی لەگەڵیدان، پێی بڵێ: خودا بە منداڵەکانت چاوو دڵت ڕۆشن بکات.. خودا وایان لێ بکات لەگەڵتدا زۆرباش بنو خزمەتت بکەن.. من خۆم کاریگەری نزاو پاڕانەوەم تاقی کردۆتەوە، کە چۆن نزاو پاڕانەوە، بوو بە هۆی ڕێنمایی کەسێك..

یەك دوو ساڵێك لەمەوبەر، کەناڵێکی ئاسمانی، لە شەوێك لە شەوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا، بۆ بەرنامەیەکی ڕاستەوخۆ بانگهێشتیان کردم.. بەرنامەکەش لە شاری مەککەو لە یەکێك لە میوانخانەکانی بەرامبەر حەرەمی پیرۆزدا بوو.. لە بارەی مانگی ڕەمەزانەوە قسەم بۆ کردنو ئامادەبووانیش، لە پەنجەرەکانی میوانخانەکەوە سەیری کەعبەی پیرۆزیان دەکردو سوڕانەوەی موسڵمانان بە دەوریدا، دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشو ئیمانی جوانی بە بەرنامەکە بەخشی بوو..

دیمەنەکە هێندە کاریگەر بوو، تەنانەت پێشکەشکاری بەرنامەکە دەستی کرد بە گریان.. ئەوەی لە لامان ناخۆش بوو، دیمەنی تەنها یەکێك لە وێنەگرەکان بوو، ئەو وێنەگرە بە دەستێکی وێنەی بەرنامەکەی دەگرتو بە دەستەکەی تری جگەرەی

دەكێشا!! بە شێوەیەك جگەرەی دەكێشا، وەك ئەوەی بیەوێت تەنها ساتێكی بۆ پڕكردنی سیەكانی لە دوكەڵی جگەرە لە دەست نەچێت!!

ئەم دیمەنە بێزاری كردمو خەریك بوو دوكەڵی جگەرە منیش و پێشكەشكارەكەش بخنكێنێت، بەڵام دەبووایە نارامم بگرتایە، لەبەر ئەوەی بەرنامەكە ڕاستەوخۆ بوو.. بەرنامەكە كاتژمێرێكی تەواوی خایاندو سوپاس بۆ خودا بە ڕێكوپێكی كۆتایی پێهات..

دوای بەرنامەكە وێنەگرەكە هات بۆ لام، جگەرەكەشی هەر بە دەستەوە بوو، بە گەرمی سوپاسی كردمو منیش پێم وت: هەروەها سوپاس بۆ تۆش كە ئەركی وێنەگرتنی ئەم بەرنامەیەت گرتە ئەستۆ، وتەیەكیشم هەیە ئەگەر لێمی وەربگری..

وێنەگرەكە وتی: فەرموو.. فەرموو..

وتم: جگەرە.. قسەكەی پێ بڕیمو وتی: ئامۆژگاریم مەكە، بە خودا هیچ سودێكی نیە یاشێخ..

وتم: باشە.. تەنها گوێم لێ بگرە.. تۆ دەزانیت جگەرە حەرامە، پەروەردگاریش دەفەرموێت..

دوبارە قسەكانی پێ بڕیمو وتی: یاشێخ كاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە.. چل ساڵە من جگەرە دەكێشم.. جگەرە چۆتە ناو خوێنو دەمارەكانمەوە.. هیچ سودی نیەو زۆریان لەگەڵ وتووم..

وتم: هیچ سودی نیە؟!

شەرم گرتیو وتی: دەی لە پەروەردگار بۆم بپاڕێوەو دوعام بۆ بكە..

دەستیم گرتو وتم: وەرە لەگەڵم..

وتی: بۆ كوێ؟!

وتم: وەرە با سەیرێكی كەعبەی پیرۆز بكەین.. لەبەر پەنجەرەكەدا وەستاینو سەیری كەعبەی پیرۆزمان دەكرد، بست بە بستی حەرەم خەڵك بوو.. بە ڕاستی دیمەنەكە زۆر سەرنج ڕاكێشو كاریگەر بوو، وتم: ئەو خەڵكە دەبینی؟!

وتی: بەڵێ..

وتم: هەر یەكەی لە شوێنێكەوە هاتوون.. هەیانە سپیو هەیانە ڕەشن.. هەیانە هەژارو هەیانە دەوڵەمەندن.. هەیان عەرەبنو هەیان عەجەمن، هەموو لە پەروەردگار دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی لێیان خۆش بێت..

وتی: ڕاستە..

وتم: دەی حەز دەکەیت، ئەوەی خودا بەوانی بەخشیووە، بە تۆشی ببەخشێت؟

وتی: بەڵێ..

وتم: دەی هەر دوو دەستت بەرز بکەرەوە، من دەپاڕێمەوەو تۆش بڵێ: ئامین.. دەستم بەرز کردەوەو وتم: خودایە لێی خۆش بیت.. وتی: ئامین.. وتم: خودایە پلەی بەرز بکەیتەوەو لەگەڵ خۆشەویستانیدا لە بەهەشتەکەتدا کۆیان بکەیتەوە..

بەردەوام بۆی دەپاڕامەوە، هەتا دڵی نەرم بوو، پاشان هەر ئامینی دەکردو دەستی کرد بە گریان، کاتێك ویستم کۆتایی بە پاڕانەوەکانم بهێنم، وتم: خودایە ئەگەر واز لە جگەرەکێشان دەهێنێت، ئەوا ئەم دوعاو پاڕانەوانەمان لێوەرگرە، ئەگەر نا لەم پاڕانەوانە بێبەشی بکە.. وێنەگرەکە بە تەواوی دایە پرمەی گریان‌و بە دەستەکانی ڕوخساری شاردەوەو لە هۆڵەکە چووە دەرێ..

دوای چەند مانگێك، جارێکی تر بۆ نوسینگەی هەمان کەناڵی ئاسمانی پێشوو، بانگهێشت کرامەوە، کاتێك چوومە ژوورەوە، پیاوێك زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردم، پاشان سەری ماچ کردم، هەروەها ویستی دەستیشم ماچ بکات، وتم: سوپاسی ئەو هەموو ڕێزو خۆشەویستیەت دەکەم، بەڵام ببورە من ناتناسم..

وتی: پێش دوو ساڵ، ئامۆژگاری وێنەگرێکت کرد، بۆ ئەوەی جگەرە نەکێشێت؟!

وتم: بەڵێ..

وتی: دەی من ئەو کەسەم، سوێند بە خودا یاشێخ لەو کاتەوە، تاوەکو ئێستا جگەرەم نەکێشاوە..

جارێکی تریان بە هەمان شێوە، لە دوای وتارێکم لە وەرزی حەجدا، گەنجێك هات‌و پرسیاری کردو وتی: لە مەراسیمی حەجدا من‌و ئەنکم‌و خوشکێکم بووین، زۆر قەرەباڵغ بوو.. پرسیارەکەی کردو وەڵامم دایەوە.. گەنجەکە لەبەر ئەوەی زۆر لێم نزیك ببۆوە، بۆنی جگەرەی لێدەهات، پرسیارم کردو وتم: جگەرە دەکێشی؟

وتی: بەڵێ..

وتم: داواکارم پەروەردگار لێت خۆش بێت‌و حەجەکەشت لێ وەربگرێت، ئەگەر لەم ساتەوە واز لە جگەرەکێشان بهێنیت..

گەنجەکە بێدەنگ بوو، بە ڕوونی کاریگەری قسەکانمی لە سەر دیار بوو.. لە دوای هەشت مانگ، لە شارێك وتارم هەبوو، سەیرم کرد گەنجێکی بەڕێز لە لای دەرگای

مزگەوتەکە چاوەڕێم دەکات، بە گەرمی پێشوازی لێکردمو وتی: دەمناسیت؟

وتم: نەخێر.. وتی: من ئەو گەنجەم، کە لە وەرزی حەجدا ئامۆژگاریت کردم، بۆ ئەوەی واز لە جگەرەکێشان بهێنم.. موژدە بێت، سوێند بە خودا لەو کاتەوە جگەرەم نەکێشاوە.. دەستیم گوشیو زیاتر هانمداو پاشان ڕۆیشتم..

هەستم کرد، نزاو پاڕانەوە بۆ خەڵکی، لە کاتێکدا خۆیان گوێ بیستی بن، کاریگەری باشتریان لە سەر دروست دەکاتو زیاتر پێی دڵخۆش دەبن.. کاتێک گەنجێك دەبینی، لەگەڵ باوكو دایکیدا چاکەکارە، پێی بڵێ: خودا پاداشتت بداتەوەو سەرفرازت بکاتو لە پاشەڕۆژدا منداڵەکانی تۆش، لەگەڵتدا ئاوا چاکەکار بن.. بە دڵنیاییەوە بەم دوعایانە، زیاتر هانی دەدەیت..

پێغەمبەری خوداش ﷺ بە هۆی دوعاو پاڕانەوەوە، کاریگەری لە سەر خەڵکی دروست کردووەو خۆشەویستی بە دەست هێناوە..

توفەیلی کوڕی عەمر، گەورەو دەمڕاستی هۆزی دۆس بوو، ڕۆژێك بۆ پێداویستیەکی دێت بۆ مەککە، گەورەکانی قورەیش دەترسن توفەیل، پێغەمبەری خودا ﷺ ببینێتو موسڵمان بێت، هەر بۆیە پێی دەڵێن: لێرە پیاوێك هەیە، دەڵێت پێغەمبەرم، ئاگاداربە لەگەڵیدا دانەنیشیو گوێ لە قسەکانیشی مەگرە، لەبەر ئەوەی کەسێکی جادوگەرەو ئەگەر گوێی لێ بگری، هۆشو ژیریت لە دەست دەدەیت..

توفەیل دەڵێت: سوێند بە خودا ئەوەندە قسەیان بۆ کردم، لە ترسا هەندێك لۆکەم کردە گوێچکەمەوە، بۆ ئەوەی گوێم لە قسەکانی نەبێت..

پاشان دەڵێت: چووم بۆ کەعبەو پێغەمبەری خودام ﷺ بینی لە نزیك کەعبەی پیرۆز نوێژی دەکرد، کەمێك لێی نزیك بوومەوەو گوێم لە هەندێك لە وتەکانی بوو، زۆر بە لامەوە جوان بوو.. لە دڵی خۆمدا وتم: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات!! خۆ لای خۆی من پیاوێکی ژیرو تێگەیشتووم، بۆچی گوێ لەو پیاوە نەگرم، ئەگەر قسەکانی باش بوون، ئەوا وەریان دەگرم، خۆ ئەگەر خراپیش بوو، ئەوا وازیان لێدێنم..

چاوەڕێم کرد، هەتا لە نوێژەکەی تەواو بوو، بەرەو ماڵ کەوتە ڕێو منیش شوێنی کەوتم، هەتا بە شوێنیدا چوومە ژوورەوەو وتم: ئەی محمد هۆزەکەت ئاواو ئاوا دەڵێن، ئەوەندەیان باسی تۆ بۆ کردم، هەتا لۆکەم خستە گوێم، بۆ ئەوەی گوێم لە قسەکانت نەبێت، بەڵام کاتێك گوێم لە قسەکانت بوو، زۆر جوان بوون!! هەندێك قسەم بۆ بکە..

پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوخساری گەشایەوەو هەندێك قورئانی بۆ خوێندو باسی

ئیسلامی بۆ کرد..

توفەیل بیری کردەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ لە خودا دوور دەکەوێتەوە.. هەتا ئێستاش بەردو دار دەپەرستێت، لە کاتێکدا چەندێك داوایان لێ بکاتو لێیان بپاڕێتەوە، نە گوێیان لێیەو نە وەڵامیشی دەدەنەوە.. پاشان بیری لە دوای موسڵمان بوونی کردەوە، چۆن واز لە ئاینی خۆیی‌و باوو باپیرانی بهێنێت؟! ئەی خەڵکی چی پێدەڵێن؟! ئەی ئەو هەموو سەروەت‌و سامانەی کە کۆی کردبۆوە؟! ئەی چی لە کەس‌وکاروماڵ‌و منداڵی بکات؟! بە بێدەنگی بیری دەکردەوەو ژیانی دونیاو دوارۆژی بەراورد دەکرد، لەپڕ ژیانی دونیای فرێداو باوەشی بۆ ژیانی دوارۆژی کردەوە..

بەڵێ.. بڕیاری موسڵمان بوونی دا، کێ پێی خۆشە، با پێی خۆش بێت‌و کێش پێی ناخۆشە، با پێی ناخۆش بێت.. خەڵکی سەر زەوی چیان پێ دەکرێت، ئەگەر پەروەردگار لە ئاسمانەوە لێی ڕازی بێت؟! ماڵ‌و سەروەت‌و سامانی بە دەست پەروەردگارەو لە ئاسمانەوە بۆی دیاری کردووە.. ساغی‌و نەخۆشی‌و پلەوپایەو ژیان‌و مردنی هەمووی لە لای پەروەردگاری زەوی‌و ئاسمانەکانە.. ئەگەر پەروەردگار لێی ڕازی بێت، گرنگ نیە هەموو خەڵکانی سەر زەوی لێی ناڕازی بن..

ولیت الذي بيني وبينك عامر وبيني وبين العالمين خرابُ

إذا صح منك الود فالكل هين وكل الذي فوق التراب ترابُ..

بەڵێ.. توفەیل موسڵمان بوو، پاشان بە هیممەتێکی بەرزەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من پیاوێکی دەست‌و قسە ڕۆیشتووم لە هۆزەکەمدا، دەگەڕێمەوە بۆ لایان‌و بانگیان دەکەم، بۆ ئەوەی ئەوانیش باوەڕ بهێنن‌و موسڵمان بن.. توفەیل بەپەلە گەڕایەوە بۆ لای هۆزەکەی.. دۆڵ بە دۆڵ‌و شیو بە شیو، هەتا گەیشتەوە ئەو ناوچەیەی کە هۆزەکەی تیایدا نیشتەجێن..

کاتێك گەیشتەوە ناوچەکەی خۆیان، باوکی کە پیاوێکی پیر بوو، هات بۆ لای.. توفەیل ویستی موسڵمان بێت، هەر بۆیە پێی وت: باوکە نە باوکی منی‌و نە منیش کوڕی تۆم..

باوکی ترساو وتی: ئاخر بۆچی کوڕەکەم؟!

توفەیلیش دەڵێت: موسڵمان بووم‌و شوێن محمدﷺ کەوتووم..

باوکیشی دەڵێت: کوڕی شیرینم ئاینی منیش، ئاینی تۆیەو ئەوا موسڵمان بووم..

توفەیل دەڵێت: دەی بچۆ خۆت بشۆرەو جل‌و بەرگی خاوێن لەبەر بکەو پاشان وەرەوە،

بۆ ئەوەی فێری ئەو شتانەت بکەم، کە فێری بووم..

پاشان توفەیل ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوەو خێزانەکەی پێشوازی لێکردو بە هەمان شێوە ئەمیش موسڵمان بوو.. پاشان توفەیل ماڵ بە ماڵ دەگەڕاو لە سەر ڕێگەکان دەوەستاو بانگی خەڵکەکەی دەکرد، بۆ ئەوەی موسڵمان بنو باوەڕ بهێنن، بەڵام خەڵکەکە ئامادە نەبوون واز لە پەرستنی بتەکانیان بهێنن..

هەر بۆیە توفەیل توورە دەبێتو دەگەڕێتەوە بۆ مەککەو دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و پێی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هۆزی دۆس یاخی بوونو باوەڕیان نەهێنا، دەی دوعایان لێبکە..

پێغەمبەری خودا ﷺ هەر دوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان..

توفەیل دەڵێت: لە دڵی خۆمدا وتم: تازە هۆزەکەم تیاچوو، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: پەروەردگار ڕێنمایی هۆزی دۆس بکە.. پاشان ڕووی کردە توفەیلو پێی فەرموو: بگەڕێوە بۆ لای هۆزەکەتو بانگیان بکە بۆ ئەوەی باوەڕ بهێننو لەگەڵیشیاندا نەرمو نیانو لەسەرخۆبە..

توفەیل دەگەڕێتەوەو هەموویان موسڵمان بوونو باوەڕیان هێنا..

بەڵێ.. پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕێگەی نزاو پارانەوەکانیەوە، لە دەرگاکانی ئاسمانیدا، نەك تەنها بۆ توفەیل، بەڵکو بۆ زۆرێك لە خەڵکی ئەم کارەی ئەنجام دەدا..

ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ داوای لە پێغەمبەری خودا ﷺ کردو پێداگری لە سەر ئەوە کرد، کە بە ئاشکرا بانگی خەڵکی بکەن بۆ ئەوەی موسڵمان بن..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئێمە کەمین.. ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ زۆر پێداگری کرد، هەتا موسڵمانان کۆبوونەوەو لە دوای پێغەمبەری خوداوە ﷺ خۆپیشاندانێکیان کردو بەرەو کەعبەی پیرۆز کەوتنە ڕێو کاتێك گەیشتنە ئەوێ، ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ دەستی بە وتاردان کردو بانگی خەڵکەکەی کرد، بۆ ئەوەی باوەڕ بهێننو واز لە بت پەرستی بهێنن.. بێباوەڕان کاتێك موسڵمانانیان بەم شێوەیە بینی، وروژانو کەوتنە لێدانو ئازاردانی موسڵمانەکانو کۆمەڵێکیان هێرشیان بردە سەر ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ و زۆر ئازاریاندا..

عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی بێباوەڕ، زۆر بە توندی ئازاری ڕوخساری ئیمامی ئەبوبەکری ﷺ دا، بە شێوەیەك کە دەمو لوتی لێك جیا نەدەکرانەوەو خوێنێکی زۆر لە دەمو چاوی هات، هەتا هۆزی بنو تمیمی هۆزی ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ هاتنو دووریان

خستەوەو خستیانە پارچە پەڕۆیەکەوەو بردیانەوە بۆماڵەوە..

ئەوەندەیان ئازار دابوو، گومانیان وابوو دەمرێت.. پاشان کەس‌وکارەکەی گەڕانەوە بۆ کەعبەو وتیان: سوێند بە خودا ئەگەر ئەبوبەکر بمرێت، ئەوا عوتبە دەکوژین.. پاشان ڕۆیشتنەوە بۆ لای ئیمامی ئەبوبەکر‌ﷺ، کە هێشتا هۆشی نەهاتبۆوەو نەیان دەزانی ماوە، یان مردووە..

باوکی ئیمامی ئەبوبەکر‌ﷺ و کەس‌وکارەکەی، لە دیار سەری وەستا بوون، بانگیان دەکرد، کەچی هیچ وەڵامێکی نەدەدانەوە.. دایکیشی لە نزیکیەوە دەگریا.. نزیك خۆرئاوا بوون، ئیمامی ئەبوبەکر‌ﷺ چاوەکانی هەڵهێنان‌و لە یەکەم وشەدا فەرمووی: پێغەمبەری خوداﷺ چی بەسەرهات؟!

خودا لێت ڕازی بێت، ئەی ئیمامی ئەبوبەکر‌ﷺ.. لە خۆی زیاتر خەمی پێغەمبەری خودایﷺ بوو.. باوکی‌و دایکی‌و ئەوانەی لە دەوری بوون، کاتێك گوێیان لەم قسەیە بوو، هەموویان توورە بوون‌و هەستان بڕۆن‌و بە دایکیان وت: شتێکی بدەرێ بیخوات، بەڵام ئیمامی ئەبوبەکر‌ﷺ هەر دەیوت: پێغەمبەری خوداﷺ چی بەسەرهاتووە؟!

پاشان بە دایکی فەرموو: بچۆ بۆ لای ئوم جەمیلی کچی خەتتاب‌و هەواڵی پێغەمبەری خودایﷺ لێ بپرسە.. ئوم جەمیل موسڵمان بوو بوو، بەڵام باوەڕەکەی شاردبۆوە.. دایکی ڕۆیی، هەتا گەیشتە لای ئوم جەمیلەو وتی: ئەبوبەکری کوڕم پرسیاری محمدت لێدەکات؟!

ئوم جەمیلە لە وەڵامدا وتی: من نە ئەبوبەکرو نە محمدیش ناناسم، بەڵام ئەگەر حەز دەکەیت، لەگەڵت دێم بۆ لای کوڕەکەت؟

ئوم جەمیلە لەگەڵ دایکی ئیمامی ئەبوبەکرداﷺ دەکەوێتە ڕێ، هەتا دەگاتە لای ئیمامی ئەبوبەکر‌ﷺ و دەبینێت، کەوتووەو جەستەی هەموو برینداره، کاتێك بەم حاڵەوە دەیبینێت، هاوار دەکات‌و دەڵێت: ئەوانەی وایان لێکردووی، بێباوەڕو لە ڕێ دەرچوون، هیوادارم پەروەردگار تۆڵەی تۆیان لێ بکاتەوە..

ئیمامی ئەبوبەکر‌ﷺ بە جەستەی پڕ برینەوەو بە ڕوخساری خوێناوییەوەو بە دڵێکی گەورەی پڕ لە باوەڕەوە، سەیری ئوم جەمیلە دەکات‌و دەڵێت: پێغەمبەری خوداﷺ چی بەسەرهاتووە؟!

ئوم جەمیلەش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەبوبەکر دایکت گوێی لێمانە!!

ئیمامی ئەبوبەکریش دەفەرموێت: مەترسە..

ئوم جەمیلە دەڵێت: موژدە بێت، پێغەمبەری خوداﷺ ساغ‌و سەلامەتە..

ئیمامی ئەبوبەکر دەفەرمویّت: ئەی لە کویّیە؟!

ئوم جەمیل دەڵیّت: لە ماڵی ئەبی ئەرقەمە.. لەم کاتەدا دایکی ئیمامی ئەبوبەکرﷺ بە کوڕەکەی دەڵیّت: دەی ئەوە هەواڵی هاوڕیّکەشت زانی، کەمیّك خواردنو خواردنەوە بخۆ..

ئیمامی ئەبوبەکرﷺ لە وەڵامدا دەفەرمویّت: بە خودای پەروەردگار، هەتا پیّغەمبەری خوداﷺ بە چاوی خۆم نەبینم، هیچ شتیّك ناخۆم.. چاوەڕیّیان کرد، هەتا خەڵکی ئارام بوونەوەو پاشان بردیان بۆ لای پیّغەمبەری خوداﷺ..

کاتیّك چوونە ژوورەوە بۆ لای پیّغەمبەری خوداﷺ، ئیمامی ئەبوبەکرﷺ روخساری بریندار بوو بوو، جل‌و بەرگەکانی درابوون‌و خویّنی لەبەر دەڕۆی.. پیّغەمبەری خوداﷺ کاتیّك بەم شیّوەیە، ئیمامی ئەبوبەکریﷺ بینی ماچی کرد، پاشان موسڵمانانیش ماچیان کرد..

پیّغەمبەری خوداﷺ زۆر دڵی پیّی سوتا، هەتا بە ئاشکرا بە روخساریەوە دەرکەوت.. ئیمامی ئەبوبەکرﷺ ویستی دڵی پیّغەمبەری خوداﷺ خۆش بکات، هەر بۆیە فەرمووی: بە دایك‌و باوکمەوە بە قوربانت بم، ئەی پیّغەمبەری خودا من هیچم نیە، تەنها ئەو ستەمکارو لە ڕیّگە دەرچووە، دەم‌وچاوی ئازار دام.. پاشان سەرەڕایی ئەو هەمو ئازارو برسیّتی‌و تینوویەتیە، فەرمووی: ئەی پیّغەمبەری خوداﷺ ئەوە دایکمەو دوعای بۆ بکە، بەڵکو پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ بیپاریّزیّت‌و ڕیّنمایی بکات.. پیّغەمبەری خوداشﷺ دوعای بۆ دایکی کردو ئەویش هەر لەویّدا باوەڕی هیّناو موسڵمان بوو..

دایکی ئەبوهورەیرە هیّشتا لە سەر دینی هۆزەکەی مابوو.. بتی دەپەرست‌و بیّباوەڕ بوو.. ئەبوهورەیرەش ﷺ بەردەوام بانگی دەکردو داوای لیّدەکرد موسڵمان بیّت، بەڵام دایکی بە گویّی نەدەکرد..

ڕۆژیّك دوبارە بانگی دایکی کرد، بۆ ئەوەی باوەڕ بهیّنیّت، بەڵام ئەم جارەیان سەرەڕای باوەڕ نەهیّنان، قسەشی بە پیّغەمبەری خوداﷺ وت.. ئەبوهورەیرەﷺ دەستی کرد بە گریان‌و بەرەو لای پیّغەمبەری خوداﷺ کەوتە ڕیّ‌و ڕووداوەکەی بۆ باس کردو داوای لە پیّغەمبەری خوداﷺ کە لە خودا بپاڕیّتەوە، بۆ ئەوەی دایکی باوەڕ بهیّنیّت‌و موسڵمان بیّت..

پیّغەمبەری خوداشﷺ لە پەروەردگار پاڕایەوەو فەرمووی: خودایە هیدایەتی دایکی ئەبوهورەیرە بدەیت.. ئەبوهورەیرە، بەم پاڕانەوەیەی پیّغەمبەری خوداﷺ زۆر دڵخۆش بوو.. بە پەلە بەرەو ماڵەوە گەڕایەوەو لە دەرگایدا بۆ ئەوەی بچیّتە ژوورەوە..

دایکی گوێی لە دەنگی پێی ئەبوهورەیرە بوو، پێی وت: ئەبوهورەیرە لە شوێنی خۆت چاوەڕێبە.. ئەبوهورەیرە ﷺ گوێی لە دەنگی خورە خوڕی ئاو دەبێت‌و دەزانێت کە دایکی خۆی دەشوات..

کەمێك لەبەر دەرگا چاوەڕێی کرد، هەتا دایکی خۆی شۆریو خۆی گۆڕیو جل‌وبەرگەکانی لەبەر کرد.. پاشان دایکی دەرگاکەی کردەوەو وتی: ئەبوهورەیرە.. اشهد أن لاإله إلا الله واشهد أن محمداً رسول الله..

ئەبو هورەیرە ئەوەندە دڵخۆش بوو، دەستی کرد بە گریان، بەڵام گریانی ئەمجارەیان گریانی خۆشی بوو، بۆیە زۆر بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، بۆ ئەوەی ئەم هەواڵە خۆشەی پێڕابگەیەنێت.. کاتێك گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ مژدە بێت.. دۆعاکەت گیرا بوو.. دایکم باوەڕی هێناو موسڵمان بوو.. پێغەمبەری خوداشﷺ بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو..

پاشان ئەبوهورەیرە ﷺ حەزی کرد پێغەمبەری خوداﷺ دۆعای زیاتری بۆ بکات‌و زیاتر تووشی خێرو خۆشی بێت، بۆیە داوای لە پێغەمبەری خوداﷺ کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لە خودا بپاڕێوە، بۆ ئەوەی من‌و دایکم لە لای هەموو ئیمانداران خۆشەویست بین‌و هەموو ئیماندارانیش لە لای ئێمە خۆشەویست بن..

پێغەمبەری خوداشﷺ ئەم دۆعایەی بۆ کردن‌و فەرمووی: پەروەردگار، ئەم بەندەیەی خۆت‌و دایکی لە لای ئیمانداران خۆشەویست بکەیت‌و ئیماندارانیش لە لای ئەمان خۆشەویست بکەیت..

ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: لە دوای ئەم پاڕانەوەیەی پێغەمبەری خوداﷺ هەر ئیماندارێك منی بینی بێت، خۆشی ویستووم‌و لە دڵیدا شیرین بووم. رواه احمد والبيهقي..

**ڕۆشنایی..**

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ...... (٦٠)﴾ غافر. واتە: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆ من بهێنن، ئەوا من دۆعاو نزاتان گیرا دەکەم)..



## ئەگەر کارەکەیت بۆ جێبەجێ ناکرێت، با قسەت خۆش بێت..!!

ساتە وەختێکی زۆر ناخۆشە، کاتێك کەسێك بۆ پێویستیەکی رووت لێدەنێت، بەڵام ناتوانیت بۆی جێبەجێ بکەیتو دڵی خۆش بکەیتو بە دڵێکی شکاوەوە، جێت دەهێڵێت..

بەڵێ.. جێبەجێ کردنو بە دەمەوە چوونی خەڵکی، کارێکی زۆر گەورەیە.. ئەوەتا پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر لەگەڵ برایەکمدا برۆم، بۆ ئەوەی پێویستیەکی بۆ جێبەجێ بکەم، لە لام خۆشترە لەوەی کە لەم مزگەوتەدا (مزگەوتی مەدینە) مانگێك خەریکی خوداپەرستی بم..

بەڵام هەندێك پێداویستی جێبەجێ کردنی ئاسان نیە.. مەرج نیە هەر کەسێك داوای قەرزێك، یان پارەیەکی زۆری لێکردی، بتوانی بیدەیتێ.. هەروەها مەرج نیە هەر کەسێك داوای لێکردی لەگەڵیدا گەشتێك ئەنجام بدەیت، بتوانی لەگەڵیدا بچیتو دڵی نەشکێنیت.. مەرج نیە هەر کەسێك داوای قەڵەمەکەی گیرفانت، یان کاتژمێرەکەی دەستی کردیت، پێشکەشی بکەیت..

کێشەکەش لەوەدایە، زۆربەی خەڵکی کاتێك ناتوانیت داواکارییەکەیان جێبەجێ بکەیت، دڵیان دەرەنجێو لەملاو لەولا باست دەکەنو بە کەسێکی ڕەزیلو چروكو دەست نوقاو ناوت دەبەن..

کەواتە: ئەی چی بکەین؟! هەوڵبدە زۆر زیرەکانە خۆت ڕزگار بکەو ئەگەر کارو داواکارییەکەیت بۆ جێبەجێ ناکرێت، هیچ نەبێت قسەت لەگەڵیدا خۆش بێت..

لاخيل عندك تهديها ولامال فليسعد النطق إن لم تسعد الحال..

کەسێك دەزانێت بەم نزیکانە گەشتێك بۆ فلانە شار ئەنجام دەدەیت، دێت بۆ لاتو داوات لێدەکات شتێکی دیاریکراوی لەو شارە بۆ بکڕیت.. تۆش بەهۆی هەر هۆکارێکەوە بێت، حەز ناکەیت ئەو شتەی بۆ بکڕیت، یان کارەکەی بۆ بکەیت، ئەی چۆن وەڵامی

دەدەیتەوە؟!

مادام شتەکەی بۆ ناکرێت، بە شێوەیەکی جوان پۆزشی بۆ بهێنەوەو داوای لێبوردنی لێ بکەو بڵێ: بڕوا بکە حەز دەکەم بە سەر سەرو بە سەر چاو خزمەتت بکەم، بەڕێزت لە زۆرێك لە خەڵکی لە لام خۆشەویست تری، بەڵام دەترسم کاتم نەبێتو نەتوانم کارەکەت جێبەجێ بکەم.. کاتێك بانگ دەکرێیت بۆ ئێوارە خوانێكو حەز ناکەیت بچیتو دەشترسیت، شتێك لە دڵی خاوەنماڵەکەدا دروست بێتو دڵیان لێت بشکێت، ئەو کاتە دەتوانیت بڵێیت: وەکو یەکێك لە براکانم وایت، بەڵام بڕوا بکە ئەمشەو زۆر سەرقاڵم..

بە دڵنیاییەوە قسەکەشت ڕاستەو درۆ نیە، لەوانەیە سەرقاڵی منداڵەکانت بیت، یان خەریکی خوێندنەوەی کتێبێکی گرنگ بیت، یان زۆر ماندوو بیتو دەتەوێت زوو بخەویت..

سەیری پێغەمبەری خوداﷺ بکە، کاتێك لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دانیشتووەو باسی فەزڵو گەورەیی کەعبەو عومرە کردنی بۆ دەکردن.. هاوەڵانی کاتێك گوێیان لەم وتە پیرۆزانەی پێغەمبەری خوداﷺ بوو، زیاتر تامەزرۆی ئەوە بوون، بەرەو کەعبەی پیرۆز بکەونە ڕێ.. هەر بۆیە بە خێرایی خۆیان ئامادەی ئەو گەشتە پیرۆزە کرد..

پێغەمبەری خوداﷺ خۆییو هەزارو چوار سەد لە هاوەڵانی، بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ، هەتا گەیشتنە ناوچەی حودەیبیە.. کاتێك بێباوەڕانی قورەیش بەمەیان زانی، گەورەکانیان هاتن بۆ ئەوەی ڕێگری لە موسڵمانان بکەنو نەیەڵن بێتە شاری مەککە.. قورەیش چەندین کەسیان بە نوێنەرایەتی خۆیان ناردە لای پێغەمبەری خوداﷺ بەڵام نەگەیشتنە ئەنجامێك، هەتا لە کۆتاییدا سوهەیلی کوڕی عەمریان ناردو گەیشتنە ڕێکەوتنێك، بەو مەرجەی پێغەمبەریﷺو هاوەڵانی بگەڕێنەوە بۆ شاری مەدینەو ساڵی داهاتوو عومرەکەیان ئەنجام بدەن..

پاشان ڕێکەوتن نامەکەیان مۆر کردو یەکێك لە خاڵە گرنگەکانیشی بریتی بوو لەوەی ئەگەر موسڵمانێك لە مەککەوە ڕۆیی بۆ مەدینە، پێویستە بگەڕێنرێتەوە بۆ مەککە، بەڵام ئەگەر موسڵمانێك لە مەدینەوە، ویستی بچێت بۆ مەککەو لە ئاینی ئیسلام پاشگەزبۆوە، ئەوا ڕێگەی لێناگیرێتو بێباوەڕانی مەککە لە پێشوازیدا دەبنو وەری دەگرن..

موسڵمان هەموو وتیان: پاكو بێگەردی بۆ پەروردگار!! چۆن دەبێت موسڵمانێك بێت بۆ لای ئێمەو پاشان بیدەینەوە بە بێباوەڕان؟! شتی وا چۆن دەبێت؟! كاتێك لەم قسەو باسانەدا بوون، گەنجێك بە كۆتو بەندەوە هاتو لە دوورەوە هاواری دەكردو دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ.. ئەی پێغەمبەری خوداﷺ..

كاتێك سەیریان كرد ئەبو جەندەلی كوڕی سوهەیلی كوڕی عەمر بوو.. لەبەر ئەوەی موسڵمان ببوو، باوكی بەندی كردبوو.. سوهەیل كاتێك هەڵهاتنی كوڕەكەی بینی، تووڕە بوو.. چۆن كوڕەكەی توانیوویەتی ڕا بكات؟! پاشان خۆی بۆ نەگیراو بە دەنگی بەرز هاواری كردو وتی: ئەی محمد ئەمە یەكەمین كەسە، كە پێویستە بیگێڕیتەوەو بیدەیتەوە دەستمان..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: هێشتا پەیمانەكەمان تەواو نەكردووە.. سوهەیلیش دەڵێت: كەواتە لە سەر هیچ شتێكی تر ڕێك ناكەوین..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ڕێكەوتنەكە جێبەجێ بكە.. سوهەیل دەڵێت: نایكەم..

پێغەمبەری خوداﷺ سور بوو لە سەر ئەوەی قوڕەیش بەرەو ئاشتیو ڕێكەوتن بەرێت، حەزیشی نەدەكرد لەبەر تەنها موسڵمانێك ڕێكەوتنەكە هەڵوەشێنێتەوە..

پاشان سوهەیل زۆر بەپەلە بە كۆتو بەندكراوی كوڕەكەی پەلكێش دەكات، ئەبو جەندەلیش بەردەوام هاواری دەكردو بانگی موسڵمانانی دەكردو داوای یارمەتی لێدەكردنو دەیوت: ئەی موسڵمانان بە موسڵمانی هاتم بۆ لاتان، كەچی دەمدەنەوە دەست بێباوەڕان؟! ئایا نابینن چەندێك ئازاریان داوم؟! بەردەوام هاواری دەكرد، هەتا لە چاو ون بوو.. موسڵمانان دڵیان هەڵدەقرچا كاتێك ئەو گەنجە موسڵمانەیان بەو شێوەیە بینی، بەڵام هیچ چارەیەكیشیان نەبوو..

گەنجێك كوڕی یەكێك لە گەورە پیاوانی قوڕەیش بوو.. لە نازو نیعمەتدا گەورە ببوو.. كەچی ئێستا ئازار دەدەرێتو بە دەستو پێ بەستراوی بەرەو بەندیخانە دەبرێت.. ئەبوجەندەلیان بەرەو مەككە گێڕایەوەو زۆر داوای پابەندبوونو خۆڕاگریو دامەزراوی لە پەروەردگاری دەكردو داوای دەكرد یارمەتی بداتو ڕزگاری بكات.. موسڵمانانیش بە دڵێكی پڕ لە غەمو پەژارەوە بەرەو مەدینە گەڕانەوە..

لە دوای ئەم ڕێكەوتنەوە، بێباوەڕانی مەككە زۆر بە توندی سزای موسڵمانە

لاوازو بێ تواناکانی مەککەیان دەداو زۆر نارەحەتیان دەکردن.. ئەبو جەندەل‌و ئەبو بەصیری هاوەڵی‌و زۆرێك لەو موسڵمانانەی کە لە شاری مەککە مابوونەوە، هەوڵی خۆ دەربازکردنیان دەدا، هەتا ئەوە بوو ئەبو بەصیر توانی خۆی رزگار بکات‌و را بکات بۆ مەدینە.. ئەبو بەصیر زۆر تامەزرۆ بوو بۆ بینین‌و هاوەڵی کردنی پێغەمبەری خوداﷺ.. رێگەیەکی زۆری بە سەر لەو بەردی بیاباندا بری بوو، تا گەیشتبووە مەدینەو هەر خێرا رووی کردە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوداﷺ..

لەم کاتەدا پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانیدا لە مزگەوت بوون، لەپڕ ئەبو بەصیر خۆی دەکات بە ژووردا.. شوێنەواری ئازارو دووری‌و ماندوو بوونی رێگەی بە تەواوی پێوە دیار بوو..

لە پڕ دووان لە بێباوەڕانی قورەیش خۆیان کرد بە مزگەوتەکەداو وتیان: ئەی محمد بە پێی ئەو پەیمانەی لە نێوانماندایە، دەبێت ئەبو بەصیرمان بدەیتەوە دەست.. لەبەر پەیمان نامەکەی نێوانیان، پێغەمبەری خوداﷺ ئاماژەی بە ئەبو بەصیر کرد، بۆ ئەوەی لە شاری مەدینە دەربچێت..

ئەبو بەصیر لەگەڵیان کەوتە رێ‌و بیری لە ئازارو ئەشکەنجەکانی قورەیش دەکردەوە.. لە رێگە دوو پیاوەکە بۆ نان خواردن لایاندا، یەکێکیان لە لای ئەبو بەصیر مایەوەو ئەوی تریان بۆ پێویستیەکی کەمێك دوور کەوتەوە، ئەوەیان کە لای ئەبو بەصیر مایەوەو شمشێرەکەی هەڵکێشاو ئەملاو لای پێدەکردو دەیوت: بەم شمشێرەم کوشتاری هۆزی ئەوس‌و خەزرەج دەکەم..

ئەبو بەصیریش پێی دەڵێت: فلانە کەس وا دەبینم شمشێرەکەت زۆر شمشێرێکی چاك بێت، با سەیرێکی بکەم.. کابراکەش شمشێرەکەی دەداتێ، هەر شمشێرەکە دەگاتە دەستی ئەبو بەصیر، ملی کابرای پێ دەفڕتێنێت‌و دەیکوژێت.. کاتێك پیاوەکەی تر دەگەڕێتەوەو دیمەنەکە دەبینێت، بەرەو مەدینە را دەکات، هەتا دەگاتە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوداﷺ.. پاش کەمێك ئەبو بەصیریش بە شمشێرەکەی دەستیەوە خۆی دەکات بە مزگەوتەکەداو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ تۆ پەیمانەکەت بردە سەرو منت دایەوە دەستیان، بەڵام پەروەردگار لە دەستیان رزگاری کردم، دەی ئێستا رێگەم دەدەن لە لاتان بمێنمەوە؟

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: نەخێر..

پاشان ئەبو بەصیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ چەند پیاوێکم بدەرێ، بۆ ئەوەی شاری مەککە ئازاد بکەم..

پێغەمبەری خوداﷺ بە ئازایەتی ئەبوبەصیر سەرسام دەبێت، لەبەر پەیمان نامەکەش نەیدەتوانی داواکارییەکەی جێبەجێ بکات، بەڵام وەك نەیتوانی داواکارییەکەی جێبەجێ بکات، ڕووبەڕووی هاوەڵانی بە ئازایەتی ئەبو بەصیردا، هەڵیداو ستایشی کردو ویستی بە نەرمو نیانی وەڵامی بداتەوەو فەرمووی: هاوار بۆ دایکی!! ئەگەر چەند پیاوێکی لەگەڵدا بووایە، جەنگی هەڵدەگیرساند!!

ئەبو بەصیر لە بەردەم دەرگای مزگەوت وەستا بوو، چاوەڕێی مۆڵەتی پێغەمبەری خودایﷺ دەکرد، بۆ ئەوەی لە شاری مەدینە بمێنێتەوە، بەڵام لەبەر پەیمان نامەکە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانیدا کە ئەبو بەصیر لە مەدینە بچێتە دەرەوە.. ئەبو بەصیریش زۆر گوێڕایەڵانە لە مەدینە دەرچوو.. لە ئیسلامیش پاشگەز نەبۆوەو خۆی دایە دەست پەروەردگار..

کاتێك ئەبو بەصیر لە شاری مەدینە دەرچوو، نەیدەزانی ڕوو لە کوێ بکات.. ئەگەر بچێتەوە بۆ مەککە چارەنووسی ئازارو بەندکردنو کوشتنە، هەر بۆیە ڕووی کردە قەراغەکانی دەریای سورو لەوێ بەبێ هیچ هاودەمێك گیرسایەوە..

موسڵمانانی مەککەش کاتێك ئەم دەنگو باسەیان بیست، دڵخۆش بوون، بەوەی کە دەرگایەکی ڕزگاربوونیان لێکراوەتەوە، لەبەر ئەوەی لە مەککە ئازار دەدرانو لە مەدینەش وەرنەدەگیران..

ئەبو جەندەل لە کۆتو بەند خۆی ڕزگار کردو خۆی گەیاندە ئەبو بەصیرو پەیوەندی پێوە کرد، پاشان موسڵمانانی تریش بەرە بەرە پەیوەندییان پێوە دەکردنو ژمارەیان زۆر بوو.. هەر کاروانێکی قوڕەیش بەو نزیکانەدا تێپەڕیایە، ڕێگەیان پێدەگرت.. هەتا وایان لێهات قوڕەیش خۆیان پێغەمبەری خودایانﷺ ئاگادار کرد، بەوەی بابێن بۆ شاری مەدینەو پەیوەندیت پێوە بکەنو لە خۆتیان بگرە..

پێغەمبەری خوداشﷺ نامەیەکی بۆ ناردنو ئاگاداری کردن بۆ ئەوەی بێن بۆ مەدینە..

کاتێك نامەکەیان پێگەیشت هەموو دڵخۆش بوون، بەڵام ئەبوبەصیر لە حاڵەتی گیان کێشانو مردندا بوو.. کاتێك هەواڵەکەیان پێڕاگەیاند، زۆر دڵخۆش بوو، پاشان داوای

نامەکەی پێغەمبەری خودای ﷺ کرد، کاتێك بۆیان هێنا، ماچی کردو لە سەر سنگی دایناو وتی: اشهد ان لا إله إلا الله، واشهد أن محمداً رسول الله.. پاشان کۆچی دوایی کرد..

ڕەحمەتو سۆزو بەزەیی پەروەردگار لە ئەبو بەصیر بێت..

ئەگەر کەسێك قسەی خۆشی لەگەڵ دەکردی، تۆش هەوڵبدە قسەت لەگەڵیدا خۆش بێتو لەگەڵیدا نەرمو نیان بە..

دەگێڕنەوە ئافرەتێکی هەژارو نەدار، لە نزیك هاوسەرەکەیو لە خانوویەکی کۆنی دارزیودا ڕاکشا بوو.. ئافرەتەکە سەیری دارەکانی خانووەکەی دەکردو بیری دەکردەوە پاشان بە هاوسەرەکەی وت: دەزانی خۆزگە بە چی دەخوازم؟!

هاوسەرەکەشی دەڵێت: بە چی؟!

ئافرەتەکەش دەڵێت: ئاواتەخوازم خانوویەکی گەورەت هەبێتو لەگەڵ منداڵەکانتدا بە کامەرانی بژیتو هاوەڵەکانت بانگهێشت بکەیت بۆماڵەوە، هەروەها ئۆتۆمبیلێکی چاکیشت هەبێتو لە کاتی سواربوونیدا زۆر بەختەوەر بیت.. هەروەها ئاواتەخوازم موچەکەت ئەوەندە زۆر بێت، هەموو قەرزەکانتی پێ بدەیتەوە..

هاوسەرەکەشی بێ هیوا بوو لەوەی حاڵو گوزەرانی باش بێت، هیچ شارەزاییو زیرەکیەکی قسەکردنیشی نابێت، هەر بۆیە کاتێك ئافرەتەکە دەڵێت: ئەی تۆ خۆزگە بە چی دەخوازیت؟!

هاوسەرەکەشی دەڵێت: خۆزگە بەوە دەخوازم کۆڵەکەیەکی خانووەکەمان بەربێتەوەو بکەوێت بە سەرتداو سەرت بکات بە دوو لەتەوە!!

**فەرموودە..**

پرسیار لە پێغەمبەری خودا ﷺ کراو وتیان: زۆربەی خەڵکی بە هۆی چیەوە دەچنە دۆزەخ؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بە هۆی داوێنو زمانەوە..

## دوورینەوەو پینەکردن..!!

جاری وا هەیە بە هەندێك شێوە قسە لەگەڵ هەندێك کەسدا دەکەین، یان هەندێك هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەین، دوایی بۆمان دەردەکەوێت، کە هەڵەبووین‌و ئەو قسەیە، یان ئەو هەڵسوکەوتە، بۆ ئەو کەسە گونجاو نەبووە..

بۆ نمونە: دەتەوێت قسەیەکی خۆش لەگەڵ کەسێکدا بکەیت‌و پیایدا هەڵبدەیت، هەر بۆیە پێی دەڵێیت: ماشاءالله لەم جوانیە!! لەم ڕوخسارە گەشاوەیە!! جل‌و بەرگەکانت چەند جوان لێدێت!! پاشان دەڵێیت: خۆزگە کچ بوویتایە، بۆ ئەوەی بێمە خوازبێنیت‌و بتخوازم!! بە ڕاستی قسەو گاڵتەیەکی قورس‌و ناخۆشە!! وانیە!!

یەکێك لە هاوڕێکانم دەڵێت: لە زانکۆ قوتابیەکی گەمژە هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا جەستەیەکی جوانی هەبوو، بەردەوام لە ڕیزەکانی دواوە دادەنیشت‌و خەیاڵی دەڕۆی.. زۆربەی جار داوام لێدەکرد بێتە پێشەوە دانیشێت، بۆ ئەوەی ئاگای لە وانەکانی بێت‌و خەیاڵی نەڕوات..

لەبەر ئەوەی لە قۆناغەکانی زانکۆدا بوو، نەمدەویست وتەی برینداركەری پێ بڵێم.. ڕۆژێك چوومە هۆڵی قوتابیەکانەوە، بینیم وەکو جاری جاران لە دواوەیە، کاتێك دانیشتم، پێم وت: فلانە کەس وەرە پێشەوە..

وتی: دکتۆر شوێنەکەم باشەو ئاگام لێت دەبێت‌و خەیاڵم ناڕوات..

وتم: برام وەرە پێشەوە با ئەو ڕوخسارە جوانەت ببینین..

قوتابیەکان بە توانجەوە سەیریان دەکردو ئەویش سور هەڵگەڕا.. هەستم کرد کەوتوومەتە چاڵێکەوەو دەبێت بە وریایی خۆم ڕزگار بکەم‌و حاڵەتەکە پینە بکەم، هەر بۆیە وتم: زۆر بە ئاسانی ژیانی هاوسەری خۆت پێك دەهێنیت‌و خێزان پێکەوە دەنێیت، بەڵام هاوڕێکانت هەتا کەسێك پێیان ڕازی دەبێت، زۆر ماندوو دەبن..

پاشان بە خێرایی دەستم بە باس کردنی بابەتەکە کردو بواری قسەکردنم

بۆ هیچ کەسێك نەهێشتەوە، بۆ ئەوەی بە تەواوی حاڵەتەکەیان بیر بچێتەوە..
قوتابییەکەش کاتێك گوێی لەم قسە خۆشەی من بوو، بە زەردەخەنەوە هاتە پێشەوە دانیشت..

بۆ خۆ رزگار کردن لە حاڵەتێکی وەکو ئەم حاڵەتە، چەند رێگەیەك هەیە، لەوانە دەتوانیت راستەوخۆ بچیتە ناو بابەتێکی ترەوەو حاڵەتەکەیان لەبیر بەریتەوە، بۆ ئەوەی کەسی بیسەر هەلی قسەکردن و تانەو تەشەری بۆ نەرەخسێت، وەك ئەوەی پێی بڵێیت: خودا کەسێکی لە خۆت جوانترت پێ ببەخشێت، دەی بڵێ: ئامین.. یان باسی شتێکی جیاوازتر بکەیت، وەکو هەواڵ پرسینی براکەی، یان ئۆتۆمبیلە تازەکەی، بۆ ئەوەی رووداوەکەی بیر بچێتەوە..

کاتێك قسەیەك یان هەڵسوکەوتێك بەرامبەر بە کەسێك ئەنجام دەدەیت و دەزانیت بریندارت کردووە، بۆ ئەوەی یەك یەك دۆستو هاوەڵانت لە دەست نەدەیت، پێویستە پێش ئەوەی برینەکە هەو بکات، سارێژو دەرمانی بکەیتو نەیەڵیت زیاتر تەشەنە بکات.. چۆن؟!

وەکو ئەم نمونەیە: پێش ئەوەی شاری مەککە رزگار بکرێت، بێباوەڕانی قورەیش دەستیان بە سەر کەسو کارو ماڵو منداڵی ئەو موسڵمانانەدا گرتبوو، کە کۆچیان کرد بوو بۆ شاری مەدینەو نەیان توانی بوو ماڵو منداڵیشیان لەگەڵ خۆیان بەرن.. ساڵێك دوای پەیمان نامەی حودەیبیە، پێغەمبەرﷺو هاوەڵانی بە مەبەستی ئەنجامدانی عومرە، هاتنەوە بۆ شاری مەککە..

پێغەمبەری خوداﷺ چوار رۆژ لە شاری مەککە مایەوەو کاتێك ویستی بڕوات، کچۆڵەیەکی بچوك، کە کچی حەمزەی مامەی پێغەمبەرﷺ بوو، کە لە جەنگی ئوحوددا شەهید ببوو.. شوێنی کەوت.. کچۆڵە بێباوکەکە، بە مامە مامە بانگی پێغەمبەری خودایﷺ کرد، ئیمامی عەلیشرضي الله عنه لەگەڵ فاتمەی هاوسەریدا، شان بە شانی پێغەمبەری خوداﷺ دەرۆیشتن.. ئیمامی عەلیرضي الله عنه منداڵەکەی هەڵگرتو دای بە دەست فاتمەی هاوسەری..

کاتێك زەیدی کوڕی حاریسەرضي الله عنه منداڵەکەی بینی، بیری کەوتەوە کاتی خۆی کە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ حەمزەدارضي الله عنه کردبوونی بە

برا، هەر بۆیە فەرمووی: ئەو منداڵە برازای منەو من شایستەترم پێی..

جەعفەریش‌ڕضي الله عنه هاتە پێشەوەو فەرمووی: ئەو منداڵە ئامۆزامەو پوریشی هاوسەرمە، من شایستەترم بۆ ئەوەی بمدەنێ.. واتە: (خێزانەکەی خوشکی دایکی منداڵەکە بوو)..

ئیمامی عەلیش‌ڕضي الله عنه فەرمووی: منیش لەبەر ئەوە وەرم گرت، کە ئامۆزامە..

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بینی، خەریکە ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان، منداڵەکەی دا بە جەعفەرڕضي الله عنهو فەرمووی: پور لە جێگەی دایکە.. پاشان ترسا لەوەی نەوەك شتێك لە دڵی ئیمامی عەلیو زەیددا دروست ببێت، هەر بۆیە بە ئیمامی عەلیڕضي الله عنه فەرموو: تۆ لە منیو منیش لە تۆم.. هەروەها بەزەیدیڕضي الله عنه فەرموو: تۆ براو گەورەی ئێمەی.. پاشان ڕووی کردە جەعفەرڕضي الله عنهو فەرمووی: تۆ لە شێوەو هەڵسوکەوتدا لە من دەچیت..

بڕوانە پێغەمبەری خوداﷺ، چۆن بە شارەزایانە دڵی شۆڕینو خۆشەویستی هەر سێکیانی بە دەست هێناو خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕین..

لەبەر ئەوە کاتێك هەڵەیەك، ئەنجام دەدەیت، یان جاری وا هەیە ئەو قسەو هەڵسوکەوتەی کە ئەنجامی دەدەیت، هەڵەش نیە، بەڵام بۆ کەسی بەرامبەر شیاوو گونجاو نیە، بە خێرایی هەوڵی سڕینەوە، یان دوورینەوەو چاك کردنی بدەو مەهێڵە زیاتر لە سەر دڵی کەسی بەرامبەر گەورە بێت..

**ئەزموون..**

ئەنجامدانی هەڵە، مایەی نەنگیو کەموکوڕی نیە،
بەڵکو سور بوون لە سەر هەڵە مایەی نەنگیو کەموکوڕیە..

## بە هەر دوو چاو بڕوانە..

ئێمەی مرۆڤ هەمیشە لە دەرخستنی هەڵەو کەموکوڕیەکانی خەڵکیدا تازەگەری و داهێنان دەکەین، بەڵام بە داخەوە زۆر جار چاومان چاکەو جوانیەکانیان نابینێت..

زۆربەی زۆری مامۆستایان سەرزەنشتی قوتابیەکانیان دەکەن و بە تەمەڵ ناویان دەبەن، بەڵام زۆر بە کەمی بە قوتابیە زیرەك و وریاو ژیرەکاندا هەڵدەدەن و هانیان دەدەن..

زۆربەمان کاتێك منداڵەکانمان یان هاوسەرانمان هەڵەیەك ئەنجام دەدەن، بە خێرایی ئاگاداریان دەکەینەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە زۆر بە کەمی کارە جوانەکانیان دەنرخێنین..

لە جوانترین شارەزاییەکانی گفتوگۆ، بریتیە: لە باس کردنی لایەنە باش و جوانەکانی خەڵکی..

پێغەمبەری خوداﷺ رۆژێك بە ئەبوموسای ئەشعەری دەگات و پێی دەفەرموێت: ئەگەر دوێنێ دەتبینیم، چۆن گوێم بۆ قورئان خوێندنەکەت گرت بوو، بەشێك لە دەنگ خۆشیەکەی داود پێغەمبەرﷺ پێدراوە..

ئەبوموساش‌رضي الله عنه روخساری دەگەشێتەوەو زۆر دڵخۆش دەبێت و دەفەرموێت: ئەگەر بمزانیبایە گوێم لێدەگریت، ئەوا دەنگم خۆشتر دەکرد..

بەڵێ.. پێغەمبەری خوداﷺ هەست و نەستی بەرامبەر بە خەڵکی نەدەشاردەوەو کەسێك هەڵەی بکردایە، بە شێوەیەکی جوان پێی دەفەرموو: هەڵەت کرد، هەروەها بە کەسی چاکەکاریشی دەفەرموو: چاکت کرد..

رۆژێك ئەبوهورەیرەرضي الله عنه پرسیار لە پێغەمبەری خوداﷺ دەکات و دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لە رۆژی دواییدا، کێ زۆر بە تکاو شەفاعەتی تۆ بەختەوەر دەبێت؟! بە راستی پرسیارێکی جوانە!! ئەم پرسیارە زۆر لەو پرسیارە جوانترە کە پێغەمبەری خوداﷺ سەرقاڵ بکەیت و بڵێیت: کەی رۆژی دوایی دێت؟

پێغەمبەری خوداشﷺ لە سەر پرسیارە جوانەکەی هانیدەدات و دەفەرموێت: گومانم وا بوو هیچ کەسێك لە پێش تۆدا ئەم پرسیارە نەکات، لەبەر ئەوەی تۆ لە وەرگرتنی زانست و زانیاریدا زۆر سوریت.. لە وەڵامی پرسیارەکەشدا فەرمووی: ئەو کەسەی بە دڵسۆزی و بە پاکی و لە دڵەوە بڵێت: لا إله إلا الله..

سەلمانی فارسی ﷺ یەکێك بوو لە هاوەڵە بەڕێزەکانو عەرەبیش نەبوو، بەڵکو کوڕی یەکێك لە پیاوە گەورەکانی فارس بوو.. باوکی بە ئەندازەیەك خۆشی دەویست، هەتا لە ترسی ئەوەی نەوەکو کارێکی بە سەر بێت، لەماڵەوە بەندی کرد.. پەروەردگار باوەڕی خستە دڵی سەلمانەوەو لە ماڵ دەرچوو..

بەڵێ.. سەلمانی فارسی ﷺ بە شوێن ڕاستیدا بەرەو شام کەوتە ڕێ.. هەندێك کەس بە فروفێڵ بە جولەکەیەکیان فرۆشتو ئەویش کردی بە بەندە.. چیرۆكو ڕووداوەکەی دوورو درێژە.. بە هەر حاڵ گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ و بوو بە یەکێك لە هاوەڵانی..

ڕۆژێك پێغەمبەری خوداﷺ لە ناو هاوەڵانیدا دانیشتبوو، سورەتی الجمعەی بۆ دابەزیو پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندنەوە، کە دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا۟ بِهِمْ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ ﴾ الجمعة. واتە: (هەر ئەو زاتەیە لە ناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بە سەردا دەخوێنێتەوەو دڵو دەروونو ڕواڵەتو ئاشکراو نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئانو دانایی شەریعەتیان دەکات، بە ڕاستی ئەوانە پێشتر لە گومڕاییو سەرلێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خوارد بوو★ لە ئایندەدا خەڵکی تریش دێن (موسڵمان دەبن لە گەلو میللەتان) پەیوەست دەبن بەمانەوە، بێگومان ئەو زاتە باڵادەستو داناو کار دروستە)..

یەکێك لە هاوەڵان دەفەرموێت: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟

پێغەمبەری خوداﷺ بێدەنگ بوو.. هاوەڵەکە پرسیارەکەی دوبارە کردەوەو فەرمووی: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟

ئەمجارەیان پێغەمبەری خوداﷺ ڕووی کردە سەلمانو پاشان دەستی خستە سەر شانیو فەرمووی: ئەگەر ئیمانو باوەڕ لە سەر ئەستێرەکانیش بووایە، پیاوانێکی ئاوا بە دەستیان دەهێنا.. متفق علیه..

**تێڕوانین..**

گەشبین بەو گومانی باش بە خەڵکی بەرمو هانیان بدە، بۆ ئەوەی زیاتر پەرە بە کارە باشەکانیان بدەن..

## هونەری گوێگرتن..

شارەزاییەکانی بە دەست هێنانی دڵو دەروونی خەڵکی، جۆراو جۆرن.. هەندێکیان بە ئەنجامدانی کارێك دەبێت، بەڵام هەندێکیان بە ئەنجام نەدانی کارێك.. هەر وەك زەردەخەنەو ڕووی خۆشو گەش، دەبێتە هۆی ڕاکێشانی خەڵکی، بە هەمان شێوە دوورکەوتنەوەو وازهێنانیش لە گرژیو مۆنیو تووڕەیی، دەبێتە هۆی بە دەست هێنانی دڵو دەروونیان..

هەر وەك قسەی خۆشو پیاهەڵدانو ستایش، دەبێتە هۆی ڕاکێشانی دڵی خەڵکی، بە شێوەیەکی جوان گوێ لێگرتنیشیان لە کاتی قسە کردندا، بە هەمان شێوە دەبێتە هۆی ئەوەی خۆشەویستییان بە دەست بهێنین..

بە لاتەوە چۆنە لە بارەی بێدەنگی سەرنج ڕاکێشەوە بۆت بدوێم؟!

بەڵێ.. کەسانێك هەن، زۆر نادوێنو کەم قسە دەکەنو لە کۆڕو دانیشتنەکاندا زۆر بە کەمی گوێت لە دەنگیان دەبێت.. جاری وا هەیە ئەگەر چاودێرییان بکەیت، دەبینیت تەنها سەرو چاوی دەجوڵێتو بەس، هەندێك جار نەبێت لێوەکانیشی دەجوڵێن، بەڵام بۆ دەربڕینی زەردەخەنە، نەك بۆ قسەکردن، کەچی لە ناو خەڵکیشدا زۆر خۆشەویستنو هەموو کەس حەز بە نزیکییان دەکات.. دەزانی بۆ؟!

لەبەر ئەوەی لەگەڵ خەڵکیدا بێدەنگی سەرنج ڕاکێش بەکاردەهێننو بە ئارامی گوێیان لێدەگرن..

هونەری گوێگرتن شێوازی جۆراو جۆری هەیە.. یەکێك لەو کەسانەی کە گرنگی بەم بوارە دەدات، پێی ڕاگەیاندم ئامادەی زیاتر لە پانزە خولی هونەری گوێگرتن بووم.. جیاوازی لە نێوان ئەم کەسانەدا بکە: کاتێك بابەتو ڕووداوێك بۆ کەسێك باس دەکەیت، لەپڕ پێت دەبڕێتو دەڵێت: منیش هەمان ڕووداوو بەسەرهاتم بەسەرهاتووە..

تۆش دەڵێیت: پەلە مەکە با قسەکانم تەواو بکەم.. کەمێك بێدەنگ دەبێتو دوبارە دەڵێت: ڕاستە.. ڕاستە.. وەکو ڕووداوەکەی من وایە، جارێکیان ڕۆیشتم بۆ...

تۆش دەڵێیت: برام چاوەڕێ بکەو پەلە مەکە.. کەمێك ئارام دەگرێت‌و بۆ جاری سێیەم دەڵێت: دەی باشە کەمێك پەلە بکە..

ئەمەی کە باسمان کرد، کەسی یەکەم بوو.. بەڵام کەسی دووەم کاتێك کە ڕووداوێکی بۆ دەگێڕیتەوە، سەیری ڕاست‌و چەپی خۆی دەکات، مۆبایلەکەشی لە گیرفانی دەر دەهێنێت‌و کورتە نامە دەنوسێت، یان دەیان خوێنێتەوە، یان لەوانەیە بە یارییەکانی ناو مۆبایلەکەیەوە خۆی سەرقاڵ بکات..

بەڵام کەسی سێیەم لەبەر ئەوەی شارەزای هونەرەکانی گوێگرتنە، کاتێك بابەتێکی بۆ باس دەکەیت، چاوەکانی دەبڕێتە چاوت‌و سەیرت دەکات، جار جارێکیش سەری دەجوڵێنێت‌و ڕاستی وتەکانت دەسەلمێنێت، جار جارەش زەردەخەنەیەکت بۆ دەکات‌و هەندێك جاریش وەکو سەرسامیەك دەڵێت: سەیرە!! پاك‌و بێگەردی بۆ خودا!!

دەی بزانم زیاتر حەز بە کۆڕو دانیشتنی کامیان دەکەیت؟! بێگومان کەسی سێیەم..

بانگخوازێکی بە ناوبانگ هەبوو، لە وتارداندا خاوەن توانایەکی باش بوو.. بەردەوام ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد.. خەڵکیش کاتێك لە سەر دوانگە، یان لە کەناڵە ئاسمانیەکاندا دەیان بینی، خۆشیان دەویست‌و حەزیان دەکرد گوێی لێبگرن، تەنها هاوسەرەکەی نەێت، چونکە بەردەوام لە ماڵەوە بەیەکەوە بوون‌و زۆر گوێی لە دەنگی مێردەکەی دەبوو..

بانگخوازەکە بڕیاریدا لەگەڵ خۆی بۆ یەکێك لە وتارەکانی بیبات..

ڕۆژێك پێی دەڵێت: هاوەڵیم ناکەیت بۆ ئەوەی بچین گوێ لە وتاری یەکێك لە بانگخوازان بگرین؟ هاوسەرەکەی لەگەڵیدا سەردەکەوێت‌و لە دەرگای مزگەوتەکە قەرەباڵغیەکی زۆر دەبینن، کە هەموویان بۆ گوێگرتنی ئەو وتارە هاتبوون.. ئافرەتەکە دەچێتە بەشی ژنان‌و پیاوەکەش لە بەشی پیاوان دەست بە وتارو ئامۆژگارییەکانی دەکات.. خەڵکی هەموو بە بێدەنگی گوێ دەگرن، تەنانەت هاوسەرەکەشی زۆر بە ئامەزرۆوە گوێ دەگرێت‌و بێدەنگ دەبێت..

کاتێك وتارەکە تەواو دەبێت‌و دەیانەوێت بگەڕێنەوە، پیاوەکە یەکسەر باسی قەرەباڵغی‌و جوانی مزگەوتەکە دەکات‌و پاشان دەڵێت: ڕاو بۆچوونت لە سەر وتارەکە

چۆن بوو؟!

هاوسەرەکەش دەڵێت: زۆر جوان و کاریگەر بوو، بەڵام کەسەکە کێ بوو؟!

پیاوەکەشی دەڵێت: سەیرە!! دەنگیت نەناسی؟! ئەوە من بووم..

ئافرەتەکە کاتێك دەزانێت مێردەکەی بووە، دەڵێت: ئۆی.. لە دڵی خۆمدا وتم: بۆ ئەوەندە درێژەی پێداو ئەم هەموو قسەیە چی بوو؟!

کەواتە: گوێگرتن لە خەڵکی هونەرو شارەزاییە.. هەندێك لە خەڵکی بیریان چۆتەوە، پەروەردگار زمانێك و دوو گوێچکەی پێبەخشیوون، لەبەر ئەوەی زیاتر لە قسەکردن، گوێ بگرن.. کەسانێك هەن ئەگەر بۆیان بکرێت هاوکێشەکەیان هەڵدەگێڕایەوەو دووزمان و گوێچکەیەکیان بۆ خۆیان دادەنا، بۆ ئەوەی زیاتر قسە بکەن..

دەی خۆت ڕابهێنە بەوەی گوێ لە خەڵکی بگریت و لە کاتی قسەکردنیاندا بێدەنگ بیت، هەتا ئەگەر لە سەر قسەکانیشیان تێبینیت هەبێت، یان ئەگەر قسەکانیان ناخۆشیش بێت و بە دڵیشت نەبێت، پەلە مەکەو ئارام بگرەو گوێیان لێبگرە..

لە سەرەتای هاتنی ئاینی ئیسلامدا، موسڵمانان کەم بوون، بێباوەڕانیش بە درۆیان دەخستنەوەو خەڵکیان لێ دوور دەخستنەوە، هەروەها بڵاویان دەکردەوە کە پێغەمبەری خوداﷺ درۆزن و فاڵچیەو زۆر جاریش دەیان وت: شێتە، یان جادوگەرە..

ڕۆژێك پیاوێکی شارەزا لە بواری پزیشکی و چارەسەردا، سەردانی شاری مەککە دەکات، کاتێك دەچێتە ناو خەڵکیەوە، گوێی لە بێباوەڕانی قورەیش دەبێت، بە شێت ناوی پێغەمبەری خوداﷺ دەبەن و دەڵێن: ئەوا شێتەکە هات و شێتەکەمان بینی و چەندان وتەی ناشیرینی تر..

ئەم پیاوەش دەڵێت: ئەو پیاوەی کە ئێوە باسی دەکەن، لە کوێیە؟ دەی بەڵکو لە سەر دەستی من چاك بێتەوە.. خەڵکەکەش ناونیشانی پێغەمبەری خودایﷺ پێدەدەن.. پیاوەکە پێغەمبەری خوداﷺ دەبینێت و لە ڕوخساری گەشاوەی ورد دەبێتەوەو دەڵێت: ئەی محمد، خودا لە سەر دەستی من شیفای بۆ چەندان کەس ناردووە، وەرە با چارەسەری تۆش بکەم.. پیاوەکە بەردەوام قسەی دەکردو پێغەمبەری خوداشﷺ زۆر بە بێدەنگی گوێی گرتبوو..

دەزانی گوێی لە چی دەگرت؟! گوێی لە قسەی کەسێکی بێباوەڕ دەگرت، کە هاتبوو

چارەسەری پێغەمبەری خوداﷺ بکاتو دەیوت: بیستوومە شێت بوویت.. ئای لەم ئارامیو خۆڕاگرییە!!

دوای ئەوەی پیاوەکە قسەکانی تەواو کرد، ئەوسا زۆر بە ئارامی پێغەمبەری خوداﷺ هەندێك قسەی کردو فەرمووی: إن الحمدلله.. نحمده ونستعينه.. من يهده الله فلامضل له.. ومن يضلل فلا هادي له.. واشهد ان لا إله إلا الله وحده لاشريك له..

پیاوەکە شڵەژاو وتی: ئەو وتانەم بۆ دوبارە بکەرەوە.. پێغەمبەری خوداشﷺ بۆی دوبارە کردەوە.. پیاوەکە کاتێك گوێی لەو وتە جوانانە بوو، وتی: سوێند بە خودا گوێ بیستی وتەی فاڵچیو جادوگەرو زمان زانەکان بووم، گوێم لە وتەی ئاوا جوان نەبووە!! دەستت بێنە با پەیمانی موسڵمان بوونت پێبدەم.. پێغەمبەری خوداﷺ دەستی درێژ کردو پیاوەکەش جلو بەرگی بێباوەڕی لەبەر خۆی داماڵیو وتی: أشهد أن لا إله إلا الله.. وأشهد ان محمداً عبده ورسوله.. پاشان پێغەمبەری خوداﷺ زانی ئەم پیاوە لە ناو گەلو هۆزەکەیدا خاوەن ڕێزو پلەوپایەیە، هەر بۆیە پێی فەرموو: بانگی گەلو هۆزەکەشت بکە، بۆ ئەوەی موسڵمان بن.. پیاوەکەش پەیمانیداو بەرەو لای گەلو هۆزەکەی کەوتە ڕێ..

کەواتە: بۆ ئەوەی گوێگرێکی باش بیت، پێویستە: کەسێکی بێدەنگ بیت.. سەرت بۆ کەسی قسەکەر ڕاوەشێنەو بە ئاماژە ڕاستی وتەکانی بسەلمێنەو زەردەخەنەی بۆ بکەو سەرسامی خۆت، بۆ قسەکانی دەرببڕەو سەیری ڕوخساری بکە، ئەوسا هەست دەکات، چۆن چاوت لە چاویەتی، ئاواش بە دڵ لەگەڵیدایو پاشان ئەویش بە دڵ پێشوازیت لێدەکات..

**ئەنجام..**

تازەگەریو داهێنانمان بۆ گوێگرتن لە خەڵکی، وایان لێدەکات داهێنانو تازەگەری لە خۆشەویستیماندا بکەنو خوومان پێوە بگرن..

# هونەری گفتوگۆ..

بیرت نایەت، ڕۆژێك لە شوێنێكدا، كاتێك لەگەڵ كەسێكداو لە گفتوگۆیەكدا، شتێك لە دڵو دەروونتدا، دروست بوو بێت، یان لەوانەیە تا چەند ڕۆژێك تووڕە بووبێتی.. یان جاری وا هەیە مشتومڕو دەمەقاڵەیەك لە نێوان دوو كەسداو لە سەر شتێكی بێ بایەخ دروست دەبێتو هەردووكیان دەنگیان بەرز دەكەنەوەو چاویان لەیەك سور دەكەنەوە، كاتێك جیا دەبنەوە، هەریەكەیان لە لای ئەوی تریان خوێنی تاڵ دەبێت..

كەواتە ئێمە هەموومان لە بە دەست هێنانو ڕاكێشانی دڵی خەڵكیدا ماندوو دەبین، پاشانیش بە هەڵسوكەوتێكی نەشیاو لە دەستیان دەدەین، هەموو ئەمانەش بە هۆی كەم ئەزموونیمانە لە هونەری گفتوگۆدا..

كەسی قسەكەر، وەكو ئەوە وایە بە سەر شاخێكی سەختدا سەربكەوێت.. بۆیە پێویستە زۆر گرنگی بە شوێنی دەستو قاچەكانی بداتو پێش ئەوەی دەستو قاچی لە بەردەكان گیر بكات، پێویستە سەیریان بكاتو لە گونجانو نەگونجانیان دڵنیا بێت.. هەروەها پێش ئەوەی قاچەكانی لە سەر بەردەكانیش لابەرێت، پێویستە سەیری بەردەكانی ژێر پێی بكات، لەبەر ئەوەی نەوەكو پێیەكانی بترازێتو بكەوێتە خوارەوە..

درێژە بە قسەكانم نادەم.. باشترین قسەش، ئەوانەن كە كورتو بەڵگەدارن.. چوونە ناو دەمەقاڵێو مشتومڕەوە، كارێكی باش نیە، بەڵكو كارێكی سەرزەنشت كراویشە.. لەوانەیە لەگەڵمدا هاوڕا بیت كاتێك دەڵێم: زیاتر لە٩٠٪ی مشتومڕەكان بێسودو بێ بایەخن..

بە گوێرەی توانات، هەوڵبدە لە مشتومڕ دوور بكەویتەوە.. كاتێكیش یەكێك ڕەخنەت لێدەگرێت، یان قسەت پێدەبڕێت، تووڕە مەبەو كارەكە بە سنگێكی فراوانەوە وەربگرەو بە بیركردنەوە لەو كەسانە، خۆت ئازار مەدەو لێكۆڵینەوە لە نیەتو مەبەستی مەكەو وازی لێ بهێنە.. بە غەمو خەفەت، خۆت لەناومەبەو زۆر بە ئارامی لەگەڵ حاڵەتەكەدا هەڵسوكەوت بكە، لەبەر ئەوەی زریانو ڕەشەبا، تەنها وردە بەردەكان دەجوڵێننو

بارییان پێدەکەن، بەڵام بە دڵنیاییەوە ناتوانن چیا جێگیرو گەورەکان بلەرزێنن.. دەی تۆش وەکو چیاو شاخەکان بەهێزو خۆڕاگربە..

کاتێك قورەیش پەیمانی حودەیبیەیان شکاند، پێغەمبەری خوداﷺو هاوەڵانی بۆ ڕزگارکردنی شاری مەککە کەوتنە ڕێو لە نزیك مەککە لایاندا.. ئەبوسوفیان خۆیو هەندێك لە بێباوەڕان لە سەربازگەیەکی موسڵمانان نزیك دەبنەوە، بەڵام نازانن کە ئەوە سەربازگەی موسڵمانانە..

ئەبوسوفیان کاتێك سەیری ئاگرەکانی سەربازگەکە دەکات، دەڵێت: هەرگیز ئاگرو سەربازگەی بەم شێوەیەم نەبینیووە.. بە ڕاستی گەورەیە!! کێ ئەوانە دەبینێت؟!

یەکێك لە هاوەڵەکانی دەڵێت: ئەوانە هۆزی خوزاعەنو بە کۆمەڵ بۆ جەنگ هاتوون..

ئەبوسوفیانیش دەڵێت: هۆزی خوزاعە زۆر لەوە کەمترن، کە ئاگرو سەربازگەی بەو شێوەیەیان هەبێت.. ئەبوسوفیان بەرە بەرە لە سەربازگەکە نزیك دەبێتەوە، هەتا لە لایەن هەندێك پاسەوانی موسڵمانانەوە دەستگیر دەکرێتو دەیانەوێت بیبەن بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ.. لەو کاتەدا عەباسی مامەی پێغەمبەری خوداﷺ بە سواری لەوێوە تێدەپەڕێت، ئەبوسوفیانیش لە ترسدا لە دوای عەباسەوەرضي الله عنه سوار دەبێتو هاوەڵەکانیشی بە ترسەوە شوێنی دەکەونو موسڵمانانیش بە دوایانەوە..

کاتێك بە لای ڕەشماڵو ئاگری موسڵماناندا تێدەپەڕن، ئیمامی عومەررضي الله عنه دەیان بینێتو دەڵێت: ئەوە ئەبوسوفیانی دوژمنی خودایە.. سوپاس بۆ خودا بە بێ هیچ ڕێکەوتنو پەیمانێك دەستمان لێی گیر بوو.. عەباسرضي الله عنه نایەڵێت دەستی ئیمامی عومەررضي الله عنه بگاتێو بەپەلە دەیبات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ..

پاشان ئیمامی عومەریشرضي الله عنه دێتو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەوە ئەبوسوفیانە.. خودا بە بێ هیچ ڕێکەوتنو پەیمانێك هێناویەتیە ژێر دەستمان.. با لە گەردنی بدەم..

ئەبوسوفیان زۆری بە موسڵمانان کرد بوو.. سەرکردەی جەنگی ئوحودو خەندەق بوو، لە دژی موسڵمانان.. زۆری ئازاری موسڵماناندا‌و زۆریشی لێ شەهید کردن، ئێستاش ئاوا بە ئاسانی کەوتووەتە دەست موسڵمانان..

ئیمامی عومەریشرضي الله عنه زوو زوو دووبارەی دەکردەوەو دەیوت: ئەی پێغەمبەری

خوداﷺ لە ملی بدەم.. کاتێك ئیمامی عومەرﷺ زۆر دووبارەی کردەوە، عەباسﷺ رووی کردە ئیمانی عومەرﷺو فەرمووی: لەسەرخۆبە ئەی عومەر.. سوێند بە خودا ئەگەر ئەبوسوفیان لە هۆزەکەی تۆ بووایە، ئەم قسەیەت نەدەکرد..

ئیمامی عومەرﷺ هەستی کرد لەوانەیە بکەوێتە مشتومڕێکی نەگونجاوەوە، هەر بۆیە زۆر بە ئارامی فەرمووی: عەباس تۆش لەسەرخۆبە.. سوێند بە خودا ئەو رۆژەی موسڵمان بوویت، لەوەم پێخۆش تر بوو کە باوکم موسڵمان بووایە، لەبەر ئەوەی دەمزانی پێغەمبەری خوداﷺ، موسڵمان بوونی تۆی لە موسڵمان بوونی باوکم پێ خۆشتر بوو..

کاتێك عەباسﷺ گوێی لەم قسەیە بوو، بێدەنگ بوو.. گفتوگۆکەش کۆتایی هات.. لەگەڵ ئەوەشدا ئیمامی عومەرﷺ دەیتوانی درێژەی پێبداتو بیوتایە: مەبەستت چیە؟! تۆ ناخو دەروونی من تۆمەتبار دەکەیت؟! دەزانی چی لە دڵی مندا هەیە؟! بۆچی دەتەوێت ناکۆکی هۆزایەتی بەرپا بکەیت؟!

نەخێر.. هیچ یەکێك لەم شتانەی نەوت.. هەردووکیان بێدەنگ بوونو ئەبوسوفیانیش سەیری دەکردو چاوەڕێ بوو بزانێت، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمان بە چی دەدات..

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: عەباس لەگەڵ خۆت بیبەو بەیانی بیهێنەرەوە.. عەباسیشﷺ دەیبات بۆ رەشماڵەکەیو ئەو شەوە بەیەکەوە دەبن.. کاتێك بەرەبەیان دێت، ئەبوسوفیان دەبینێت موسڵمانەکان هەموویان هەستاونو خەریکی دەستنوێژ گرتنن، دەڵێت: عەباس ئەمانە چیانە؟!

عەباسیشﷺ دەفەرموێت: ئەوە گوێیان لە بانگی بەیانی بووەو دەچن نوێژەکانیان ئەنجام بدەن.. پاشان هەموو ئامادەی نوێژ دەبنو ریز ریز دەوەستن، پێغەمبەری خوداﷺ پێشنوێژیان بۆ دەکاتو ئەبوسوفیانیش ئەم دیمەنانە دەبینێت، بە ملکەچیو گوێڕایەڵیان سەرسام دەبێت..

کاتێك نوێژەکانیان تەواو دەبێت، عەباسﷺ دێت بۆ ئەوەی ئەبوسوفیان بەرێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ.. ئەبوسوفیان دەپرسێتو دەڵێت: عەباس ئەگەر محمد هەر فەرمانێکیان پێ بکات، بە گوێی دەکەن؟

عەباسیشﷺ دەفەرموێت: بەڵێ.. سوێند بە خودا ئەگەر فەرمان بدات بەوەی کە واز لە خواردنو خواردنەوەش بهێنن، بە گوێی دەکەنو وازی لێدەهێنن..

پاشان ئەبوسوفیان دەڵێت: ئەوەی ئەمشەو بینیم نە لە لای کیسراو نە لە لای قەیسەر نەمبینیووە!! کاتێك چوونە لای پێغەمبەری خوداﷺ پێی فەرموو: ئەبوسوفیان ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، کە بزانیت جگە لە الله هیچ خودایەکی ڕاستەقینە بوونی نیە؟!

ئەو شەوەی کە ئەبوسوفیان لە ناو موسڵماناندا بە سەری برد بوو، بەس بوو بۆ ئەوەی کە ڕق‌و دوژمنایەتیەکەی کەم بێتەوە، هەر بۆیە وتی: باوك‌و دایکم بە قوربانت بن، ئای چەندە ئارامگرو بەڕێزیت!! سوێند بە خودا وا دەزانم ئەگەر جگە لە الله خودایەکی تر هەبووایە، ئەوا یارمەتیەکی دەدام!!

پاشان پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ، ئەی ئەبوسوفیان، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بزانیت کە من پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودام؟!

ئەبوسوفیانیش زۆر ڕاشکاوانە دەڵێت: باوك‌و دایکم بە قوربانت بن، چەندە ئارامگرو بەڕێزیت، بەڵام سوێند بە خودا هێشتا شتێك لە دڵ‌و دەروونمدا هەر ماوە!!

لەم کاتەدا عەباس رضي الله عنه دەفەرموێت: دەی ئەبوسوفیان موسڵمان بەو شایەدومان بهێنە..

کەمێك بێدەنگ دەبێت‌و پاشان دەڵێت: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گوێی لە موسڵمان بوونی ئەبوسوفیان بوو، ڕوخساری گەشایەوەو زۆر دڵخۆش بوو.. پاشان عەباس رضي الله عنه فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەوسوفیان پیاوێکە حەز بە گەورەیی‌و شانازی دەکات، شتێکی بۆ بکەو ڕێزێکی لێ بنێ.. پێغەمبەری خوداشﷺ فەرموی: هەر کەسێك بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە، ئەوا پارێزراو دەبێت..

**بۆچوون..**

زیرەکی ئەوە نیە کە لە مشتومڕدا سەرکەوتوو بیت، بەڵکو زیرەکی ئەوەیە کە هەر لە سەرەتاوە نەچیتە ناو مشتومڕەوەو خۆت توشی دەمەقاڵێ نەکەیت..

# ڕێگە لە بەرھەڵستکاران بگرە..

زۆربەی کێشەو گرفتەکان کە ڕوو دەدەن، بەرھەمی زمان‌و قسەکردنە..

جاری وا ھەیە بە ھۆی پەلەکردن لە قسەبڕین بە خەڵکی‌و چاوەڕێ نەکردنی کەسی قسەکەر ھەتا کۆتایی بە قسەکانی دەھێنێت، مشت‌ومڕو دەمەقاڵێیەکی نەزۆکی بێ بەرھەم دروست دەبێت‌و دەبێتە ھۆی تێکچوونی دڵ‌و دەروونەکان..

کاتێك ناتوانیت چاکسازی لە ھەموو خەڵکیدا بکەیت‌و وایان لێ بکەیت ھەموو بە پێی ڕەوشتە شەرعیەکان بجوڵێنەوە، یان ھەموویان وا لێ بکەیت، جوانترین ھونەرەکانی ھەڵسوکەوت کردن، لە بیستن‌و بینین‌و گفت‌وگۆدا بەکاربھێنن، دڵتەنگ مەبە..

ھەندێك کەس بەردەوام دەڵێن: پێویست بوو خەڵکی وایان بکردایە، یان وایان نەکردایە.. واز لەو قسانە بھێنە.. وەك وتراوە: نوێژ لە سەر ئەم مردووە ئامادەیە بکە..

بە کورتی پێویستە خۆمان بەوەوە سەرقاڵ نەکەین، کە پێویستە خەڵکی چی بکات، بەڵکو ئەوە گرنگە بزانین خۆمان چی بکەین.. جاری وا ھەیە، کاتێك باسی بابەتێکی سەیرو نامۆ دەکەیت، لەوانەیە ھەندێك کەس پەلە بکەن‌و بیانەوێت بابەتەکەت پێ ببڕن، بۆیە پێویستە پێش ئەوەی ئەوان بابەتەکەت پێ ببڕن‌و ڕەخنە لە وتەکانت بگرن، دەرگاکانی ڕەخنەو تێبینی بە ڕوویاندا دابخەیت، ئەمەش بەوە دەبێت، لە سەرەتادا ھەندێك ڕوون کردنەوە لە سەر بابەتەکە بدەیت، پێش ئەوەی کە پرسیار لە بارەیەوە بکەن..

پیاوێکی بە تەمەن لە کۆڕو دانیشتنێکدا، باسی ڕووداوی ناکۆکی نێوان دوو کەس دەکات، کە لە وێستەگەیەکی بەنزیندا ڕوویدا بوو..

پیاوێکە دەڵێت: بە شێوەیەك ناکۆکیەکەیان پەرە دەسێنێت، ھەتا پیاوانی پۆلیس دێن‌و دەیان بەن بۆ بنکەی پۆلیس.. ئامادەبوویەکی زۆر بلێ، دێتە ناو باسەکەوەو دەڵێت: بەڵێ.. ڕاستە.. بەڵام بەو شێوەیە نەبوو، بەڵکو بەم شێوەیە بوو، خەتای فلانە کەسیشیان بوو، پاشان دەست دەکات بە باسکردنی ڕووداوەکە..

پیاوە بە تەمەنەکەش لە داخا خەریکە گڕی تێبەربێت‌و پیایدا ھەڵبشاخێت، بەڵام

خۆی دەگرێت‌و زۆر بە ئارامی پێی دەڵێت: تۆ خۆت لەوێ بوویت؟
پیاوەکە دەڵێت: نەخێر..
ئەی کۆنوسی لێکۆڵینەوەکەت خوێندەوە؟
پیاوەکە دەڵێت: نەخێر..
ئیتر پیاوە بە تەمەنەکە خۆی بۆ ناگیرێت‌و بە سەریدا هاوار دەکات‌و دەڵێت: باشە ئەی چۆن هیچ شتێك نازانیت‌و بە درۆشم دەخەیتەوە؟!
بە ڕاستی بە خۆگرتن‌و ئەو پێشەکییەی پیاوە بە تەمەنەکە باسی کرد، سەرسام بووم، خۆ ئەگەر بە بێ هیچ پێشەکییەك‌و بەبێ ئەو پرسیارانە، بەرەنگاری ببووایەتەوە، ئەوا دەرگای ڕزگار بوونی بەرووی کابرای زۆر بلێدا دەکردەوەو ئەگەر بە درۆش بووایە، خۆی ڕزگار دەکرد..
زۆر جار کاتێك دەمانەوێت باسی بابەتێك بکەین، پێویستە پێشەکییەك بۆ وتەکانمان پێشکەش بکەین، بۆ ئەوەی وەڵامێکی ئەو کەسانە بدەینەوە، کە لەوانەیە ڕەخنەو تێبینییان لە سەر وتەکانمان هەبێت..
کاتێك قورەیش، لە جەنگی بەدردا، هاتن بۆ شەڕو کوشتاری موسڵمانان، هەندێك کەس مەبەستیان نەبوو بێن‌و شەڕی موسڵمانان بکەن، بەڵام گەل‌و هۆزەکانیان زۆریان لێکردبوون..
پێغەمبەری خوداش ﷺ ئەم دەنگ‌وباسەی دەزانی، دەشیزانی‌و دڵنیا بوو ئەگەر ئەو کەسانە ئامادەی جەنگەکەش بن، کوشتاری موسڵمانان ناکەن.. کاتێك موسڵمانان لەمەیدانی جەنگەکە نزیك بوونەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ ویستی هاوەڵانی ئاگادار بکاتەوە، بەوەی ئەگەر دەستیان لەو کەسانە گیر بوو، نەیان کوژن، ئەمەش لەوانەیە پرسیار لە لای هەندێك کەس دروست بکات‌و بڵێن: چۆن کەسانێك نەکوژین، کە بۆ کوشتارمان هاتوون؟! بۆچی چەند کەسێکی دیاریکراو، وازیان لێ بهێنرێت‌و نەکوژرێن؟!
هەر بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ پێشەکییەکی بۆ وتەکانی دانا، بۆ ئەوەی وەڵامێك بێت، بۆ ڕەخنەو تێبینییەکانی هاوەڵانی، هەر بۆیە فەرمووی: من دەزانم کەسانێك لە نەوەی هاشم‌و کەسانێکی تریش، بە زۆر هێنراون بۆ ئەم جەنگەو هیچ پێویستیەکیشیان بە کوشتاری ئێمە نیە، پێشەکیەکەی ئەوەندە بوو، تەواو..
پاشان فەرمووی: هەر کەسێك لە ئێوە بە کەسێکی نەوەی هاشم گەیشت، با نەیکوژێت..

هەر کەسێکیش بە ئەبو بوختەری کوڕی هیشام گەیشت، با نەیکوژێت.. هەر کەسێکیش بە عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامەی پێغەمبەری خوداﷺ گەیشت، با نەیکوژێت، چونکە بە زۆر هێناویانە..

هەندێك لە هاوەڵان لە ناوخۆیاندا لەم بارەیەوە گفتوگۆیان دەکرد، هەتا ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: ئێمە باوکان و کوڕان و برایانی خۆمان بکوژین و واز لە عەباس بهێنین؟! سوێند بە خودا ئەگەر پێی بگەم، بە شمشێر دایدەگرمەوە..

ئەم قسانە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوداﷺ، پێغەمبەری خوداشﷺ لای کردەوە بە لای ئیمامی عومەرداﷺ و فەرمووی: ئەی باوکی حەفص.. ئیمامی عومەرؓ دەفەرموێت: ئەوە یەکەمین جار بوو بەم نازناوە بانگم بکات..

پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: ئەی باوکی حەفص، ئایا بە شمشێر لە ڕوخساری مامەی پێغەمبەری خودا دەدرێت؟!

ئیمامی عومەرؓ توورە دەبێت و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: چۆن ئەبوحوزەیفە بە گوێی فەرمانی پێغەمبەری خوداﷺ ناکات، ئەی ئەو موسڵمان نیە؟! پاشان بە دەنگی بەرز هاوار دەکات و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا وازم لێ بهێنە با لە گەردنی بدەم..

ئەبوحوزەیفەؓ لە قسەکانی پاشگەز دەبێتەوە و دەڵێت: لەو ڕۆژەوە لەو قسەیەم دڵنیانیم و بەردەوام دەترسم، وا هەست دەکەم تەنها شەهیدی ئەو گوناهەم بسڕێتەوە.. سوپاس بۆ خودا لە جەنگی یەمامەدا پەروەردگار پلەی شەهیدی پێبەخشی..

**ئامۆژگاری..**

زیرەك و بە توانابە و پێش ئەوەی بە پرسیار و ڕەخنە دەستت لێ بکەنەوە، بە وەڵام و ڕوون کردنەوەی جوان، دەستیان لێ بکەرەوە و فریای خۆت بکەوە..

## چاوەڕوان بەو بەرهەڵستی مەکە..

بیرم دێت، کەسێك باسی هونەری گفتوگۆی دەکرد، باسی بابەتێکی لە چیرۆکی یوسف ﷺ کرد، کاتێك گەیشتە ئەم ئایەتە پیرۆزە.. ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرًا وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾ یوسف. واتە: (ئەوسا دوو لاوی تریش بە تاوانی جیا جیا لەگەڵ یوسفدا خرانە بەندیخانەوە، (هەر یەکەیان خەوێکی بینی بوو) یەکێکیان وتی: بێگومان من خۆمم دەبینی لە خەومدا ترێم دەگوشیو شەرابم لێ دروست دەکرد، ئەوی تریشیان وتی: بە ڕاستی من خۆمم دەبینی لە خەومدا کە نانم بە سەر سەرمەوە هەڵدەگرتو باڵندە لێی دەخوارد، ئاگادارمان بکە بە لێکدانەوەی ئەم خەونە، چونکە بە ڕاستی ئێمە دەبینین تۆ لە چاکەخوازانیتو (شارەزای لە لێدانەوەی خەودا))..

پاشان لە ئامادەبووان وردبۆوەو وتی: کاتێك دوو گەنجەکە چوونە ژوورەوە، کامیان پێشتر چوونە ژوورەوە، یوسف ﷺ یان دوو گەنجەکە؟!

یەکێك لە ئامادەبووان هاواری کردو وتی: یوسف ﷺ..

یەکێکی تر هاواری کرد: نا.. نا.. دوو گەنجەکە..

یەکێکی تر وتی: نا.. نا.. یوسف ﷺ..

کەسێکی تر وتی: بە یەکەوە چوونە ژووری..

کەسێکی تر شتێکی تری وتو، بوو بە ژاوەژاو، هەتا وای لێهات بابەتە سەرەکییەکەی خۆیان بیرچووەوە، وەك ئەوەی کەسی پێشکەشکار ئەوەی مەبەست بێت، جارێکی تر لێیان وردبووەوەو لێیان ڕاما..

کات تێدەپەڕی.. پاشان زەردەخەنەیەکی کردو ئاماژەی پێدان، کەبێدەنگ بنو وتی: چ کێشەیەکە گەنجەکان لە پێش یوسف ﷺ دا، چوو بێتنە ژوورەوە، یان یوسف ﷺ لە پێش دوو گەنجەکەدا چوو بێتە ژوورەوە؟!

ئایا ئەمە ئەو کێشەو دەنگە دەنگە زۆرەی دەوێت؟!

بەڵێ.. زۆربەی جار لە سەر شتی ناپێویست جارەی خۆمان لە لای یەکتری ناشیرین دەکەین.. کاتێك یەکێك قسەمان بۆ دەکات، هەندێك ڕەخنەی نەشیاوی لێدەگرینو باسەکەی لێ تێك دەدەینو چاوەڕێ ناکەین تا قسەکانی تەواو دەکات.. زۆر جار هەندێك ڕەخنە دەگرین،

کە هیچ کاریگەرییەکیان لە سەر قسەکانی کەسی قسەکەر نیەو بەم هەڵسوکەوتەشمان چێژو خۆشی وتەکانی تێك دەدەینو خۆمانی لەبەر چاو ناشیرینو بێزراو دەکەین..

بیرم دێت سعودی برام کاتێك منداڵ بوو، لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، جارێك دێتە مزگەوتەوەو وا دەردەکەوێت پەلەی بێتو پێشنوێژیش دوا دەکەوێت.. کاتێك زۆری پێدەچێت، بەرەو لای بانگدەرەکە دەچێت، کە پیاوێکی بە ساڵاچووی گوێگران دەبێتو لوتی دەگرێت، بۆ ئەوەی دەنگی خۆی بگۆڕێتو دەڵێت: قامەت بکە، پاشان هەڵدێتو را دەکات..

بانگدەرەکەش کاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت، خەریکە هەڵبسێت قامەت بکات، بەڵام هەندێك لە نوێژخوێنان ئاگاداری دەکەنەوەو ڕووداوەکەی تێدەگەیەنن..

بانگدەرەکە بە تووڕەییەوە لا دەکاتەوە بۆ دواوەو خۆزگە دەخوازێت منداڵەکە ببینێتو سزای بدات.. ئەم ڕووداوە شتێکی خۆش بوو، بەڵام من لەبەر خۆشی ڕووداوەکە باسم نەکرد، بەڵکو بۆ ئەوە باسم کرد، لەبەر ئەوەی دوای ئەو ڕووداوە لە شوێنێك دانیشتبووم، یەکێك لە ئامادەبووان باسی ڕووداوەکەی کردو وتی: سعود بۆیە پەلەی بوو، زوو نوێژ بکرێت، لەبەر ئەوەی لەگەڵ باوکیدا دەچوو بۆ قەراغ دەریا..

بۆ زانیاریش شاری ڕیاز لە بیاباندایەو هیچ دەریایەکی لێوە نزیك نیە.. سەرسام بووم و نەمزانی قسەکانی لێ تێك بدەمو ڕەخنەی لێبگرم لە سەر زانیارییە هەڵەکەیو پێی بڵێم: دەریا کوا لێرە هەیە؟! یان بێدەنگ بم، چونکە ئەو زانیارییە هیچ کاریگەرییەکی لە سەر ڕووداوەکەی سعود نەبوو، هەر بۆیە حاڵەتی دووەمم هەڵبژاردو هیچ ڕەخنەیەکم لە قسەکانی نەگرت..

جاری وا هەیە ڕەخنەو نارەزایی لە شتێك دەردەبڕین هەر لە بنچینەدا لەو شتە تێنەگەیشتوویتو لەوانەیە ئەو کەسەی تۆ لۆمەو سەرزەنشی دەکەیت، بیانووی خۆی هەبێت، بەڵام تۆ نەیزانیت..

زیاد کەسێکی نەرمو نیان بوو، حەزی بە ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد.. ڕۆژێك لە کاتی وەستانی، لە یەکێك لە نیشانەکانی هاتوچۆدا، گوێ بیستی دەنگی گۆرانییەکی ڕۆژئاوایی بەرز دەبێت.. کاتێك سەیر دەکات، دەبینێت سەرچاوەی دەنگەکە لە ئۆتۆمبیلەکەی تەنیشتیەوە دێت..

شۆفێری ئۆتۆمبیلەکە دەنگی ڕادیۆکەی زۆر بەرز کردبووەوە، بە شێوەیەك دوورو نزیك گوێ بیستی بوون.. زیاد دەست دەکات بە لێدانی هۆڕن، بۆ ئەوەی شۆفێرەکەی تەنیشتی کەمێك دەنگەکە کز بکات، بەڵام شۆفێرەکە بە هیچ شێوەیەك هەر ئاوڕیش ناداتەوە، وەك ئەوەی بە تەواوی ئاوێتەی دەنگو ئاوازەکە بوو بێتو نەزانێت لە دەوروبەری چی دەگوزەرێت..

زیاد هەوڵ دەدات ڕوخساری شۆفێرەکە ببینێت، چونکە جامانەکەی سەری، لەملاولاوە ڕوخساری شاردبووەوە، دوای هەوڵێکی زۆر، کاتێك ڕوخساری دەبینێت، سەیر دەکات ڕیشی سەراپای ڕوخساری داپۆشیووە!! سەرسام دەبێت!! کەسێك بەو سەرو ڕوخسارەوە لەباتی گوێ لە قورئان بگرێت، چۆن گوێ لە گۆرانی دەگرێت؟! نەك هەر ئەوەندە، زۆر بە بەرزیش!!

گڵۆپی سەوز هەڵدەبێت‌و هەموو دەست بە ڕۆیشتن دەکەن.. زیاد سور دەبێت لە سەر ئەوەی کە ئامۆژگاری شۆفێرەکە بکات، هەر بۆیە شوێنی دەکەوێت، هەتا بۆ کڕینی هەندێك شت‌ومەك لە بەردەم دوکانێك ڕادەوەستێت.. زیادیش ڕادەوەستێت‌و کاتێك کابرا دادەبەزێت، دەبینێت جل‌وبەرگەکەشی کورتەو ڕیشێکی درێژیشی هەیە.. گومان دەبات چووبێت بۆ جگەرە کڕین، کەچی کاتێك لە دوکانەکە دێتە دەرەوە، گۆڤارێکی ئاینی بە دەستەوە دەبینێت!!

لەوە زیاتر زیاد خۆی بۆ ناگیرێت‌و بانگی دەکات‌و دەڵێت: براکەم.. بە یارمەتیت..

کابرا هیچ وەڵام ناداتەوە..

زیاد زیاتر دەنگی بەرز دەکاتەوەو هاوار دەکات‌و دەڵێت: هێی.. براکەم.. بە یارمەتیت.. گوێ بگرە..

کابرا بە بێ هیچ وەڵامێك سواری ئۆتۆمبیلەکەی دەبێت..

زیادیش زۆر بە توڕەییەوە دادەبەزێت‌و بەرەو ڕووی دەچێت‌و دەڵێت: براکەم.. نابیستی؟! پیاوەکە زەردەخەنەیەکی بۆ دەکات‌و ئۆتۆمبیلەکەی ئیش پێدەکات‌و ڕاستەوخۆ ڕادیۆکەی دەکەوێتە کار..

زیاد تووڕە دەبێت‌و دەڵێت: براکەم ئەمە وا نابێت.. خەڵکیت بێزار کردووە.. پیاوەکە زیاتر زەردەخەنەی بۆ دەکات.. دەنگی گۆرانیش زۆر بەرزە.. زیاد زیاتر تووڕە دەبێت‌و سور هەڵدەگەرێت‌و زیاتر دەنگی بە سەردا بەرز دەکاتەوە..

پیاوەکە کاتێك زیاد بەم شێوەیە دەبینێت، بە هەر دوو دەستی ئاماژە بە گوێچکەکانی دەکات، پاشان تیانوسێکی بچوك لە گیرفانی دەردەهێنێت، کە لە یەکەم لاپەڕەیدا نوسرا بوو: من پیاوێکی کەڕو نابیستم.. بە یارمەتیت چیت دەوێت بینوسە!!

تروسکەیەك..

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا ﴿١١﴾﴾ الإسراء. واتە: (ئینسان هەمیشەو بەردەوام بەپەلەو هەڵەشەیە).. ئاگادار بەو پەلە مەکە، چونکە پەلە کردن بەرەو گۆڕت دەبات..



## بە پێشەکی دەست پێبکە..

داواکاری گەورە، پێویستی بەوە هەیە، پێش ئەوەی داواکەمان دەربڕین، بە تەواوی خۆمان بۆ دەربڕینی ئامادە بکەین، بۆ ئەوەی داواکەمان بە ڕوودا نەدەنەوەو پەسەند بکرێت.. ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی هەموو داوایەکی زارەکی یان نوسراو دەگرێتەوە..

ئەگەر ویستت نامەیەك بۆ کەسێکی دەوڵەمەند بنێریت، بۆ ئەوەی پێویستیەکت بۆ دابین بکات، وا گونجاوە پێش دەربڕینی داواکەت هەندێك ستایشی بکەیتو بە کەسێکی بەخشندەو چاکەخواز ناوی بەریت، پاشان داواکارییەکەتی پێ ڕابگەیەنیت..

بە هەمان شێوە ئەگەر ویستت داوای شتێك لە باوکت، یان دایکت، یان هاوسەرەکەت بکەیت، وا جوانترە بە پێشەکییەك دەست پێ بکەیت..

کاتێك دەتەوێت هەندێك لە هاوەڵانت، بانگهێشتی ئێوارە خوانێك بکەیتو دەتەوێت هاوسەرەکەت ئاگادار بکەیتەوە بۆ ئەوەی خواردن ئامادە بکاتو ماڵەکە ڕێكوپێك بکات، وا گونجاوو شیاوە، لە پێش هەموو شتێکدا بە ڕاشکاوانە پێی بڵێیت: بە ڕاستی خواردنی دەستی تۆ زۆر خۆشو بەلەزەتە.. هەموو هاوەڵەکانم حەز دەکەن بانگهێشتیان بکەم بۆ ماڵەوە، تەنها لەبەر ئەوەی خواردنی دەستت بخۆن..

باوەڕ دەکەیت، لە بەناوبانگترین چێشتخانەکان نانم خواردووە، کەچی تامو چێژی خواردنی دەستی تۆی نەبووە!! دوێنێ یەکێك لە هاورێکانم بینی، هەر بۆ گۆڕینەوەی گفتوگۆ، پێم وت: سبەینێ میوانمان بە.. ئەویش یەکسەر ڕازی بوو!! لەگەڵ ئەویشدا چەند هاورێیەکی تریشم بانگ کرد، خۆزگە خواردنێکت بۆ دروست دەکردین..

ئەم شێوازە دەربڕینە جوانترو باشترە، لەوەی بێیتەوە بۆ ماڵەوەو بیکەی بە هاوار هاوارو بڵێی: خێرا.. خێرا.. خواردن ئامادە بکە، میوانمان دێت.. دوا مەکەوەو بە خێرایی ئامادەیان بکە.. بە هەمان شێوە کاتێك دەتەوێت داوای مۆڵەت لە بەڕێوەبەرەکەت بکەیت، یان هەواڵێك بە دایكو باوکت بدەیت.. لە پێشدا بە پێشەکییەکی جوانو کاریگەر لەگەڵیاندا بدوێ..

خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَـٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ

﴿... نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ... ﴿١٢﴾﴾ المجادلة. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك ویستتان چپەیەك، یان قسەیەکی نهێنی لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بکەن، پێش ئەو کارە خێرێك بکەن)..

عەرەب خوویان وابوو، پێش ئەوەی داوای یارمەتی، یان شتێك لە کەسێك بکەن، سەرەتا بە هەندێك وتەی جوان دەستیان پێدەکرد، بە هەمان شێوە ئەگەر بشیان ویستایە سوکایەتی بە کەسێك بکەن، یان بیان ویستایە کوشتاری بکەن، بە وتەو هۆنراوەو وتار دەستیان پێدەکرد.. هەندێك قسەیان دەکرد، کە لە شمشێر زیاتر کاریگەرییان لە سەر دەروونو جەستە دروست دەکرد..

پێغەمبەری خوداﷺ بە منداڵی لە نزیك ناوچەی هەوازن شیری پێدرا بوو، زۆریش حەزی دەکرد کە ئەو هۆزە باوەڕ بهێنن.. کاتێك هەواڵی پێگەیشت، کە هۆزی هەوازن خۆیان ئامادە کردووە، بۆ ئەوەی کوشتاری موسڵمانان بکەن، پێغەمبەری خوداﷺ و موسڵمانان بۆیان چوونو پەروەردگار سەرکەوتنی پێبەخشین..

ئەوەی کوژرا کوژراو زۆرێکیشیان لێ بە دیل گیرا.. پێغەمبەری خوداﷺ ئافرەتو منداڵەکانیانی لە جێگەیەك دانا.. هۆزی هەوازنی ویستیان پیاوێکی قسەزانی بلیمەت بنێرن، بۆ ئەوەی ژنو منداڵەکانیان ئازاد بکرێن.. بۆ ئەم مەبەستەش کەسێکی شارەزایان ناردو لە سەرەتای قسەکانیدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێمە لە خاڵوانی تۆین.. هەروەها ئێمە لە ئەوەی ئەو ئافرەتانەین کە شیریان پێدایتو سەرپەرشتیان کردی، ئێستاش دەبینی ئەوەی بە سەرمان هات، بە سەرمان هات، داوای سۆزو بەزەییت لێدەکەینو تۆ باشترین کەسی لێقەوماوانو بێنەوایانی..

پێغەمبەری خوداﷺ کاتێك گوێی لەم قسانە بوو، هەموو ژنو منداڵەکانیانی ئازاد کرد.. سەیر بکە چەند پێشەکییەکی جوانی باس کردو ڕۆژانی منداڵی هێنایەوە یادی پێغەمبەری خوداﷺ ..

**بە ئاماژەیەک تێدەگات..**

پارووی گەورە، پێش قوتدان، پێویستی بە جوینی باش هەیە..

## گرنگ نیە هەمیشە سەرکەوتوو بیت..

دوو هاوڕێ.. کە یەکێکیان زۆر کەللە ڕەق دەبێت، بە بیابانێکدا دەڕۆن و لە دوورەوە شتێکی ڕەش لە سەر زەوییەکە دەبینن.. ڕەشەباو گەردەلولی بیابانیش جار جارە لە چاویانی ون دەکات و جار جارەش دەردەکەوێت..

یەکەمیان ڕوو دەکاتە کەسی دووەم و پێی دەڵێت: پێشبینی دەکەیت، ئەو شتە چی بێت؟!

ئەویش دەڵێت: ئەوە بزنێکی ڕەشە..

یەکەمیان دەڵێت: قەلە ڕەشە..

کەللە ڕەقەکەیان دەڵێت: کە پێت دەڵێم بزنە، واتا: بزنە..

یەکەمیان دەڵێت: دەی باشە نزیک دەبینەوەو دڵنیا دەبین.. کاتێک نزیک دەبنەوە، بە تەواوی دەردەکەوێت، کە قەلە ڕەشەو بزن نیە..

یەکەمیان دەڵێت: براکەم.. بە خودا قەلە ڕەشە..

دووەمیان سەری ڕادەوەشێنێت و دەڵێت: بزنە.. بزن..

یەکەمیان بێدەنگ دەبێت، پاشان بە تەواوی نزیک دەبنەوەو قەلە ڕەشەکە هەڵدەفڕێت..

یەکەمیان هاوار دەکات و دەڵێت: قەلە ڕەشە.. قەلە ڕەش.. نابینی ئەوەتا هەڵفڕی؟!

دووەمیان دەڵێت: بشفڕێت هەر بزنە!!

بۆچی ئەم چیرۆکەم باس کرد؟ بۆ ئەوە باسم کرد، لە ئەنجامی ئەو هەموو لاپەڕانەی کە لەم کتێبەدا نوسیوومەو باسم کردووە، گەیشتوومەتە ئەو باوەڕەی کە هەندێک کەس، ئەگەر بە جوانترین هەڵسوکەوت و هونەری مامەڵە کردنیش، مامەڵەی لەگەڵ بکەیت، کاریگەری لە سەر دروست ناکەن و سودی لێ نابینن..

ئەگەر بە یەکێک لەو کەسانە بڵێیت: ماشاءالله.. جل و بەرگەکانت چەندە جوانن!! دەڵێی تازە زاوایت!!

بە بڕوای خۆت وا دەزانیت، بە ڕوخسارێکی خەندە ئامێزەوە سوپاست دەکات‌و خۆشحاڵی خۆیت بۆ دەردەبڕێت، بەڵام بە داخەوە، نەك هەر وای نەکرد، بەڵکو بە سوکیەوە سەیرت دەکات‌و دەڵێت: باشە.. باشە.. دەتەوێت بەم قسانە ڕەزای خۆت سوك بکەیت؟!

کاتێك ڕووبەڕووی ئەم کەسانە دەبیتەوە، بزانە کە ئەمانە نوێنەرایەتی کۆمەڵگە ناکەن‌و ژمارەیان کەمە..

بەڵێ.. سوێند بە خودا.. خۆم ڕێساو یاساو بنەماکانی ئەم پەرتووکەم تاقی کردووەتەوەو بینیم کاریگەری گەورەو بەهێزی لە سەر خەڵکی هەبووە..

لە سەر گەورەو بچوك..

لە سەر کەسانی زیرەك‌و ئاسایی..

لە سەر کەسانی خاوەن پلەو پایە..

لە سەر قوتابی زانکۆ، کاریگەری هەبووە..

لەگەڵ منداڵەکانمدا بەکارم هێناو تاقیم کردەوە، شتی سەرسوڕهێنەرم هەست پێکرد..

بەڵکو لەگەڵ زۆرێك لە کەسانی جیاوازدا جێبەجێم کرد، شوێنەوارو کاریگەرییەکەیم بینی.. منیش تەنها ئامۆژگاری کارێکم بۆ تۆی ئازیزو بەڕێز..

**بە کورتی..**

ئایا بە ڕاستی مەبەستت ئەوەیە گۆڕانکاری بکەیت..؟

# پاڵەوان بەو هەر لە ئێستاوە دەست پێبکە..

بیرم دێت خولێکم لە سەر شارەزاییەکانی مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکیدا، پێشکەش کرد.. عبدالعزیزیش یەکێك بوو لە ئامادەبووان.. تێبینی ئەوەم کرد، وردو درشتی شتەکان دەنوسێتەوە..

ڕۆژان تێپەڕینو خولەکە کۆتایی هاتو هەموو لێك جیابووینەوە.. لە دوای مانگێك جارێکی تر هەمان خولو بابەتو وانەم پێشکەش کردەوە، کاتێك سەیری ئامادەبووانم کرد، بینیم دووبارە عبدالعزیز لە ڕیزی پێشەوە دانیشتووە!!

سەرسام بووم!! بۆچی دوبارە ئامادەیە، لە کاتێکدا دەزانێت خولەکە، هەمان خولی پێشووە!!

کاتێك بانگی فەرموو، قوتابیەکان بڵاوەیان لێکرد، دەستی عبدالعزیزم گرتو شان بە شانی ڕۆیشتمو لێم پرسی: عبدالعزیز ئەوە بۆ دوبارە ئامادەی خولەکە بوویت، خۆ تۆ دەزانیت هەمان خولی پێشووە، دوبارەی دەکەمەوەو ئەو نوسراوانەی کە لە بەردەستتدان، هەر ئەوانەی پێشوون، ئەو بڕوانامەیەی کە بە دەستیشی دێنی، هەمان بڕوانامەی پێشووە!! کەواتە چ سودێك دەبینی؟!

ئەویش پێی وتم: ڕاست دەکەیت، بەڵام بڕوا بکە هاوڕێکانم پێم دەڵێن: بە ڕاستی عبدالعزیز ماوەی مانگێکە هەڵسوکەوتت لەگەڵماندا، بە تەواوی گۆڕانکاری بە سەردا هاتووە!! بیرم کردەوە، من لە ماوەی ئەم مانگەدا ئەو شتانە جێبەجێ دەکەم، کە لە خولی پێشوودا فێریان ببووم، هەر بۆیە هاتم بۆ ئەوەی بەشداری خولێکی تریش بکەمو دڵنیابم لەو هونەرو شارەزاییانەی کە فێریان ببووم..

**کەواتە..**

ئەگەر سوریت لە سەر ئەنجامدانی گۆڕانکاری،
پاڵەوان بەو هەر لە ئێستاوە دەست پێبکە..





## ناوەڕۆک

## بەختەوەر بژی..

● ژیان کۆمەڵێک هونەرو شارەزاییە.. گەلانێک ئەو هونەرو شارەزاییانەیان پەیڕەو کردو سەرکەوتوو بوون..

● یەکەم پێشەواو سەرکردەی سەرکەوتوانیش، محەمەد ﷺ بوو.. هەموو ژیانی ئەو پێشەوایە، پڕە لە گەوهەرو مرواریو ئەزمونی بەپێز، هەر بۆیە لە دوو توێی ئەم دێڕانەدا، وەکو ملوانکەیەک بۆم هۆنیوێتەوە.. لە ئاکامیشدا پەرتوکی بەختەوەر بژی لێ پێکهات..

● بەختەوەر بژی.. لە دایکبووی مانگێک، یان ساڵێک نیە، بەڵکو بەری ڕەنجی بیست دانە ساڵمەو بە خوێنم نوسیومەتەوەو گیانمی تێکەڵەو یادەوەرییەکانم تێدا تواندۆتەوە..

● بەختەوەر بژی.. چەندان هەڵوێستی ناوازەی یەکەم مامۆستاو ئارامی دڵو سۆمای دیدەمان، محەمەد ﷺی لەخۆگرتووە.. هەڵسوکەوتو تواناو زرنگی ئەو پێشەوایەم، لە گەڵ خەڵکیدا، خستۆتە ڕوو..

● بەختەوەر بژی.. یادەوەرییەکانی تایبەت بە خۆمی تێدا ئاوێزانە.. ئەزمونی ڕاستەقینەو چەند هەڵوێستێکی ژیانمی تێدایە، بۆ یەکەمین جارە دەیان دەرکێنمو دەیان خەمە ڕوو، سا بەڵکو خودایە سوودی لێ ببینرێت..

● بەختەوەر بژی.. دەستەوشەیەکە، هەڵقوڵاوی دڵو دەروونمەو ئامەزرۆی ئەوەشم، لە دڵو دەروونی تۆی ئازیزیشدا هەوار هەڵبدات.. کەواتە دڵت بۆی بزوێتو بەزەیت پێیدا بێتەوە، لەبەر ئەوەی لەلام شیرین ترینو بەنرخترینی پەرتوکەکانمە..

● لە پەروەردگاریش دەخوازم مایەی سوودمەندی بێتو تەنهاش لە بەر خاتری خۆی بێت.. پاداشتی هەموو ئەو کەسانەش بداتەوە، کە لە بڵاوکردنەوەی ئەم پەرتوکەدا بەشداری دەکەن..

د. محمد عبدالرحمن العريفي
Arefe6@gawab.com




نارین